# ئیتر لە دەرگا نادات، پۆستەچی!

کتێبی نامەکان

بوشرا کەسنەزانی

لەزنجیرە بلاوکراوەکانی

ناوەندی غەزەلنووس- بۆچاپ و بلاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب ٢١

# ئیتر لە دەرگا نادات، پۆستەچی!

کتێبی نامەکان

کتێبی یەکەم

## بوشرا کەسنەزانی


- بەرگ و هێلکاری: گۆران محەممەدی
- رێکخستن ونەخشەسازی ناوەوە: سینا حەکیم زادە
- چاپ: یەکەم – ٢٠١٤
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ١٣٠٠٠ دینار
- بلاوکار: ناوەندی غەزەلنووس- بۆ چاپ و بلاوکردنەوە

لەبەرێوەبەراتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ٢٢٤٥ی ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە.

## چەند پەیڤێک لە بارەی نامەوە

من وا بیردەکەمەوە کە قسە گرنگەکان.. قسەی نامەکانن، لەو شوێنەی قسە دەکەین بۆ ئەوی تر، بێ ئەوەی کەس زۆرمان لێبکات و بێ ئەوەی کەس چاومان تێبڕێت، بێ ئەوەی شەرم بکەین، دەنووسین و دەگێڕینەوە. هەندێجار لە نامەکاندا مرۆ هێند ڕووت دەبێتەوە، کە دوای زەمەنێکی دوور ئەگەر نامەکەی خۆی دەست بکەوێتەوە و بیخوێنێتەوە هەست دەکات سەرمایەتی، سەرمایەک دانەچۆقەی پێ بخات. بەڵام مرۆ شەرم ناکات نە لە ڕووتییەکانی نە لە گریان و تکاکانی ناو نامەکان، شەرم ناکات لە دەمێکدا قسەی بۆ کەسێک کردووە کەسەکە بەهای ئەوەندەی هەبووە لە قوڵایی وجودییەوە بۆی بدوێت، لەو خاڵە تاریکەوە، کە گەمارۆی داوە و خودی قسەکردن بەس بووە بۆ ئەوەی ئەو تاریکییە پڕ نەبێت لە بونەوەری بێ دەست و پێی خەیاڵی کە ژیانی بەشەر دەماشنەوە.

نامەکان سندوقچەی برین و گریان و نائومێدییەکانی ئێمەن، مەگەر ئەوە نییە پاش ئەو هەموو ساڵە ئێستە, کە دەیانخوێنینەوە تەزوویەک بە گیانماندا دێت و موچرکێک دەمانگرێت، ئایا دەبێت لێپێچینەوە لە خۆمان بکەین، بۆ زەمەنێک کەسانێکمان ناسیوون و پرس و ڕامان پێکردوون, یان جێگەی سەرنجمان بوون یانیش وەک مامۆستا و پێشەوای خۆمان تەماشمان کردوون. بۆ دەمانێک کەسانێکمان بە هاوڕێ و دۆستی دورئاسا زانیون؟ دەبێت لە خۆمان تورە بین کە جوانترین نامەکانمان بۆ کەسانێک ناردووە، ئێستا قینمان لێیانە؟ ئێستە سیاسەت و ئایدۆلۆژی و جیاوازی بیروبۆچوون و یەک قەبووڵنەکردن، یان ناشرینیەکانی دونیا هێند چۆتە نێوانمانەوە, دەرفەتی ئەوەی نەهێشتۆتەوە بچینەوە سەریان و بڵێین: ئەوە من بووم! منیش زەمەنێک کێ بووم!!

ئێستا کە نامەکان دەکەینەوە، بیرمان دەکەوێتەوە ئەو دەمە چۆن بووین و چۆنمان بیرکردۆتەوە؟ چیمان خوێندۆتەوە و چۆن ژیاوین و خەمی سەرەکی

ئەو دەمانەمان چی بووە و چیش هۆکاری بەدبەختی یان بەختەوەری ئەو وەختانەمان بووە. بنیام بۆ دەیەوێت ئەوسای خۆی بیر بباتەوە؟ بەلام نامەکان بە فەرامۆشی دەڵێن بۆستە؛ زەبری تۆ هێندەش قوڵ نییە، چونکە ئیمە هەین!

زۆرمان کە ئاوڕ دەدەینەوە دەبینین، ڕابردوومان ئازاری زۆرە، هێند زۆر کە هاتۆتە ئێستاوە و پەلە تازە چرۆکردووەکانی بۆ ئایندەش درێژ دەکات، بەلام مەگەر هەر ژیان ئەم ئازار و ناخۆشی و دڵڕەنجان و ئاشت بوونەوانە نییە؟ مەگەر ژیان لە سادەترین باریدا زنجیرەیەک دڵشکان و دڵڕنجان و چابوونەوە و خۆشبوونەوە و سەرلەنوێ ڕەنجاندن نییە؟ مەگەر ئێمە یەک جار ناژین؟ لەو جار ژینەدا و لە وێستگە جوداکاندا چەند هاوڕێمان دەبێت و چەندمان لێ جێدەمێنێ؟ ئاوڕێک دەدەینەوە و دەبینین چەندە زۆرن ئەو هاوڕێیانەی وان لە تاریکخانەی ڕابردووماندا، بەلام نامەکانیان ماون، نامەکانیان گەواهی دەدەن، ئێمە لەگەڵ ئەواندا دۆست بووین بەشداربووین لە باسکردنی جوانییەکانی ژیان و خەمە بچووک و عەزابە گەورە و نەبینراوەکاندا. خۆ ئەگەریش ئێستە ئیدی نامانەوێت باسی ئەو دەمانە بکرێت، ڕێزی وەک خۆی دەهێڵینەوە، **من وەها بیردەکەمەوە..**

کەس لە یادی نییە یەکەم نامە، کێ بۆ کێی نارد، بە کێ دا نێردرا، تەنانەت کەس بیریشی نییە ئەو نامەیە خوێندرایەوە و وەلام درایەوە یان نا.. کەس ئەمانەی بیر نییە، بەلام هەمومان یادەوەریمان لەگەڵ نامەدا هەیە، و نامەکانی خۆمانمان لە بیرە، ئەو نامانەی لەگەڵ هاتنیاندا دەموچاومان سوورهەڵگەڕاوە و بزە گرتووینی، ئەو نامانەی دەستمان لەرزیوە تا هەڵچڕین و خوێندنەوەی و یەکجار و دووجار و چەندین جار پێداچوونەوەی و هێشتاش هەزم نەکردنی. هەمووومان ئەو نامانەمان لە یادە، کە ڕەنگمان لەگەڵی دا ڕەش یان زەرد هەڵگەڕاوە و قورگمان هیشک بووە و سیمامان بەکاوەخۆ ڕەنگی مردووی لێنیشتوە. تەنانەت ئەو نامانەی غیرەتیان جولاندوین، یان توڕەییان کردووین، خستوینەتە جنێو دان، یانیش ئەو نامانەی هۆن هۆن فرمێسکی بە چاوماندا هێناوەتە خوار. ئەو نامانەشمان لە یادە کە هەواڵی زۆر ترسناک و وێنانەکراوی تیابووە و کەسی

نامەهێنمان ئیتر بە چاوی کەسێکی شومەوە تەماشاکردووە.. ئەزموونی هەموومان لەگەڵ نامەدا تا ئەو شوینەی نامەمان نووسیوە و نامەمان بۆ نووسراوە هاوبەشە. ئەزموونێکە سەر بە نەسلێک کە هێشتا چێژی نووسین بە دیار پەڕەی کاغەز و لە ولاتی ئێمەدا بە دیار کەسێکەوە بیبات و چاوەڕیی وەلام بین [پۆستە کەمتر هەبوو] لە ئەزموونە جوانەکانمانە. هەر هەبوونی ئەم ئەزموونەیشە، وامان لێدەکات هەست بە جۆرێک جیاوازی، بە جۆرێک کۆتایی بە جۆرێک لە لێوار و بوون و بەربوونە بکەین، چونکە بۆمان دەردەکەوێت زەمەنی ئەو جۆرە ناردن و چێژە ئیدی بەسەرچوو.

ئەم کتێبە نامەیەکی نۆستالیژییە، بۆ بیرهێنانەوەی ئەو زەمەنە لە دەستچووە، و سەرلەنوێ نووسینەوە و پەراوێزدانانە بۆ دەمانێک کە نامە موجیزەی نێوان پەیوەندییەکان بوو، نامە حوکمی بەسەر پەیوەندیەکان دا دەکرد، هەر نامە پەیوەندی دروست دەکرد و زۆرجاریش ئەو کۆتایی پێ دەهێنا، بۆ نەوەی داهاتوو، پەیامێک دەبێت بگەیەنرێتە گوێیان: نامە دەسەلاتی کەم نەبوو؛ لە ژیانی ئێمە دا!

ئەم کارە وەک نامە بکەرەوە و وەک نامە بیبینە ودوایش هەروەک بەسەرهاتی نامەکانی مێژوو، یان لە دەستتدا گرموڵەی بکە، یان بیسووتێنە، یانیش هەڵیگرە بۆ تا ئێستا دەبێتە مێژوو!

## کێ نامەکان هەڵدەگرێت؟

ڕەنگە یەکێک لە بەسەلیقەترین و نامەدۆستترین، کەسەکانی سەدەی نۆزدە، چیخەف بێت، چیخەف لە ژیانی دا بەوپەڕی وریاییەوە و نامەکانی دەپاراست، ئەمەش کاتێک دەرکەوت کە بڕیار بوو نامەکانی چاپ بکرێ، لە پاش مەرگی خۆی، هەر ئەو دەمە بینرا کە زیاتر لە "دەهەزار" نامە و نووسراوی بۆهاتووی پاراستووە، نەک هەر هێندە؛ بەڵکو بە ڕیزبەندی ناوی کەسی نێرەر و مێژووی و ڕێکەوتی ناردنی نامەکانی پۆلێن کردووە. ئەمەش جێگەی سەرسامی بوو، کە دواتر هەموو نامەکان لە چەند بەرگێکدا بڵاوکرانەوە. نامەی گرنگ و یاریدەدەری زۆرباش بۆ تێگەشتن لە چیخەف و بەرهەمەکانی. چیخەف نامەکانی دەپاراست چەندان نووسەری دیکەش کە ئێمە نامەکانیمان بە چاپکراوی لەبەر دەستە و لە زۆر حاڵ و باری ئەو دەمە تێدەگەین، هەم وەک مێژوو، هەم وەک باری دەروونی و هەڵچوونی کەسی و بیرکردنەوە نوێ و یەک لە دوای یەکەکانی، و گۆڕانی هزری و پێگەشتنی.

کۆکردنەوەی نامە وەک کتێب؛ لە کتێبخانەی کوردی دا، کارێکی نوێ نییە و بەر لەم کارە، هەوڵی گرنگ چ لە ئاستی نامەی تاکەکەسی و نامەی کۆدا دراوە، بۆ نموونە (یادی مەردان)[1] و کتێبی (ئەدەبی نامەنووسینی کوردی)[2] بە هەوڵێکی ورد و گەڕانێکی زۆرەوە لە سەرەتای پەخشانەوە باس دەکات، تا دەچێتە ناو یادداشت و عەرزوحاڵ و نامە و نووسراوی دیکە. کارەکە بەهای تایبەتی خۆی هەیە، ئەم کارە وەک نامەی کۆکراوەی کەسانی جیاواز و ناودار و نووسەران، وەک کاری تاکیش، نموونەی نامەکانی "جەمال شارباژێڕی"مان هەیە، کە نامەی ئەرشیفی خۆی بڵاوکردۆتەوە بە ناوی (نامەکان)[3]ەوە. یا نامەکانی (شەهید

---

[1] مەلا عبدالکریمی مدرس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا، ١٩٧٩.

[2] بڕوانە: کەمال ڕەئووف محەمەد(بابی لالۆ)، ئەدەبی نامەنووسینی کوردی، (٣)بەرگ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٤

[3] جەمال شارباژێڕی، نامەکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠١٣

شوانە تەنسیق)[1]، خود نامەی نێوان دوو نووسەر وەک "بۆنی شەراب لە هەناسەم دێ"ی هیواقادر و سەحەر رەسایی و بەردەوام بڵاوکردنەوەی نامە لە گۆڤار و رۆژنامەکان دا، ڕامان بە نموونە و چەندان کاری دیکە.

زۆرێک لە نووسەران هەستیان بە گرنگی نامە کردووە و پاراستوویانە، هەندێکی تریان وەک نووسەرانی کورد بە هۆی ئاوارەیی و دەربەدەری و یاساغییەوە نووسینەکانیان لەناوچووە یان خۆیان لە ناویان بردووە، یانیش لە مەنفا بووە بە قوربانی دەستی داڕزین و نەدۆزینەوە!

لە مێژووی کورد دا کەسێک کە زۆر گرنگی بە مانەوەی نووسراوەکانی دابێت، "مەولانا خالیدی نەقشبەندی" بووە، ئەو وەک کەسێکی ئایینی و شێخێکی خاوەن مورید، بێ گومان نامە و نووسراوی فرەی هەبووە بۆ گەیاندی پەیامەکەی و بڵاوکردنەوەی ڕێبازی نەقشبەندی، هەر زوو خۆی و موریدەکانی بۆ مانەوە وەک هێزێک و زانین و خۆسەلماندن بەرهەمەکانیان پاراست. نامەکانی خالید بە ناوی مەکتوباتەوە بە هەردوو زمانی فارسی و زمانی عەرەبی، لە بەردەست دان، کە لەم دووایەدا کران بە کوردی و بڵاوکرانەوە. دیارە لە کتێبی یادی مەردان وەرگیراون. ئەگەرچی دەستنووسی تر هەیە لە بارەی ئەو نامانەوە بۆ نموونە هەر ئەو هەوڵەی کە لە ساڵی (١٨٨٤) دا دراوە و نامەکان کۆکراونەتەوە، مانای ڕێزگرتن و بەهاپاراستنە، بۆ نامەکان بە پێی یەک لەو دەستنووسانەی من دیومە (١٢٦٣) عبدولفەتاح نەقشبەندی خالدی کوردی نووسیەتی و کۆی کردتۆتەوە و لە "خانەقای حەقە" لە دێی شەدەڵە پارێزراوە[2].. لێرەوە کورد هەوڵی پاراستنی ئەرشیف دەدات، بەڵام بە داخەوە لە سەدەی بیستدا بەهۆی هەموو شلۆقی باری سیاسی و جەنگە یەک لە دوا یەکەکانەوە ئەرشیفی نووسەری کورد وەک پێویست نامێنێت و لەبەرچاو دا نابێت..

---

[1] پیشکەشە بە بەڕێز دایکی ڕەوا، ئا. ئەمیرە محەممەد، بەهاری٢٠١٢مەکتەبی سیاسی ناوەندی مێژووی (ی.ن.ک).

[2] نسخە الخط عبدالفتاح كردى، مكتوبات، ١٨٨٤.

لە سەردەمی نوێ دا ئەوی ئەرشیفی پارستبێت [هێندەی من بۆ ئامادەکاری ئەم کارە سەردانم کردبێت]، "فەرهاد پیربال"ە. ئەو زیاتر لە پێنج سەد نامەی پاراست بوو لە ساڵانی هەشتا و نەوەدەکاندا، لە نێوان خۆی و هاوڕێی نووسەرەکانی دا ئاڵوگۆڕیان کردبوو. بابەتی زۆر هەنووکەیی و گرنگی ئەو دەمانەی تێدایە، لە چوونە شاخ و پێشمەرگایەتی نووسەرانەوە، لە سەرەتای کۆچی ئەو نەوەیەوە کە دواتر بە ڕەهەندییەکان دەناسرێن، بۆ هەندەران، لە باسی مەنفا و ناڕەحەتییەکانی غەریبییەوە، تا شەڕی براکوژی، تێدایە. هاوتا لە نێو ئەو نووسەرانەی دیکەدا بە سەلیقەوە پاراستن لە ئەرشیفی "کاکە حەمەی مەلا کەریم" دەبینرا، زیاتر لە دوو سەد نامەی بە پاکەتنامە و بە ڕێزەوە پاراست بوو.

بۆ پەیداکردنی ئەم نامانە، نامەی ئەلکترۆنیم بۆ زۆرێک لە نووسەران نارد و زۆریانم دیت و پەیوەندیم لەگەڵ زۆری تریشیاندا گرت، هاوتا سەردانی هەنێکێشیانم کرد، هەندێکیان هەرگیز وەڵامیان نەدایەوە [کە ئەمە زۆر جار قەدەری نامەیە و لە تایبەتمەندییەکانییەتی]، هەندێکان بە هەڕەشە و تورەبوونەوە وەڵامی پڕ ڕوونکردنەوەیان نووسی بۆ بڵاونەبوونەوەی نامەکانیان [کە ئەو هەڕەشانە زیادەبوون، چونکە من بێ ڕەزامەندی، بڵاوم نەدەکردنەوە]، هەندێکیان ئامۆژگاریان کردم دەست لەو کارە نەدەم. هەندێکیان زیاتر لە شەش بۆ حەوت مانگ ڕایان دەگرتم کە نامەکە دەنێرن و ڕازین بڵاوبێتەوە، بەڵام دواتر ئیمەیلیان دەکرد کە پاشگەزبوونەتەوە، هاوتا ئەو کەسانەشی نامەکانیان لەم پەرتوکەدایە، بێگومان هاوکارم بوون و دڵگەرمیان کردووم، تا کارەکە بێتە دی.

ڕەنگە بوترێت بۆ ئەم کارە! من دەڵێم نازانم، دوورنییە، نەمەوێت ئەمەش نامەیەک بێت و بیگەیەنم بە خوێنەری ئەو نووسەرانەی، لە بوارە جیاوازەکاندا دەنگیان هەیە و خوێنەری خۆیان هەیە، دوورنییە ئەمەش نامەیەکی تر نەبێت، کێ هەیە بڵێ بۆ نامە دەنێرێت؟ تەنها دەتوانیت نەیکەیتەوە و هەرگیز نەیخوێنیتەوە!

نامەکانی نێو ئەم کتێبە، دەبێت لە چوارچێوەی سەردەمی خۆیاندا بخوێنرێنەوە و چێژیان لێوەربگرێت و بیریان لێبکرێتەوە، بەبێ ئەوە مەحاڵە هەڵگری قورسیایی خۆیان بن..

### نامەکان وەک چی تەماشاکەین؟

بێگومان نامەکانیش وەک دەقێک دەبێت هەڵگری تایبەتمەندی خۆیان بن. لە ڕەگەز و خەسڵەت و بونیادی تایبەتی خۆیان بێبەش نەبن. بەڵام لەو ڕوانگەیەوەی نامەکان لە دەمی نووسینیاندا وەها بڕیارێک لە ئارادانییە بڵاوبکرێنەوە، گفتوگۆی نێوان دووکەسە، بە نۆرەیی، واتە مادەم ڕووبەڕوو نییە، یان وەک دەمی ئێستە چات و مەسیج نییە، کەسی یەکەم ڕەهایی وەردەگرێت بۆ تاک گۆیی و پاش تەواوبوونی نۆرەی کەسی بەرامبەر دەدات ئەویش بەهەمان چەشنی تاک گۆیی، بەم شیوەیە لە پەیوەندییەکی دوو جەمسەرەدا نامەکان دێنە بوون. ئەمە وەک باری باو و ئاسایی، خۆ لە باری نائاسایی دا، تەک گۆیی قوڵ دەبیتەوە و درێژە دەکێشت، ڕەنگە بۆ چەندان ساڵ ڕەنگە بۆ هەمیشەش. کە ئەمانە زیاتر لە ناو ئەدەبیاتی چیرۆکی دا بەرچاودەکەوێت.[1]

---

[1] نموونەیەکی ئەم تاک گۆییە، لە ڕۆمانی "ڕاپۆرتی مەرگێکی پێشوەخت ڕاگەیەندراو"ی "گابریل گارسیا مارکیز" دا هەیە: کە "ئەنخێلا ڤیکاریۆ" بەردەوام نامەی دووروودرێژ بۆ "بایۆردۆ سان رۆمان" دەنووسێت بێ ئەوەی هیچ وەڵامێکی هەبیت ئەو نامانەی لە ناو ئەدەبیاتدا بایەخیان هەیە و گرنگن و نامەی تاک لایەنەن, یان نامەی بێ وەڵامن, یان نامەی نەنێردراون. زۆرن بۆ نموونە جگە لەم ڕۆمانەی مارکیز, دەکرێت ئاماژە بە نامەکەی تێس بدەین لە رۆمانی (تێس)ی تۆماس هاردی و, بە رۆمانی ژیان کورتەی یۆستاین گاردەر و هەژارانی دستۆیڤسکی و دواجاریش رۆمانی بەعلی بابلی ئارابال و نامە بۆ باوکمی کافکا, کە ئەمەی دوایی نامەیە و نەگەشتۆتە کەسی مەبەست کە باوکییەتی و چەندەین ڕۆمانی تری گرنگ کە لە یادم نین, یان من هێشتا نەمخوێندونەتەوە...

لە نامەی ئاسایی دا نۆرەی کەسەکان ناوبەناوە، بە جیاوازی بێ قەراریەکانی کەسانی شەیدا و عاشق کە چاوەڕوانی وەڵام ناکەن و دەنووسن، وەگەرنا خەسڵەتی قسەکانی ناو نامە، پێویستی بەو ناوبەناوەیە، ئەمەش لە مەودای ناردنی نامەکەدا کەسی بەرامبەر پاش خاڵی کردنەوەی هزری یان ڕشتنی چرە بیرەکانی، چاوەڕیی کاردانەوە و وەڵامی کەسی بەرامبەرە بۆ بەردەوامی گفتوگۆکە و گەشتنە ئامانج، دواجاریش پاراستنی پەیوەندییەکان.

## ئیستاتیکی نامە

دەقی نامە، پانتاییەکە لە ناو خۆیدا زۆریک لە ڕەگەزەکانی تری ئەدەبیات هەڵدەگریت: دوور لە چوونەوە سەر پێناسە و چەمکی نامە و ڕەگەزەکانی، لە خودی نامەکانەوە باسی پێکهاتەکانیان دەکەین. دیارە ئەم نامانە جیاوازن لە نامەی خۆشەویستی و باسی عەشق، کە لەو بڕوایەدام لە داهاتوودا کاریان لەسەر بکەم. ئەم نامانە؛ نامەی نێوان نووسەرانن لە دوو جۆر پەیوەندی دا، پەیوەندی هاڕییانەی فرە نزیک و پەیوەندی دووراودوور و فەرمی. بەڵام لە هەردوو بارەکەدا نامەکان دەقن و دەکرێت بە دەقی ئەدەبی یان نیمچە ئەدەبی ناوزەدیان بکەین.

بەر لە هەرشتێک کەسی نامەنێر کاتێک نامەیەک دەنێرێت، کەسێکی دیاریکراو یان کەسانێکی دیاریکراوی لە پێش چاوە و زاری قسەی لەوانە، ئەمەیشە وادەکات نامە لە دەقی دیکە جودابێت. نامەنووس کەسێکی وێناکراو یان خوازراوی وەک نووسەر لە پێش چاو نییە، یان خودیش وەک هەندێک لە نووسەرەکان بڵێن بێگومان بۆ خۆمی دەنووسم. نووسین لەم خاڵەدا لە چوارچێوەیەکی دیاری کراودایە، بەو شیوەیە: بڵێ من واخەریکە نامە بۆ تۆ دەنووسم! لێرەوەیش ئێمە کەسێکی نێرەر و کەسێکی وەرگر، لەو ناوەندەش دا پەیامێکمان هەیە. کەسی نێرەر لە دەمی نووسین دا، کەسی وەرگری لە ئەندێشە دایە و کۆی پەیامەکەی بۆ ئەو ئاراستەدەکات. بۆیە بەهۆی (ئەو) هەبوونەوە، چییەتی و چۆنییەتی پەیامەکە دەگۆڕێت، درووست بە پیچەوانەی ڕۆماننووسێکەوە، کە بۆ هەمووان دەنووسێت و چینێکی دیاریکراو یان کەسێکی

تایبەتی پێشوەخت دانراوی لە زەیندا نییە. لەبەر ئەم هۆیەیە نامەکان دەبنە دەقی نهێنیخواز و ڕازاوی و زۆرجاریش لە ناو خەرمانەیەک لە تەمومژی واتایی و تێگەشتندا دەمێننەوە، بۆ کردنەوەیان پێویستمان بە کلیکی وەرگر دەبێت. وەک چۆن بۆ هەندێک لە نامەکانی نێو ئەم کتێبە, دەبوو من پەنابیمەوە بەر وەرگرەکان تا لەو نهێنی یان ڕازە بە خەبەربوومایە، کە ڕەنگە بیست یانیش پەنجا ساڵ لەمەوبەر نووسراوەو تا هەنوکەش ڕازە.

نمونەیەکم بێتەوە یاد، کە نێرەر لە دەمی نووسینی دا، نامەکەی ئاراستەی کەسێک کردووە و کەسێکی دیکەی مەبەست بووە، بەو مانایەی کەسی ناو ئەندێشەی کەسێک بووە و کەسی وەرگر کەسێکی تر، ئەمەش بۆ هێزدان و برەودان بە خۆی تا بتوانێت ئەوەی دەیەوێت بینووسێت. نامەیەکی "غەسان کەنەفانی" بۆ "غادە سەمان"ە. بەو پێیەی هەردووکیان نووسەرن و لەو نێوەندەشدا نامەکە, نامەیەکی ئەڤینداری غەسانە بۆ غادە، بەڵام لە سەرەتاوە تا کۆتایی ڕووی دەمی لە "فایزە"ی خوشکی خۆیەتی و هەموو پەیامەکان بەجۆرێکن، کە قسە بۆ فایزە دەکرێت. ئەوی مەبەست؛ بە کەسی نائامادە باس دەکرێت، کەسی نامەبەست بە ئامادە. واتە کاتێک نامەکە بخوێنرێتەوە، هەست بەوە دەکرێت ئەم نامەیە دەردەدڵێکە بۆ خوشکێک، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، دوایی دەزانین، کە بۆ غادە نووسراوە:

"نازانم فائیزە، بەڵام دەزانم ڕۆژو شەو، سات دوای سات، بیر لە هەموو ئەمە دەکەمەوە و لەپێناویدا دەژیم و عەزاب دەچێژم.. هەندێ جار سەیری چاوەکانی دەکەم و بەخۆم دەڵێم: دەبێ ڕقت لەو ئافرەتە بێتەوە کە پێی خۆشە بەم شێوەیە زەلیلت بکا، بەڵام ناتوانم. جاران دەمتوانی بگەمە بڕیارێک لەوساتەی ئاوهام بەخۆم دەوت، بەڵام ئێستا نازانیت چەند بەدبەختم! دنیا سەیرە، چارەنووسیش بەهەمان شێوە. دەستێکی دڵڕەق لەئاسماندا شتەکانی بەشێوەیەکی ترسناک تێکەڵاو کردووە، کە سەرەتای شتەکانی کردووە بە کۆتاییەکانی و کۆتاییەکانی کردووە بە سەرەتا.. بەڵام پێم بڵێ: چ شتێک شایەنی

ئەوەیە بیدۆڕێنین لەم ژیانە ڕاگوزەرەدا؟ تێدەگەی مەبەستم چییە؟ لەکۆتاییدا ئێمە دەمرین."

کەسی قسەبۆکراو وەک دەبینن فایزەیە، بەڵام لە کۆتایی نامەکەدا کاتێک غادە بڵاوی دەکاتەوە، بە تێبینی دەنووسێت:

سپێدەی ڕۆژی (٢٨/١٢/١٩٦٦) دەنگی لێدانی دەرگا خەبەری کردمەوە. "غەسان" وەستابوو، ماندوو و توڕەبوو، ئەو نامەیەی دایە دەستم و وتی: ئەمە بۆ تۆیە، بۆ تۆم نووسیوە، بەڵام لەبەر توڕەییم لەتۆ، ئاراستەی فائیزەی خوشکمم کردووە. نامەکەی لەناو دەستم جێهێشت و ڕۆیشت. نامەیەک بوو کە شەوی پێشوو دەستی بە نووسینی کردبوو و لەگەڵ بەرەبەیاندا بەنامەیەکی دی تەواوی کرد بوو.[1]

نامەیەکی دیکەی لەم چەشنە, نامەیەکی "جیمس جۆیس"ە بۆ "نورا"ی هاوسەری, بە یادی ئەوەوە دەچێتەوە ئەو ئوتێلەی کە یەکەمجار ئەوی وەک خزمەتکار تێدا ناسیوە و دواتر یەکیان خۆشویستوە و بوونەتە هاوسەر و هەنوکە لە دەمی ناردنی ئەم نامەیەدا لێک دوورن. ئەو نامەکە بە کەسی سێیەمی تاک دەنووسێت و ڕووی دەمی لە کەسێکی نادیارە و باسی نورا دەکات, هەم کەسی سێیەم و هەم دووەمەکەش خودی نورایە:

"دوێ شەو کاتێک نامەم بۆ نووسی لە بارێکی دەروونی زۆر خراپ دابووم, بچووکترین پەیڤی کاریگەریەکی قوڵی لەسەرم دەبێت..."[2]

ڕەنگە جۆیس پیرۆزیی نورای بردبێتە ئاستێکی هێند باڵا, کە ڕووی نەیەت زاری قسەی ڕاستەوخۆ لەو بکات و بە ناڕاستەوخۆ بۆی هاتوتە قسە.

---

[1] ئینسان هیچ نییە، جگە لە دۆزەرەوەی پەناگە، غەسان کەنەفانی، و. زلێخا، گۆڤاری هەنار، ژمارە ٤٧، ل١٤٤.

[2] احمد اخوت, ای نامە, کتاب جهان, چاپ اول ١٣٨٨, ل١٠٦

لە نامەدا کەسی نێرەر، کە دەیەوێت پەیامەکەی بگەیەنێت، لە سادەترین شێوەی دا پەنادەباتە بەر ڕشتنی هێڵێک بۆ ئاراستەکردنی پەیامەکە، ئەو ڕەنگرێژیە خۆکردەو و زۆرینەی بار ئامادەنەکراوە، بەڵکو لە ئان و ساتی نووسیندا دەڕێژریت و پەیڕەو دەکرێت، جاری واشە ئاراستەکە دەگۆڕێت. بۆ نموونە هەموو نامەیەک بە سڵاو دەستپێدەکات پاشان هەواڵپرسین و دواتر چوونە ناو بابەتی گفتوگۆ و گێڕانەوە جوداکانەوە، لە کۆتایش دا دووپاتکردنەوەی ڕێز و خۆشەویستی و ئەوسا ناو و ئیمزا. ئەمە وەک دەقێک لە ئاساییترین و باوترین جۆری دا. بەڵام کەسەکان بەپێی شێوازیان بۆ جیاکردنەوەی خودییەتی خۆیان لەوانی دیکە, هاوتا نیشاندانی سەلیقەی ئەدەبی و ئاستی جوانی ناسییان، بەو پێیەی نامەی نێوان دوو ئەدیبە (لەم کتێبەدا)، چۆنییەتی پەیامەکەیان دەگۆڕێت. خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی خودئاگاییش نەبێت, ئەوە ناخودئاگا بە جۆریک دەنووسن، کە خودیەتی خۆیانیان پێوەدیار بێت. ئەم بابەتەش زیاتر پەیوەست دەبێتەوە بە شێواز یان ستایلی کەسی نێرەرەوە. بەر لە هەر شتێک دەتوانین لە فۆرم و ڕووی دەرەوەی نامەکانەوە بدوێین، تا دەگاتە ناواخن و پێکهاتە و جۆریەتی پەیامەکە.

لە کۆی ئەو نامانەی لەم کتێبەدا دەبینرێن، تەنها پازدە نامەیان، نامەی دەستنووس نین، ئەوانی دیکە دەستنووسن و دەگەڕێنەوە بۆ دەمی بەر لە شاڵاوی کۆمپیوتەر و ئیمەیل. ئەگەرچی مێژووی ناردنیشیان بگەڕێتەوە بۆ سالانی دووهەزار، واتە تەنها سیانزە ساڵ بەر لە ئیستا. بەڵام تایبەتمەندی خۆیانیان لە دەستنووس دا پاراستووە. بەو مانایەی ئەم نامەیە، یەک دانەیە من بە دەستی خۆم بۆ تۆی دەنێرم. کۆی نامەکان بەگشتی لە دوو شێوەدا دەبینرێن، شێوەیەکیان نووسینە لەسەر کاغەز بە هەموو قەبارە و شێوەکانییەوە، جۆریکی دیکەشیان پۆستکارتە، نموونەی ئەمیان کەمترە. لە پاڵ ئەم دوو شێوەیەدا باری شازیشی تیدەکەوێت.

نووسەران بۆ نووسینی نامەکانیان بێ گومان بە پێی کەسی بەرامبەر جۆری هەڵبژاردنەکانیشیان دەگۆڕێت، بۆ نموونە نامەیەکی "فەرهاد پیربال" بۆ

"ئەحمەدی مەلا" نامەیەکە وەک زۆرێک لە شیعرە وێنەییەکانی نووسەر، نووسراوە. لەسەر ڕووی فیگەرێک نێراوە، ڕوویەکی وێنەی کوردێکە بە چەکەوە و ڕووەکەی تریش مەودای ڕەشی نووسین لە ناوەڕاستی کاغەزە سپییەکەدا بە جێهێشتنی مەودای جودا لە هەر چوار لاوە، لە ناوەندا نووسینی نامەکە بە جۆرێکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە شێوەی مەرکانەیەک، خۆی دەنوێنی کە لە کۆتایی نوکی خوارەوەدا لێی دەچۆڕێت. یاخود بە پێچەوانەوە نامەیەکی "ئەحمەدی مەلا" بۆ "فەرهاد پیربال" لەسەر پارچە کارتۆنێکی خڕ نێراوە و هەموو مەوداکەش بە شێوەیەکی بازنەیی بە پەخشانێکی ئەدەبی پڕ کراوەتەوە.

ئەو شیوازە ئێستاتیکییەی فەرهاد پیربال، لە نامەیەکی "ڕێبوار سیوەیلی"دا دەبینرێت بۆ فەرهاد پیربال، کە خودی نامەکە لە ناو کارتێکی کراوەدایە، لە پشتەوەی کارتەکە، وەک پەراوێز بەشێکی قسەکانی بە شێوەی بازنە و حەلەزونی و هاوتا بە پێنووسی سوور نووسیوە، کە بۆ خوێندنەوەی ناچاریت کارەتەکە چەندان جار بخولێنیتەوە تا لە بازنە بچوکەکەوە دەگەیتە بازنەیەکی گەورەی کراوە.

شیوەیەکی دیکەی تایبەت، نامەیەکی "ریبوار سەعید"ە بۆ "فەرهاد پیربال"، کە ئەم جۆرە نە کاغەزی ئاسایی و نە کارت و پۆستکارتە، بەڵکو وەک کارێکی هونەری و هاوتا دیارییەکیش، تابلۆیەکی بچوکی ئۆرگینالی خۆیەتی، کە هەم تابلۆکە هەم نامەکە پیکەوە کۆی پەیامەکە دەگەینن، بەو تایبەتمەندییەی ئەو تابلۆیە بۆ هەمیشە یەک دانەی هەیە، ئەویش نێردراوە بۆ پیربال و ئێستە لە ئەرشیفی من دایە!

زۆرێکی تری نامەکان لە سەرەتاوە تا کۆتایی پەڕە نووسراون، لە کۆتایی دا پەراوێزەکان شتانی گرنگ، بەڵام لە یادکراویان تێدایە و لە باری پانی پەڕە یان بە خواری یان بە سێگۆشەیی لە سووچێک دا نووسراون.

نامە وەک شێوەی نووسین و زمانی ئەدەبیش، دیارە لە دەمە جوداکاندا دەگۆڕێت، بۆ نیشاندانی ئەو دەمانە دوو نامەی سەردەمی نوێ لەم کتێبەدا

دەبینرێن، کە بە ستایل و زمانی ئەدەبی ساڵانی حەفتاکان نووسراون. وەکوتر نامەی دیکە هەن، چونکە ئەو نامانەی لە شێوە باوەکانیاندا هەر یەکەیان و زادەی سەردەمێک و مێژوویەک و ناوچەیەکی جوگرافین، کە کار لە نووسینەکان دەکەن. هاوتا لەگەڵ دەمی نووسینی نامەکەدا بە ڕەچاوکردنی بیری ئەو کەسە، بەرامبەر بە شتەکان بە خودی ئەو پەیوەندییەی کە تێیدایە.

بۆ نموونە ئەگەر کۆنترین نامەی ناو ئەم کتێبە وەربگرین، نامەی (حافز مەلا محەمەد زادە) کە بە تورکی نووسراوە، نامەیەکی سەمییە و زیادەڕۆیی تیدانییە لە ڕووی دەربڕین و زمانەکەشی زۆرتر پەیامییە تا زمانێکی هەستی. بەڵام بە پێی زەمەنی ناردنی نامەکان، چاومان بە نامەی تایبەت دەکەوێت، کە خوێندنەوەی بۆ ئێستە و بۆ خوێنەری ئەم دەمە کەمێک گرانە، وەک نامەکەی "ئیسماعیل حەقی شاوەیس" بۆ "شوکرییە ڕەسول"، کە خودی شێوازی نووسین و ڕێنووسەکەشی جۆریکە نەک هەر تایبەت بە دەمێکی دیاری کراو، بەڵکە لە دەمی خۆشیدا تاک شێوەیە و تەنها بۆ ستایلی ئەو دەگەڕێتەوە، کە خوینەر هەر لە سەرەتاوە هەستی پێدەکات. بۆ نموونە رێنووسی سلێمانی بەم شێوەیە نووسراوە: (سوو لەی مانی)، یاخود لە نووسینی هەندێک وشەدا وەک دانانی حەوتی ژێر (ڕ) بۆ بە قورسی خوێندنەوەی دوو (رر) نووسیوە. نامەکە وەک ناواخن و وەک ڕێنووس دەبێت بەشیوەی جودا و لە دەمی جودادا لێکۆڵینەوەی لە بارەوە بکرێت. دیارە لێرەدا خوێنەر دەبێت ئەو بەرچاو ڕوونییەی پێ بدرێت کە نامەکان بە ڕینووسی خۆیان نووسراونەتەوە، تەنانەت بە هەڵە و پەڵەی زمانیشەوە دانراونەتەوە، هەندێک لە نووسەران لە دانانی (و، ی، سەر و بۆردا) پێڕەوی خۆیانیان هەبووە، بۆیە ئێمە وەک خۆیمان داناونەتەوە تا لە دەمەکانی داهاتوودا وەک بەڵگەی زمانی و کارکردن بە شێوەی دیاکرۆنی سودی بۆ توێژەری ئەو بابەتە هەبێت، جگە لە نامەکەی شاوەیس، هەڵەی نامەکانی دیکەشمان ڕاستکردوەتەوە و لە کەوانەدا ڕوونکردنەوەیش دراوە.

ناواخنی نامەکان، هەندێکیان لە سڵاو و ڕێز بۆ کەسی وەرگر و کەسوکار و مناڵان و هاوسەرەکەی. کە زۆر جار ئەمە شێوە باوەکەیەتی. لە نامەکاندا

مەودایەکی فرە بۆ کەسی نێرەر هەیە تا خۆیی تێدا بگێڕێتەوە و باس لە خودی خۆی بکات، ئەگەر مەودای نامەکان دابەش بکەین بۆ چوار بەش، ئەوە سێ بەشی بۆ خودی نێرەرە و یەک بەشی بۆ وەگر و خێزان و ئاشنا و هاوڕێیانەیە لە سنووری پەیوەندی هەردوو لادان. بە جیاوازی ئەو نامانەی کە بابەتی سەرەکی باسی بەرهەمێکە یان ڕووداوێکە، ئەوسا مەودای زۆرینەی باس بۆ ئەو تەرخان دەکرێت.

لە ناواخنی نامەکاندا هەندێکیان باس لە چرکەساتی مێژوویی یان چرکەساتی هەستی، یانیش دەمی نووسینی ئەو نامەیە دەکەن. بۆ نموونە لە نامەیەکی "ئەرخەوان" دا بۆ "شوکرییە ڕەسول" وێڕای زمانە پەخشان ئاساکەی، کە تایبەتە بەو دەمە و لە دەمی نوێ دا ئیتر نامەکان ئەو زمانە پەخشانییە خوازەییە دەگۆڕن بۆ شێوەیەکی دیکە، دەنووسێت:

"ئێستا ئێوارە بە کات ژمێر (٧)ڕۆژی "شەم ٦-٤-١٩٦٩" ١٧-١-٢٥٨١ کوردی بارانێکی بەخوڕ ئەباری ئاسمان بەرگێکی ڕەش و مۆنی پۆشیوە و کزەبایەکی سارد دێت جارجار هەورەتریشقەیەک ئەدا و خورەی باران بە خوڕ بەسەر بووکی سروشتا ئەگری وەک ئەوەیە هاوبەشی منە لە خەم گریاندا.."

"جەلیل قەیسی" باسی هەستی خۆی دوای کۆڕەکەی "شێرکۆ بێکەس" دەکات و ئاماژە دەدات، بەوەی دەمی نووسینی نامە, ئەو کاتەیە، کە لەو کۆڕە هاتوتەدەر.

ئەم چرکەساتانەی نووسەرەکان تێهەڵکێشی دەکەن، دەبنە پاژێک لە جوانیناسی نامەکان، وەک چۆن "هیوا قادر" دەنووسێت: "ئێوارەیەکی پایزە، گوێ لە مۆسیقای فیلمی "شین" ئەگرم، تەنها لە پەنجەرەوە سەیری ئەو باڵدارانە دەکەم، کە لە من دەچن، منیش لەداخی ئەوەی کە وەک ئەوان باڵم نییە، ئەم نامەیەم بۆ تۆ نووسی".

"شێرزاد حەسەن" دەنووسێت: "سلێمانی ژوورەکەی خۆم، ئێوارەیەکی دڵگیری بەهارە و زەردەپەرە.. من هێشتا بڕوا ناکەم وام لە سلێمانی.."

"محەمەد موکری" دەنووسێت: "برا ئەوە ئێستە، پێکی دووەمی عارەقەکەی ئێوە، هەندێ لەو هەستە ناسک و دەگمەنانەی پێ بەخشیوم.."

"هێمن" دەنووسێت: "هەتاو هەڵات و ئارەقم بە ناوچاوان دا، هاتە خوار و نووسین دژوار بوو. جارێ ماڵئاوا.."

هەندێ نامەی دیکە هەن ساتی مێژوویی گرنگیان تێدایە، بۆ نموونە "مەزهەری خالقی" بۆ "شێرکۆ بێکەس" دەنووسێت: "ئێستە کە ئەم نامەیەت بۆ ئەنووسم، سێ ڕۆژ بەسەر مردنی خومەینی دا، تێ ئەپەڕیت بێ گومان مەرگی هەر دیکتاتۆرێ، شادی دینێ و نوخشە بێت لە زوحاکی بەغدا.."

یان "عەتا محەممەد" لە کورتترین نامەی ئەم کتێبەدا بۆ "بەرزان هەستیار" دەنووسێت: "برای بەڕێز کاک بەرزان هەستیار.. پاش ڕێز و سڵاو چاوت ماچ دەکەم، ئێمە باشین لە شەڕی ناوخۆ دا، ئەی تۆ...؟" لە کۆتایی پەڕەکەش دا دەنووسێت چواردە سەعات دوای شەڕ وەستان. بێ گومان مەبەست لە شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانە لە ساڵی ١٩٩٦دا.

بێگومان زمانی نامەکان، لە نامەیەکی فەرمییەوە، بۆ نامەیەکی هاوڕێیانە دەگۆڕێت. زمانی بەشێکیان زمانی ئاسایی و هەواڵین. بەشێکی دیکەیان زمانی باڵا و چڕ و ئەدەبی. لە پاڵ ئەمانەشدا زمانی شۆخی و تەشەر و تەنانەت جنێوێشی تێدەکەوێت.. کە زیاتر لە نێو نامە زۆر هاوەڵانەکاندایە، هاوتا بە ڕەچاوکردنی خودی شێوازی نووسەرەکە. یەکێک لەو نووسەرانەی لەگەڵ هاوڕێیانی دا بێ پەردانە دوواوە، "شێرزاد حەسەن"ە. هاوتا لە نامەکانی "محەممەد موکری" و چەند نامەیەکی "ڕێبوار سیوەیلی"یش دا، ئەو جۆرە گفتوگۆ نزیکانە بەدی دەکرێت. بەڵام ناکرێت ئەمە بگشتێنرێت، چونکە هەمیشە دەبێت کەسی وەرگر لە بەرچاوبێت، دەتوانین تەماشای دوو نامەی یەک نووسەر بکەین:

_ لاچاوی کچانی پاریس ماچ بکه و سلاوی منیان پێ بگەیەنە.

_ سلاوی گەرم و ڕێزی بێ پایانم قبوڵ بفەرموون.. دەستی مامۆستای مەزن ماچ دەکەم و ئاواتی تەمەنی درێژی بۆ دەخوازم

نامەیەی یەکەم بۆ "فەرهاد پیربال" نێراوە، نامەی دووەم بۆ "کاکە حەمەی مەلا کەریم". ئەگەرچی هەردووکیان "ریبوار سیوەیلی" ناردوونی، بەڵام دوو دەربڕینی جودان. هەر بۆیە ڕووبەڕووی گەلێک کێشە بوومەوە وەختێک دەمویست ژمارەیەک نامە کۆبکەمەوە و لە بەرگێکدا چاپیان بکەم، چونکە دەبوو هەندێک قسەی دۆستانە هەندێک دەربڕینی هەستیار لابرێت، کە خاوەن نامەکە نەیدەویست ئەو بەشەی کەسێتی دەربکەوێت، بۆ هەموو ئەمانەش بە شێوەی (....) لە نامەکاندا دانراون، بەو مانایەی ئێرە وشە یان ڕستە یان پەراگرافێک هەبووە، کە لەبەر هۆکاری کۆمەڵایەتی، ئایینی، سیاسی، یانیش زۆر شەخسی ناکرێت لە ئێستادا دابنرێت، بەڵام لەگەڵیشیدا بە خوێنەر وتراوە کە لەم شوێنەدا وشە لابراوە[ ڕێک ئەو وشەیەی کە خوێنەر بۆی دەگەڕێت و بەڵام نایبینێت].

زمانی پەخشانی و ئەدەبی لە بەشێک لە نامەکانی "جەلیل قەیسی" و "لەمیا" و "ئەهەبە جەزائیری" دا دەبینریت، کە وەسفی ڕەوانبێژی ئاسای تێدایە. لە بەرامبەر ئەمەشدا زمانێکی دیکە هەیە، کە بارگاوییە بە فیکر بۆ دەربڕینی خود و گرتنەوەی ئەو مەودایەی بۆ خود تەرخان کراوە لە نامەکەدا: وەک نامەی "مەریوان وریا قانع"، نامەی دیکەش هەن، کە زمانەکەیان زمانێکی شعرئاسای بارگاوی بە هزرە، زمانێکە لە ناوخۆیدا ڕامانی هەڵگرتووە، وەک نامەکانی "ئەنوەری ڕەشی عەولا"...

هاوکاتی ئەمانە، زمانی شیعری هەندێک نووسەر زاڵە، بۆ نموونە لە هەندێک نامەدا "شێرکۆ بێکەس" بە نەفەسێکی شیعرییەوە دەست دەکات بە نووسین و پاشان دەبێتە زمانی ئاسایی. ئەم شێوەیە لە جیهانی ئەدەبیدا لای "نازم حیکمەت" دەگاتە لوتکە، بە تایبەت لەو نامانەی دا، کە لە زیندانەوە ناردوونی، بە

تێبینی ئەوەی بەشێکی زۆری بۆ هاوسەرەکەی (پیرایە) بووە. لەگەڵیشیدا بەشێکی زۆر شیعرەکانی، وەک یەکەم بڵاوکردنەوە بۆ کەسی یەکەم، لە نامەکاندا بووە. کە ئەم شێوەی لە نامەکانی "شێرکۆ بیکەس"یش دا دەبینرێت.. لە نامەکانی "نازم حیکمەت"دا نەک هەر شیعرەکان دەنێرێت، بەڵکو داوای ڕای پیرایەش دەکات لە بارەی شیعرەکانەوە، بۆ نموونە لە نامەیەکی دا دەنووسێت:

"ئازیزم بەو شێوەیەی وتم ئەمە سێیەمین شیعرە، دووەمیانت تا ئێستا دەست کەوتووە، و خوێندوتەوە. لە نامەی پێشووشدا نوسیبووم، تکایە لە بارەی دووەمەوە ڕای خۆت بڵێ، سێیەمیان کورتە، بەڵام لەم کۆمەڵە شیعرەدا دەمەوێت یادداشتی کورتیشی تێدابێت. دەمەوێت هەموویان لە کۆمەڵەیەکدا بە ناوی (نامەکان لە زیندانی چانکرییەوە بۆ پیرایە) کۆبکرێتەوە".[1]

دیارە زۆرترین و جوانترین نامەکانی "نازم حیمکەت" هاوتا زۆرێک لە شیعرەکانی لە زینداندا نووسیوونی. یەکەم پرس و تەگبیرەکانیشی وەک بەرهەمی ئەدەبی بە پیرایە بووە. ئەگەرچی نووسەران، زۆرجار بۆ کەسانی نووسەری هاوڕێیانی دەنووسن، بەڵام هەندێکیشیان هاوکات بۆ ئەندامانی خێزان و قەومانیان نووسیوە و هەواڵیان پێ گەیاندووە. "بۆدلێر" هەواڵی کارە ئەدەبییەکانی بۆ دایکی دەنووسێت و باسی بەرهەمە نایابەکەی (گوڵەکانی شەڕ) دەکات, کە بەیانکەری هەموو شتێکی ئەوە، لە نامەکەدا باسی ئەوە دەکات، بە ڕەنج و ماندووبوونێکی زۆرەوە نووسیویەتی، هەرچەندە دەزانێت خەڵکی تورە دەکات، بەڵام لە نامەکەدا بەوپەڕی پشتبەخۆبەستن و دڵنیاییەوە دەڵێت: بە هەموو کەموکورتی و بەهێزییەکانییەوە، ڕێگەی خۆی لە زەینی خەڵکاندا دەکاتەوە لە پاڵ باشترین هۆنراوەکانی ڤیکتۆر هۆگۆ و گۆتە و بایرۆن دا، کە بێگومان واش دەردەچێت.[2]

---

[1] ناظم حکمت، آسمان مانند دست های توست، دفتر اول، ت. زرین تاج پناهی نیک، نشر دنیا نو، تهران ١٣٨٤، ل٣٢٤

[2] نامەهای از نویسندەگان، مامان عزیزم، ت. مینا دارابی امین، انتشارات ققنوس، تهران ١٣٨٨، ل١٢

یەکێک لە کتێبە ناوازەکانی چیرۆکناسی کتێبەکەی "میریام ئالۆت"ە، بە ناوی (ڕۆمان بە گێڕانەوەی ڕۆمانووسان)، کتێبەکە تیۆریایە لە بارەی ڕۆمانەوە، نووسەر وەک ڕەخنەگر و وەک لێکۆڵەر، باسی پەیکەری ڕۆمان دەکات و بۆ بەڵگەهێنانەوە و قوڵتر ڕوانین لە بەش و پاژ و ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی ڕۆمان، بۆچوونی نووسەران و ڕۆماننوسە سەرکەوتووەکان دەهێنێتەوە. کە بێگومان ئەو قسانەیشی، لە چەند سەرچاوەی جوداوە کۆکردونەتەوە. وەک کتێبی نووسینەکانیان، یادەوەرییەکان، ژیاننامە و چاوپێکەوتن و لە هەمووی گرنگتر نامە تایبەتییەکانیان. بە هێنانەوەی دەقی گوتەی ئەو نووسەرانە، دنیای ئەوان و چۆنیەتی بیرکردنەوەیان لە پرۆسەی ڕۆماننوسین و تەنانەت هەستی شاراوەیان، بەرامبەر بە کارەکتەر و نووسینەکانیان دەردەکەوێت. و وەک کاری ڕەخنە، بە بەشێکی دانەبڕوا و بە بەهای پرۆسە ڕەخنەییەکان دادەنرێن لە ئەدەبیات دا. بۆ نموونە لە بەشێکی کتێبەکەدا کە لە بارەی چین و پێکهاتەی ناوەوەی ڕۆمان و چیرۆکەوە دەدوێ، لە بەشی قسەی نووسەراندا، چاومان بە چەندان ڕای جیاواز دەکەوێت، کە جگە لەو بەرهەمانەی تر، لە نامەوە سەرچاوەدەگرن و دەبن بە ڕایەکی جێی سەرنج لە بارەی چیرۆک و ڕۆمان و نووسین، و تەنانەت وردتر، لە بارەی ئیلهام و چرکەساتی خولقاندن، بۆ نمونە ئەم قسە لە بارەی ڕۆمانەوە:

"هەر ئێستا (پیکویک)ی نووسراوی دیکنزم تەواوکرد. دەزانی چی؟ هەندێ پارچەی پرشنگدارە؛ بەڵام بونیادێکی زۆر شڕو وڕی هەیە! ئەسڵەن نووسەرە ئینگلیزەکان هەموویان وەهان. والتەر سکۆتی لێ دەرچێ، ئەوانی تر بێ بونیاد و

چنینن. ئەمە بۆ ئێمەی بە ڕەگەز لاتینی شتێکی لەتاقەت بەدەرە، تەحەمولنەکراوە."[1]

ئەم گوتە کورتە، کە گورزی خۆی وەک خوێنەر، وەک نووسەر، وەک ڕەخنەگر دەوەشێنێت، گوتەی نێو نامەیەکی "گۆستاڤ فلۆپێر"ە بۆ "جۆرج ساند" لە (٢١ ژوینی ١٨٧٢)دا نێراوە. ڕەنگە ئەم گوتەیە و سەرجەم گوتەکانی دیکەش بۆ خوێنەرانی ئاسایی نەک جێگەی بەهادان نەبێت، بەڵکو شیاوی دیتن و لەسەر وەستانیش نەبێت، بەلام بۆ ڕەخنەگرانی ئەدەبی، خاڵی ڕامان و لەسەر وەستانە و بناغەی ڕوانینە جوداکانی نەوەیەکە بەرامبەر بە نەوەیەکی تر. لە ڕایەکی هاوشێوەی ئەمەوە لە بارەی خوێندنەوە و جودابینینەوە، ڕای نووسەرێکی دیکە هەیە کە دەڵێت:

"یا حەق، لە سپێدەوە تا ئێستا، کە سەعات ١/٢ ٤ دوانیوەڕۆیە، خەریکی خوێندنەوەی ئان ڤیکەرز بووم، نەک ئەوەی کە کتێبیکی زۆر ئینتەرسان بێت (سەرنجڕاکێش)، بەڵکو دەمویست ڕزگارم بێت لە دەستی. لە بەرهەمی ئەم نووسەرە، ئەم کتێبە و دوو کتێبی دیکەشیم خویندۆنەتەوە، زۆر ڕواڵەتی و ئەمریکییانەیە، هەمان خەمخۆری ناوکتێب بۆ مەسەلەکانی ئەمریکا.." [2]

ئەمە گوتەی "سادق هیدایەت"ە، لە نامەیەکدا بۆ "حەسەن شەهید نورائی"ی دەنووسێت و ڕای خۆی لە بارەی ڕۆمانێکی نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی و خاوەن نۆبڵ - هێری سنکلەر لویس- دەردەبڕێت، پێی وایە نووسینەکانی هەموو لە بارەی شتە سادە و عادەتییەکانی ژیانی ئەمریکییەکانەوەیە، بەمەش نەقدی خۆی لە بەشی دووەمی نامەکەدا بەوە دەکات، کە ئەگەرچی بابەت و تێما دووبارەو ئاساییە، بەلام سادە و هاوتا وەستایانە و لێهاتوویانە، نووسەرەکە بابەتەکان پێکەوە گرێ دەداتەوە، و دەچێتە پێستی کەسە جیاوازەکانەوە. کە

---

[1] صادق هیدایت، هشتاد و دو نامە بە حسن شهید نورائی، ناصرپاکدامن، چاپ اول، ١٣٨٢، ل ١٥٧

[2] هەمان سەرچاوە، ل ١٥٧

مەبەست لە کارەکتەرەکانە. بەڵام لە جێیەکی دیکەدا ڕایەکی نزیک لەمەوە دەبینرێت، کە هەم بۆ ڕەخنەگران و هەم بۆ ئەوانەی دەیانەوێت چێژی ئەدەبی و سەلیقەی "سادق هیدایەت" بناسن، جێگەی لێروانینە, کە هەر لە نامەیەکی دیدکەدا بۆ نورائی لە بارەی ڕۆمانێکی دیکەی ئەمریکییەوە بە ناوی sens interdit لە نووسینی stuart engstrand دەڵێت:

"پێچەوانەی چاوەڕوانیمەوە وەک زوربەی کارە ئەدەبییە ئەمریکییەکان، بەینی خۆمان بێ، گەمژانە بووا "[1]

بەم دوونامەیە؛ تاڕادەیەک هەست بە چەشەی ئەدەبی هیدایەت دەکرێت، کە نەک چێژ لەو جۆرە ئەدەبیاتە وەرناگرێت، بەڵکو بە ئەدەبی باشیان نازانێت و هاوشێوەی یەکیان دەبینێت، کە ئیدی ئەمە دەبێتە کاری ڕەخنەگرەکان و کەسانی ئەو بوارە تا بە وردی لەوە بکۆڵنەوە، بۆچی سەرسامە بە ئەدەبیاتی فەڕەنسی و ئەڵمانی، لە کاتێکدا بەرگەی ئەدەبیاتی ئەمریکی ناگرێ!؟

لە نێو نامەکانی ئەم پەرتووکەدا، گەلێک بابەتی ڕەخنەیی تێدایە، لە سەر دوو ئاست: یەکێکان ئاستی بۆچوون و ڕەخنە لە بەرهەمێک، ئەوی دیکەیان دەربڕینی ڕا لە بارەی بەرهەمێکەوە، کە دەکرێت لە نێوان دوو نووسەردا بێت، وەک گفوگۆی نائامادە لەسەر بەرهەمی یەکێکان ئەنجام بدرێت.

شێوەی "سادق هیدایەت"، لە نامەیەک دا، ئەم ڕایە بەرچاودەکەوێت:

"چاوپێکەوتنەکەی (شاملو)م خوێندەوە، سەرم سوڕما، ئەو شاعیرە گەورەیە بۆ وا نەخوێندەوارە، نازانم بۆ دەبێ فەرهەنگی شاعیرەکانی ڕۆژهەڵات، فەرهەنگێکی بەرتەسک بێت، بۆ نمونە ڕۆشنبیر و توانای فیکری (ئەدۆنیس) و (شاملوو) بەراورد کە، لە ڕاستی دا (شاملوو) لە بەردەمی ڕۆشنبیری (ئەدۆنیس) دا، دۆش دائەمێنی، هەر ئەمەش وادەکات، شاملوو بە ئەندازەی ئەدۆنیس قوڵ نەبێت!".

---

[1] صادق هیدایت، هشتاد دو و نامە بە حسن شهید نورائی، ل ١٤٨

دیارە خاوەنی ئەم گوتەیە "مەریوان وریا قانع"ە. ئەم ڕایەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە دەمی خۆی و بەرلە درووستبوونی ڕەهەند. بۆ گۆڤاری "ئازادی" چاوپیکەوتنێک لەگەڵ "شێرکۆ بیکەس" دا دەکرێت، دواتر بەرۆژ ئاکرەیی دوو پرسیار لەو پرسیارانەی ئاراستەی شێرکۆ کراوە لەگەڵ چەند پرسیارێکی تری خۆی دا لە شاملوی دەکاتەوە[1]. پاشان هەمان پرسیار لە ئەدۆنیسیش دەکرێت، کە دوواتر لەم نامەدا "مەریوان وریا قانع" دەنووسێت، نەخوێندەوارە.

ڕای نووسەران لەمەڕ بەرهەمی یەکدییەوە لە زۆر باردا بە ناردنی بەرهەمی نووسەرێک دەبێت، بۆ یەکێک لە هاوڕێ نووسەرەکانی، یان نووسەرێکی دی، کە دەکرێت تەنها لە پەیوەندییەکی ڕەسمیدا بن، و لە چوارچێوەیەکی زۆر ڕەسمی و جدیات دا لەسەر بەرهەمی یەکدی بدوێن. بۆ نمونە "حسێن عارف"، بە شێوەیەکی ڕەسمی، وەڵامی نامەکەی هیوا قادر، دەداتەوە. وەک دەردەکەوێت بەهۆی ناردنی ڕۆمانی "ئاوێنە سەرابییەکان"ەوەیە، کە یەکەم ڕۆمانی هیوا قادرە. دیارە لەم نامەدا بیروبۆچونەکان بە شێوەیەکی ورد دەخرێنە بەرباس، کە پاشتر بۆخوێنەری ڕۆمانی ئاوێنە سەرابییەکانیش دەبێتە جێی سەرنج. حسین عارف جگە لەوەی خاڵی پتەوی ڕۆمانەکە باس دەکات، دەستدەخاتە سەر کەلێن و لەنگییەکانی ڕۆمانەکە و دەڵێت:

((دوو کەلێنی گەورەی تیدا هەن، کە خۆزگە نەدەبوون، یەکەمیان: کزی لایەنی درامی یە، کە ڕەنگە هەر یەکەمان بۆچوونی تایبەتی ی خۆی لە بارەیەوە هەبێ. بۆ چوونی من هەر ڕا کلاسیکی یەکەیە، کە دەڵێ: ڕۆمان دەبێ کە دەستت کرد بە خوێندنەوەی بەری نەدەیت هەتا تەواوی دەکەیت. ئەمەش بە ڕادەی

---

[1] سەبارەت بەم چاوپیکەتنە، خوێنەر دەتوانێت زانیاریێ ورد لە بارەی چۆنییەتی ئەم چاوپێکەوتنەو دەقی چاوپێکەوتنەکەی "شاملوو"یش، لە دیوانی بە کوردی کراوی ئەحمەدی شاملو دا بخوێنێتەوە، بڕوانە:
بەرۆژ ئاکرەیی، دیوانی ئەحمەد شاملو، بەرگی یەکەم، ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ساڵی ٢٠١٣

کاریگەری ی لایەنە درامی یەکەی دێتە دی. من ڕۆمانەکەی تۆم" ٢٢٣ لاپەڕە" بە چوار ڕۆژ تەواو کرد. لە کاتێکدا ئەوە هی یەک ڕۆژە. چونکە هەر جارە کە دەمگرت بە دەستمەوە "٢٠-٣٠" لاپەڕەم لێخوێندەوە و بەرم دا. بۆچی؟ چونکە ڕای نەدەکێشام و نەیدەبەستمەوە بە خۆیەوەو واتە مادەی موگناتیز"درامی یەکەی" کز بوو...)).

هەندێکی تر لە بۆچوون دەربڕین لە پاڵ بابەتی بوون دا، تێهەڵکێشە بە قسەی دۆستانە و دەربڕینی هاوڕێیانە، کە خوێنەر هەست دەکات ئەمانە، تەنها دەربڕینی ڕایەک نین و خودی نامەکە تەنها پەیامێک نییە بۆ وتنی ئەوەی، کە بەڵێ من کتێبەکەتم خوێندەوە و ئەوەش قسەی من، بەڵکو لە ناو فەزایەکی ئارامی دۆستانەدا قسەکان دەکرێت بۆ نموونە:
"کردنی خەیاڵ لە سەرەتاوە بەسەنتەری گێڕانەوەکان لەم ڕۆمانەدا، هەرە خاڵی درەوشاوەی ناو ئەم ڕۆمانەیە. لە ڕاستیدا داخراوی کۆمەڵگەی ئێمە و دڵڕەقی خۆی بەرامبەر خۆی و دڵڕەقی و ناشیرینی دوژمنەکانیش بەرامبەری، ئینسانی کوردیان چەندان قۆناغ کرد بە کائینێک کە تەنها لەسەر خەیاڵ بژی، بەڵام خەیاڵێک کە تەنها لە سینە و سەردا بمێنێتەوە و ڕێگای نەبێت بێتە دەرەوە و بتوانێت وەک خەونێک ئامادەیی هەبێت. ئێمە هەمووومان ئەو کچانەی کە بەخەیاڵ خۆشمان ویستوون زۆر زیاترن لەو کچانەی کە لە واقیعدا توانیومانە خۆشمان بوێن، ئەو سەفەرانەی کە بەخەیاڵ کردوومانە زۆر زیاتربوون لەو شوێنانەی، کە بەڕاستی توانیومانە بیان بینین.. "
لێرەدا کە ئەم نامەیە دەبینیت، تەنها بۆچوونێک نییە لەبارەی ڕۆمانی "غەزەلنووس و باغەکانی خەیاڵ"وە، بەڵکو لە هەناوی ئەو دواندنە دا، دواندنی خودی نووسەری نامەکە لەگەڵ خۆیدا و لە پاڵ باسکردنی ڕۆمانەکەدا باسی یادەوەری خۆشی دەکات. بەمەش نامە ئاوێتەیەک لە هەست و یادەوەری و ڕەخنە و سەرنج دادەنرێت. ئەم جۆرە هاوڕێیانە، دەکرێت کەموکورتی، یان لاوازی بەرهەمێک نیشان بدەن، کە ئیدی نامەکان جدی دەبن و وەک وتاری ئەدەبیان لێدێت و نووسەری نامەکە لە ناو فەزای خوێندنەوەدا، کەسی بەرامبەر (کە نامەکەی بۆ نووسراوە) گەمارۆ دەدات. لە ناواخنی بەرهەمەکەوە بۆ ناواخنی خۆی و ئەو دەچێت. بۆ نموونە هەر لە تەواوکاری ئەم نامەیدا دەڵێت:
"من ئەو چوارینانەم زۆر پێ جوان بوون، جگە لە دوو دانەیان نەبێت کەبەدوای یەکدا دێن و کەمێک سادەبوونەتەوە، دەنا ئەوانی تر پڕن لە ئیشراق و جوانی"

له ڕاستی دا شتێک نەرمی نواندە بەرامبەر ئەو ڕەخنەیە، کە چوارینەکانی دوایی زۆر دەستکردییان پێوە دیارە و بوونیان لەنگییەکی خستۆتە جێگەکەیانەوە. (نامەی هیواقادر بۆ بەختیار عەلی).

لە نامەیەکدا "ڕەفیق سابیر"، پاش ئەوەی "کاروان کاکەسوور" بەرهەمێکی خۆیی بۆ ناردووە (هەڵبەت نووسەرەکان بەرهەم بۆیەکدی دەنێرن، تا لە ڕای یەک ئاگادار بن) بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە:

"ئەستێرە بۆ من حەپەسان و سەرسامییەکی پێوە دیاربوو، چونکە چیرۆکنووسێکی پێناساندم، کە بە توانایەکی ئەدەبی بەرچاو و جیهانبینییەکی تایبەت و زمانێکی تارادەیەکی زۆر ڕەوانەوە، ڕێگە دەبڕێت و دەیەوێت، لە نێوان هەردوو جیهانی خەون و واقیعدا جیهانێکی ترمان پیشان بدات، پیرۆزبایت لێدەکەم و هیوای بەرهەمی داهێنەرانەت بۆ دەخوازم".

"ئەستێرە" ناوی کۆمەڵێک چیرۆک بووە، کە کاتی خۆی ژمارەیەکی کەمی لێ چاپکراوە و کاکەسوور داویەتی بە دۆستانی نووسەری، هاوتا هەندێک لە ناوە دیارەکانی ناوەندی ئەدەبی. تا لەو بارەیەوە بۆ چوونیان بزانێت. یەکێک لەوانە "ڕەفیق سابیر" دەبێت، پاش ئەوەی چیرۆکەکانی بۆ دەچێت و دەیخوێنێتەوە، ڕای خۆی دەنووسێت، کە دواتر وەک پشتگیرییەکی قورس بۆ "کاکەسوور" لە ڕووی ڕۆحییەوە دەشکێتەوە. لەم بارەیەوە "کاروان کاکەسوور" یادەوەری یارمەتی بات، لە نامەیەکی دا لە بارەی ئەم نامەیەوە دەنووسێت:

ڕاستییەکەی من ساڵی ١٩٩٥بەهۆی (هەڵکەوت عەبدوڵڵا)وە کۆمپیوتەرێکی ماکنتۆشم دەستکەوت، و چەند چیرۆکێکی خۆمم پێ تایپ کرد. بەو مەبەستەی وەک (کۆچیرۆک) لەژێر ناوی (خێو)دا بڵاوی بکەمەوە، بەڵام ئەو فایلەی بۆ (هەڵکەوت عەبدوڵڵا)م ناردبوو بە ناوی (ئەستێرە) سەیڤ کرابوو. ئەویش وای زانیبوو (ئەستێرە) ناوی کۆمەڵەچیرۆکەکەیە، نەوەک (خێو)، بۆیە ئەو وشەیە بووە ناونیشانەکەی. دەبێت ئەوە بڵێم (هەڵکەوت عەبدوڵڵا) لە بواری کۆمپیوتەردا زۆر شارەزا بوو و لەم ڕووەوە یارمەتیی هەموومانی دەدا. ئەوە بوو کتێبەکەی بۆ مۆنتاژ کردم، تابلۆیەکی بۆ بەرگەکەی هەڵبژارد و بە پۆست بۆی ناردم. ئیتر خۆم بردمە دووکانێکی کۆپی و نزیکەی سەد دانەم لێ ڕاکێشا. بۆ چەند نووسەرێکم نارد، کە هەر (هەڵکەوت عەبدوڵڵا) ئەدرێسەکانیانی دامێ. ئەدرێسی (ڕەفیق سابیر)م دەستکەوت و زۆر بە شەرمەوە، دانەیەک لەو کتێبەم بۆ نارد، کە هەر باوەڕم نەدەکرد بیشیخوێنێتەوە، بەڵام بە وردی خوێندبوویەوە و ئەو نامەیەی بۆ ناردم.

لێرەدا بیرمان بێت دەرکەوتنی ناوێکی نوێ و دیتنی بەرهەمەکانی و ستایشکردنی و هاندانی، ڕوویەکی جوانی ناوەندی ئەدەبییە، لە نامەکاندا ڕەنگ دەداتەوە. هەمان بۆچوون بەرامبەر بە چیرۆکەکانی کاروان کاکەسوور، کە پاشتر چیرۆکەکانی تری وەک (ئەسپیدیلۆن)، (پێڵاوی چەرخەدار) و (دەرگای چواردەری)یشی دەخاتە سەر ئەو چیرۆکانە و لەژێر ناوی (ئەسپیدیلۆن) دا چاپی دەکات، لە نامەیەکی "بەختیار عەلی" دا، دەبینرێت:

"..بەش بە حاڵی خۆم لە دوای (ئەسپیدیلۆن) دڵنیام، کە لەبواری چیرۆک دا داهینەرێکی ترمان هەیە... کاک کاروان، من لە دەنگی تۆدا، دەنگێکی نوێ دەبیستم، کە پێشتر فەزای چیرۆکی ئیمە نەیناسیوە"

لەم نامەیەی بەختیار عەلی دا سەرنجی وردی تێدایە لە بارەی چیرۆک و دونیابینی کاروان کاکە سوورەوە، بێ گومان بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بایەخی خۆی هەیە، وەک ڕایەکی گرنگ بۆ ئەو خوێنەرە زۆرانەی، کە لە دنیای چیرۆکنووسی نوێی کوردی دا، بێ لە بەختیار عەلی ناتوانن کەسی تر بخوێننەوە، لە کاتێکدا بۆمان دەردەکەوێت، کە خودی بەختیار عەلی نەک هەر چێژ لەم جۆرە ئەدەبە وەردەگرێت، بەڵکو بە پرکەرەوەی کەلێنێکی دادەنێت لە ناوچیرۆکنووسی کوردیدا. ئەم نامەیە لە دەمی خۆیدا بێ کاریگەری نابێت بە بارێکدا کە گوڕی چیرۆکنووس بەرز بکاتەوە و خودی کاروان کاکەسووریش دانی پێدادەنێت کە ئەم قسانەی بۆ گرنگ بوون و لە نامەیەکی دا بۆ من دەنووسێت: "نایشارمەوە باوەڕم نەدەکرد (ئەسپیدیلۆن) هێندە سەرنجی (بەختیار عەلی) ڕابکێشێت. بۆ منێک تازە یەکەم بەرهەمم چاپ کردبوو، هێزێکی گەورەی پێ بەخشیم.!

لە نامەیەکی نێو ئەم کتێبەدا، کە گفتوگۆیەکی قوڵی ئەدەبی سیاسی ڕەخنەیی نێوان "ڕەفیق سابیر" و "بەرۆژ ئاکرەیی"ە، خودی نامەکە وەک دانپێدانانی کارنامەی ئەدەبی "ڕەفیق سابیر" دەردەکەوێت، بەرامبەر بە ئەدەب وەک هونەر و ئەدەب وەک سیاسەت. بۆچوونەکانی لەوەدا خۆ دەبیننەوە، کە دەبێت ئەدەب ئەدەبییەتی خۆی بپارێزێت، نەبێتە پەیامێکی سیاسی ڕووت و، پروپاگەندەی نە سیاسەت و نە حیزب نەبێت. دیارە قسەکانیش لەبەرامبەر نامەیەکی بەرۆژ ئاکرەیی دا دەکرێن، کە ڕەخنە لە هەندێ بۆچوون و ڕەوتی شیعری ڕەفیق سابیر دەگرێت. هاوشیوەی ئەم گفتۆگۆیە لە نامەیەکی نێوان "ڕێبوار سیوەیلی" و "فەرهاد پیربال" دا دەبینریت، لە بارەی شیعرەوە. نامەکە بە جۆرێک

وەلامدانەوە سەرنج و ڕەخنەکانی "فەرهاد پیربال"ە لە بارەی شیعرەکانی "ڕێبوار سیوەیلی"یەوە و داکۆکیکردنە لە شیعرەکانی بەرامبەر بە ڕەخنەکانی "فەرهاد پیربال"، گفتوگۆکە ئەگەرچی یەک لای لە ئێمەوە دیارە، بەلام وەک دیدگای "ڕێبوار سیوەیلی" بەرامبەر بە شیعر دەردەکەوێت، کە لە بارەی شیعری چوارینەوە دەلێت: "زۆربەیان لەسەر وەزنی لاحول ولا قوة اله بالله نووسراون" ڕەنگە لە چرکەساتێکی وەها تورەیی یان کاردانەوەی ئەو بێت بەرامبەر بە ڕەخنەکانی کە لە شیعرەکانی گیراوە، بەلام دواجار وەک ڕای ئەو دەمێنێتەوە و ئەویش سنگفراوانە ریگەی داوین، کە لەم کتێبەدا، جگە لە سانسۆرکردنی سێ وشە، نامەکان وەک خۆی دابنێینەوە..

جۆرێکی دی، کە تەنها باس لە جوانی بەرهەمەکە دەکەن، بۆ ئەوەی دلنیای بکاتەوە ئاگای لەبەرهەمییەتی بۆ نمونە:

"لەتیف هەلمەت" بۆ "حەمەسەعید حەسەن" دەنووسێت: "بەرهەمە چاپکراوە نوێیەکەت (شیعر و تەور) گەیشتە دەستم ئومیدەوارم دەیان کتێبی دی وا بە پێز و کاریگەر بە چاپ بگەیەنی.." بێ لەمە هیچی دیکە لە بارەی بەرهەمەکەوە نالێت، بەلام باسی وشە و نووسین دەکات، کە تەنها ئەوانە نووسەرەکان دەهێلنەوە نەک هیچی دی.

یان

"موحسین ئەحمەد" بە هەمان زمانی ئاوێتە لە سۆز و هەست، شیعرئاسا پەسنی شیعرەکای پیربال دەکات، کە ڕەخنەیی نییە، بەلکو نیشاندانی مەیل و ڕەزامەندی و هاوتا هەستی لەگەل شیعرەکاندا هەلچوونە: ".. حەزم لە شیعرەکانتە.. لە جیهانتە... قەسیدەکانت، باسی ئەو جیهانە سادەیەم بۆ دەکەن، باسی ئەو شتە بچکۆلانەم بۆ دەکەن، من پێیان ئاشنام، بەلام چاوم نەیانبینیوە، وەک ئەوە وایە تۆ یەکەم جارە پیشانم دەدەی و بەلێ تۆ باسی ئەو شتانە دەکەی وەک ئەوەی یەکەم جارەدەیبینم و هەستی پێ دەکەم، ئیمرۆ چەشنێکە لام و سبەینێش چەشنیکی دیکە. تۆ ووشەکان لە ناوەوە دەتەقێنێتەوە، سەریان دەخەی،

دەیخەیتە گویمان، ووشەکان، ووشەن، ووشەی پڕن، بە ناو فەلسەفەی غەریبی ڕۆدەچیت و مەنفا دەبێتە ئەو نیشتمانە کاتی یە پرە بە ئاوەزە. ئەم ژیانە تاریکەش, لچکێکی زۆری تەفسیریکی لامەعقول و جوان هەڵدەگرێ، بۆیە شیعرەکانتم خۆشدەوێ و حەزیان لێدەکەم..." .

هەندێکی تر، لە دەربڕینەکانێ بە زمانێکی پەسنی دادەڕێژرێن و بە شێوەیەک کە باسکردنی هەستی خۆی و کاردانەوەکانی بێت لەمەڕ ئەو بەرهەمەی، کە بۆی نێراوە: ("پیاویک لە دارسێو".. وەکو هەموو بەرهەمیکی تری جەنابت، هەر کە بە دەسم گەشت خویندمەوە و چیژم لێوەرگرت، و گریاندمی و زۆر شتی لێ فێربووم..)، لێرەدا "عەتا نەهایی" هەستی خۆی دەردەبڕیت و پاشان بە گشتی قسە لەبارە بەرهەمەکانی دیکەوە دەکات، کە دەکرێت لە ئایندەدا وەک توێژینەوەی مۆدێرنانە کاری لەسەر بکرێت. هەمان هەست بە جۆرێکی زۆر قوڵتر و نارەخنەییانە لە نامەیەکی "جەلیل قەیسی" دا بۆ "شێرکۆ بێکەس" دەبینرێت لە بارەی (بۆن نامەوە)، کە مەرج نییە وەک ڕەخنە تەماشا بکرێت و دەشێت وەک هەستی نوێی دوای یەکەم خوێندنەوە بێت، کە هەمیشە جۆرێک لە تاسە و مەیلی تێدایە بۆ ستایش و دەستخۆشانە.

یان تەماشای ئەم نووسینەی "شێرزاد حەسەن" بکەین لە بارەی کتێبیکی "ئارام کاکەی فەلاحەوە":

"چیرۆکەکانتم بە دڵ بوو. بەڵام لە هەموویان جوانتر (بەیازی گوڵفرۆشەکان) بوو، بەلام تۆ خەمخۆری ئەدەبی و پێشکەوتووی، دیارە دوواجار خوێندنەوە و مەعریفەتی زۆر، و تێڕامان و ئەزمونی ژیان دەوڵەمەندترمان دەکات!" شێرزاد وەک چیرۆکنووسێکی بەئەزموون دەستخۆشانەی خۆی بۆ چیرۆکەکان دەنێرێت، نە ستایشی زۆر دەکات نە ڕەخنەش دەگرێت، وەلێ پەنهانانە شتێکی تر دەڵێت، ئەویش تۆ هێشتا ماوتە!

مەرج نییە ئەوەی لە ناو نامەکانەوە دێت، ڕەخنە بێت وەک ڕەخنەگر، بەڵکو گفتوگۆی پێشوەختەی دوو نووسەرە، کە بەهۆی دووری مەوداوە ناتوانن

بەرامبەر یەک لە دانیشتنی ئاسایی دا ڕای خۆیان باسبکەن، بۆیە دەبێتە نامە لە پاڵ هەواڵە ڕۆژانە و هەواڵە تایبەتی و گشتییەکاندا، ئەوەش دەبێتە هەواڵێک، کە من ئێستا دەخوێنمەوە و ئەوەم خوێندۆتەوەو ئەمەش ڕایەکەمە. هەموو ئەمانە چەندە قسەکردنە لەگەڵ کەسی بەرامبەر، هێندەش دواندنە بە دەنگی بەرز بۆ خودی نووسەری نامەکە، تا بیری بێت ڕای چییە لەسەر ئەم بەرهەمەی، کە تازە لە خوێندنەوەی بۆتەوە:

"شارم خوێندەوە و بەو شتانەشی لەسەری نووسراون- ئەوەی بەردەستم کەوتبێ- خوێندمەوە. شار- شتە، شایەنی ئافەرین و دەستخۆشی یە. بریا بریا ئەو صیراعەی نێوان گەلاوێژ و مریەم بەرجەستە تر دەکان.. ڕەسمی مریەم زۆر جوانە. تێکڕای ڕۆمانەکە چاکە، تاکە عەیبێکی ئەوەیە کە بۆتە دەستکەلا بۆ خەڵکانی "کە ڕۆژانی خەبات و قارەمانێتی و خێرخوایی خۆیانی پێ دەرخەن و بڵێن: چاکی وەبیرهێنایەنەوە ئێمەیش لەو سەردەمەدا- بە کێلی قەبری باوکی ڕەحمەتیانەوە بنازن!"

لەم نامەیەدا "موکری" بۆ "ڕەووف بێگەرد" دەدوێت، و ڕای خۆی دەنووسێت لە بارەی ڕۆمانی "شار"ی "حسێن عارف"ەوە، کە بێگومان ئەو ڕۆمانە وەک بەرهەمێکی ناوازەی کوردی تەماشادەکرێت، هاوتا وەک هەر بەرهەمێکی تری ئەدەبی قابیلی ڕەخنە و هەڵە و پەڵە لێ گرتنە.

لە هەندێک نامەدا (نامەی ئەم کتێبە)، نووسەران قسە لە بارەی سەرقاڵی ئەدەبیی و هونەرییانەوە دەکەن، هەر خودە باسی ئەو بەرهەمەی کە پێیەتی و بۆ دڵگەرمی خۆی و لە هەمان کاتدا بۆ سۆزبەخشین بەوی تر، کە تۆم خستۆتە ناو نهێنییەکەوە، ئەمە؛ دوابەرهەممە و هێشتا چاپ نەبووە. هاوکات بۆ ڕەخنەگران و خوێنەران ئەوە ڕوون دەبێتەوە، بەر لە نووسینی ئەو بەرهەمە یان بەر لە چاپبوونی، نووسەرکە لەو دەمەدا کە هێشتا لە ناو خەرمانەی ئەو هەستە نوێ و تازەدایە چ جۆرە بۆچوونێکی هەیە لەسەر خودی کارەکەی خۆی، کە لە دەمی نووسینی نامەکەدا هێشتا بڵاونەبۆتەوە ڕەنگە بێ لە خۆی کەسی دیکە نەیخوێندبێتەوە. "هایدگەر" لە نامەکانی دا کە بەشێکی زۆر بۆ قسە ئاسایی و ڕۆژانەکانی ژیان و بەجێهێنانی ئەرکی وەک هاوسەر و وەک باوک بۆ هاوسەرەکەی و منداڵەکانی، تەرخان کردوە. لە گەڵیشیدا "ئەلفرێدە" ئاگادار دەکاتەوە لە قۆناغە جیاوازەکانی بیرکردنەوە و نووسین و پێگەشتنی بە جۆرە ئەندێشە و ڕامانی قوڵ و نوێ، لە نامەیەکی دا دەنووسێت:

"..ئێستا بەشێوەیەکی ڕێکوپێک کار لەسەر برگسۆن دەکەم، دەمەوێت دوای ئەوە لەسەر یاسپرس کار بکەم. خۆم زۆر بە ئازاد، سەربەخۆ و داهێنەر دێتەبەرچاو- هەروەها بابەتێکی ڕوونم لەهەمبەر هۆسرل دا دۆزیوەتەوە- ئێستا تەنها دەبێت ئیلهام بێت و دواتر دەتوانم بە تەواوی و بە هەموو هێزێکەوە بئەفرێنم و تۆش دەتوانی ئارامتر نەفەس بدەی و لە خۆت بێیتە دەرەوە".[1]

بەم شێوەیە لە نامەکاندا ساتەوەختی بیرکردنەوەی نامەنووس تۆمار دەکرێت. نامەکە وەک دەفتەری یادەوەری دەپارێزێت و هەمیشە دەمێنێتەوە. نموونەی ئەم شێوەیە لە نامە کوردییەکاندا بەرچاودەکەون:

---

[1] گرترود هایدگر، نازنین من (نامەهای هایدگر بە همسرش الفریدە)، ت. مهشید میر معزی، مؤسسە انتشارات فلسفە، سال ١٣٨٦، ل ١١٥

"له دوابەشی وەرگێڕانی زۆربادام، زۆربا و بودا هەڵیان تەکاندووم.."

"ڕەووف بیگەرد" بۆ "دڵسۆز حەمە"ی دەنووسێت، وەک هەواڵێکی ئەدەبی. ئێمە کە ئێستا چاپی چەندەمی زۆرباماک لە بەردەستە دەزانین، ئەو دەمە "ڕەووف بیگەرد" چ هەستێکی هەبووە.

یان:

"ئێستاش خەریکی نووسینی ڕۆمانێکی نوێم بەناوی "منداڵانی گەڕەک"ەوە، نزیکەی پەنجا لاپەڕەیەکم لێنووسیوەو هەفتەی دوو تا سێ ڕۆژ لەسەری دەنووسم و تاڕادەیەک دڵم پێی خۆشە، چونکە دەمەوێت لەڕێی ئەم ڕۆمانەوە هەرچی سێبەرێکی درندەبوون لەئینسانی ئێمەدا هەیە بیهێنمەوە دەرەوە و باسی بکەم، هەوڵ ئەدەدەم زۆرینەی گەنجە سەرکێش و درندە و خێر لەخۆنەدیوەکانی گەڕەکی چوارباخ زیندووبکەمەوە، ئەو گەڕەکەی زیاد لەسێ چوار وەچە لەگەنجەکانی لەناوچوون و کوژران. هەروەها دیوێکی نادیاری ئەورووپاش بەتایبەت ساتی بەیەکدادانی کلتوورەکان باسبکەم، بەهەرحاڵ بالێکەڕێین تا کاتی تەواو بوونی ڕۆمانەکە"

نامەی "هیوا قادر" بۆ "یوسف عیزەدین"، کاتێک وەک خوێنەر ئەم نامەیەم دیت، دەمێ بوو ڕۆمانی منداڵانی گەڕەکم خوێندبووە، بەڵام مابووە و سەر ئەوەی بزانم، ئایا نووسەر لە نێوان ئەو ویست و خەیاڵەی بۆ نووسینی ئەو ڕۆمانە هەیبوو لەگەڵ ئەوەی نووسرا هیچ تەباییەک هەیە؟ بێ گومان من ئەوە وەڵام نادەمەوە، چونکە خوێنەرانێک هەن لە پشت ئەم دێڕانەوە بە من دەڵێن ئێمە وەڵام دەدەینەوە، و دەچمە سەر نامەیەکی تر، کە بێگومان خوێنەر بەر لەوەی من ناوی ببەم بە ناوی بەرهەمەکە دا دەزانێت، نامەی کێیە:

" ..من لە ڕووی نووسین و بەرهەمەوە لێم ئەڕژێ هەست ناکەم نە تووشی باران بڕان بووم و نە ماندوویشم، دوا بەرهەمم "دەربەندی پەپولە"یە کە ئێستە لە ژێرچاپ دایە. یەک قەسیدەی درێژی درامی یە کە بە نەفەسی ڕۆمان نووسیومە، نامۆی و نیشتمان مێژوو و یادگارە، بە قەوارەی مام ناوەندی(١٨٢)

لاپەڕەیە، تاقیکردنەوەیەکی تازەمە، هەوڵدانێکە بۆ ئەوەی شیعر لەو قاوغە بەرمەدەرەوە کە تا ئێستا گیریان تیا خواردووە. پارانۆمایەکی هەزار رەنگە، رەنگە تا دوومانگی تر بکەوێتە بەردەست بەقەدەر یەک دنیا دڵم پێی خۆشە.نزیکەی ساڵێک پێوەی خەریک بووم."

خوێنەری ئەم نامانە، کە "دەربەندی پەپوولە"ی خوێندبێتەوە، هەست بەو گەرمی و پەرۆشییە و سۆزەی "شێرکۆ بێکەس" دەکات بۆ بەرهەمەکە.

جۆرێکی دیکە، لەو نامانە، کە نووسەران باسی بەرهەمی نوێی خۆیان دەکەن، بەڵام هێشتا بەردیدەی خوێنەر نەکەوتووە، تا دەمی چاپکردنی ئەم کتێبەش. بۆ نمونە لە دەوری سالانی ۲۰۰۰دا "شێرزاد حەسەن" لە دوو نامەی جودای دا بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا؛ باس لە نۆڤلێتی (دوا دابەزینی مەسیح) دەکات، کە پێشکەشی کردووە بە هەمان نووسەر، لەو نامەدا دەڵێت:

"من لە نۆڤلێتی( دوا دابەزینی مەسیح) کە بە تۆ پێش کەش کراوە.. باس لەوە دەکەم.. دەمەوێ لە ناو مەسیحدا قسە لەسەر مەسیحێکی دۆڕاو بکەم کە منم.. کە تۆیت.. ئێمە دەڕۆین و پەیامی شەرمنمان بە هیچ شوێنێک نەگەیشت. "

ئەم نۆڤلێتە تا ئێستاش چاپ نەکراوە، بەڵام خوێنەر وا لێدەکات چاوەنواڕی وەها کتێبێک بێت.

نامەکان لە جێیەکدا رای گرنگیان تێدایە، کە پێشوەخت کەوتووە. بۆ نموونە نووسەرە بە ئەزموونەکان؛ مەزندەی دەستەیەک نووسەری تر دەکەن، کە وەک نەوەی پاش ئەمان ببنە دەنگی دیار. بۆ نموونە "چیخەف" لە نامەیەکی دا باسی "گۆرکی" دەکات، ئەگەرچی خۆشی زۆرترین پەیوەندی نامەی لەگەڵ گۆرکی دا هەیە، لە نامەیەکی دا بۆ "ئا. ئەی یوژین" لە بارەی "ماکسیم گۆرکی"یەوە دەدوێت و بەرهەمەکانی هەڵدەسەنگێنێت، بەو رایەی هەندێک لە کارەکانی جێگەی تایبەتیان هەیە و هەندێکی تریان نرخێکی وەهای ئەدەبییان نییە. لەگەڵ ئەمانەشدا پێگەی گۆرکی دیاریدەکات، کە هێشتا تەمەنی تەنها سی و پێنج ساڵە بەوەی دەنووسێت:

" ...بەلام شتیک کە دەبێت بزانرێ ئەوەیە، کە بەهای گۆرکی لە خۆشلێهاتنیدا نییە، بەڵکو لەوەدایە کە ئەو یەکەمین کەسە لە روسیا دا یان رەنگە لە سەراسەری جیهاندا لە بارەی وردە بۆرژوازییەوە بە نەفرت و قینەوە دەدەوێت، رێک وەختێک دەستی کردووە بە قسەکردن کە کۆمەڵگا ئامادەی پێشوازی ئەم جۆرە نارەزاییەیە، چ لە دیدگای مەسیحییەت و چ لە دیگای ئابووری یان هەر دیدگایەکی دیکەوە کە بتەوێت وردە بۆرژوازی بە زوڵمێکی گەورە دادەنرێت"[1].

لەم نامەدا "چیخەف" داوەری خۆی لە بارەی "ماکسیم گۆرکییەوە دەکات، لە دەمێکدا کە چەند ساڵێکە بە نامەگۆرینەوە لەتەک "گۆرکی" دا ئاگایان لە یەکدییە، بەردەوام "چیخەف" رای خۆی لەسەر کارەکانی "گۆرکی" دەنووسێت و "گۆرکی"ش لە روانگەیەکەوە کە زیدەرەوانە سەرسامە بە "چیخەف" و کارەکانی، تاسە و مەیلی خۆی بەرامبەر بە کارەکانی نیشاندەدات. لە نێو ئەم پەیوەندییە ئەدەبییەدا، لە نامەیەکی دا "چیخەف" وێرای دووپاتکردنەوەی لیهاتووی "گۆرکی"

---

[1] مجموعه اثار چخوف، نامه ها، ترجمه ناهید کاشی، جلد نهم، چاپ سوم ۱۳۸۹، انتشارات توس، ل ۱۸۰

و سەلیقەی، دەکەویتە پرسیارکردن لە "گۆرکی" وەک ئەوەی بیەویت بڵێت هێشتا لاویت و دەرفەتی زێدە سەرکەوتنت هەیە بۆیە پێشنیاری ئەوەی بۆ دەکات واز لە دووری بهێنیت ئاوێتەی ناو کۆڕ و مەجلیسە ئەدەبییەکان بێت و لە نزیکەوە نووسەران و ئەدەبیان بناسێت. لە وەڵامی ئەم نامەی چیخەف دا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە گۆرکی بەو پەڕی تواناییەوە خودی خۆی دروستکەر و یارمەتی دەری خۆی بووە:

"من بە ڕێگەی خۆفێرکردن خوێندوومە، تەمەنم سی ساڵە. لەو بڕوایەدا نیم لە ئاینده دا باشتر بم لەوەی کە هەم. خوا بکات لەم قۆناغەی کە پێم تێناوە خۆم بپارێزم. پێگەیەکی بەرز نییە، بەڵام بۆ من بەسە. بە شێوەیەکی گشتی من کەسێکی جێی سەرنج نیم"[10].

ئەم گوتانەی "گۆرکی" وەک دەرخەری بەشێکی ئەوی نووسەرن، لەبەرامبەر نووسەرێکی گەورەدا، کە هاوچەرخن و ئاگایان لە کاری یەکە. ئەمە لە لایەک لە لایەکی دیکەوە لە ڕووی سۆزپێدانی ئەدەبییەوە و پشتگیری کردنی مەعنەوییەوە بۆ گۆرکی، جیخەف توانیویەتی ڕۆڵی گرنگی هەبێت، چونکە لە یادمان بێت، نەوەی پێشوو دەتوانێت دڕایەتی نەوەی نوێ بکات، دەشتوانێت سۆزی پێببەخشێت و ئاراستەی بکات، ئەگەرچی نەوەی نوێ، بێ ئەمانەش، وەک ئاوی ڕۆشتوو دەڕوات و خۆی دەگەیەنێتە دەریا...

لە ئەدەبیاتی فارسیدا وێڕای نامەکانی "هیدایەت"، نامەکانی "جەمالزادە" نامەی ڕەخنەیی و ئامۆژگاری ئاسان بۆ زۆرێک لە لاوە نووسەرەکان. نامەکانی "سەید محەممەد جەمالزادە" نامەی درێژ و پڕ لە قسە و بیروڕا ڕێنمونین، بۆ هەندێک لەو لاوانەی کە بەرهەمی خۆیانیان بۆ ناردووە و چاوەڕوانی سەرنج و بۆچونی ئەو بوون، وەک باوکی چیرۆکی فارسی چاویان لە زاری بڕیوە بۆ گوتەیەکی خێر. لە نامەیەکی دا بۆ "حەمید شاد" وێڕای ئەوەی باس لەوە دەکات کە ڕەخنەی لێدەگیرێت وەڵامی هەموو نامەیەک دەداتەوە، وەڵامی ڕەخنەکەش

---

[1] مجموعه اثار چخوف، نامه ها، ل ١١٣

دەداتەوە، کە ئەو لە نێوان دوو کۆمەڵگادا فێری ئەوە بووە: یەکەم کۆمەڵگەی سونەتی ئیسلامی ئێرانی، کە لە منداڵییەوە وتویانە تەنانەت سەلامیش، بێ وەڵام مەهێڵەوە و مەغرور مەبە. دووەم کۆمەڵگای ئەوروپی، کە نامە بێ وەڵا ناهێڵنەوە. لەو نامەدا ئامۆژگاری "شاد" دەکات و دەنووسێت: وەک چۆن لە نامەی پێشوویش دا بۆم نوسیت تا تەمەنی ٤٥ساڵی تا دوو پەڕەت لە کتێبی فەرەنگی باش و شاکاری ئەدەبی نەخوێندبێتەوە، یەک پەڕە فارسی مەنووسە. ئێوە دڵنیابن کە سادق هیدایەت ئەگەر بەردەوام کتێبی نەخوێندایەتەوە و تێبینی نووسییایە و بە بیرکردنەوە و ڕامانەوە سەرقاڵ نەبوویایە، وەها پێگەیەکی گرنگی نەدەبوو.[1]

لە نامەیەکدا "شێرکۆ بێکەس" بۆ "ڕەووف بێگەرد" وەک شاعیری بە ئەزموون لە بارەی دەستەیەک لە ناوەوە دەدوێت، مەزندە دەکات قۆناغێکی نوێی شیعری کوردی بن، بە ڕەچاوکردنی مێژووی نامەکە و دەمی ناردنی کە ساڵی ١٩٩١، دواتر ئێمە وەک شاعیرانی هەشتا و نەوەدەکان دەیان ناسین:

"لە نێو نەوەی نوێ دا ئەوەی پیوەندی بە شیعرەوە هەبێ بەرهەمەکانی: محمد عومەرعوسمان، مهاباد قەرەداغی، قوبادی جلیزادە، هەروەها (حەمە فارووق) کەلە کەنەدایە و ناوبەناو لەم ناوە شیعری بڵاو ئەبێتەوە- دڵم خۆش ئەبێ و هەست ئەکەم کە ئەم دەنگانە (رەنگە هی تریش هەبێ و من بەرهەمیانم نەدیبێ) ڕەنگە مژدەی قۆناغێکی ترمان بدەنێ."

پاش ئەم نامەیە ئێستا خوێنەر ئەم نەوەیە دەبینێت، چەندیان لە پێگەی شاعیریدا ماونەتەوە چەندیان لە بوارەکانی دیکەدا کار دەکەن. لە نامەیەکی دیکەدا ڕوو لە "ئەحمەی مەلا" سۆزی ئەوەی پێ دەبەخشێت، بەرهەمی ئەو، بە بەرهەمی باش دەزانێت، بە تایبەت لە ڕوویەکەوە کە دەنگدانەوە و چاولیکەری ئەمان نییە، ئەمان بەو مانایەی کە وەک دەستەی شاعیرانی حەفتا و درێژکراوە

---

[1] سید محمد علی جمالزاده، نامەهای جمالزاده، انتشارات سخن، چاپ اول، ١٣٨٧، ل٥٠٩

تا هەشتا و ئێستاش، کە ستایلی خۆیان هەیە. ئەم ڕایەی "شێرکۆ" بەهای خۆی هەیە بۆ ڕەخنەی ئەدەبی ئەگەرچی ڕایەکی رەخنەیی نەبێت و نووسراوی ناو نامەیەکیش بێت!

چۆن "شێرکۆ بێکەس" دەست دەخاتە سەر چەند ناوێک و بە نەوەیەکی جودایان دادەنێت، لە شوێنی خوێ دا، وەهاش "ڕەفیق سابیر" دەستەبژێرەکانی هەمان نەوە دیاریدەکات، لە نامەیەکی دا بەم شێوەی باسیان دەکات:

"مایەی خۆشحاڵیمە کە تۆ و هەندێ لە شاعیرە لاوەکانی تر (ئەحمەدی مەلا، حەمە فاروق، بەرۆژ ئاکریی، ڕێبوار..) لە سەرەتاوە هەوڵێکی زیرەکانەتان داوە، کە لە دەنگی ئێمە نەچن و، فەزایەکی شیعری تایبەت بەخۆتان دابهێنن."

ئەگەر لە نامەی هەردوو شاعیری بەئەزموون بڕوانین؛ "شێرکۆ بێکەس" و "ڕەفیق سابیر" ئەوە دیدی هەر کەسەیان جیاوازە بۆ نەوەکە، ئەگەرچی نامەکانی هەردوو نووسەر لە یەک ساڵ دا نێراون, ساڵی ١٩٩١. ئەمەش دیدگای جودا و هاوکات چەشەی ئەدەبی جودای هەردوو نووسەر دەردەخەن. ڕەفیق سابیر لەم نامەیەدا لەگەڵ ئەو پەسنە و ئەو ڕاستبێژییەی لە بارەی "فەرهاد پیرباڵ" و ئەو نەوەوە دەیدا، هاوتا داوا دەکات کە زێدەتر گرنگی بە زمان بدات وەک چۆن لە نامەیەکی "عەبدوڵڵا پەشێو" دا بۆ "لەتیف هەڵمەت" هەمان داوا دەبینین، ڕەفق سابیر دەنووسێت:

"..لێرەدا ئەگەر ڕێگە بە خۆم بدەم سەرنجێ دەرببڕم، دەڵێم ئاواتەخوازم زیاتر و زیاتر بایەخ بە زمان بدەیت، ڕەنگە ئەم سەرنجە بۆ هەر شاعیرێک، لاو، بەساڵاچوو پیر، درووست بێ، چونکە بەڕاستی زمان ئەو دەریا بەرینەیە کە چەند بە ناویدا شۆڕ ببینەوە قوڵتر و فراوانتر و پڕ ڕازتر دەبێ."

هەم ڕاکەی ڕەفیق سابیر گرنگە، چونکە زمان بناغەی دەقی ئەفرێنراو و پتەوە، هەم ڕاکەی عەبدوڵلا پەشێویش، کە بۆ شاعیرێکی باڵادەستی وەک لەتیف هەڵمەت دەنووسێت:

"تۆ لە ڕیزی پێشەوەی ئەو شاعیرانەی کە بە ویژدانی خاکی و نەتەوە حسێب دەکرین، بۆیە وەکو هاوڕێیەک و شیعر دۆستێک، تکات لیدەکەم کەمتر بنووسە، زۆرتر خەریکی فۆڕمی هونەریی بە، وریای زمان بە، زمان، زمان، زمان، زمان.. هەندێ جار کە شیعرەکانت دەخوێنمەوە و فێنکاییەکی ولاتم بەسەر گیاندا دێ، وام دیتە بەرچاو کە تۆ هەرچی دەینووسیت، نایننووسیتەوە.. ئەگەر وایە لێت دەپاڕێمەوە، ئەوەی دەینووسیت سەد جار بەسەریدا بڕۆرەوە، سەد جار بینووسەوە، ئیمە هەر شیعر نالێین، بەڵکو زمانی ئەدەبیش دەچەسپێنین و دەیڕسکێنین.!"

شێوەی ئامۆژگارییە ڕەخنەئامێزە دۆستانەکەی پەشێو بیری ئەو ڕایانەی ترمان دەخاتەوە کە دەڵێن: یان ئەو وتە پیرۆزانەی لە بابەتە ئاینییەکان دا هەیە و جەختی چەندین بارە دەکاتەوە. لێرەش دا ئەم نەک یەک جار بەڵکو چوار جار زمان چوار بارە دەکاتەوە، کە ئەگەر بۆ شاعیرێکی وەک لەتیف هەڵمەت نووسرابێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە بۆ شاعیرانی تازەکار و کەم ئەزموون دەبێت چەندین جار ئەم وتەی ڕەفیق سابیر و عەبدوڵڵا پەشێو ئەزبەر بکەن و کاری پێبکەن.

بەشێکی ئەوەی ئەم نامانە کۆدەکاتەوە، خولیای ئەدەبی نووسەرانە، بۆ بەردەوام نوێبوونەوە و پێشڕەوی ڕۆشنبیری و ئەدەب. بەهۆی ناوەندێک و کەناڵی گەیاندنەوە، کە لە زۆربەی کاتەکاندا گۆڤارە ئەدەبییەکان ئەو ڕۆڵەیان دیتووە. بەهۆی نامەکانەوە هەست بە گرنگی ئەو بڵاوکراوانەوە و بەر لەوانیش پێداگری نووسەران دەکەین، بۆ ئاراستەکردنی ئەدەب لە ڕێگەیەکی بەپێز و گونجاو و بەردەوام نوێیەوە، لە ڕووی فیکر و ئەندێشەوە. زۆرینەی خاوەن نامەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان لە پەیوەندیدا بوون لەگەڵ بڵاوکراوەیەک، چ وەک دامەزرێنەر، چ وەک بەڕێوەبەر, یان وەک ئامادەکار یانیش هاریکار. ئێستا لە ئەرشیفدا دەتوانین، زۆربەی ئەو گۆڤار و بڵاوکراوانە ببینن، بەڵام لە نامەکاندا ڕوویەکی دیکەی ئەو بڵاوکراوانە دەبین و هەوڵە ناوەندییەکانی نووسەران بەرچاودەکەوێت بۆ دەرکردنی هەر یەک لەو بڵاوکراوانە.

لە نامەیەکی "مەریوان وریا قانع" دا بە وردی باس لە پێکهاتنی گۆڤاری ڕەهەند دەکرێت، نامەکە چۆنیەتی کۆبوونەوەکان و بڕیارەکان بە وردی بۆ "ئارام کاکەی فەلاح" باس دەکات و دەیەوێت ئەویش وەک هاریکار لەگەڵیان کار بکات:

"هەفتەی ڕابردوو لە (فرانکفۆرت) بووم، چوار ڕۆژی ڕەبەق لە ژوورێکی چکۆلانەدا من و بەختیار عەلی و هەڵکەوت[عەبدوڵا] و ئاراس[فەتاح] و ئەوانی دی، کۆبووینەوە و پلانمان دانا و خەونمان هێناو خەونمان برد. دووجار لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە هەم گۆڤاری (ئازادی) دابخەین، هەم گۆڤاری (یەکگرتن)، بە حوکمی ئەوەی ئەو دوو گۆڤارە هەر یەکەیان لە ڕۆژگارێکی تایبەت بۆ مەبەستێکی تایبەت دامەزرا، کە ئێستا بە هیچ حوکمێ لە ئارادا نەماون. بۆیە بە هەردوولا بڕیارماندا گۆڤارێکی نوێ دەربکەین، گۆڤارێ نوێ، لە هەموو شتێکا و لە ناونیشانەکەیەوە بۆ ناوەڕۆک و شێوەی کارکردن و فرۆشتن و یارمەتی و هتد..ئەوەی تائێستا لە بارەیەوە پێتی بلیم ئەوەیە کە: گۆڤارەکە بە ناوی

(ڕەھەند)ەوە دەردەکرێت،دیارە لەبەر ئەوەی ئیمکاناتی ئەوەمان نییە، مانگانە دەری کەین، بۆیە وابڕیارە وەرزی بێت". خوێنەر لە ئێستادا ڕەھەندی دیوە و دەناسێت و ئەو دەستە نووسەرانەش دەناسێت، کە بە ڕەھەندییەکان ناسراون، بەڵام ڕەنگە دوور لە کاری ئەکادیمی لە زاری کەسیانەوە وەھا نەزانێت چۆنێتی درووستبوونی ڕەھەند چۆن بوو و ئەوانە کێ بوون.

لە نامەیەکی "محەمەد نوری تەفیق" دا زۆر بەوردی و یادەوەری ئاسا باسی گۆڤاری "شەفەق" دەکات. بێ لەوەی "مارف ئاغایی" باسی چۆنیەتی کارکردن لە گۆڤاری "سروە" دا دەکات، یان ھەر یەک لە گۆڤارەکانی دیکەی وەک (بەیان، نووسەری کورد، چریکە، بەربانگ، بینین، خەرمانە..) چەندانی تر دەبنە جێی گفتوگۆ.

لە نامەی "ڕێبوار سیوەیلی" دا باسی گۆڤارێکی نوێ دەکرێت، کە "فەرھاد پیربال" و دەستەیەک نووسەر دەری دەکەن، ئەگەرچی ناوی نایەت، بەڵام دواتر دەزانین ئەو گۆڤارە "وێران" بووە..

بە شێوەیەکی گشتی ئەو گۆڤارانە دەنگی نووسەرانی گەیاندووە و زۆربەی کاتیش ھەوڵەکان لە ئاستی تاکەکەسی و جوھدی خۆیاندا ماونەتەوە، بۆ نموونە "حەمەسەعید حەسەن" لە بارەی "خەرمانە"وە دەنووسێت:

"خەرمانە دەبێتە گۆڤارێکی ئەدەبی، تاک و تەرا بابەتی غەیرە ئەدەبی بڵاودەکاتەوە، ئەویش مەگەر بە دڵی دەستەی نووسەران بێ، یان یەکێ لە خۆمان نووسی بێت. خەرمانە دەیەوێت ببێتە زمان حاڵ نووسەرانی ئەورووپا، بەرھەمی ئەدەبیش کە لە کوردستانەوە بە دەستمان دەگا بە ڕێزەوە بڵاوی دەکەینەوە".

"محەممەد موکری" لە بارەی گۆڤاری "کلتور"ەوە دەنووسێت:

" گۆڤارێکمان بە نێوی کلتورەوە دەرکردووە بە دوو زمان عەرەبی و کوردی عەرەبی یەکەی تەنھا بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردی یە. گۆڤارەکە قەوارەی

گەورەیە ژمارەی لاپەڕەکانیشی ٤٢٠ لاپەڕەیە مەبەستم "فولسکابە" چاپی مادەکانی ژمارە دوو خەریکە تەواو دەبێ ئەم ڕەنگە ئەم ژمارەیە لە ٦٠٠ لاپەرە زیاتر بێت هیچ مادەیەک نیە لە پەنجا فلسکاب کەمتر بێ".

هەموو ئەمانە شتێکمان بیردەخاتەوە: ئەو دەمانە گۆڤار و ڕۆژنامەی ئەدەبی گرنگبوون و ماندووبوون و چێژی خۆی هەبوو بۆ ئەو کەسانەی کاریان دەکرد، هاوتا سەنگی خۆیانیان بە ئێستاشەوە کە زۆریان وەستاون، ماوە!

### لە پەراوێز دا

دیارە هەر نامەیەک، ڕوونکردنەوەی خۆی پێویستە، هێندەی توانیبیتمان ڕوونکردنەوەمان داوە بە یارمەتی وەرگرتن لەو نووسەرەی نامەکەی بۆ چووە یان کەسانی تر. بۆ نموونە ئەو دەم بۆ نامەکان و بۆ پێداچوونەوەی یادداشتەکانی "شێرکۆ بیکەس"یش پرسم بە ڕەووف بێگەرد دەکرد، چونکە هەم هاوەڵی بوو، هەم خۆیشی دەیگوت بچن لەو بپرسن. لە نامەیەکی "محەممەد موکری" دا، لە پەراوێز دا هەواڵی "ئەحە" دەپرسێت، کە لە زمانی کوردی دا "ئەحە" کورتکراوەی "ئەحمەد"ە و من پرسیم مامۆستا ئەم ئەحمەدە کێیە؟ ئەویش یەکسەر پێکەنی و وتی: ئەحمەد نییە، "ئەحلام مەنسوور"ە. یان بۆ لێکدانەوەی "حەمە" جوداکان کە ئایا "محەممەد عومەر عوسمان، محەممەد حەمە باقی"یە بەو شێوەیە، زۆریک لە نووسەران هاوکار بوون. یان لە ڕوونکردنەوەی نامەیەکی "هەردی" دا, بۆ کاروان کاکەسوور, هەردی باسی ئەوە دەکات کە ئایا کاروان کاکەسوور دەوێت "هەردی" شیعری بۆ بنووسێت وەک ڕێبوار سەعید؟ کە ئێمە نازانین ڕێبوار سەعید چ داوایەکی لە هەردی کردووە بۆیە لە ڕوونکردنەوەیەکدا, دەنووسێت: "ساڵی ١٩٩٩ لە لەندەن ماستەرەکەم لەسەر وشەو ڕەنگ بوو بۆ ئەم پرۆژەیە داوام لە زۆر شاعیری کوردو وڵاتانی کە کرد کە هەر یەکە تابلۆکەی من بە شیعر بنوسێتەوە لەوانە مامۆستا هەردی بوو، کە

داوام لێکرد. ئەویش پاش کارکردنی چەند مانگێک کە چەند جارێک تەلەفۆنی بۆ دەکردم بۆ زیاتر وردەکاری ناو تابلۆکە، پاشان ئەو شیعرەی نووسی، کە تەرجەمەی تابلۆکەبوو لە ڕێگەی تێگەیشتن و هەستی تایبەتی "مامۆستا هەردی"یەوە. هەڵبەت من کە داوام لێکرد زۆر دڵنیانەبووم لە قبوڵکردنی، بەڵام ئەوەم پێوت کە بەشداری لەو پرۆژەیەدا بۆ من و بۆ پرۆژەکەش قورساییەکی تایبەتی دەبێت، ئێستە تابلۆکە لە فەرەنسایە لەگەڵ پرۆژەکەدا. بەڵام لە کتێبی وشەو ڕەنگدا کە بە ئینگلیزی لە لەندەن بڵاوکرایەوە بڵاوبۆتەوە".

یاخود لەو نامانەی ڕەحیمی قازی دا، حەسەنی قازی ڕوونکردنەوەی پێویستی پێ دام، لە بارەی شێخ لەتیف ناوێکەوە پرسیارم لێ کرد ئایا شێخ لەتیفی حەفیدە؟ ئەو وێڕای ئەو ناوە و ناوی "عەلی"یەک، دواتر ڕوونکردنەوەی دا کە "عەلی گەلاوێژ"ە و ئەوەش "شێخ لەتیفی حەفید"ە، یادەوەرییەکی گێڕایەوە کە پێمخۆشە لێرەدا وەک نامە لە پێناوی نامەدا بیهێنمەوە:

شێخ لەتیفی بەرزنجی کوڕی شێخ مەحموودە. شێخ لەتیف دۆستی ڕەحیم قازی بوو. وا بزانم لە ساڵی ١٩٦١ شێخ لەتیف لەگەڵ هەیئەتێکی لایەنگری ئاشتی دەچنە سۆڤییەت و سەری "باکو"ش دەدەن. ئەو دەمی "ڕەحیم قازی" و "عەلی گەلاوێژ"یش لە باکو دەژیان. بە هەر حاڵ لەوێ شێخ لەتیف بۆ موداوا ماوەیەک لە نەخۆشخانە دەکەوێ و "ڕەحیم قازی" هەموو ڕۆژێ دەچێتە سەردانی و ڕۆژێکیان بە شێخ لەتیف دەڵێ ئێستا تا ماوەیەکی دی "گەلاوێژ"یش دێ، شێخ لەتیف پێشتر "عەلی گەلاوێژ" ناناسێ و پێی وا دەبێ "گەلاوێژ" کچێکی کوردە. و هەر پەیتا پەیتا دەپرسێ "چی بوو گەلاوێژ" هەر نەهات؟ ڕەحیم قازی هەست پێ دەکا شێخ شتەکەی تاق و جووت کردووە، دەڵێ هەر ئێستا دەگاتێ. دوای ماوەیەکی کورت "عەلی گەلاوێژ" کە پیاوێکی کەڵەگەت و بەخۆوە بوو دەگاتە، دیوی شێخ لە نەخۆشخانە و سڵاو دەکا و ئەحواڵی شێخ دەپرسێ، ڕەحیمیش بە شێخ لەتیفی دەناسێنێ. شێخ دەڵێ هەی باوکەڕۆ ئەمە بوو- گەلاوێژ؟

لە ڕوونکردنەوەکانی تردا، کە هەندێکیان تەنها بۆ خۆمن و ناتوانم لێرە دایان نێم، زۆری تر هەن، بۆ نموونە ڕوونکردنەوەی نامەیەکی ڕێبوار سیوەیلی بۆ

ڕەفیق سابیر، وێڕای ڕوونکردنەوەکانی ڕەفیق سابیر، سیوەیلی لە بارەی ئەو نووسینەوەی کە لە بارەی 'ئەخوان سالس'ەوە نووسیویەتی و لە نامەکاندا هاتوە، دەنووسێت:

من لە دیمەشق بووم، کە هەواڵی مەرگی "ئەخەوان سالس" بڵاوکرایەوە، ئەوکاتە بە ناونیشانی 'ئەزموونی شەوبێداری ئەخەوان'ەوە، وتارێکم نووسی و ناردم بۆ گۆڤاری "ڕێگای کوردستان"[ ئاشتی و سۆسیالیست]، کە حزبی شیوعیی بڵاوی دەکردەوە. پاشان کاک "عەلی دەهباشی" کە سەرنووسەری گۆڤاری (کلک) بوو لە تاران، بەم کارەی زانی و لە ڕێگەی ئەوەوە ئەخەوانیش زانیبووی. بۆیە داوایان کرد وتارەکە بکەمە فارسی و بۆیان بنێرم. کاتێک وتارەکەیان بەدەست گەیشت وتیان وەکو خۆی بڵاویدەکەینەوە و من لە سەرەتای وەرگێڕانە فارسییەکەدا تێبینیەکم نووسیبوو، کە چۆن هەواڵی مەرگی ئەو شاعیرەم بیستووە، بەڵام خۆشحاڵم کە وانەبووە و داوای تەمەنی درێژ بۆ ئەخەوان دەکەم. کاتێک لە ژمارە (٥) یان ژمارەیەکی تری گۆڤاری (کلک) دا بڵاوبۆوە، ناوبەناو وتارەکە بۆشایی کەوتبووە پەرەگرافەکانییەوە. لە چاوپێکەوتنێکی پاشتردا، کە دهباشی هاتە کۆپنهاگن، پێی وتم: کە لە چاپخانە سانسۆری حکومەت ناچاری کردووین ئەو پەرەگرافانە لابدەین. بۆیە ئێمەش هەر بەو جۆرە دامان نا تا بزانرێت وتارەکە سانسۆر کراوە. پاشتر ئەخەوان سالس بە (دهباشی) وتبووی: با ڕیبوار چیتر داوای تەمەنی درێژم بۆ نەکات، من دەمرم..

---

بەشێکی نامەکانی ناو ئەم کتێبە، گفتوگۆی زانستی و پرسی گرنگن، لەمەڕ ڕاستکردنەوە و ڕوونکردنەوە و نووسینەوەی بابەتی فەرهەنگی و مێژوویی، و ساغکردنەوەی دەستنووس و نووسراوی ئەدەبییەوە وەک ڕاوێژکردن بەیەک و قوڵبوونەوە و ڕاوەستان تەنانەت لەسەر یەک پیت و یەک وشەش. بۆ نموونە لە نامەکانی "فەرهاد شاکەلی" بۆ "ئیبراهیم ئەحمەد، هەژار موکریانی" یان نامەکانی "ئەنوەر سوڵتانی و عەبدوڵڵا مەردۆخی و سدیق بۆرەکەیی" دا بەدیدەکرێن.

لە نامەکانی 'ئەنوەر سوڵتانی'دا بۆ "محەممەدی مەلا کەریم و مەلا عەبدولکەریم مودەریس"، پرسیار لەسەر ساغکردنەوەی دەستنووسێک دەکات، کە شیعری

شاعیران گۆرانی تێدایە و کێشەیەک هەیە بەوەی جۆرێک، لە تێکەڵی لە نێوان شیعری شاعێریک بە ناوی "مەحزونی" و "بێساراني" هەیە، ڕوون نەبۆتەوە ئایا ئەم دووانە یەک کەسن، یان بە هەڵە شیعرەکان تێکەڵکراون. لە نامەیەکدا پرسیار دەکات بۆ ڕوونکردنەوەی. لە نامەی پاش ئەوەدا مژدە دەدات کە کارەکە وەک کتێب چاپ دەبێت.

لە ئێستادا کتێبێک لە بارەی دەستنووسەوە دەبینن و بەردەستە بۆ خوێندنەوە، ئەو کتێبە بەرهەمی ئەم نامەکارییی نووسەرە لە مەڕ وردبوونەوە و کۆڵنەدان و هاوکات بەهای نامە بۆ دۆزینەوە و ساغکردنەوە. کە وەک لە نامەکەدا هاتووە باسی کەشکۆڵێکی "شێخ موئمین مەردۆخی"یە لە بارەی شیعری گۆرانەوە. لە کتێبەکەدا مەبەستی نامەکەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە وەک بەشی ونبوو بە کۆی نامەکانی سوڵتانی و کتێبی دەستنووسەکە زانیاری تەواومان پێ دەدرێت، لە بارەی ئەو دەستنووسەی لە نامەکەدا هاتووە، لە کتێبەکەدا دەنووسێت:

"ئەم کەشکۆڵە شیعرە، بەشێکە لە دەستنووسێکی گەورەتر، کە بەشەکانی دیکەی بریتین لە تەجویدی قورئان و شیعر و دوعا و پاڕانەوە بە زمانی فارسی و عەرەبی، ئەوەی زمانی کوردی بگرێتەوە، بەشی دووەهەمی دەستنووسەکەیە، کە ٣٨١ پارچە شێعری ٣٩ کوردی ناوچەکانی باشوری تێدا کۆکراوەتەوە و ٤٨پەڕ لە سەرجەمی ٨٤ پەڕی دەستنووسەکەس گرتۆتە بەر."

ئەمە وەک زانیارییەک لە بارەی دەستنوسەکەوە، وەک ڕوونکردنەوەی باسی مەحزونی و بێساراني، کە لە نامەکەدا هاتووە، هاوتا ئێمە نازانین وەڵامی "محەمەدی مەلا کەریم" چ بوە، نووسەر لە کتێبەکەدا وەڵامەکەمان پێدەدات و دەنووسیت:

" کاکە حەمە لە وەڵامدا بۆی نووسیم: لە بارەی مەحزوونی و بێساراني یەوە، من هیچ بەڵگەیەک شک نابەم کە یەک کەس بن.. بیروڕای مەرحوومی سەید

طاهیریش لەوانەیە نییە پشت گوێ بخرێ، بەڵام ئەبێ بزانین دەلیل و دەستاویژی چی بووە"[10] .

لێرەوە هەم وەڵامی نامەکە، هەم زانیاری ورد لە بارەی دەستوونەسەکەوە لە رێی نامەکەوە دەست دەکەوێت.

[1] ئەنوەر سوڵتانی، ۲۱ دەستنووسی کوردی (و فارسی سەبارەت بە کورد) لە کتێبخانەکانی بەریتانیا، چاپی کتێبی ئەرەزان، چاپی یەکەم، ۱۹۹۷، ل ۲۲

## کۆتایی

ئێستە وەختی ئەوەیە "١٨٦" نامە، بخرێتە بەر دیدەی خوێنەران، کە بە ڕیزبەندی ئەلف بێ، پۆلێنکراون، نەک بە ڕیزبەندی مێژووی ناردن. کۆی نامەکان، لە لایەن نووسەرێکەوە بۆ نووسەرێکی دی یان هونەرمەندێکەوە نێراون. بە جیاوازی دوو نامەی ناو پەرتووکەکە، کە یەکێکیان نامەی "نەوشیروان مستەفا"یە بۆ "شێرکۆ بێکەس" و باس و خواسی ئەدەبیاتە، ئەوی دیکەیان نامەی "مەلا مستەفای بارزانی"یە بۆ "ڕەحیمی قازی" و باسی کوردایەتییە. ئیدی نامەکانی دی لە کەسی نووسەرەوەیە، کە زۆرینە کوردن و هاوتا نامەی نووسەرانی عەرەب و فارس و ئینگلیزیشی تێکەوتووە و بە وەرگێڕاوی دانراون، جگە لەوەی نامەیەکی "نورەدین زازا"یشی تێدایە لە پیتی لاتینیەوە کراوەبە پیتی عەرەبی.

نامە بڵاوکراوەکانی ئەم کتێبە، چەندێکن، هێندەی کەش، لە ئەرشف دا لەلام ماونەتەوە، ڕەنگە ئەم کارە بەردەوام بێت و بەرگی دیکەی هەبێت، ڕەنگیشە دوا کار بێت، کەس نازانێت!!

سوپاس بۆ ئەوانەی ماندوو بوون لەگەڵم، ئەوانەی دەیخوێننەوە، ئەوانەشی کە پێچەوانەی ئەم کتێبە، پۆستەچی لە دەرگایان دەدات جارێکی تر...

**سەرچاوەکان:**


١. ئەنوەر سوڵتانی، ٢١ دەستنووسی کوردی(و فارسی سەبارەت بە کورد) لە کتێبخانەکانی بەریتانیا، چاپی کتێبی ئەرەزان، چاپی یەکەم.

٢. ئینسان هیچ نییە، جگە لە دۆزەرەوەی پەناگە، غەسان کەنەفانی، و. زلێخا، گۆڤاری هەنار، ژمارە ٤٧.

٣. احمد اخوت, ای نامه, کتابَ جهان, چاپ اول ١٣٨٨.

٤. بەڕۆژ ئاکرەیی، دیوانی ئەحمەد شاملو، بەرگی یەکەم، ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ساڵی ٢٠١٣

٥. پیشکەشە بە بەڕێز دایکی ڕەوا, ئا. ئەمیرە محەممەد, بەهاری٢٠١٢مەکتەبی سیاسی ناوەندی مێژووی (ی.ن.ک).

٦. جەمال شارباژێری، نامەکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠١٣

٧. سید محمد علی جمالزاده، نامەهای جمالزاده، انتشارات سخن، چاپ اول، ١٣٨٧

٨. صادق هیدایت، هشتاد و دو نامە بە حسن شهید نورائی، ناصرپاکدامن، چاپ اول، ١٣٨٢

٩. فرانتس کافکا، نامە بە پدر، ت.فرامرز بهزاد، انتشارات خوارزمی، چاپ سوم ١٣٨٥

١٠.کەمال ڕەئووف محەمەد(بابی لالۆ)، ئەدەبی نامەنووسینی کوردی، (٣)بەرگ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٤

١١.گرترود هایدگر، نازنین من(نامەهای هایدگر بە همسرش الفریدە)، ت. مهشید میر معزی، مؤسسە انتشارات فلسفە، سال ١٣٨٦

١٢.مجموعە اثار چخوف، نامە ها، ترجمە ناهید کاشی، جلد نهم، چاپ سوم ١٣٨٩، انتشارات توس.

١٣. مەلا عبدالكريمى مدرس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا، ١٩٧٩.

١٤.ناظم حکمت، آسمان مانند دست های توست، دفتر اول، ت. زرین تاج پناهی نیک، نشر دنیا نو، تهران ١٣٨٤.

١٥.نامەهای از نویسندەگان، مامان عزیزم، ت. مینا دارابی امین، انتشارات ققنوس، تهران ١٣٨٨.

١٦.نسخە الخط عبدالفتاح کردی, مکتوبات, ١٨٨٤.

## ئەم ڕۆمانە کردنەوەی دەقێکە،

## کە مێژوو ناتوانێ بینووسێت...

**نامەی ئازاد سوبحی بۆ ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل**

مامۆستای بەڕێز

کاک احمد محمد اسماعیل

ڕۆمانەکەتم[1] خوێندەوەو لەبەر ئەوەی سروشتێکی تایبەتی هەیە و زیاتر دەچێتە خانەی دەقی تۆمارکارییەوە، بۆیە منیش هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئەو بناغەیە خوێندمەوە، بێگومان ڕۆمانەکە خۆی خوێنەر بەرەو ئەو جۆرە مامەڵەیە دەبات و ڕۆمانی لەم جۆرە بە بەڕوای من زیاتر لە چوارچێوەی وەزیفەی تۆمارکارییدا دەبینێ، ئەگەرچی من بە هیچ جۆرێک بڕوام بەو وەزیفەیە نییە، چونکە ژیان تۆمار ناکرێت، بەڵام ڕۆمان دەتوانێ کارەساتە خوێناوییەکان لە بزبوون و بیرچوونەوە بپارێزێت، لەم حاڵەتەدا ڕۆمان دەبێتە هێزێک بۆ یادکردنەوەو هێزێک بۆ دانەبڕان لە ڕابردوی پڕ کارەسات، بێگومان ئەم یادکردنەوەیەش دواجار هەمیشە ترسمان لەلا پەیدا دەکات بەرامبەر بە داهاتوو، چونکە ئەنفال بە کردەوە لە ڕابردوودا ماوەتەوە، بەڵام بە احتمال دەکرێت لە داهاتووشدا تووشمان ببێتەوە. ئەمەش خاڵی گرنگی ڕۆمانەکەی تۆیە، تۆ لە ڕۆمانەکەتدا دەڵێی ئەوەی ڕوویدا لە ڕابردوودا بوو، خوێنەریش دەڵێت: ڕەنگە کارەساتێکی وا لە داهاتووش دا ڕوویداتەوە، لێرەدا ڕۆمان لە چوارچێوەی تۆمارکاری دەترازێت و لەو سنوورە زیاتر دەڕوات کە مێژوونووس تیایدا کار دەکات.

---

[1] ڕۆمانەکە مەبەست لە: ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، بەهاری ڕەش، دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠١.

ڕۆمان لێرەدا نووسینەوەیەکی سارد و سڕی کارەسات و ڕووداوەکان نییە، بەڵکو دۆزینەوە و گرتنی ئەو ویژدانە ئینسانییەیە کە تەنها ئەدەب و بەتایبەتیش ڕۆمان شوێنەکەی کەشف دەکات و لێرەدا ڕۆمان دەبێتە هێزێک کە لە ناو ڕووداوەکانەوە و لە مێژووی نەنوسراوەوە سەرچاوەی گێرانەوە و گوفتاریکی تر دەدۆزێتەوە بۆ هێنانە گوێ ئەو بەشەی مێژوو کە هەمیشە فەرامۆش دەکرێت و ئەدەب دەیدۆزێتەوە، ئەم ڕۆمانە کردنەوەی دەقیکە کە مێژوو ناتوانێ بینووسێت.

لەگەڵ ڕێزم

ئازاد صوبحی

ڕێکەوت، ماوەیەک دوری خستینەوە.

نامەی ئەحمەد خواجە بۆ عیزەدین مستەفا ڕەسول

زۆر بەڕیز دوکتور عیزالدین

خۆشی و باشیتان ئەخوازم. ڕێکەوت ماوەیەک دوری خستینەوە بەڵام دڵنزیکی دۆست و بریانی چاک و بە نرخە. هاتم بۆ بغداد و هاتم بۆ کلیەش بە داخەوە بە خزمەتتان نەگەشتم.

کاک دوکتور، بێگومان حسابی کتێبەکان لەلای خۆیشت روونە. پاش ئەو ۲۳/۵۰۰ دینارەی پیم گەیشت مادەی کتیبەکانتان کە ناردەوە بە پی ی ژمارە۲۳/۰۰ دینار لە لاتان ماوە پاش هاتنەوەی کتێبەکان چەند جاریکیش ئاگادارم کردن بەلاّم وا دیار بوو کە کارزۆریتان ماوەی دوایی پی هێنانی نەدان. جا، تکا ئەکەم ئەم ۲۳/۰۰ دینارەم بۆ بنێرن بۆ ماڵی عثمان افندی حاجی مصطفی کە زاوامە و ماڵیان لە حارسیە(ث)[1] نیزیکی اسواق کندی یە. کە خۆشتان شارەزان وە مالەکەشیان ئەزانن. ئەبی بزانیت لەم کاتەدا چەند پیویستمان هەیە. ئیتر چاوەریی همتی برایانە تانم وە ئەو زحمەتەی بۆ ئەم مامەی خۆتان کێشاوتانە بێ گومان نە لەبیرئەچیتەوە و نە فەرامۆش ئەکری و بە خواتان ئەسپێرم گیانی شیرینم.

زۆر تکایە ئەم نامەیە بگەیەت

بە بەرێز دوکتور کمال مظهر. سوپاس

[1]لە نامەکەدا بە پیتی کوردی نووسراوە و لە سەریشییەوە پیتی (ث) عەرەبی.

**بۆ ئاگاداریتان، چیرۆکەکان شتاقان تەماشا نەکرابوو.**

نامەی ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل بۆ ڕەووف بێگەرد

١٠/٢

برای بەڕیزم کاکە ڕەووف.. دەستەکانت دەگوشم و هەموو دەمێکت ڕووناک

ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم تکات لێ دەکەم بۆ دەستەی بەڕیوەبەری یەکێتی ی نووسەرانی بخوێنیەوە... بۆ ئەوی بۆیان دەرکەوێ نەک لایەکی تر بەڵکو دەزگا ڕۆشنبیریەکانی خۆمان چەند بە چاوێکی سووکەوە دەڕواننە نووسەر و شاعیرانی خۆمان... مەبەستیشم لەمە تەنها گلەیی یە و یەکێتی نووسەرانیشم بەباشترین شوێن زانی کە گلەیی خۆمی بۆ بکەم، هەروەها نامەوێ گلەیەکەم بە لایەکی تر بگەیەنرێ و من لە لای خۆمەوە بۆ هەموو فەرعەکانی تری نووسەران هەمان گلەییم دەگەیەنم.. پێشەکیشی نیازم وایە تاکو "مارف" ناوێک لە ڕووی ئەرز بمێنێ بەشداری هیچ کۆڕێک نەکەم.. لە هیچ شوێنێک دا..

ڕۆژی ٥-١٠ بە ڕێکەوت چوومە بەغدا "حسێن عارف" م بینی و پێ ی ووتم ٢٠-١٠ جمعە کۆڕیکی چیرۆک دەبەستێ منیش وەکو هەموو ئەدیبێکی تر حەزم کرد بەرهەمێکم بخەمە بەر گوێ و دەستی (جەماوەر) حسێن پێ وتم کە بروسکەکەیەکت بۆ لێ دەدەین بۆ دهۆک ئەگەر هات و ڕازی بوون.. گەڕانەوە دهۆک ڕۆژی چوارشەممە بروسکەیەکم پێ گەیشت ئەمە دەقەکەیەتی " دهۆک / مدرسە خەبات یرجی حضورک للمساهمە فی الندوە القصصیە مساء یوم ٢٠-١٠ " لە عەینی ڕۆژدا ڕۆژنامەی هاوکاری هەواڵەکەی بڵاو کردەوە کە من یەکیک بووم کە بەشداری کۆرەکە دەکەم لە دهۆکەوە بۆ بەغدا ٥٠٠ کیلۆمەترە ئێوارەیەک درەنگ لە هۆک دەرچووم ئۆتۆمبیلم دەست نەکەوتوە و هاتومەتە اربیل لەوێوە بۆ کەرکوک سەعات ١ی شەو ئۆتۆمبیل پەیدا بووە و نزیکەی سەعات (٥) ی سەرلەبەیانی گەیشتومەتە بەغدا. ئێوارە کە چومەتە جمعیە بێ گوێ دانە هیچ عورف و عادەتێک بەو پەڕی بێ شەرمیەوە پیان ڕاگەیاندنم کە تۆ نابێ چیرۆکەکەت بخوێنیتەوە!! گوایە ١. چیرۆکەکەیان نەدیووە ٢. لیژنەکەمان

بڕیاری بەشداری بوونی تۆی نەداوە (بۆ ئاگاداریتان چیرۆکەکان شتاقان تەماشا نەکرابوو) احلام منصور و محمد موکری لە پێشدا بڕیاریان دا کە ئەگەر تۆ نەیخوێنتەوە ئیمەیش بەشدار نابین، بەلام لیم مەگرن کە بڵیم "ئەم عالەمە زۆربەی ڕاڕاو لەسەر باریکدا نامێنن" کۆر دەست پێ کرا هەموویان چیرۆکی خۆیان خوێندەوە منش کەوشەکەم دڕا و هیچم پێ نەبڕوا. شتێکی تریش هەیە صلاح شوان بەر من کەوتبوو، کە چیرۆکەکە هەڵسەنگێنێ.. احلام [مەنسور] بەر انور جاف [ئەنوەر قادر محەممەد] کەوتبوو.. محمد موکری بەر حسین [عارف] کەوتبوو رووف حەسەن بەر رەفیق صابر کەوتبوو "لەم حاڵەتە انور جاف" خاون شەنسی خۆیەتی .

صلاح گوایە ناکۆکی یەکی کۆنی هەیە لەگەڵ مارف دا گوایە وتیان منیش بەبۆنەی ئەوەوە سووتاوم.

بەلام من هەر ڕایەکی ئیوە لەم بارەیەوە هەبێ مل کەچ دەبم بۆی... ئەمە ڕەوایە؟ ئەمە "اهانە" کردنی ئەدیب و ئەدەب نی یە؟! جارێکی تر دەیڵیمەوە نیازم تەنها ئاگادارکردنەوەی یەکێتی نووسەرانە و بەس، بە خواتان دەسپێرم و خواتان لەگەڵ

احمد محمد اسماعیل

دهۆک/ مدرسە خیات

**نازانم تۆ چۆنی لەگەڵ نووسیندا...؟**

نامەی ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل بۆ ڕەووف بێگەرد

دەستەکانت دەگوشم و هیوام خۆشیتە دووز ٧٨/١/٦

چەند ڕۆژی لەمەوبەر نامەیەکتم پێ گەیشت.. سوپاست دەکەم

(نقل) بوونم بۆ کەلار هەر ئەوەندە جیاوازی لەگەڵ دهۆک دا هەیە: ئەتوانم بە ئاسانی هەفتەی جارێ دوو جار سەر لە وردیلەکانم بدەم.. ئەی چۆن ئەدیبی خەڵک هەر کە نەرمە تایەکیان لێ دێ گەورەکان بەسەریان ئەکەنەوە و هەواڵی نەخۆشی یەکەی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاودەکەنەوە. کە دەمرن دنیایان بۆ دەورووژێنن تا کە دەچن شەوانی سووریان لە شارەکانی ئەوروپا بەسەر دەبەن بە هەمو کەسی رادەگەین[ڕادەگەیەنن] سەیری ئەدیبانی لای خۆمان! بکە..

چەند چیرۆکێکم نووسیوەتەوە.. ئەمەی لەگەڵ نامەکەدایە دەمێکە نووسیومە و هەر حەزم کرد کە بیخوێنیتەوە "حەز ناکەم کەسی تر بیخوێنێتەوە" تەنها لەبەر ئەوەی کە جاریکیان چیرۆکێکم بۆ "ئەفەنی یەک" خوێندەوە زۆری پێ نەچوو چیرۆکێکی بۆ یەکێ خوێندبووەوە کت و کت ئەوەی لای من بوو!!

یەک دوو چیرۆکی یەشار کەمال م گۆڕیوەتە کوردی لە تورکی یەوە.. نازانم تۆ چۆنی لەگەڵ نووسیندا...؟

کاکە ڕەوۆف.. ووتارێکم دەربارەی چیرۆکی کوردی نووسیوە، ناوێرم بڵاوی کەمەوە کورتەی ووتارەکە ئەوەیە کە: چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ لە تەنگ و چەڵەمەدایە..

وەگەر نەبێتە زیادە ڕووییی هەر هیچی نەکردووە..کوا ئەو کورتە چیرۆکەی کە بیانییەک بیخوێنتەوە لە باری دەروونی و مرۆڤی کورد نزیک بیتەوە خواست و هیواو بیری مرۆڤی کورد وەکو پێویست لە کام چیرۆک دا بەدی دەکرێ ڕەنگە

بلێی : ڕێگا و ..و....و.. شار وا.. هەندێ شتی تر بەڵام ئەڵێم چیرۆک نووسی ئەگەر زاڵ بێ بەسەر هونەری چیرۆک نووسی دا زۆر لەوانە فت دەکا.

تۆ گۆرانێکی بنەڕەتی بە دی دەکەی لە چیرۆکی ئەمڕۆ دا؟ توانراوە داهێنانێکی تازە یان هەنگاوێکی باشتربهاوێژرێ بە گوێرەی ٥-٦ ساڵ لەمەوبەر؟ 'هەرچەندە ماوەکە کورتە من ن ایبینم جوینەوەی شتەکانی سەرەتای هەفتاکان بەدی دەکەم باشە چارە چی یە؟'

١. لە جیاتی ئەو کۆڕانەی کە بۆ خوێندنەوەی چیرۆک دەیبەستن چیرۆکنووسان بانگ بکەین و لە چیرۆکی کورتی کوردی بدوێن.
٢. رووتان لە چەند ڕەخنەگرێکی شارەزا و بە انصاف ! کە چەند باسێک لەسەر چیرۆکی کورت ئامادە بکەن.
٣. ی.ف روو لە لێ پرسراوانی لاپەڕەی 'ئەدەب' ی ڕۆژنامەکان بنێ کە چیرۆکی لاواز بڵاونەکەنەوە. باری چیرۆکی ئەمڕۆ دەمەتەقێ و لیکۆڵینەوەی لەسەر بڵاو بکریتەوە.

کاکە ڕەووٚف ئەزانم وڕینە ئەکەم..

حەز دەکەم سەرت لێ بدەم.. خۆ ئەگەر هەر ڕێک نەکەوت بێ من نەڕۆی بۆ بەغدا و کە ڕۆیشتی ئاگادارم بکەرەوە. سلاوم بگەیەنەرە برادەران.

طوز/ بجنب دائره البريد

برات احمد محمد اسماعيل

کاکە رەوۆف نووسەر و شاعیرانی دهۆک لە کۆڕ و چالاکی هونەری و ئەدەبی زۆر محرومن خۆزێ ی.ن بانگیانی دەکرد بۆ سلێمانی، چونکێ چەند جارێ نامەیان بۆ نووسیوم لەوە رووەوە ئەگەر ناونیشانیشت ئەوێ ئەم کوڕە ئاگادار بکەنەوە.

عبدالرحمن مزوری کە لە ثانویَە برایەتی یە.

لە

٢٠٠٣/١٠/٢٥

کەرکوک

**بۆ کوێ برۆین، کوردبوونمان دیاره.**

نامە ی ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل بۆ سوزان سامانجی

خاتوو سوزان ڕیز و سلاو [1]

چیرۆکی " Morsalkimlar" م بە دیقەت خوێندەوە دەستتان خۆش بێت، من ڕەخنەگر نیم، ئەوەشی لێرەدا دەیلێم ئامۆژگاری نین.. ئەم چیرۆکەکەت لەگەڵ چیرۆکەکانی ترت دا لەگەلێ ڕووەوە جیاوازی هەیە.. جوانترە و مۆدێرنە، لە ڕووی زمانیشەوە جیاوازیم بینی، زمانێکی شیعریت بەکارهێناوە، هەڵسوکەوتێکی جوانت لەگەڵ کات و شویندا کردووە.. وەکو لە چیرۆکەکەتدا دەرتخستووە بۆ کوێ برۆین کوردبوونمان دیارە. با بزانن.. ئاه.. ئەو منالە کوردەی "تەسمیم" ت بۆ ماچ نەکرد؟؟ دایکی نەخۆش بوو.. هەوالی دایکیت پرسی دایکی بێ کار و دەست بە تالە، تۆ بلێی ئێستا کارێکی دەست نەکەوتبێ، من کە ئەویم خوێندەوە گریام.. هەوڵ دەدەم ئەم چیرۆکە وەربگێڕم.. تکایە ئەو ڕۆمانەی لە بارەی هەڵەبجەوە نووسیوتە بۆمی بنێرە..

سەلام

ئەحمەد

١٠/ ٢٠٠٧

---

[1] ئەم نامەیە بە زمانی تورکی نووسراوە، وەلامەکەی لە لاپەرەی (٣٠٧) دا یە.

**لەم تەمەنەدا، لەوە زیاترم لە دەست نایەت.**

نامە ی ئەحمەد هەردی بۆ شێرکۆ بێکەس

برای بەڕیزو بە نرخ و خۆشەویست

کاکە شێرکو                                                    سەقز ١٩٨٩\٥\٥

نامەی ڕۆژی ٢١-٤ تان گەیشت، زۆر پێی گەشامەوە، چونکە بەراستی زۆر پەرۆش بووم بۆ هەواڵ و دەنگ و باستان. پێشەکی ڕێزو سڵاوم هەیە بۆ شەفیقە خان و نەسرین [1]وە چاوی منالان ماچ ئەکەم.

کاکەشێرکۆ! لە ڕووی نەجابەتەوە هەستی برایەتی خۆتان دەربڕیوە بەرامبەر بە من زۆر سوپاستان ئەکەم. هەڵبەت کە ئەڵێم لە ڕووی نەجابەتەوە، چونکە گەلیکی وا هەن کە پەیوەندییان وەکو تۆ بگرە زیاتریش بووە لەگەڵ مندا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەی ئیوە، بەڵکو نیو ئەوەندەشم لێ نەبیستوون. جا دیارە ئەمانەیان ئەگەڕیتەوە بۆ پاکی راستی خۆتان.

بە هەرحال بێینە سەر باسی ئێستا. حەز ئەکەم بزانم چۆن کات ڕائەبوێرێ.. وە کێ هاوڕێتە..وە بیروڕات دەربارەی هەموو شتێک چی یە؟ بەرامبەر ئەوانەی کە لەگەڵیاندا ئەژیت. وە ئەو کەسانەی لەگەڵیاندا دێیت و ئەچیت..یان ئەو بارودۆخەی کە کورد پێیدا دەڕوات.

زۆر حەزم ئەکرد بە درێژی هەندێک شتتان بۆ بنووسم، بەلام کاتی ئەوەم نییە و داخەکەم دەردی خۆت ئەڵێی: ((لەم تەمەنەدا لەوە زیاترم لە دەست نایەت)).

باسی (بەرەت) کردبوو، بە بۆنەی ئەوەوە هەر ئەوەندە ئەڵێم: سەد خۆزگە بەو (بەرە)یە زوورتر بووایە..نەک لە دووای هەشت ساڵ جەنگ و قوورس بوونی تای تەرازوی صەدام و چی و چی..هەرچۆنێک بێت ئێستاش ئەگەر هەموو لایەک لە ئاستی ئەم قۆناغەدا بیربکەنەوە، و گوێ لەیەک بگرن، لەوانەیە ئەو

ترووسکاییەی ئێستا بەدی دەکرێت، ببێت بە مەشخەڵێک. هەرچەندە سەرتاسەری کوردستانی عێراق کاولکراوە و، شەوەزەنگێکی وەها کوردستانی دابین کردووە کە لە هیچ چەرخێکی لەمەوپێشدا نەبیندراوە و نەبیستراوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەردی (مەولەوی) خۆمان ئەڵێ:

دیسان مەگەر قەیس بە مودارا بێ

بەهارێ ئەبێ چەمەن ئارابێ

من لێرە زۆر بە دڵخۆشی یەوە هەواڵی تۆ لەم و ئەو ئەبیستم، وە هەروەکو لەوەو پێشیش ئەوەم بیست کە لە (ئیتاڵیا) خەلاتێکی ئەدەبیتان وەرگرتبوو لە ناو کۆمەڵێک شاعیرانی هەمە جۆردا. پڕ بە دڵ پیرۆزبایتان لێ ئەکەم و هیوام وایە هەمیشە لە سەرکەوتن و پێشکەوتندا بن..

هەربژین بۆ براتان: ئەحمەد هەردی

---

[1] خاتوو شەفیقە دایکی شێرکۆ بیکەس و خاتوو نەسرین هاوسەری شێرکۆ بێکەسە.

**ئایا دەتوانی داخوازی خۆتم،**

**بە ڕوونی بۆ بخەیتە چوارچێوەیەکی دیاریکراوەوە؟**

نامەی ئەحمەد هەردی بۆ کاروان کاکەسوور

کاروان کاکەسوور

برای شیرینم برای شیرینم کاک کاروان

لە دوای پێشکەشکردنی ڕێز و خۆشەویستی، ڕۆژی(٢٨-٤) کارتە خنجیلانەکەتانم پێگەیشت، زۆر بەپەرۆشەوە سووپاستان ئەکەم و چاوتان ماچ ئەکەم.

پێشەکی داوای لێبودن ئەکەم، کە وەرامەکەی دواکەوت. سەبارەت بەوەی یەک دوو کاری "لابەلا" یەخەیان گرتم.

برای شیرینم نووسیبووتان شیعرێکی منتان لە گۆڤاری-بینین-دا خوێندۆتەوە و هەستت کردووە، هێشتا من هەر گەنجەکەی سەردەمی(ڕازی تەنیایی)[1] م. بێگومان ئەو دەربڕینەی ئێوە ئەوە دەرئەخات، کە من توانیومە دووای چەند ساڵ بێدەنگی، شیعریک بڵێم، کە تامی شیعرەکانی پێشووم بدات، کە ئەمەش پەسەندکردنێکی وەستایانە و جێگەی سووپاسە.

برای بەڕێز لە دێڕی دووایدا دەفەرموون: (شیعرێکی تری ئاوا جوان بنووسیت)[2]، لەوەرامدا دەڵێم، بێگومان زۆر حەزەکەم، ئەگەر بتوانم، داخوازی

---

[1] ئەحمەد هەردی، ڕازی تەنیایی، چاپی یەکەم،چاپخانەی شەفیق، بەغدا- نەورۆزی ١٩٥٧

[2] لە بارەی ئەم نامەیەوە کاروان کاکەسوور دەڵێت: ساڵی ١٩٩٧ کاتێ شیعرێکیم لە گۆڤاری (بینین)دا خوێندەوە، زۆر پێمخۆش بوو. ڕاستییەکەی داوام لێ کرد ئاخۆ ناکرێت شیعری دیکەیش بنووسێت. ئەو وای زانیبوو من داوای شیعرێکی تایبەت دەکەم، بۆیە گوتوویەتی دەبێت وەک (ڕێبوار سەعید) پێی بڵێم شیعرێکی چۆن بێت. من دەمویست بیجووڵێنم، تاکو شیعری دیکەیش بنووسێت.ڕوونکردنەوەی زیاتر لەم نووسینەی کاروان کاکەسووردا هەیە، چونکە

کەسانی خۆشەویستی وەک ئێوە، بەدی بێنم، بەو مەرجەی داخوازییەکەیان دیاریکراو بێت. یان لە بابەتێک بیت کە بۆ شیعرێکی ڕۆمانسی دەست بدات، بەڵام پوخت و پالیار بێت، بەو مەرجەی منیش بجولێنێ، واتە بەدڵم بێت.

بۆ نموونە ئەگەر ڕێبوار بیوتایە شیعرێکی جوانم بۆ بنووسە، دیارە هیچم پێ نەدەکرا، چوونکە شیعری جوان، زۆر جۆری شیعر دەگرێتەوە، تەنانەت ڕێبوار لە باتی ئەو هەموو تابلۆیانە، یەک تابلۆی بۆ بهینامایە، کە من بەدڵم نەبووایە، یان بابەتیکی ڕۆمانسی هەڵنەگرتایە...یان..هتد، بێگومان نەمئەتوانی وا شیعریکی بەسۆزی بۆ دانێم.

جا برای شیرینم، ئایا دەتوانی داخوازی خۆتم، بە ڕوونی بۆ بخەیتە چوارچیوەیەکی دیاریکراوەوە؟ تابزانم پێم دەکری یان نا؟

لەگەڵ ڕێزو سوو‌پاس دا

شێرکۆ بێکەس ١٩٩٩/٥/١٠

---

پێشتر نامەکە بلاوکراوەتەوە لە:
http://www.dengekan.com/doc/٢٠٠٩/١١/karwanKakasur٢٧.pdf

**فەرهاد شیرین کوانێ؟**

نامەی ئەحمەدی مەلا بۆ فەرهاد پیربال

فەرهاد شیرین کوانێ، ئەویش گوێی بۆ ئەم موسیقایە هەڵدێرێ؟ شەقام بەفرە و رووباریش هەڵدەلەرزێ، جەستەی ئەمنیش بەفرێ پێراره..شیرین کوانێ..ئەوە دەمەوبەیان ئاوا دەبێ. دوا ئافرەت پێش خۆرنشین جێ ی هێشتم. شەو بە گۆچانیکی سپی یەوە بەرەو پیرم هات..شەو بوو شەو، شەوی شیرین.

پاریس و کوچە و دەوروبەرەکانی دەبنە لەشی ئەرمونیان، دەبنە پەنهان بۆ تۆ و ئەو و ئەوانی تر.

بار: رەش و سپی و نارنجی یە میوانەکانی، موسیقاش. شیرین کوانێ گوێ بۆ داروخانی بەفر و هەرەسی ووشە هەڵدێرێ. فەرهاد ! فەرهاد! شیرین کوانێ .

ئەتۆش یە قەفی سمیلی تاریک و جگەرەی باریک و پالتۆیەک بۆرەوە لە میهرەبانی و عەشق و شیرین و گەرێ ی. ووریا بە ووریا! ئەم زەمەنە زەمەنی نە شیعر، نە ووشە، نە جوانی. کوچەیەکی میهرەبان بگرە و شەق لەبەرد و دەرد و شیعر هەڵدە..برۆ..بگەڕیوە سەرەتای کوچە. شاعیرانە گۆرانییەکی بیدەنگ لەبۆ بەرد و لە بۆ دەرد و لە بۆ شیعر بچرە.

**دەمەوێ بە دزیەوە بژیم!**

نامەی ئەحمەدی مەلا بۆ فەرهاد پیرباڵ

ئەحمەدی مەلا ٩١/٢/٨

فەرهادی خۆشەویست سەعات سێ و نیوی بەیانی یەک شەممە

ئەم ژیانە بێ ڕۆحە، سەرەڕای چاوقایمیمان ملمان شۆڕ دەکاتەوە. هیوادارم تێبگەی بۆ وا دەڵێم! تووشی بێدەنگی هاتووم، ئەوانەی لە دەورووبەرم دان، رستە هەزار و دووبارەبووەکان دەڵێنەوە و منیش دەمەوێ رستەیەکی نوێ بڵێم. بەڵام چی بێت؟ ئەویش دەبێتە رستەیەکی بی دەنگی.

راستە دەنووسم، ئایا نووسین بەرەو بێ دەنگی نامان بات.

ژیان دەبێتە چەندین بۆچوون نەزەری لە مێشکم دا و وردە وردە مشت و ماڵ دەبن و هیچی تر. تا دێت تەنها دەبم. بۆچی تەنهام؟ ئایا کەسیک نییە لە نزیکەوە لە حەماقەتەکانم بگات. ئەوەی راستی بێت، دەمەوێ بە دزیەوە بژیم، ئەمەش کارەساتیکی راستەقینەیە. هیوادارم لەم رستە یەک لە دوای یەکانە زویر نەبیت، چونکە سانتێزی کۆمەڵی پرسیاری جوداوازن و وا پەرت و بڵاوی دێنە ژێر نووکی پێنووسەکەم و دەمەوێ بۆ تۆی بنێرم.

چونکە ئیمڕۆ و ئەمشەو، لەگەڵ یەکێک باسی تۆم کرد. هەندەم زانی کە لەسەر پەیژەکان (...) داوەزیت و نوشیتایتەوە سەر زەوی و هەندێ پووشی پەلاشی هیچ و پوچت هەڵگرت و ئیعلانی ئەوەت کرد کە عاشقی. من لە ناخەوە لەم عەشقە بێ مانایە تێ دەگەم، لە ناخەوە دەزانم ئەم ژیانەی ئیمە هەندەش ناهێنێ بچەمینەوە سەر زەوی بۆ ئەوەی بە دیلەکەی هەڵگری،واتە: هەندێ پووش و پەلاش.

- پێویسته بکەویته سەر ڕێ ی ڕاست، واته بگەڕیتەوه کوردستان. بۆ ئەوەی به تەواوی ڕووت بیتەوه.

دڵم خۆش نی یه.

ماچێکی گەرم

برات ئەحمەدی مەلا

**ئەحمەدی خانەم، وا لە خانەی ئیوە.**

نامەی ئەحمەد شوکری 'دکتۆر شۆ" بۆ عیزەدین مستەفا

سلێمانی ٩٧٩/٢/١٠

بۆ ئازیزم دکتۆر عیزەدین تەماشای کات

دور بن لە تاڵ و ترشی بژین بە خۆشی احمدي خانەم وا لە خانەی ئیوە. ریزم بۆ هەڤالە باشەکانت.

ئەوا ئەم پێنج تاکي یەم بۆ ناردون ئەتواني دکتۆر عیزەدین بینێرن بۆ عیزەدین لەسەرەوە.

لێ خورپي گەل هیچ و پووچە عیزەدین

ئاخ لە دەس سەرداری پیس و نائەمین

خائیني خوي نایەڵي رزگار ببین

تا دەخەڵ مابێ چلون سەربەست ئەژین؟؟

لەعنەتی حوا بێ لەبەدخوي سەرزەمین

ئیتر ریک و پێکي تان ئاواتەخوازم.

وەلام گەیشتن بدەنەوە تکایە.

**نامە پیرۆزەکەتم، پێرێ پێ گەیشت.**

نامەی ئەرخەوان بۆ شوکریە ڕەسول

هاوڕێ نازدارە شیرینەکەم شنە گیان

چەپکە سڵاوێکی رازاوە ئەکەم بە دیاری ئەم نامەیە... سڵاوێک کەلەگەڵ ئەشکی خەما لە ناخی دڵی پڕ خەم و نائومێدیمەوە هەڵقوڵابێ.. سڵاوێک کەلەبەهاری لای من پاییزی کوردستانەوە هەڵفڕێ بێ..سڵاوێک کە هەتاهەتایە تاجێکی درەوشاوەدار بێ بەسەر سەری هاوڕێیەتیمان و خوشکایەتیمانەوە..

هاوڕێ شیرینم شوکریە ئەو نازناوەی سەرەوەش کە بە رێکەوت بەر نووکی خامەی لە کار کەوتووم کەوت هیوادارم پەسەندی کەیت..

لەم کاتەدا ئەم نامەیە بۆ تۆ ئەرازێنمەوە
لە ژیانی پڕ ئەندێشە و خەمی ئێستام
هاتومەتە دەرێ بە باڵی یادگار و خۆزگە
بەسەر
گوڵشەنی یادگاریدا ئەسوڕێمەوە ئەو
گوڵشەنەی هەر گوڵیکی
یادگاریەکی جوانە و شیرینە هەر
گوڵیک خەوێکی خۆشە کە لە
خۆشی هاوڕێیەتی رابردوومان‌دا بینیومانە
پڕە لە قاقای پێکەنین و قسەی پچڕپچڕی مناڵیمان کە وەک
پەپولەیەکی بێ خەم لە شاری جوان و رازاوەی سلێمانی دا
ئەگەراین.. بەڵام ئاخ .. هەزار ئاخ بۆ ئەو رۆژانەی زۆر زوو
ئاوابوون و نەمان دینوە..

ئەو رۆژانی پەلی کامەرانی خێوەتی سەر هەڵدابوو، سروەی شەماڵی خۆشی و بەختیاری باوەشێنی ئەکردین.. ئەو کاتە بێ ئەوەی برۆین بەدوای کامەرانی

دا هەمیشە کامەرانی لامان میوان بوو. کەچی ئێستا ڕۆژو شەو بێ وچان بە دوایدا ئەگەڕیم هەتا تروسکەیەکیش لە دوورەوە بە دی ناکەم... باڵی ڕەشی تەم و نائومێدی و دووری خۆی کێشاوە بەسەر ئاسۆی ژیانمدا و بۆ هەمیشە ڕەشی کردووە تەوقی دەستی مرۆڤانی تێنەگەشتووی سامان ویست لە گەردنی بەختیاریم ئاڵاوە لەو باوەڕەدام هەتانەی خنکێنی لێ ی نابێتەوە.. جا بۆیە منیش هەر لە ئەمرۆی ژیانمەوە گریانە پیشەم هەتا سبەینێ ی دوور و رەش دایەت.. ئەزانی هاوڕێ ی شیرینم کە بۆ خۆم ناگریم؟ بۆ ئەو گوڵە ئاڵە گەشە ئەگریم کە لە توتڕکی هەژاریدا ڕوواوە و ناتوانم ئاوی بدەم، بومەتە هۆی ژاکان و سیس بوونی ئەو گوڵە بە جۆرێ بۆیان باس کردوم کە هەموو ژیانم لا تاڵ و تاریک بووە... ویژدانم ئازارم ئەدات.. دڵم ئەسووتێنێ چونکە هەست ئەکەم تاوانبارم بومەتە هۆی سزا و ئەشکەنجەی گوڵێکی ناکام و نەشکوفتە لە گوڵشەنی بەهار دا زەرد و ژاکاوم کردووە..چۆن نەگریم شەو ڕۆژ تا بە جۆگەی ئەسرینی دیدەکانم، لافاوێکی بەهێز هەڵبستێنم کە کۆشکی زۆرداری و پارەپەرسیتی وێران بکات.. چۆن بە هەناسەی ساردم ڕەشەبایەکی وا هەڵنەکەم، کە ڕەگ و ڕیشەی داری ڕەوشتی چەپەڵی پول و پارە لە بێخ هەڵ بکەنێ.. چۆن نەسوتێم وەک مۆم بە خۆشەویستییەک کە گشت گۆشەیەکی دڵمی گرتووە و تەنیوە.. هەر ڕێگایەک ئەگرم بۆ دەرچوون لێ ی یەک لە یەکی سەخت تر و پر ئەندێشە ترو ئەستەم ترە..

هاوڕێ ی شیرینم بێزار مەبە لە ووتەکانم، چونکە دڵم بۆتە دەریایی ئەم جۆرە باسە ئەمیش تەنیا دڵۆپێکە بۆ تۆی ئەنووسم، بۆیە ئەمەشم بۆ نووسیت، زۆر ترسم هەیە کە گوڵی هیوای منت لە ئاهەنگی نەورۆز دا ناهومید کردبێ لەسەر قسەکەی خۆت کە ووتت لە یەزدان ئەپاڕیمەوە کە کارێکی وات نەکردبێ(.........).

هاوڕێ خۆشەویستەکەم: پیرۆزبایی نەورۆزت لێ دەکەم لەگەڵ پیرۆزبایی ئەو بەشە جوانەی دیت لەسەر شانۆی کوردایەتی..هەواڵم زانی کە تۆ لەناو هەموو ئەستێرەکاندا وەک مانگ چواردە درەوشەدار بووی... هیوام وایە.. هەر وا

درەوشەدار بی.. لە هەموو کوڕ و ئاهەنگێک دا بە راستی شایەنی سەربەرزی و شانازیە بۆ هاوڕێ ی دلسۆزت.

شکری گیان: نامە پیرۆزەکەتم پێری پێ گەیشت زۆر بەختیار بووم.

هەوالی باوکت: زۆر بەیانی لە ڕێ ی قوتابخانە پێم ئەگات هەر لە دوورەوە پێ ئەکەنی.کە ئەگەمە بەردەمی ئەلێم چۆنی ئەویش ئەلێ ئای سەلامەت بی..بەخێربێ ی..ئینجا هاوڕێ کانم پێکەنین ووتیان بۆ کوێ بەخێر بێت..دلنیابە سووپاس بۆ یەزدان زۆر باشە بەخوا جوانیش بووە شوکر..

ئێستا ئێوارە بە کات ژمێر (٧)رۆژی شەم ٦-٤-١٩٦٩ ١٧-١-٢٥٨١ کوردی بارانێکی بەخۆڕ ئەباری ئاسمان بەرگێکی ڕەش و مۆنی پۆشیوە و کزە بایەکی سارد دێت جارجار هەورە تریشقەیەک ئەدا و خورەمی باران بە خوڕ بەسەر بووکی سروشتا ئەگری وەک ئەوەیە هاوبەشی منە لە خەم گریان دا..

شەوی ئاهەنگەکە بە رادیۆ گوێم لێ بوو هەموویم تسجیل کردوە هەتا تەواو بوو سەعات دوو نەنووستم هەر ئەم ووت خۆزگەم بە شوکری ئێستا لەوێ یە بڕوا بکە لە بوردەیەکدا دەجار وام ئەوت پاشان مالەوە ووتیان ئەبێ بنووی، وتم ئەگەر بنووم خەو مەرگم بێ..بەلام تەنیا ئاواتم ئەوە بوو کە لەلات بوومایە و بەشداربوومایە.. هیوادارم زۆر بە خۆشی لێتان ڕۆشتبێ چەپکە سلاوی منت پێشکەش کردبێ (هەرچەندە بڕواش ناکەم)

ئیتر بەرزیت هیوامە

## جیگەی داخە کە..

نامەی ئەسترید لیندگرێن بۆ ئەنوەر قادر

ئەنوەر قادری خۆشەویست

سوپاس بۆ نامەکەی رۆژی ٢١ی جانیوەرت . جیگەی داخە کە تۆ پێش ئەوەی دەست بکەیت بە وەرگێڕانی "مێومێوکەی من"[١] بۆ کوردی، هیچ پرست پێ نەکردووم. بە داخەوە من ناتوانم مافی لە چاپدانی کتێبەکەت بدەمێ، لەبەر ئەوەی پێشتر مافی بڵاوبوونەوە "واتە وەرگێرانەکەی بۆ کوردی" یمان فرۆشتوە بە کۆمەڵەیەکی کلتوریی کوردی لە (سپۆنگا). بەلاّم لەگەڵ ئەمەش دا گرنگ ئەوەیە کە منداڵی کورد دەرفەتی دەستکەوتنی کتێبەکەی بۆ برەخسێ.[٢]

هیوام وایە.

---

[١] پاشتر ئەم کتێبە بلاو بوویەوە بە زمانی کوردی بروانە:
ئاسترید لیندگرێن، مێو.. مێوەکەی من، و.ئەنوەر قادر محەمەد، بەرێوەبەرێتی گشتی چاپ و بلاوکردنەوە، سلێمانی ٢٠٠٣.
[٢] ئەم نامەی بە زمانی سوێدی نووسراوە.

**له کۆتایی نامەکەشدا، ژمارەی سندوقی بەریدی خۆتان نوسیبوو.**

نامەی ئەنوەر سوڵتانی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

P.O.BOX 4043
London SW6 2XI
ENGLAND.
29 / 6 / 94

بۆ مامۆستای بەڕیز کاک محەممەدی مەلا کەریم

لەگەڵ ڕێز و سڵاوی زۆرمدا هیوای لەش ساغی و سەرکەوتنتان بۆ ئەخوازم و دەستی مامۆستای خۆشەویست جەنابی مەلا عبدالکریم ماچ ئەکەم.

کاکە حەمە گیان،

من ماوەی دووسێ ساڵ لەمەوبەر نامەیەکم ناردە خزمەتتان لەمەڕ مەسەلەی کەشکۆڵە شیعرێکی هەورامی کە لێرە- لە لەندەن پارێزراوە و شیعری لە سی چل شاعیری گۆرانیدا تێدا کۆکراوەتەوە. عەرزیشم کردی کە کۆکەرەوەی شیعرەکان "شێخ عبدالمؤمین"ی مەردۆخی یە و لە ساڵی ١١٩٧تا ٩٨ ی کۆچیدا شیعرەکانی نووسیوەتەوە.

بەختەوەرانە، چاوم بە وەڵامی نامەکە ڕوون بووە کە گەورەییتان نواندبوو و لە لایەن مامۆستای بەڕێز مەلا عبدالکریمەوە بۆتان نوسیبووم. لە کۆتایی نامەکەشدا ژمارەی سندوقی بەریدی خۆتان نوسیبوو کە ئەمەم بە واتای ڕەزامەندیتان بۆ نوسینی نامە لەلایەن خۆمەوە وەرگرت و نووسینی ڕاستەوخۆی ئەم نامەیەش بەهۆی ئەو بۆچونەوە بوو، تکایە لێم ببوری.

کەشکۆڵەکە، ژمارەیەکی زۆری شیعری بێسارانی تێدایە کە هەموو لەژێر ناوی "مەحزونی"دا هاتوون. مەیجەرسۆن لە ساڵی ١٩٢١ و مەکەنزی لە ١٩٦١

ژمارەیەک لەو شیعرانەیان بەناوی مەحزونی یەوە وەرگێڕاوەتە سەر ئینگلیزی و چاپیان کردوون. مینۆرسکی لە ١٩٥٧ دا (وتاری گۆران)، کەسایەتییەکی سەربەخۆی داوە بە مەحزوونی و ناوی ئەوی جیا لە ناوی بێسارانی هێناوە. مامۆستای کۆچ کردوو علادین سەجادیش بە ڕواڵەت هەمان بۆچونی ئەو کاری تێکردوە کاتێ لە بەشی باخچەی شاعیرانی مێژووەکەی خۆیدا هەمان ژین نامەی بۆ مەحزونی هێناوەتەوە و لە بێسارانی بە جیاواز زانیوە.

لە لایەکی ترەوە، دوو برادەری ناوخۆی وڵات (هەردوو لە زمان مامۆستای خوالێخۆشبوو سەید طاهیری هاشمی یەوە) بۆیان نووسیوم کە بێسارانی و مەحزونی هەر یەک کەسن و مەحزونی نازناوی بێسارانی بووە.[1]

تکاتان لێ دەکەم لە وەڵامی ئەم نامەیەدا پێم بفەرموون راتان سەبارەت بەو بۆچونە چییە و ئایا بەڵگەیەک بۆ یەک بوون یان جیاواز بوونی ئەم دوو کەسایەتی یە بەدەستەوەیە یان نا؟

داوای لێبوردنتان لێ دەکەم و بۆ هەموو خزمەتێک ئامادەم

بچوکتان

ئەنوەری سوڵتانی

---

[1] وردەکاری لە پێشەکی ئەم کتێبەدا, لە بارەی ئەم دەستنووسانەوە هەیە.

**ئایا ئەوسێ بەرگ کتێبەی،**

**بە جەنابی شێخ ناصح دا ناردبوم، گەیشتنە جێ؟**

نامەی ئەنوەر سوڵتانی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

ئەنوەر سوڵتانی بۆ کاکە حەمە

١٩٩٨/١٠/٢١

مامۆستای بەڕێز

بەوپەڕی ڕێز و سڵاومەوە. کاک نوری تەلەفۆنی کرد و سەبارەت بە دوو شت قسەی بۆ کردم:

یەکەمیان کۆپی لاپەڕەی کتێبەکەی د. فوئاد لەمەڕ شعری شێخ ڕەزا و دووهەم لەسەر مەسەلەی سەفەری جەنابت.

سەبارەت بە کۆپی لاپەرەکان دەبێ بڵێم حەوتوویەک دوای ئەوەی نوسخەیەکم بۆ کاک نوری نارد نوسخەیەکیشم بە هەمان ئەدرێس بۆ جەنابت بەڕێ کرد، کە دەبێ تا ئێستا گەیشتبێتە خزمەتتان. من لەم ماوەیەدا لەگەڵ پۆستەی بەغدا موشکیلەم هەبووە و نامەی "مسجل" ی مامۆستا محمد علییش گەڕایەوە دەستم. جا تکایە ئەگەر ئەو نوسخەیە نەگەیشتۆتە دەستان ئاگادارم بکەنەوە بۆ کۆپییەکی دیکەتان بۆ بنێرم. ئەوەندەی من سەرنجم دابێ جگە لەو ٣ نوسخە کەشکۆڵەی بەرلین، لە نێو کتێبەکانی ئۆسکارماندا هیچ لەسەر شێخ ڕەزا نییە خۆ لە بەریتانیاش ئەوەندەی من بینیومە شتی ئەوتۆ چنگ ناکەوێت.

لەمەڕ تەشریف هێنانی خۆتان بۆ ئێرە، دیارە ئەوە ئارەزومە و بە ئاواتەوەم سەر بگرێت. لەگەڵ برادەرانیشدا قسەم کردووە ناردنی نامەی بانگهێشتی گەلیک هاسانە بەڵام گرنگ ئەوەیە لەوێ خەتمان بخوێننەوە و بە قسەمان بکەن. وەک شەخس من نەک هەر ئامادەم بەڵکوو منەتباریشم دەعوەتنامە بە ناوی خۆمەوە بنێرم و بنوسم و مەسرەفی هات و چۆ و مانەوەش لەسەر من بێت بەڵام

بانگهێشتی تاکەکەس سەرکەوتوو نابێت مەگەر خزم و کەسو کاری نزیک بێت. ئەگەریش ببێت، دەبێ خەڵکانی پارەدار حیسابی بانکیان دەوڵەمەندە بیکەن.

بانگهێشتی هەندێ لایەنی وەک مەڵبەندیش هەر گونجاوە، بەڵام موشکیلەی ئەویش ئەوەیە کە ناتوانێ بڵێ مەسرەف وپیتاکی لەئەستۆی من. ئایا ئەگەر ئێمە لەوانەوە نامە وەربگرین بۆ مەسەلەی مەسرەف دەبێ چ بکات؟ ئەگەر بڵێ لەسەر خۆیەتی، ئەوا ئەو کارە بۆ جەنابت موشکیل دەبێتەوە کە وا هەیە داوات لێ بکەن پارەیان نیشان بدەی. نازانم ئەگەر مەڵبەند بیکات و بڵێ مەسرەفە هاتوچۆو مانەوەی لەسەر فلان کەسێکە (بۆ نموونە، خۆم) و ئەو کەسەش نامەیەکی لەگەڵ بخات و مەسرەفەکە بگرێتە ئەستۆ، ئەم شیر بۆ داپیرەدایە سەردەگرێت یان نا؟ بەڵام ئەوەش ئیحتیمالێکەو دەبێ بیری لێ بکرێتەوە. ڕێگەی سێهەم کە لە هەموان سەرکەوتوتر دەبێت ئەوەیە لایەنێکی سیاسی ئەم بانگهێشتنە بکات. ئەو لایەنە سیاسیە کوردەش یەکەم واهەیە جەنابت پێت خۆش نەبێت ودووهەم ئەوەی کەسیکی وا جوامێریان تێدا هەبێت و کاری وا بکات!

تکام لە خزمەتتان ئەوەیە کە ڕای خۆتان لەسەر ئەو شێوازە جۆربەجۆرانە ڕوون بکەنەوە. دیارە هاسانترین ڕێگا ئەوەیە خۆم نامەی بانگهێشتتان بۆ بنێرم وئەوەش لە ماوەی سەعاتێکدا دەکەم، بەڵام بۆ ئەوەی شتەکە شیاوی سەفارەت بێت، پێویستە ئادرێسی جەنابت لە نامەکەدا بنووسم دیارە ئادرێس صندوقی بەرید بۆ شوێنی دا شیاو نییە و ئەگەر ویستتان نامەکەم بەڕێ بکەم تکایە ١) ناونیشانی خۆتان ٢) ناونیشانی سەفارەی بەریتانی لە عەممان ٣) ئادریس و ڕەقەم تەلەفۆن و ناوی کەسێک لە ئۆردەن کە سەفارەت بتوانی پەیوەندی پێوە بکات و مەوعید بۆ موقابەلەکەتان دابنێ، بۆ من بنێرن تا دەست بەجێ هەمان ڕۆژ نامەکە ئاراستەی ئەوان بکەم و نوسخەی بۆ جەنابیشت بنێرم (یاخود بۆ هەر شوێنێک کە پێتان باش بێت).

ئەگەریش ڕێگەکانی یەکەم و دووەم واتە بانگهیشتنی مەڵبەند یان ڕیکخراوەیەکی سیاسیتان پێ باش بێت ئەوا تکایە ئاگادارم بکەنەوە. ئەمشەو

لەگەڵ کاک کەماڵ باوکی نەبەزیش قسە دەکەم بزانم ئەوان هیچیان لەدەست دێت؟ ئەگەرچی زۆریش لێیان بێ هیوام.

وا ئەمشەو قسەم لەگەڵ کاک کەمال کرد. ناوبراو بڕیارە سبەینێ بە تەلەفۆن قسەتان لەگەڵدا بکات و لە بنکەی ڕاگەیاندنی کوردییەوە نامەیەکی بانگهێستن بنێرێتە خزمەتتان وەک ئەو باسی دەکرد هۆی بانگهێشتنەکە، وتاردان و باسی ئەدەبی دەبێت. جا نازانم بارودۆخی ئەوێ بۆ کاری وا چۆنەو ڕای جەنابت چ دەبێ. بەڵام هیوادارم هەر لەو تەلەفۆنەدا پێک بێن و لێرە بتوانین دەست بەکار بیین، دیارە خەمێک لەمەڕ مەسرەف و مەسەلەی هات و چۆ نییە و ئەوانە بە باشی جێ بەجێ دەکەین. ماڵی دۆست و برادەری خۆشتان ئەوەندە زۆرە کە وا هەیە من بکەومە کۆتایی لیستەوە.

بە هیوام زۆر زوو بە هەواڵی جێ بەجێ بوونی کارەکە بزانم. و لە ڕێگەی کاک کەماڵەوە بۆچونی جەنابتان سەبارەت بە مەسەلەکە دەزانم.

ئایا ئەوسێ بەرگ کتێبەی بە جەنابی شێخ ناصح دا ناردبوم گەیشتنە جێ؟

لەگەڵ ڕێزدا

ئەنوەر

نامەی ئەنوەری سوڵتانی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

مامۆستای گەلێک بەڕێزم

لەگەڵ سڵاو و ئیحتیراممدا وا بە خۆشی کتێبی "کەشکۆڵە شعرێکی کوردی گۆرانی" لە چاپ هاتە دەرێ و ڕۆژی ٢/١٨ جەژنێکی بچوک بۆ دەرکەوتنی دەگیرێ کە زیاد ١٢٠ کەسی نووسەر و ئەهلی قەڵەمی ئینگلیز و کورد و بێگانەی تر بانگ کراون. کتێبەکە گەلێک ڕازاوە و جوانە: ٥٠٨ لاپەڕەی A٤، ڕوبەرگی قایم و چوار ڕەنگ، بە شەست لاپەڕەی ئینگلیزییەوە و وێنەی هەموو لاپەڕەکانی دەستنوسەکە هاوڕێ لەگەڵ دەقی تایپکراوی شێعرەکان پێشەکی جەنابتان و کاک ئەمیری حەسەنپوور (بە ئینگلیزی)+ سەرەتای خۆم و ژین نامەی شاعیران.

من لە یەکەم فرسەت دا دوو بەرگی کتێبەکە بۆ جەنابتان و مامۆستا محەممەد عەلی دەنێرم و ئاشکرایە نوسخەیەکیش پێشکەش بە خزمەت جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم دەکەم. بەڵام با بزانین چۆنیان بۆ بنێرم. لە کاک بەختیار و دکتۆر عەزیزیش سەبارەت بە چۆنێتی ناردنەکە دەپرسم.

مامۆستا گیان:

لێرەدا دەمەوێ مەسەلەیەک لە خزمەتتاندا باس بکەم، کەشکۆڵەکە، لە ڕاستیدا دیوانێکی بێ خەوشی شیعری بێسارانیشە. من لەگەڵ چاپخانەیەکی سوێد قسەم کردووە، شیعری خەڵکانی تری لێ هەڵاوێرم و سەرجەمێکی دیوانی بێسارانی پێکبێنم و چاپی بکەم. هۆی ئەم کارەش کە لەدوای چاپ بوونی دیوانی بێسارانی لە سنە دەمەوێ چاپێکی تازەی لێ بڵاو بکەمەوە، دوو شتە: یەکەم دیوانەکە ئامادەو تایپ کراوو هەڵگیراوە، لەبەردەستدایە، چراخ بۆتە چراغ و باقی ئیزافە گەلێک مضاف و مضاف الیەدا نوسراون. وا هەیە هۆیەکی سێیەمیش هەبێت: شێخ عبدالمؤمن مەردۆخی، شیعرەکانی بە گوێرەی بابەت

کۆکردونەتەوە نەک بە پێی پیتی یەکەمی وشەی یەکەم (بەحری ئەلف و....).
ئەوەش بۆ سەردەمی خۆی هیچ تەنانەت بۆ ئێستاش کە کورد هەر بە پێوانی
کۆن، پەیوەندی بابەتیانەی شیعر و ناوەڕۆکیان ناگرێتە بەرچاو، شتێکی نوێیە و
جێی خۆیەتی بە هەمان شێواز بڵاو بکرێتەوە.

بە کورتی: من کە دیوانی چاپی سنەم چاوپێکەوتووە، پێداویستییەکی لە جاران
زیاتر بە چاپی دیوانی بێسارانی لەسەر ئەساسی ئەم کەشکۆڵە هەست پێدەکەم،
بەڵام بەهۆی شارەزایی و لێزانیی جەنابتەوە هەروەها بوونی جەنابی مامۆستا
باوکتان لەوێ و هەروەها بوونی نوسخەی دەستخەتی سەیید لە "دار
المخطوطات" ی ئەوێ کە دەتوانێ پشتگیرێکی بە متمانە بێت بۆ ساغ کردنەوە و
ڕاستکردنەوە، وای بە باش دەزانم ئەگەر جەنابتان رازی بن و کاتتان هەبێت،
ئەم کارە پێکەوە بکەین واتەشیعرەکانی بێسارانی لە کەشکۆڵەکە دەربێنین،
لەگەڵ نوسخەی دەستنوسی مامۆستا سەید طاهیری ڕەحمەتی کە لای من هەیە
و نوسخەی سەیید لە دارالمخطوطات و هەروەها نوسخە گەلێکی دیکە کە
واهەیە لای جەنابت هەبێت یا دەستتان بکەوێت، بەراوردیان بکەین.
ئاڵوگۆڕەکانی بێتەوە سەر کەمپیوتەر و لە کۆتاییدا دیوانەکە بە پێشەکی
جەنابتانەوە لە چاپ بدرێت. بۆ مەسەلەی چاپیش دەکرێ جەنابتان لەوێ هەوڵی
بڵاو کردنەوەی بدەن بەتایبەت کە مەسەلەی پیت چنین و ڕازانەوەی لاپەڕەکان
لەسەر منەو مەسرەفێکی بۆ کەس نییە. لام وایە هەموو چاپخانەیەک بەم کارە
ڕازی ببێت و خۆ ئەگەر بەشداری کردن و یارمەتیەکیشتان بوێت وا هەیە بەپێی
شەرت و قەرار، ئەم یارمەتییەش هەر لەم لایەنە پێک بێت. نیازم ئەوەیە ئەم
کارە یەکەم بە بەشداری پسپۆڕێکی وەک جەنابتان بکرێت و دووهەم
نوسخەکانی لە وڵاتدا بڵاو ببنەوە چون ئەگەر لێرە چاپی بکەم وا هەیە جگە لە
دە دوازدە نوسخە نەگاتەوە وڵات ئەمەش ناتەواوییەکی زۆرە بۆ چاپی کتێب.
سپاستان ئەکەم ئەگەر بۆچونی خۆتان لەسەر مەسەلەکە ڕابگەیەنن، لەگەڵ
ڕێزماندا.

**به كوردیی له دایكبوون، خۆی له خۆیدا گەورەترین شیعره.**

نامەی ئەنوەر قادر محەممەد بۆ شێركۆ بێكەس

كاكه شێركۆ!

سڵاو و ڕێزی بێ پایان..

دوو نامەتم تا ئێستە بە دەس گەیشتووە، یەكێكیان لە سووریاوە بە دەستی كاك تەهادا ناردبووت، لەم ڕۆژانەشدا ئەوەی سویدت. بە داخەوە! نامەی فلۆرەنساتم پێ نەگەیشتووە. پێشەكی لە دڵەوە پیرۆزبایی ئەم نرخ لێنان و پاداش پێدانەت لێ ئەكەم، بێ گومان سەدایەكی چاكە بۆ ئەدەب و سەرجەم مەسەلەی میللەتەكەشمان، زۆر پیرۆزبێت و لە جێگەی خۆیدایەتی. ئەگەر دەرفەتیش پەیدابوو سووكە وتارێكی ئیعلامی لەسەر ئەنووسم، هەرچەندە لێرە شتی وا زەحمەتە! ئەوەی نامەكە لە ئەمری ئیداری و شتی وا ئەچێ، بەڵام هەر ماڵیان ئاوابێ! بە ڕاستی سوید وڵاتێكی ئینسانی و پیاوانەیە.

كاكه شێركۆ! ڕەنگە پێویستی بەوە نەبێت بۆت بنووسم، چەنێ یادت دەكەم. ناوبەناو لەملاولا و دووراودوور هەواڵ و دەنگوباستم زانیوە. تا لە ناوشاریش بوویت، بەرهەمە بڵاوكراوەكانتم ئەدی. وەختێ خۆی هۆنراوەی ((فوڕات و چەند هۆنراوەیەكی خەمگین))[1]م كردە عەرەبی و لە (سقافەت ئەلجەدیدە)[2]دا بڵاومكردەوە و وەرگێرانەكەشیان بەدڵ بوو.

ئەڵبەتە خۆشت دیوتە. بەرگێكی كەشكۆڵەكەشتم دیوە، نازانم لەچییەوە دەست پێ بكەم؟! چونكە ئێمە پتر لە هەشت ساڵە لێك دابڕاوین و هەر كەسەش لە باروزورفێكی جیاوازدا ژیاوە، تەنانەت بە پاریزەوە ووشە و ڕستە هەڵئەبژێرم

---

[1] ئەم هۆنراوەیە لە دیوانی ڕەنگاڵە دا، ١٩٧٤ بڵاوكراوەتەوە، بڕوانە:
شێركۆ بێكەس، دیوانی شێركۆ بێكەس، بەرگی ٢، سوید ٢٠٠٩.

[2] گۆڤاری الثقافة الجديدة، كە ئۆرگانی حیزبی شویعی عێراق بوو، لە هەشتاكاندا لە دیمەشق دەردەچوو.

نەوەکا دڵگیرت بکەم. نازانم هەرچەندە من تۆ هەر بە براگەورە و دۆستە گیانییەکەی جارانم ئەزانم، بەڵام وەخت و ڕۆژگاریش، دوورکەوتنەوەش کاری خۆی هەر ئەکا. لە لایەکەوە تۆ لەواقیعەکە و لە ناو ئازار و کارەساتەکاندا ژیاوی، کورد واتەنی: ((وەکو پیاوە خوێن گرتووەکە...)) منیش لەم غەریبی و ئاوەرەییەدا و دوو لە وڵات و نەتەوە.. هەرچەندە ڕووس قسەیەکیان هەیە، دەڵێن: (( لە دوورەوە و لە کەنارەوە شتەکان و ڕووداوەکان چاکتر و هەمەلایەنە دەرئەکەون)).. باوابێ! بەڵام باوەڕ بکە ((غیاب))ەکەی من ((حزور))ێکی هەمیشەیی بووە. سەرەڕای ئەو ئازار و دەردی سەری و کوێرەوەرییانەی وڵات، من هەموو دەمێ خەریکی سەرزەنیشتی خۆکردنیش بووم، خوا نەخواستە! مەبەستم ئەوەش نییە، کە تۆ و ئەو کەسانەی لە وڵاتدابوون قەرزاربار بکەم، چونکە من هەمووکاتێک هەر ئەو کەسانەم لا ڕاستگۆترن، با جیاوازی بۆچوونیشم هەبێ لەگەڵیاندا. بە تایبەتیش ئەوانەی لە شارەکاندا و لە بەردەستی دووژمندا ماونەتەوە، نەک هەر خۆشیان نە دۆڕاندووە، بەلکو قەڵەمەکەیان بۆ بەرگریی لە کلتور و بوونی نەتەوەییمان هەمیشە لە کاردایە. هەموو ساتێکیش چاوەڕێ ی سەرنگوم کردنن، لە خوێندنەوەی نووسینەکان_ بەرهەمەکانیاندا، ئەم کۆپلیتەی ئیلینا بۆنۆی ژنەشاعیری ئیتالییاییم دێتەوە یاد:

هەمو مرۆڤێ دەبێ ئێرەیی بە ئێوە بەرێ!

ئای کە شیرینە! مرۆڤ پێرەوەی یاسایەک بکات،

تا ئێستا هیچ دەستێ نەینووسیبێ..!

ئای کە خۆشە، بۆ ئەوینی دڵت بمری..!

ئێوە لە کەژەکاندا ئەهاتن و ئەچوون

کەس ڕایەکی نەئەکەوت، ڕێگە گیرتان بێ،

ئازادی لە لووتکەی چیاکاندایە،

ئێوە لاوچاک و قۆزترین کەس بوون،

بۆیە لەوێ مانەوە...!

کاکی خۆم! ئەم ژیانی دوورە ولاتی و غەریبی یەش، بۆ یەکێ بیەوێ، ئەتوانێ سوودی باشی لێ وەربگرێ. بۆ من زمانی رووسی، ئەدەبی ڕووسی پەنجەرەیەکی گەورەن..کێ هەیە لاری لە دەوڵەمەندیی ئەدەبی ڕووسی هەبێ؟! ڕاستی یەکەشی شارەزابوون لەم ئەدەبە، منی ماوەیەکی زۆر یەخسیر و داماوکردبوو، بێ گومان مەبەستم لە ئەدەبی کلاسیکییانەیە بە مەفهومە فراوانەکە، کە مایکۆفسکی و یسینین و بلۆکیش دەگریتەوە، مەسەلە(...)نی یە، بەلام ڕووسی زانینەکەی من، وەکو ئەوەی دکتۆر کاوس و کتێبەکەی مایکۆفسکی نی یە! بەڕاستی نەک هەر من، ئەم شارەی ئێمە، کۆمەڵێ لاوی کوردی لێیە هەموو کوڕی یەکی یەکی و جافی سینەسافن، سوودیکی باشیان وەرگرتووە. زۆربەشیان ئەدەبدۆستن و قەلەندەرخانەکەی منیان کردۆتە کتێبخانەیەکی بچکۆلە و منیش گەلێ بەوە چاو و دڵم ڕوونە. هەرچەندە لە سیاسەتدا جیاوازیی بیروڕایان هەیە، بەلام وامان کردووە، تەنانەت لە کاتی کوشت و بڕەکانی کوردستانیشدا، ئێمە کوردایەتی یەکەمان خستۆتە سەروو هەموو شتێکەوە.

لەم ئەورووپایە، پیاو تووشی بە تووشی مرۆڤی کوردی وا سەیروسەمەرەوە ئەبێ و هەر مەپرسە! ئەبێ شایەتمان بە شانی ڕەخنەگرە چەقۆکێشەکانی لای خۆمان بهێنی... بەلای کەمەوە لەم ولاتەی لای ئێمە دیاردەی وا کەمن. ڕەنگە بیستبێتت زیاد لە ساڵ و نیوێکە خوێندنم تەواوکردووە. ئەم سالانە لەگەڵ مەولەوی و سۆفیزمدا ژیاوم[1]. زۆر لەگەڵ مەولەویدا ماندووبووم، چونکە خۆت ئەزانی چ دونیایەکی بێ بن و چ دەریایەکی بی کەنارە! لە کاتی داکۆکییەکەمدا،

---

[1] مەبەست لە تێزی دکتۆرایەکەیەتی، لە بارەی مەولەوییەوە بڕوانە:
ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد (مەولەوی) بە دیالێکتی گۆرانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی سێیەم، ٢٠٠٧ سلێمانی.

گەلێ ڕژهەڵاتناسی و زانای گەورەی سۆڤییەتی، شیعری مەولەوییان (بە لووتکەیەکی بەرزی ئەدەبی ئینسانی دوورگەیەکی شیرین و بەش بە حاڵی ئەمان تازە دۆزراوە) ناو برد. تا ئێستە بە ڕووسی (ئەزانم وەک فارسییەکە ئەڵێی دەک پێ نەگەی!) پێنج وتارم لەبڵاوکراوەی مەعهەدەکەماندا لەسەر بڵاوکردۆتەوە، سەرجەم نامەکەشم پێشنیاری چاپ کراوە. بە داخەوە! بۆ مەسەلەی ئەدەبی سەردەم، لێرە گیروگرفتی بڵاوکردنەوەی هەیە. لەلایەکەوە سیاسەتەکە و لەلایەکی تریشەوە سۆکە وسۆک و خۆبردنە پێشەوە(ی) ئەوێ. کە ئەزانی بە من ناکرێ. ئەمتوانی شیعری خۆم بە ڕووسی بڵاو بکەمەوە، بەڵام من لام وابوو، ئێستەش هەر لەو باوەڕەدام، بەبێ نووسینی ووتارێک و بێ شیعری تۆ و لەتیف هەڵمەت و فەرهاد(شاکەلی) و کەسانی تر. شیعری خۆبڵاوکردنەوە، لە خۆپەرستیی بەولاوە شتێکی تر نابێت. لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا لەگەڵ چەند کوردناسیکی کوردو سۆڤییەتدا فەرهەنگێکی ڕووسی_ کوردی ٣٠ هەزار وشەییمان داناوە، لەم ماوەیەدا، ڕەنگە بدرێتە چاپخانە. هەرچی نووسینی شیعریشە دیوانی دووەم_ زایەڵە[1]_م ناردووە بۆ فەرهادی برام، د.شۆ واتەنی بۆ ئەوەی بۆمی لە چاپ بدات.

بە ڕاستی نووسینی ئەتروحە بە زمانی ڕووسی و کارووباری ڕۆتینی داکۆکی کردن بڕستیان لێ بڕیبووم، دووایش ئەم قامووسە. واماوەیەکە کەوتوومەتە سەر نووسینی خۆمانە. کۆمەڵێ وەرگێڕانم ناردووە بۆ لەندەن و لای ئێوە بۆ بڵاوکردنەوە. وتاریکیان لەسەر لێرمەنتۆڤ و هەندێک لە شیعرەکانییەتی، ئەبێ لە ژمارە (٥) پەیڤ[2] بڵاو ببێتەوە. ماوەیەک لەگەڵ (بلۆک)دا تێکچووبووم و بووبوومە برادەری (لێرمەنتۆڤ)، وادیارە دیسانەوە بلۆک بە دنیا سۆفییە ئەفسانەی یەکەیەوە، بۆ لای خۆیم ڕائەکێشێتەوە. سەرجەمی شیعری ئەمرۆمان

---

[1]ئەم دیوانە ساڵی ١٩٨٨ لە سوید چاپ دەبێت و ئێستا هاوتا لەگەڵ یەکەم و سێیەم دیوانی دا لە بەرگێک دا کۆکراونەتەوە بڕوانە:
ئەنوەر قادر محەمەد، زریان و زایەڵە و زنار، وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی ٢٠٠٤.

[2]گۆڤاری پەیڤ ساڵی ١٩٨٧ دەردەچوو.

ڕووی کردۆتە ڕوونی و ساکاری یەکی هونەری، شێکی باشە. ڕەنگە هەر ئەمەش زیاتر لێرمەنتۆڤی لەلا خۆشەویست کردبم.

هەرچەندە زۆربەی شیعری ڕووسی، ئەم سافی و ڕوونییەی تیدایە. بەلام جاروبار ئەو ئاوازە نادیارانەی دەروون، بەرەو ئەو دوورگانەم رائەکێشنەوە، کە (هونەر) خۆی ئەکەنە بەرزترین بەها و نرخی مرۆڤایەتی و شارەمزی جوانی.. من لام وایە بە کوردیی لە دایکبوون، خۆی لە خۆیدا گەورەتین شیعرە..هەر ئەم زامە ئەبەدییە گەورەیەش (یەلّماز گۆنای)ی خولقاند. لەم ڕۆژانەی پێشوودا موخریجێکی تاجیکی ناسراو، کە ژنەکەی کوردە_من لام وایە خۆشی کورد بێ_ هاتە لام بۆ ئەوەی هەندێ کەرەسەی بدەمێ، گۆرانی و مۆسیقای کوردی، چونکە فیلمێکی دەکیومێنت ئامێز لەسەر شاعیری ئێرانیی کرماشانیی بنەچە کورد(ئەبولقاسمی لاهووتی)) دەرئەکات. زۆر لەم بابەتە ئەدەبییانەی دووایـن. ووتی من، کە لە ڤیستیڤالّیکی ئیتالیدا(ڕیگا)م بینی، یەلّماز گونەی دابووی لە کەللەمم، ئەوم لە هەموو ئیتالّیا و ڤیستیڤالەکە لا بەرزتر بوو.. بۆ؟! چونکە هونەرەکەی، هی ئینسانە و میللەتێکی زامدار و چارەنووس ئەفسانەیی یە..

قسە زۆرە و مەودای نامە کورت.

جاریکی تر ئەملاولات ماچ ئەکەم و

سلّاو ڕێز و خۆشەویستی زۆرم بۆت هەیە

برای دلّسۆزتان_ ئەنوەر قادر محەمەد

١٩٨٧\٨\١٣ لینیگراد

ئەمەش تەلەفۆنی بەشە ناوخۆییەکەمانە:

٠٦/٤٤/٥٥٢

ژووری ٦١

## ٤ سرێکە، وەها مەحکومی غموضن؟!

نامەی ئەنوەر قادر محەممەد بۆ محەممەدی مەلا کەریم

کاکە حەمەی هێژاو خۆشەویست.

سلاوو ڕێزی زۆر..

کارتەکەی سەریسال و کتێبەکان و گۆڤارەکانی پێشوو و ئەم دواییەشم بەدەست گەیشتوون، زۆر سوپاس بۆ ئەو هەموو زەحمەتە.

ڕاستییەکەم من دوومانگە لە ماڵەوە لەبەر ئازاری شان و قۆڵ ئیجازەی نەخۆشیم هەیە، دوای چوونە لای دکتۆر و ئەوەی پێی دەڵێن شویکگیمناست هەست دەکەم باش بووم و بە نیازم بگەڕێمەوە سەر کار بەیانی، بزانم چۆن دەبێ؟! ئەم ماوەیەش سێوێ هەلامەتی گرتبوو ئەویش بەنیازە بەیانی بچێتەوە باغچەی مندالانەکەی.. وردە وردە گەورە دەبێ، کوردییەکەی خراپ نییە، بەلام زۆر سەیرە هەورامی واتەنی زوانەکەی بۆ ثویدی فەثیح ترە...! هارو هاجییەکەی لە سنور بەدەرە.

وەکی تریش مەردۆخ هاتۆتە ئێرە، (...). بە هەرحاڵ ئەو وتارەی کە دەربارەی مەولەوی نوسیبووت بۆت ناردبوو، من لێیم وەرگرت. بەدەستمانەوەیە کۆمەڵێ وتار بڵاوبکەینەوە، یەکێکیان ئەوەیە، هەروەها فازیل کەریم وتارێکی چاکی دەربارەی نالی نوسیووە، من شتێکم دەربارەی شاعیرێکی ڕووس تەرجەمەو ئامادە کردووە، هەروەها هەندێ وتاری بەکەڵکی ترە. ئەو برادەرەی وتارەکەتی بە کۆمپیوتەر نوسیوەتەوە پێی وایە ئیملاکەی تۆ لەگەڵ هیچ کام لەوانەی ئێمەدا وێک ناکەوێتەوە تەنانەت جاری وا هەیە خۆشت یەک شتت بە دوو شێوە نووسیووە، بەلام من هەر لە هەوەڵەوە پێم گووت، کە چۆنی نوسییووە وەها بمێنێتەوە. بەرەکەت دا! وا ئیجازەی ئەو نۆڤێلەی لە سویدییەوە کردومەتە کوردی وەرگیرا، ....خەڵکی تر زۆر پێیان گوتوم و ئامادەیی خۆیان دەربڕیوە، بەلام لەبەر دۆستایەتی ویستم ئەو بیکا، وا جارێ ئەویش ئاوا ساردوو سڕە، بە

هەر حاڵ،چاپچییەکی تر بەڵێنی داوە، وتارەکانی دەربارەی شەرەفنامە و ئەوەی ڤیلچیڤسکی هەروەها نووسراونەتەوە و دانراون ئەمیش دیسان بەهۆی کەمتەرخەمی خەڵکی ترەوە... مرۆڤ تاقەتی لە هەموو شتێ دەچێ.. وردە وردە شیعر دەنووسم، بەڵام نە لە شیعرەکانی پێشوی خۆم دەچن نەلەوەی کە ئەمڕۆ بەناوی شیعری تازەوە بڵاو دەکرێتەوە... من نازانم، هەوڵ دەدەم بەو زمانانەی دەیزانم شیعری شاعیرە گەورەکانی دنیا بخوێنمەوە، کەچی ئەوانەی ئەوان گەلێ مەفهووم ترن، لەوەی بابایەکی تۆزێ عەرەبی یان فارسی، کوردی زانی لە مەڕ خۆمان دەینوسی... چ سرێکە وەها مەحکومی غموضن؟! نازانم هەرچەندە نیازم نییە، ئەگەر نەبن بە "دیوانێ!" تاک و تەرا بڵاویان بکەمەوە.

دەستە پیرۆزەکانی بابە گەورە ماچ دەکەم، سڵاو و ڕێزی زۆر بۆ شیرین خان و عالییە خان و ماڵی پوورم و کاک سەلاح و چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم و ڕێزم بۆ هەموو دۆست و ناسیاوان هەیە.

ئیتر خۆشیتان دەخوازم

برای دڵسۆزتان -

ئەنوەر قادری مەد

١٩٩٩/٢/٥٨

**دەقە بێگوناهەکان، تەنێ دەقە ئیلاهییەکانن بۆ ئێمەی مرۆڤ!**

نامەی ئەنوەری ڕەشی عەولا بۆ ئیسماعیل حەمەومین

بۆ ئیسماعیل حەمەمینی هاوڕێم...

شیعر یەعنی: لەمسی شەفافیەتی هەور و هەتاوی هەناو بە پەنجەکانی ڕۆح

شیعر یەعنی زیندانی و ئازادبوونی هەمیشەیی وشە

لە هەساری تێکستدا

شیعر یەعنی.. بارین و خۆشبوونەوە

هەڵفڕین و نیشتنەوە

ڕەنگ و بێرەنگی

دەنگ و بێدەنگی

پڕبوون و خاڵیبوون

شادی و وەحشەتی لاموتەناهی.

کوێخای زێدە خۆشەویست.. سڵاو لە ڕۆحی پڕ حوزنی ئێوەش.

گەلێک سوپاس و ستایش بۆ نامە و شیعر و گەشتنامەکەت بە دنیا نۆستالیژیاکەی هیوا قادردا.

گیانی من هەر دەڵێی ئەم نەوەیەی ئێمە دوعاکەی ئۆدیسیوسی لێکراوە. قەدەری (سەفەرەکانی.. جەنگەکانی.. خەونەکانی.. پەیامەکانی) هیچی لە دەست خۆیدا نین و ناچارە بیکات! لە تەنگژەیەکەوە ڕوو بە ڕووی تەنگژەیەکی تر دەبێتەوە. نەوەیەکین لە ناو گێژەنی نادڵنیاییەکاندا گەورەبووین و هەمیشە دەترسین لەو (سیرن)ە دەنگخۆشانەی ژیانمان دەخەنە تالوکەوە! هەوڵێک بۆ هەوڵێکی دیکە.. و

کۆچ کۆچی دیکە.. و چاوەڕوانی و چاوەڕوانی دیکە.. و گومان و گومانی دیکەی لە خۆیدا هەڵگرتووە.

جا نەخوازە بۆ کردەی نووسین، کە پرۆسەیەکە لە لەتبوون.. و گردبوونەوە، لە نێوان شێوە بێ شێوەکان.. و نامەلموسیەتی مەلموسەکان.. و نادامەزراوی دامەزراوەکان!

بەڵێ کردەی نووسین لە چاوەڕوانی گۆدۆ وە دێتە وجود. لەبەر ئەوەی هەر دەقێک گۆدۆی راستەقینە نییە.

بۆیە تا گۆدۆ نەبێت، نووسینیش کردەیەکی هەمیشەییە. وەک بڵێی تا نووسەر خۆی نەکات بە خاچی دەق دا نابێتە مەسیح و پەیامەکەشی ناگات. ئەو پەیامەی وریامان دەکاتەوە لە (دەنگی پێی ئاو).. (رەنگی سووری شەراب، قەرزێکە لە ترێ)..( رۆژگارێک دێت، باڵندە شەرەنگێزەکان جێگای مرۆڤ دەگرنەوە)!

ئەم گوناهانە لە سروتێکی سۆفیانەدا هەناسە دەدەن، تا رۆح بەرەو پاکبوونەوە(تطهیر) بڕوات. ئەو دەمە دڵ نەک دەبێتە عەرشی خودا و گەیشتن بە ئیشراق، بەڵکە خۆی خودایە و دڵی دەبێتە عەرشی گشت شتێک، ئەمەش جۆرێکە لە مەحاڵ! ئاخر خەون و تەمەنناى مرۆڤیش بە گشتی و نووسەران بە تایبەتی باوەش کردنە بەو مەحاڵەدا!

وەختە بڵێم ئەمە ئەو تاوانە جوانەیە، کە نووسەر دەیکات. بۆ خاتری دەسەڵاتی دەق، گشت رەگەزەکان لە خودی خۆیدا حەل دەکات. هەر ئەمەشە وەها دەکات دەقی بێبەری و بێگوناهمان نەبێت! بەڵێ رەگەزەکان دەبنە (قوربانی) و دەقیش وێنەی (جەللادێک) وەردەگرێت. ئەو دەقەی بێگوناهە نە لە دایک بووە و نە لە دایک دەبێت.

دەقە بێگوناهەکان تەنێ دەقە ئیلاهیەکانن بۆ ئێمەی مرۆڤ!

بۆ ئێمەی گوناهبار کە هەمیشە دەبێ ئامادە باش بین بۆ گشت ئیلتزامێک دەرهەق بە داواکانی ئەو دەقە پیرۆزە. ئەگینا لە بەرامبەر بێگوناهی دەقێکی

پیرۆزدا، ئێمە گوناهبار دەبین و هەقی سزامان هەیە! دەشێ هەر ئەوەبێ کە بۆدلێر دەڵێت: هەرچی ئەوەی کە دەینووسین بۆ ئەوەیە لە گوناهی یەکەم رزگارمان بێت.

یاخود کافکا گوتەنی: مرۆڤ بێ ئەوەی گوناهی کردبێت گوناهبارە!

گشت نووسینەکانیش هەوڵێکی بێهودانەیە، بۆ نیشاندانی بەڵگەیەک بۆ بەرائەت!!

نوسەر دەقێکی گوناهبار دەهێنێتە وجود. چونکە لە دەقدا وشە و رستە و گوزارشت و رێکخستنیان و جەنگی نێوانیان لە رێگەی رەمز و هێما و ئاماژەکان و وێنە و وێناکردنەکانەوە، گەڕەلاوژە و تیرۆرکردنی ئەساڵەتی وشە و ماناکانیان و کرانەوەیان و خستنە سەری دەلالەتی تر بۆیان گوناهە. بەڵام بە گوناهـ و تاوانی جوان ناوزەدی دەکەین. بە خاتری فەراهەمبوونی ئەم کرانەوە هەمیشەییە و ئەم ئاسۆیە و دواندنی هەستپێنەکراو و نەدرکێنراو و نەوتراو و نەدۆزراوەکان. بە قەولی راسین(کەلاوەی گومانی پێ چاکتر بێت، لە کۆشکی یەقین) دەنا کرمەڕێز دەبێت.

جا بۆ روونەدانی ئەم حاڵەتەش، شاعیر کەسێکی ماندوو.. گەڕۆک.. تەنیا.. قەلق.. خەمۆکی.. لێپرسراو....تاد

واتە بە ئیختیاری خۆی سزای خۆی داوە. ئەو ئیختیارەی کە دەبێتە ماهیەتی وجودی!

بۆیە کردەی نووسین، جۆرێکە لە سزادانی خود. ئەوەی سزاش درابێ لە جاری دووەمدا سزاکەی کەم دەبێتەوە.

کەواتە بۆ ئەوەیە نووسەر بڵێت: ئەم دەقە بەڵگەکەمە، کە من سزای خۆمم داوە و ئیدی من شایەنی سزای تر نیم. من بە دەستی خۆم گوناهەکانی خۆمم پاککردەوە، کە دەکاتە ماسۆخییەت بەسەر خۆی و سادییەت بەسەر وشەکانەوە.

نووسەر لە کیبرکێی ناو دەقدا ئازار دەچێژیت. کە دەگات بە کۆتاییەکی وەهمی، وەک بڵێی ئیتر لە سزا رزگارم بوو، هەناسەیەک هەڵدەکێشێت. لێرەوەیە کە هەست دەکەیت، دەقێک ئازاری زۆربەی هەڵگرتووە. ئێمەش لە ڕێی ئەو دەقەوە هەست بە سوکەڵەیی و ئاسودەگییەک دەکەین. وەک نووسەر مەسیح بێت و لە بری هەموان خۆی کردبێت بە خاچی دەقدا! لەبەر رۆشنایی ئەو سەرنجانەی خستنمە روو. ئەو دەقە زیندوو و فرە رەهەندەی هیوا قادر لە رووبارەکەی نیمایۆشیج دەچێت کە دەڵێت: شیعری زیندوو، لەو رووبارە دەچێت کە هەرکەسێک بە ئەندازەی پەرداخەکەی خۆی ئاوی لێدەردەهێنێ، بێ ئەوەی کەم بکات.

دەرهەق بەو سەفەر و خوێندنەوەیەی خۆشت دەڵێم:

ئەو خوێندنەوە ئەنتۆلۆجیەی رۆحی شاعیر بە چاوی رۆحت فرسەتی ئەوەی بۆ سازاندی ناچۆڕاڵیانە

* دەم لە هێڵە جیاکەرەوەکانی کرانەوەی دەقی هەنوکە و داخراویی دەقی رابردوو یاخود سەلەفی بدەیت.

کە ئەمە کێشەی ئێستاکەیە، بۆ نەوەی ئەمڕۆکە و هەریەکە بە شێوازی جیاواز جیاواز دەست و پەنجەی لەگەڵدا نەرم دەکات، بەڵام لە روو بە رووبونەوەکەدا هاوبەشن.

* ئازادییە ئیستاتیکییە رەخنەییەکەی خۆشت، لە رووبەرە بێ رووبەرەکەی شیعردا، فەنتازیایانە مومارەسە کردووە.

* لە لایەکی ترەوە بە تەماهیبوونت لەگەڵ (شەڕەکانی خۆشبەختی لە نێو باخچەکانی جەفای هیوا قادری شاعیردا) توانیوتە ئەو هەقایەتە نائاشنا باسەفایەمان بۆ ئاشنا بکەیت کە نەوترابوون، بەو شێوازە تایبەتەی خۆت.

که لێت ناشارمەوە ئەم ئسلوبەت بە پێزتر و پوختەتر و پڕماناترە لە نووسینەکانی ترت ئەوانەی گۆڤاری سەراب و ئەمجارەی رەهەند. دیارە ئەمە نەزەری خۆمە دەتوانی قبوڵت نەبێت.

وێدەچێ گشتیەتی ئەو سێ خاڵە، لە خوێندنەوە لەسەرخۆ و پێچیدەکەت بمانبەنەوە سەر ئەو مەعریفە شیعرییەی کە شیاوە گوتاری شیعری تازە لە دڵنیاییەکانی نەستیاندا هەڵیانگرتبێت. بۆ خاتری ئەوەی خۆت گوتەنی تا "بیر.. لە نێوەڕۆکی شیعرییەتی رستەدا دنیا لە چڕتریین پەیوەندیدا راڤە بکات ل٩".

گەرچی جیهانبینی ئەو شیعرە، دەتوانێ زەمینە خۆشکەری کۆمەڵێ تەوەرەی تریش بێت. کە لە خزمەت ئاوەدانکردنەوەی زیاتری پرۆژە رەخنەیەکەتدا بێت و هەم زیاتر نامەئلوفییەتی ئەو دەقە شیعرییەمان بۆ بخاتە روو.

بمبەخشە ئەمانە سەرنجی کورتی من بوون لەسەر هەوڵدانەکانت، کە پێدەچێ هیچیت قبوڵ نەبێت. یاخود بە بارێکی تردا بیانسەلمێنیت بە خودی خۆشت. تەقریبەن لە وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە ناردمەوە بۆ کوردستان بە زمانێکی تر من قسە لەو گرفتانە دەکەم کە تۆ لێی دواویت. هەڵبەت دیراسە سیستماتیکانەترە بە بەراورد لەگەڵ چاوپێکەوتن دا. سوپاس بۆ هەموو شتێک و پیرۆزبایی لە تۆ و هیوا قادر و خۆشم دەکەم. با ئاگامان لە یەک بێت.

نۆڤەمبەری ١٩٩٩ تامپێرێ

برات/ ئەنوەری رەشی عەولا

**ئەو نوورەی لە عەرشی دڵ هاتەدەرێ، دەمرێ!**

نامەی ئەنوەری ڕەشی عەوڵا بۆ دلاوەر قەرەداغی

هاوڕێم دلاوەر قەرەداخی...

"تەنیاکان تەنیاترین مەخلوقی خوڵقن

تەنیاکان تەنیاترین ئەندازیاری- واز- بوونی زمانن

زمانی شنە و

زمانی حەوانەوە و

زمانی ڕووان و

زمانی سەما و سەفەر"

مەنفا: مەسافە بە سفتوسۆکانی نێوان ڕۆح.. و ئەقڵە. مەسافەی نێوان بینین.. و شتەکانە. مەسافەی نێوان خود.. و ئەوانی ترە!

سەفەریش.. بۆ حونجەکردنی ئەبجەدییەتی ئەو مەسافە پڕ موعجیزانەن کە پڕن لە مەحدودییەتی تەکامول، و پڕن لە نامۆییەکانی ئیدراک، و پڕن لە خۆشبەختییەکانی وەحشەت، و پڕن لە جیلوەکانی دڵنیایی با، و وەستان و خەڵوەتی لەنجە پڕ نەشئەکانی ئاو... و پڕن لە هیچ!!

زوهدیش لە سروتی بێ سرەوتی ئەو مەسافانەدا (ئاسمانێکی بێپایانە؛ کە

لەوێ نە زەمینێکە، وە نە ئاوێک.. نە ئاگر.. وە نە هەوایەک. ئەو ئاسمانە نە مەحدودییەتی جێگەیە نە مەحدودییەتی زانیارییەکانە. ئەو ئاسمانە نە – بوون–ە. نە ئیدراک و نە بێ ئیدراک. نە ئەم جیهانەیە نە جیهانێکی تر، نە هەردوکیشیان. نە خۆرەتاو و نە مانگ. ئەی ئەوانەی کە ئەم رێگا ئاسنە دەپێون. من دەڵێم: نە هاتن هەیە نە رۆیشتن.. نە بەردەوام و نە وێرانی.. نە بەرهەمهێنان. ئەو بێ بونیاد و بێ تەکامول و بێ شەرتە_ بودا_) من لەوێ هۆدە و هەیوانێکم بۆ خۆم هەیە لە تەنهایی. (ژیان نەشئەی تەنیاییە- سپهری-) ئەمە بۆنی رەشە رێحانەی بایەکی باسەفایە. کە لە کۆسارەکانی رۆحمەوە دێن؛ رۆحێکی بێ سیما....

ئەم حاڵەتە بێ حاڵانەش سرکن و تەنێ وەک عەرافێک دەتوانم ئەو سڵاوانەی لە ئێوارانی دەریاوە دێن، بە زمانە پڕ موحجیزاتەکەی رۆح بدوێنم و بە هەستەکانی نەستم بۆنیان بکەم.. و پەنجە لە پێستیانەوە بدەم.. و گوێ لە دەنگیان بگرم.. و تامیان بکەم..و بە چاویش.......کە ئەمەیان ئیمانێکە لە بێ ئیمانی!

ئەمە شهودێکە کە لە تاماهیبوونی من.. و خودا شکۆفە دەکا و ئیشراق بە نووری خۆی ئاوێزانی تیشکە شیفۆنییەکانی رۆحێک دەبێت، کە ناتوانێ لە عارفی خۆی بدوێ!

ئەو نوورەی لە عەرشی دڵ هاتەدەرێ، دەمرێ!

ئەو نوورەی لە ماهیەتی خۆی بدوێ دەمرێ!

ئەو نوورەی خوێنی تێکەڵ بە خوێنی نوورە دەستکردەکان بکات، دەمرێ!

هاوڕێی غوربەت نشینم" چارەی مەنفا، مەنفای ناوە"

گیانی گیانم.. سڵاو لەو رۆحە تەنیایەت، کە جێگەی هەموومانی تیا دەبێتەوە. ئێمەش بە باوەشێک مەحەببەتی شەرمنەوە دێینە حزورت و دەڵێین: تەمەننا

دەکەین، بە هات و هوتی منالآنەمان یاسەمینەکانی نەسیمی هەناسەتان نەشەمزێن.

مەنفا چیە.. گەڵا کە دەستی لە دەستی درەخت دەبێتەوە، هەم ئازاد دەبێ.. و هەم دەمرێ!

باران.. کە دەرگای هەور لە گریژەنە دەبات.. و دەستی لە دەستی ئاسمان دەبێتەوە و روو دەکاتە زەمین، هەم ئازاد دەبێ.. و هەم دەمرێ!

مەنفا ئازادییەکی مردووە.. هاوڕێم! (تنها درد، درد بزرگ است کە اندیشەرا در نهایت رها می زاد، دردی کە بەدگمانی بزرگ را آموزش دادە- نیتشە_).

ئیتر هاوڕێ بە ئەمەکەکانی مەنفا، باران.. و گەڵا.. و سەراب.. و با.. و ئەستێر.. و باڵندەکانن. هەندێکی دەکەونە تالوکەی (سیرنە)ە دەنگخۆشەکان.. و هەندێکی دیش ئۆدیسیۆسی موسافیرن!

ژیان بە سەفەرەکانی رۆحەوە خۆشن و سەفەرکانیش هەر لە مەنفای راستەقینەدا دەبن!

قوربانی دڵت بم هاوڕێ.. گەر هەلاڵەی دڵیش پروا، بە شنەبای ئەم قوتبە شینە، خوازیارم گوڵستانێک لە دەوری دڵت شین ببێت و ئەندێشە رەنگاڵەییەکانت هەر جریوەیان بێت، هەتا سترانە نەبیستراوەکانی رۆحت بێژن.

بە ئومێدی ئەوەی ئەم ئیقامەیە، ئومێدی خۆشتری بەدوادا بێت و بە دامون و هاوسەرەکەت شاد ببیتەوە و ئێمەش لە ئامێزی یەکتریدا بتانبینین. خۆشمدەوێیت.. ئا بیرێکی جیدی بکەنەوە بۆ هاتنتان لەگەڵ هیوا قادردا. لەگەڵ خۆشەویستی دووبارەمدا. بە هیوای دیدار

برات- ئەنوەری رەشی عەولا

١٩٩٩/١١/١٨

**هیچ شتێک لە شیعر باشتر دڵمان ناداتەوە،**

**وڵات خۆی نەبێت.**

نامەی ئەهبەلجەزائیری بۆ شێرکۆ بێکەس

شێرکۆی ئازیز

زەمەن نەیدەتوانی فراوانتر بێ، تا یەک بینینەکانمان درێژتر بووایە؟ هەرچۆن بێ..بەردەوام بە گرنگیدان و دڵخۆشییەوە ئاگامان لە هەواڵتە. زۆر گرنگە بۆمان کە دنیا، لە ڕێگەی شیعرەوە کورد بناسێ... من و کەریم بە باشی چاودێری دیوانەکەت دەکەین، سپاردومانە بە چاپخانەیەک کە بەڵێنیان داوە دەستبەجێ چاپی بکەن پێش ڕازی بوونی (رەقابە)..

هاوڕیان لێرە ترسی ئەوەیان هەیە کە شیعری شێرکۆ بپچڕێ کە ئەو لە زنجیرە ئاخەکان بترازێنێ، ئاواتەخوازن شیعری نوێت بخوێنینەوە.. هەواڵە شیعری و چالاکیە ڕۆشنبیرییەکانتمان لێ دامەبڕە.

پێش چەند ڕۆژێک لە دیمەشق ڕووداویکی جوانمان بینی، کە ئەویش کردنەوەی پیشەنگایەکی هونەری عێراقی بوو لە غوربەت... لەگەڵ وردەکاری وێنە و تابلۆکاندا ژیانی عێراقی جوان ژیابین، کە لە ناویاندا شاخەکانی کوردستان بوون، کە جێدەستی وێنەکێشە کوردەکان زۆر دیار بوو لەو پێشەنگایەدا.

لەم چەند رۆژەدا کتێبێکم بە ناوی (الاوراق جبلیە- گەلا شاخاوییەکان)ەوە دەردەچێت، کە زیدەی ژیانمە لە کوردستان، هیوادارم کە چەند بەشێکت خوێندبێتەوە، چونکە لە ڕۆشنبیری نوێ دا بڵاو بووەوە. بەلامەوە گرنگە بیخوێنتەوە و بیرو ڕای خۆتم لە بارەوە بۆ بنووسی.

مەیلم بۆ عێراق هیچی پێ ناگاتەوە، ئەو کاولکارییەی تێیدا ڕوو دەدات درز دەباتە ڕۆحم و تەقینەوەکان شوشەکانی یادەوەریم دەشکێنن. پێت وایە جاریکی تر عێراق کۆمان بکاتەوە، جاریکی تر لە باخچەی یەکێتی نووسەران مەست

بین؟ بگەرییینەوە بە پێ و هەرکەسەمان باسی ئەو شتانە بکەین بە دەنگێکی هیواش کە لە دەورمان روو دەدەن و دەیانبینین؟ دەمرم ئەگەر ئەم ساڵ، یان ساڵیکی تر یان دوای سێ ساڵی تر نەگەڕیمەوە عێراق و نابورم هەرگیز! بەبێ عیراق هەروەکو ئێستا دەمێنینەوە پەرت بوو بەسەر چەند گەڕەکێکی پچڕاودا، پێم بڵێ... شێرکۆ چەند دێڕێکم بو بڵێ دەربارەی مەیلت بۆ عێراق؟؟؟هیچ شتێک لە شیعر باشتر دڵمان ناداتەوە، وڵات خۆی نەبێت.. یەک ئەبینینەوە؟[1]

ئەهبە ئەلجەزائیری

---

[1] ئەم نامەیە بە زمانی عەرەبی نووسراوە.

**ئاورێکی تازە بۆ سەر ڕێزمان.**

نامەی ئەو ڕەحمانی حاجی مارف بۆ حەسەن قازی

برای بەڕێز و هێژا مامۆستا حەسەن!

ڕۆژ باش!

دەستەکانت دەگوشم... هەواڵی بە سۆزت دەپرسم... هیوامە لە کاری زانستی دا سەرکەوتوو و لە ژیاندا سەربەرز بی. پێڕێ دیاری یە بەنرخەکەتم پێگەیشت و لە قووڵایی دڵمەوە سوپاست دەکەم... تۆ کە دەست و قەڵەمت ئاوا ڕەنگین بێ، چاوەڕوانی پیت و بەرەکەتی بەرهەمی پترت لێ دەکەین... تەمەنی درێژ و بەختەوەریت بە ئاوات دەخوازم و سەرکەوتنت لە بە جێ گەیاندنی ئەو ئەرکە پیرۆزەی گرتووتەتە ئەستۆی خۆت ئارەزوو دەکەم.داوات کردبوو لە سەر وەرگێڕان و نێوەڕۆکی دیاری یەکەت – کتێبی [1]"ئاورێکی تازە بۆ سەر ڕێزمان" لە بیر ورای خۆم ئاگادارت بکەم. داوات لە سەر هەردوو چاوان.. چ بکەم؟ دەستێکم کەوتووەتە ئەملا و دەستێکیشم ئەولا کەوتووە. نە دەکرێ ڕێ بە خۆم

---

[1] حەسەن قازی لە بارەی ئەم نامەوە نووسیویەتی: لە ساڵی ١٩٩٣ کتێبی " نگاهی تازه به دستور زبان "نووسینی دوکتور محەمەد "ڕەزای باتێنی"م لە زمانی فارسییەوە وەرگێڕا و بە نێوی "ئاورێکی تازە بۆ سەر ڕێزمان" لە سوێد چاپ و بلاوم کردەوە. نوسخەیەکی ئەو وەرگێڕانەم بۆ مامۆستا ئەورەحمان نارد و لەنامەیەکدا, داوام لێکرد بۆچوونی خۆی لە سەر وەرگێڕانەکە و نێوەڕۆکی کتێبەکە بنووسێت. زۆری پێنەچوو وڵامی دایەوە. دیارە ئەمن ئەم وەرگێڕانە بەهیچ جۆر شیاوی ئەو نرخاندە بەرزە نابینم کە مامۆستا ئەورەحمان کردوویە. ئێستا کە زۆرێک لە ڕێبوارانی بواری زمانناسی و ڕووناکبیریی کورد بە لەدەستدانی وی تاساون، بۆ ڕێزلێنان لە بیرەوەی ئەو زمانناسە ماندوویی نەناسە، هەموو نامەکە لە ڕووی دەستخەتییەوە لێرەدا بۆ ئاگاداری خوێنەوەرانی کورد بە تایبەتی ڕێبوارانی بواری زمانناسی بڵاو دەکەمەوە. بەداخەوە نە ئاواتی مامۆستا و نە ئی من هاتە دی و ئێستا دەبێ هەر لە کارەکانی دا ببینم.

بدەم داوای ئەتۆ بە جێ نەهێنم و نە دەشێ ئەو کارە بە نامە مەیسەر بکرێ. جا لێم ببوورە، بە کوردی و بە کورتی، چەند دێڕێکت بۆ بنووسم: کتێبەکە لێکۆڵینەوەیەکی چاکە و بە شێوازێکی ڕێک وپێک نووسراوە... لە بواری زمانناسیدا کەڵکێکی زۆر بە خوێنەری فارس دەگەیەنێ و دەهێنێ بکرێتە بەرنامەی وانەی زانستی زمان لە زانستگاکانی ئێران...

خەوشی گەورە و دیاری ئەو بەرهەمە لەوەدایە، کە زوربەی زۆری باس و لێدوان و بۆچوون و بیروڕا و ئەنجامەکانی، زادە و مایەی بیری خودی نووسەرەکەی نین، بەڵکوو وەری گرتوون و وەری گێڕاونەتە سەر فارسی. ئەگەر ئەمەش تا ڕادەیێک شتێکی ئاسایی بێ، بەلاّم ناونەبردنی خاوەنەکانیان لە شوێنی خۆیاندا هەڵوێستێکی نازانستانەیە. بۆ نموونە، دەبینین ڕەخنە و سەرنجی بەجێ و زانستییانەی سەبارەت قوتابخانەی (سوننەتی، بناخەگر) خستووەتە ڕوو... بەلاّم هەر زمانناسێک، ئەوە دەزانێ، کە دەیان ساڵە بە زمانە ئەوروپاییەکان، ئەو زانیاریانە بڵاو کراونەتەوە و خاوەنەکانیشیان ناسراون، کەچی دوکتۆر محەمەد ڕەزای باتینی ناوی ئەو سەرچاوانە و نووسەرەکانیانی نەبردووە.

سەر لە بەری باسی قوتابخانە جۆربەجۆرەکانی زمانناسیی کتێبی "ئاوڕێکی تازە بۆ سەر ڕێزمان"، نەک لە مێژە لەو کارانەی بە زمانە ڕۆژئاواییەکان، دەربارەی زمانناسی دەدوێن، باس کراون، تەنانەت قووڵتر و فراوانتریش خۆیان دەنوێنن.. جا، ئەگەر لە بارەی ئەو باسانە هەرچی یێک بڵێم، ئەوە دەبێتە ڕادەربڕین بەرانبەر کاری زمانناسە ڕۆژئاواییەکان، نەک کتێبب "ئاوڕێکی تازە بۆ سەر ڕێزمان".

وەک وتم، ئەمە کاری نامە نییە و ناتوانم درێژەی پێ بدەم... بەڵێ تێبینی زۆرم هەیە، بەڵام بۆ نموونە تەنیا سێ چواریکیان باس دەکەم:
١. نووسەر دەربارەی خەوش و کەمایەسیی قوتابخانەی (سوننەتی و بناخەگر) دواوە، کەچی خۆی لە خەوش و کەمایەسیی ڕێبازی چۆمسکی نەگەیاندووە.. خۆ ئەو ڕێبازەش بێ کەم و کورتی نییە و زمانناسانیش کەمیان لەبارەیەوە نەنووسیوە...
خاسیەتی رووتی ژیربێژیی لێکۆڵینەوەی بنیوی زانایانی وەک "ئیلمسلیڤ و چومسکی"، لە سالانی ٦٠ دا نەک هەربووە مایەی ڕەخنە لە بیروڕایان، بەڵکوو بووە هۆی دەرگاکردنەوەی بایەخ دان بە کێشەی کۆمەڵایەتیی زمان و دەروونناسیی ئاخاوتن و ئەندازیاریتیی زمانناسی.
٢. باشتر وابوو لە سەرەتای لاپەڕە(١١١) ئەم ڕاستی یەی خوارەوە بڵێ: کۆڕی کۆپنهاگن لە سەرەتای سالانی ٣٠ دا پەیدا بوو. ڕابەر و دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە "ل. ئیلمسلیڤ" بوو، کە تیۆری یەکەی خۆی ناونابوو "گلۆسیمانتیک". گلۆسیمانتیک بریتی یە لە هەوڵێک بۆ هێنانە ئەنجامی تیۆری یێکی بەڵگەنەویستی زمانناسی لە جیاکردنەوەی تەن و ئەرکدا. تەن – نیشانەی دانەیە؛ ئەرک – پێوەندیی نێوان ئەندامانی ئەرک گیرە. بە پێی بۆچوونی ئیلمسلیڤ تیۆریی زمانناسی بریتی یە لە شێواز و ڕێبازی زمانناسی. شێواز و ڕێبازی ئیلمسلیڤ نموونەی نەخشە کێشانی ژیربێژیی بیرکاری یە. وێنەیێکی دی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە، شێواز و ڕێبازی بزوێن و بگۆڕی ن.چۆمسکی زانای ئەمەریکاییە.
٣. وێڕای ئەو چەند ڕێباز و کۆڕ و قوتابخانانەی د.باتینی لێیان دواوە، هی بەناوبانگی دی ئەوتۆ هەن، کە دەبوو ئەوانیش پشت گوێ نەخات.
٤. ئەگەرچی شێوازی نووسینی سەرلەبەری کتێبەکە ڕەوانە، بەڵام ئەو چەند دێرەی لاپەڕەی(٩)، کە بە نێوی "پێشگوتارە" وەیە، سەرنج ڕادەکێشێ. ئەوەتە لەو دە دێرە دا حەوت جار وشەی (کتێب)ی وتووەتەوە و لە دوو دێری سەرەتاشدا سێ جار: "ئەم کتێبە ڕێزمانی زمانی فارسی نییە؛ئەم کتێبە وتەیەکە لەمەڕ ڕیزمان. لەم کتێبەدا"...(ل ٩دا – ٣). پێم وایە، باشتر بوو بنووسێ: ئەم

کتێبە ڕێزمانی فارسی نییە، بەڵکوو وتویەکە لەمەڕ ڕێزمان... لەم بەرهەمە دا لە گەڵ هەموو ئەمانەشدا د.باتینی خۆیشی زانیاریی باشی تۆمار کردووە و هونەری بەرزی نواندووە و کارێکی گەورەی بە ئەنجام گەیاندووە. هەرچی مامۆستا حەسەنی خۆمانە، بە ئاشکرا دیارە بۆ بە جێ هێنانی ئەو ئەرکە پیرۆزە تەقەلایێکی زۆری داوە ...لەو باوەڕە دام گەلێک گیروگرفت و تەگەرە و کۆسپ هاتووەتە ڕێگەی، کە چارەسەرکردنیان ئاسان نەبووە، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا هونەری بەرزی خۆی نیشان داوە و لە وەرگێڕانی کتێبەکە دا تەواو سەرکەوتووە.کوردییە پاراوە ڕەوانەکەت، ڕستە جوان و سادەکانت... خوێنەر شەیدای زمانی کوردی دەکەن... لە کاتی خوێندنەوەدا هەر پەڕەیێکم هەڵدەدایەوە، پتر هەستم بە بەرهەمی قەڵەمی مرۆڤێکی کوردی دڵسۆزی بەهرەدار دەکرد. ئەمەش لە دڵمدا ڕێز و تەقدیری بەرانبەرت زیاتر پەیدا کرد و بۆیە ئێستاکە بە دڵ ئارەزوو دەکەم ڕۆژێک بە دیدەنیت شادبم.مامۆستا حەسەنی ئازیز! کارەکەت سەرکەوتووە، بەڵام بەرهەمی چاک مەرج نییە بێ کەم و کورتی بێت .خەوش و ناتەواویش نابێت بە هۆی کەم کردنەوەی نرخی ئەو کارە و وەرگێڕی بەڕێزی. کەم ڕێ دەکەوێت، شتێک لە زانستدا، لە سروشتدا... خەوشی تێدا نەبێ. خۆ بە نیسبەت نووسینی کوردییەوە، نەبوونی کەم و کورتی جێگای سەرسوڕمانە، نەک بوونی.لێم ببوورە گەر بێژم، خۆزیا هێندە ئامرازی (کە) ت بە کار نەدەهێنا. بۆ نموونە، با پێکەوە بڕوانینە لاپەڕە (١١):دێری ٩ : ... لێ هەڵکێشا کە هەموو لێکۆڵینەوەیەکی زمانی کە... دێری ١٣: ... کە بیروڕاکانی چامسکی کە... تاد.چۆمسکی بە کوردیش هەروەک ئینگلیزی یەکەی بە (چۆمسکی) ڕۆیشتووە .وا پێ دەچێ فارسەکان (چامسکی) پێ بڵێن و بۆیەش تۆ (چامسکی ) یت نووسیوە.چاکتر وابوو فەرهەنگۆکی پاشکۆی کتێبەکەت (کوردی – فارسی – ئینگلیزی) بێت، نەک (فارسی – کوردی – ئینگلیزی). ئاشکرایە، نووسینەکە کراوەتە کوردی و خوێنەر وشە و زاراوەی کوردی دێتە پێش چاو و مانای نازانێ و دەیەوێ لێی تێ بگا. بە وێنە، گەر یەکێک لە زاراوەی (دۆخ) تێ نەگەیشت، چۆن بەرانبەرەکەی بە فارسی یان ئینگلیزی بدۆزێتەوە.دەمەوێ ئەوەش بڵێم، کە منیش و تۆیش و هەرکەسێکی

دیش پێویستیمان بە هاوکاری و یارمەتی و ڕێگانیشاندان هەیە و زۆر جاری واش هەڵدەکەوێت شاگرد ڕەخنەی ڕاست و ڕەوان لە مامۆستای خۆی بگرێ. هیوامە ئەو چەند وشەیەم بە چەپکەگوڵی وەفا و خۆشەویستی لە قەڵەم بدەیت و لە هەموو هەڵەییێکم ببووریت، کە دیارە خۆم هەستم پێیان نەکردووە، ئەگینا ببڕای ببڕ و هەرگیزاوهەرگیز مافی ژیانم نەدەدانێ.بە هیوای خۆشی وسەرفرازی.

ئیمزا

ئەورەحمانی حاجی مارف ١٤/١٠/١٩٩٤

ڕووناک خان هاوسەری عێزەدین مەلا ڕەسووڵ عێزەدین مەلا ڕەسول، حەسەن قازی، عەلی قازی، برایم یونسی، عەلی سەیفی قازی، محەممەد قازی

**موعەلیمی وانەی ئەلف و بێ و وتووێژم!**

نامەی ئەورەحمانی حاجی مارف بۆ فەرهاد شاکەلی

برای بەڕێزو هێژا مامۆستا فەرهاد شاکەلی!

بەهیوای سەرفرازی و چاو و دڵڕوونی و خۆشی و شادی و بەختیاری و کامەرانی و سەربەرزی و سەرکەوتوویی و لەش ساغی و تەمەن درێژیتم.

نامە شیرینەکەتم بە دەست گەیشت، سوپاسی هەستی دۆستانەت دەکەم..دەزانم بە دڵ فەرمووتە (بە داخەوە ئەو ساڵانەی کە هێشتا لەوێ خوێندکار بووم یەکدیمان نەدەناسی)، بەڵام ڕاستت دەوێ، دەبێ من ئەو داخە بخۆم... بەندە هەمیشە پێویستی بە ناسین و ئاشنایەتی و دۆستایەتی لاوی زرنگ و هۆشیار و سەنگینی وەک تۆ هەبووە. گەورەیی و شکۆی من تەنیا تەمەنە، بەڵام تۆ و دڵسۆزانی دی لە گشت ڕوویەکەوە و لە هەموو مەیدان و بوارێکدا پایەبەرز و شاسوارن.

لەو نووسینانەی بڵاوت کردوونەتەوە بەزۆری ئەوانەی گۆڤاری"هیوا"م خوێندۆتەوە، بە تایبەتیش وتاری "بنچینەکانی بیری کوردایەتی لە مەموزینی خانی دا" و "چەند ئالیێن ڕەوشا زمانێ کوردیێ" .. شیعری "گەڕانەوەیەک".
هەرچی ئەوانی گۆڤاری "مامۆستای کورد"[1]ن کەمتر ئاگاداریانم، ئەویش لەبەر ئەوەی تەنیا چەند ژمارەییێکی کەمیانم بەرچاو کەوتووە.. ئەوەی باش بیرم بێ سەروتارە بە پێزەکانتە، کە پێیان نیشانت ڕاست پێکاوە..

زۆرم پێ خۆشە و سوپاست دەکەم، کە نیازت وایە، لێرە بە دواوە جاروبار گۆڤاری "مامۆستای کورد" و کتێبی دیکەم بۆ بنێرت. .ئەگەر یەک دوو جار ناردت و نەگەیشتن، ئەوە ئاگارت دەکەمەوە، خۆت ماندوونەکەی.

---

[1] "مامۆستای کورد" گۆڤارێکی فەرهەنگی و فکری بوو، سەرجەم ٣١ ژمارەی لێ دەرچوو. لە ساڵانی ١٩٨٥-١٩٩٦

له بەغداش وا بۆ مانگیک دەچی، خوێندن دەستی پێکردووەتەوە. دیسانەوە له کاری شیرینی هاوێنەم پچڕام و خەرکی کات به فێرۆدانم، چەند ساڵێکه له بەشی کوردیی کۆلێجی پەروەدە موعەلیمی وانەی ئەلف و بێ و وتووێژ...م. ئیتر ژیانه و پیاو دەبێ شانی بداته بەر.

سڵاوی گەرمی مامه ڕەحمان به هاوسەرت و وردیلەکانت بگەیەنە.

ڕیزی زۆرم بۆ هەموو مامۆستایان و دۆست و ئاشنایان هەیە.

ئیتر هەر بژین

ئەوڕەحمانی حاجی مارف

١٩٩٤/١٠/١٥

**با ئەم ژاوە ژاوە جیهانییە، بێ دەنگ بێت.**

نامەی ئیبراهیم چێوار بۆ هادی مەهدی

ئەی سوریایی ئەزیزم هادی گول

سڵاو و خۆشەویستی ئازاراویم  بۆ تۆ و میدیای ئازیز، ماچی پڕ خۆشەویستیم بۆ هیوای عەجول، هیوای خۆشی و کامەرانی و سەرکەوتن و خێرتان بۆ ئەخوازم، چ چۆڵەوانییەکە لێرە جێتان هێشتووە، چەند باشن ئێوە.

با ئەم ژاوە ژاوە جیهانییە بێ دەنگ بێت، گۆرانییە خۆشەکانمان بێنەگۆ لەسەر تەختی زیندوی شانۆ، چنور و ئاڤان ئالان عوسمان چێوار و هۆرێن  ومحەمەد سدیق و بەدیعە دارتاش هەموویان هەواڵتان دەپرسن. پەیمانگا لە بارێکدایە بەزەییت پیادێتەوە، میهرەجانی شانۆییەکەش نەکرا هەرچەند من دوو **مانگ** کارم لە شانۆیی (أرض الحرام)[1] دا کرد، جەوێکی خنکێنەری هەیە.

سوپاس بۆ دیوانەکەی مەحمود دەرویش، ئاواتەخوازم ژیانە شانۆییەکەی بۆ بنێری ئەگەر کرا لە ریگەی مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە بینێرن بۆ تەلەفزیۆنی یەکێتی نیشتمانی، بە هیچ جۆرێک بیر لەوە نەکەنەوە بێنەوە بۆ ئێرە. ببورن ئەم نامەیەم پەلەیی پێوە دیارە.

سڵاو و ڕێزم قبول بکەن جاریکی تر

ئیبراهیم چێوار

١٩٩٦/٤/٥ سلێمانی

---

[1] مەبەست لە شانۆیی "أرض الحرام" بەرهەمی "هارۆلد پینتەر"ە، دواتر کاروان چیوار پێشکەشی کرد.

**لەسەر تەختەی شانۆ، ئەو زامانە دەکولێنمەوە...**

نامەی ئیبراهیم چێوار بۆ جەمال غەمبار

خۆشەویستم و ئازیزم، جەمال غەمباری دوور لە ئێمە

جگە لە خۆشەویستی و خۆزگەی بینینت، چاوەکانت ماچ ئەکەم و ڕێز و ستایشم بۆ دادەپەیمان و ئەملاولای ڕەوەز و ڕۆزا ماچ ئەکەم، هیوادارم لە بەختەوەریدا بژین.

بەراستی غەمبار گیان، ماڵەکە، وڵاتەکە، جادەکان و کوڕەکان، و مەجلیسەکان بێ بۆنی توی لێدێ، من یەک لە کێشە گەورەکانم ئەوەیە، ئەوانەی دوردەکەونەوە، وادیتەبەرچاوم جارێکی تر بەدیداریان شادنابمەوە، و لەدەستم چوون و لێم ترازاوان، ئەم دەردە زۆر گرانە و سارێژنابێتەوە.

غەمبارگیان، ئەو بەلەمە شێتەی کە ئێمەی هەڵگرتووە، و ناوی وڵاتی لە چارۆکە شرەکەی کردۆە جێی و نیشانەی شەیتانیش نازانێ لە کوێ، ئارام دەگرێ و لەت و پەت دەبێ و، هەر ڕۆژەی با بەرەو شوێنێکی دەبا و وەها هەڵوەشاوە، ئەوەی درووستی کردوە، جارێکی تر بۆی درووست ناکرێتەوە.

ئەوەندەش خەم بە هەمووشت دەخوا و هەمووشت لەم سەرزەمینە، ڕووئەدا، وا ئەزانم من تاوان بارم و من بەرپرسیارم، و هیچیشم پێناکرێ جگەلەوەی هەندێ جار لەسەر تەختەی شانۆ ئەو زامانە دەکولێنمەوە، کەس باش نییە، بڵێم کێ باشە و کێ سەلامەت لێدەکات. هەموومان هەنگاو بەسەر ڕۆژەکانا ئەنێین و شەوەکانمان بە خەوێکی تاڵ و هەڵبزرکاو ئەنێژین. وابزانم هیچ شوێنێک بۆ ئێمە و مانان ئارامی نییە و نە هەندەران و نە ئێرە و نە جەهەنەم و نەبەهەشتیش، ئێستا خەرکی پرۆڤەی کارێکین لەگەڵ هۆرین[هۆرین غەریب][1].

---

[1] ئیبراهیم چێوار لەگەڵ هۆرین غەریب خەریکی پرۆڤەی (پێکەوە لە بەهەشتا، عەسری) بوون ساڵی ٢٠٠٢.

**منیش کوێرە خەتێکم هەیە...**

نامەی ئیحسان فوئاد بۆ عیزەدین مستەفا ڕەسول

رئاسە جامعە بغدار

عمادە کلیە تربییە

بغداد

بۆ بەڕێز مامۆستا، دکتۆر، سەرۆک، سەرنووسەر، ئوستاز عیزەدین

ڕۆژ باش

کە دەربارەی شیخ رەزا نوسیوتانە، نەتانزانی بوو منیش کوێرە خەتیکم هەیە، ئەمەنەیە،.....

لە ژمارەیکی "برایەتی"[10] دا، وتاریکی لیکۆڵینەوەم وەختی خۆی، نیشاندای دەربارەی کاکەی فەلاح، جا خۆشم بۆم هێنای، ئومید دەکەم ئەمەشت بیرنەچووبێ، چوونکە تۆ بۆ کاروباری خەڵکی، نەختی بیرەوەریت تابانە!

ئیتر خۆشیتان

برات احسان

١٩٨٠/٣/١٠

---

[1] برایەتی, گۆڤارێکی سیاسی گشتی بوو, مانگی دوو جار دەردەچوو, لە کۆتایی شەستەکان و حەفتاکاندا, خاوەن ئیمتیازی حەبیب محممەد کەریم و سەرنووسەری عەلی عەبدوڵڵا بوو.

نامەی ئیسماعیل حەقی شاوەیس بۆ شوکریە ڕەسول

سوولەیمانی: جزرە: 24/ئەیلول / 1974

هەردوو چاووم شکری رەسوول خان..

رۆژتان باش. نامەی شیرین تان رۆژی ١٩٧٤/٨/٢٦ نووس را بووگەیشت. ئەمە وەرامە کەیەتی:- ئەم قەرنە، گەلی شەتی تازەی هی ناوەتە روو. وەکوو: ئەلەک تروو... ATome Competitor . گەلی شەتی بە نرخی تر یش. ئەمانە بۆ مرو، جی هان خی رو پیت یان فرەیە. بە تای بەتی Chemical-Industry ئەم شەتە نایابانە. ژیانی مرویی تازە و نوێ کردەوە. آی دولوژی، سیاسەتی لی دەرانی کونوو- تازە.. پرووپوچ کردووە، گەلی عاداتی، رەووشنو، رەف تاری تازەی هی نایە روو.. لە جیهان دا هاتوو چویی ری کوو فرەوآن کرد. پنج کەرتەی زەوی: آوروپا، آسیا، آفریقا، آووستورالیا، وەک شارانی مەزەنی، عالەمی جی هانی نزیک بە یەک تر کردەوە. بەهۆی تەکنولوجی- ئین دەستەری چی می کال: سوسیو تەکونۆجی_ پۆلەتیکی ,socia- economy, poletic.. ژیان و ژی یی نی، کاتو و دەمەی کۆنی بە جاریک گوری، رەوستوو- رەف تاری کونی بە جاریک رەماند.. دەستەي چی نەکانی شی نەمان وو. وە دۆس توورەکانیشی رووخاند.

سوسیو تەکونومی ئەم رویی جی هان: بەرەو شوروشی اوکتوبەری- مەزەنی سوڤییەت[1] Soviet ئەروا. بەم ای دولوژیەوە Socio- economy پینج کەرتەی مەزەنی جیهانیش، کە موو زور گورراوە.. Philosophy فی لوزوفی، ژیانیکی تازە هاتوتە روو. گەلانی روژهەلاتی- دوور و نزیک عالەمی- عەرەب

کوردی شی بە جاریک گوری وە؛ لە حالەتوو شورشیکی: سوسیو-ئەکونومی، بەرەو ژیانیکی تازە و نۆی ئەت لێ تەوە. بە تەبی عەت فولک لوری کوردی، پروپوچی کوردی... وەک جاران ئەو نرخوو نازداریەی نەماوە؛ بەرەو پو لی تی کالی- دەمەی تازە ئەروات Political-Era دەستە و چی نەکانی ئەم روژ: بەو اهەن گوو پی یە، ئەبی بروات خوی بەگورین، بە هەستی و ژیانی تازەو نویێ بەکاتەوە . شورەشوو خەباتوو، بەزوت نەوەی کاروو فرمانی- کومەلە مەزنەکانیش To Mass Movement لەگەل خەباتوو بزوت نەوەی رەژی مەکانی Ideologies and halers بە تەبی عەت بەرەو قەرنی ۲۱ On ئەروات Era of Movements-regimes.. بو پیک هی نانوو جی گیر کردەنی ناسییونالی- ئەنتەرناسیونالی، سوس یی تیکی تازە درووست کردن ئەروات.
Or Remaking of National or International-society بە مانەوی نەمانەوی بەرەو دروست کردەنی ناسیونال- ئەنتەر ناسیونال سوسایتی ئەروین...؟! بەم رەن گە، لە پینج کەرتەی جیهانی دا: گەلی لی دەرانی _پێش وایانی_ تازە ئەزیت، دی نە پی شەوە کوردوساحەی- می ژوویی- کون.. ئەبی بە چی تە ناو آنتی کە خانەکان..! می ژوویکی تازە، حادثات و فودعاتی تازە.. گەلی روداوی تازە... پیک ئەهی نیت. Space age جیهانیکی تازەی تر دروست ئەکات.

بەلام هیچ گومانی تی دا نی یە، فیلوزوفی اینسانی- مرویی جیهانی: بەرەو Marxism-hemism بو ئازادی مرو- بەشەر پەرەستی- بەرەو گورینیکی تطور- تجدد... بو پی شەوە دی و اسا ئەروات.. کەموکووری سوسیو- ئەکونومی جهان بە جاریک پیش ئەکەویت ئەگوریت، ابنار هاوکاری یەکی ئەنتەر ناسییونالی سوساتی یەک نویێ، هەرەوەزی یەکی- ئەنتەرناسیونالی درووست ئەبیت Co Operation .

International-National: New- Societies and Co-Operation

---

[1] پیتی ڤ بە شیوەیک نووسراوە سێ نوکتەر لەسەر واوەکە بێت.

دوون یاش وەک ئەمرو نا می نیت. هیچ گومانی تیدا نی یە هەر وەک زانایانی جیهان بان گەوازی ئەکەن پێ دا ئەگ رن.

ای دولوژی یەکی -انسانی مرویی، قەومی – می لەلی عالەمی- سەر ئەکەویت.. جیان بەرەو کومونیزمی – اکتوبەری مەزەن- ئەروات ئەنجامی کار حاکم زال ئەبیت.. درەنەگوو زوو، دوایی قەرنی- ۲۰م بە جار ئەگورریت. قەرنی ۲۱ اتومی زم – ئەلەک ترونی زم، لەسەر دەستوری بن چینەکانی سووڤییەت October Revolution, the sovietئەروات ژیان و ژین بەم رەنگە جی گر قایم ئەبیت، Marxism-hemism زال ئەبیت، کەموو کووری نامی نیت بە جاریک ئەم آی دولوژی مروڤ ە کامل ئەبی پیش ئەکەویت.. ئی تر عبادەت و معنایی- سحر دافوون، ایی نوو پەرەستییان.. بە جاریک ئەکوژی تەوە آلیهەکانی کونوو -تازە لی دەران لە جیهاندا ناوبانگ یان نامی نیت، بەشەریەت، لە زول موو زوور دا ربی یان ، عبادەتی شخص پەرەستی یان رزگاری ئەبیت. -Our Incantatory Cult .. نە خود بایی یان هیچ نامی نیت.. راستەو خو ئەچیتە ناو سەرەلون کی- انتیک خانەکانی کون، لەوی زیندانی ئەکریت.. ترسوو هیز و هیوایان مفهومی- ئەف سودن یان، بە جاریک ئەکژی تەوە.

ئەم شەتانەی سەرەوە لەناو کتی بەکانی بەندە، کە ناویان پرووپووچی پی شی نان، گوتەی مەزنان، گووستاو لوبون- لی لوزونی دە مەتەل: ژمارە ۱_۲ دا کەموو زور ئەبی نیت. ئەگەر ئەرک نەبیت، بی خونی تەوە، رەنەگە پەی شادمان بیت کە لە سالی ۱۹۳۰_۱۹۳۳ لە بەغداد چاپ نووس کراوە، کە عەهدی بائدی نووری سەعید، زور بە توون دی منع و مکافحەی کردەبوو.. نەی ئەهیشت بلاو بکریتەوە لەگەل ئەمەش، نەی توانی قەدەغەی کات، گەنەجان و لاوان قوست یانەوە؛ لە دەری عیراقیش، لە ناو روژنامەکاندا، روژهەلات ناسەکان باسی یان لی کردەبوو. بە پلەیەکی پەسەندی یەوە.. لی رەدا جیگا نی یە باسی لی بکریت.

بە کورتی پی ویستە آی دولوژی مارک سی زم- لی نی زم، عوامل هی زوو گووری سوسیو- ئەکونومی.. ئەدەب دا خلاقی قەرنی – ۲۱ هەر لە ایستاوە بخری تە بەرچاو، لی کولی نەوەی لی بکریت .. تاکو بەرەو ژیانیکی مرویی،

برایەتی، یەکیتی این سانی جهانی.. زوو بە زوو دروست بکریت، باوەرم وایە، ئەم شەتانە... Cosmetology- Cosmopolitan آرابیش – کوزموپولی نانی نی یە. بەلام هەر وەکوو لە سەرەوە نووس راوە لەسەر دەستوری؛ ناسیونال ئەنتەر ناسیونالیزم- جیهان وردە وردە ئەروات، پشتی کرتوتە ژیانی رابردوویی- کون .. خووا حافی زی- goodbye لی ئەکات، لی شی کردووە..

ئەم کوردی عیراقە: پی وستە ئەم رو نەرموو نی یان، ئەلاستیکی- مادەییکی- پەتەو قایم، بە جەرگ بین، بەران بەر گەرماو- سەرمایی گی ژەلووکەی- جیهانی.. رابەوەستی هوش یاربین. لە ژیانی جهان، دەرد و آزاریان خەبەر دار بین.. و دوا روژمان زور بە وردی لیکی بەدەی نەوە، لە دژی ام ریا لیستانە- بورژوازی Bourgeoisie – Dictatorial جیانی بەوەستین، خومان رابگرین،بە مرویانە، برایانە بژین بە تای بەتی لەگەل عالەمی عەرەبی -١٣٠- سەدو سی میل یوون براکانی عەرەب مان بە کەل کو اومید هی وایکی مەزن بت وانین، خزمەتی این سانی یەت بکەین. ئی مە کوردیش، بت وانین بلەین، انسانین، لایق و شایستەی مافی ژیان، هەستی مان هەیە.. ئەبی وەک مرویەکی باش و بە کەلک، دروست کەر، نەک روخینەربین..! کورد گەرەکە لە عالەم، لە بەشەری یەت خوی دور نەخات گوشەگری نەکەین.. کوێر و کەڕ و گەوج، بی میشک نەبین...بەران بەر روداوەکانی جیهان، بی گانە نەبین، خومانی لی دور نەخەین... عزل نەکەین لە ناو قضایایی انسانی عقد و مشکلاتیان بەشدار، حساس و فعال، چست و چالاک هوشیاربین.. لە بو ژیان ژین مان، تووانا، بی هی زی مان، کەم و کووری مان، دەردوو آزارمان.. دەرمان ئەبی بزانین پلەکانی گیر وگرفتمان لەگەل مشکلات و عقد عالەمیدا.. بی ویستە زور بە وردی بی پیوین، عیلاجیان بزانین. گەلی کورد هەر لە ئیستاوە پی ویستە بو دەمی ژیانی قەرنی ٢١ خوی حآزر امادە کات.. تاکو بت وانی خوی بژی یَت No any Profound Nations (...) Cleavage هیچ گیر و گرفتیک هیچ کەن دەلانیک لەناو قوم و گەلاندا نابی بمینیت هەر لە ئیستاوە ئەمانە حل و فصل بکریت. بە تای بەتی روژ هەلاتی- نزیک، گەلوو اقوامیان، گەلی گی روو گرەفتی تی دایە... ایشتان گری کانی هەر بە کۆری ماوەتەوە، نەکراوەتەوە، لەناو گەلانی رۆژهەڵاتی

نزیکدا، آهەنگ یەکیتی برایەتی یەکی تەواو... ایشتان دانەمەزراوە. لە جیهاندا اقوامی هەژار دیل کراو، ماف خوراو... نابی بمی نیت Nazism نابی حاکم بیت. بی جیاوازی دین و زبان- رەسەن، هەموو گەلان مافی این سانی مرۆیی یان هەیە.. سوسیو ئەکونومی یان وەک یەک بیت... بەلام پی کەوە بە آرام و أشتی مرۆیانە بەژین کورد لە جەنگی خونینی _ قری مەوە Creaman War ۱۸٥٤ لە برسیتی زوول موو زورداری، هەژاری، دی لی یەوە... میش کوو- دەلی.. توشی هەراسانی حساسی یەتیک بووە... بەرەو آورووپا- امەریکا، چاری زم رووس یا، بە ری ی قەف قاسەوە- Émigré بە مهاجری رویش توون.. لەوی دا ژیاوون، تی کەل بە ژیانی گەلانی- قاف قاس، بە تای بەتی لەگەل رووسەکاندا ژیاوون، ژیانی موژیک Mujic یان دیوە، پیکەوە تیدا ژیاون.. زور تی کەل بە Georgian گورجی یان بوون. رەوشت و رەف تاری رووس- گورجی یان، لە خۆش بووە. ژیانیان نزیک بە یەکتر بووە. ژیانی سوسیالیزمی- دەموکراسی یان... لا خوش بووە، بەم رەنەگە کەم و زوور ژیانی دیکتاتوری — چاری زم ایم پراتوری- پوناپارتی زم.. شارەزایی یان پەیدا کردووە، هوش یار بوون.. لە ژیانی خیلافەتوو سەلتەنەتی عثمانی دور کەوتونەتەوە... لەگەل روس دا یەک یان گرتووە، پیکەوە بە خوشی ژیاون؛ لە روشن بی ران گەلی کەلک یان وەرگرتووە، بیر و باوەریان گوراوە.

کوردانی- تورکیا: لە زەمانی — باستیل، کومونی فرانسزی بورژوازی جم هووری- فرانسە گەلی شارەزایی یان پەیدا کردووە، لەگەل شورەش گیرانی آورووپا- رووسیا تی کەل بوون.. گەلی روشن بی رانی کورد؛ بە مهاجەرەتیکی سیاسی رویش توون بو رووسیا، پەنروگراد یان پەترس بوورگ.. لەبەر گیانیکی شورەش گری، روشن بیرانی کورد گەلیک یان بو گریک- جزیرە رگرید، بال قان دەربەدەر بوون. لەوی وە بوو روما و پاریس چوون هەن دی کیش یان گەیش توونە آمەریقا.. لەوی دا ژیانی خویان ریک خستووە، اگاداری داب و تقالید، بی روو باوەری سوسیالستی دەموکراسی کەموو زوور شارەزا بوون. بەم جورە لە سیاسەتی دیکتاتوری خیلافەت و سەلتەنەتی عثمانی یان دوور کەوتوونەتەوە... گەلی کیش یان لە پاش گورینی سیاسەتی- عثمانی: بە آی

دولوژیەکی وەتەن پەرەستی- دەموکراسی یەوە، گەراونەتەوە ناو کوردستانی- تورکیا ایران... دەستیان کردووە بە خەبەتوو شورەش...

لە دەوری سەلتەنەتی ایم پراتوریەتی عثمانی یان دا.. پارتی سیاسی یەکانی کورد سەرەکو اەنداموو هوش یاران شاگردان (...) کانی استانبول، حقوقە فاکو ولتەی طب- حەربی یەی شاهانە... لەگەل کومەلانی سیاسی ال بانی باش فیم؛ ژونە توور کانە Jeunne Turcs زعماو رجالی سیاسی- عەرەب تی کەل بوون.. لەگەل ئەرمەنی- گریک – کومیتەکانیش هاوکاری یان کردووە. بە تای بەتی لەگەل احزابی عەرەبدا. زور هاوکاری کراوە. زعمای کورد لەگەل زعمای – عەرەب؛ لە سالانی؛ ۱۹۰۸ کورد لەگەل اخاء العربی، و لە ۱۹۰۹ لەگەل المنتدی الادبی و الجمعیە القحطانییە... و لە سالی ۱۹۱۱ دا لەگەل جمعیە- الفتات العربیە.. لەگەل طلابی عەرەبدا.. و لە سالی ۱۹۱۳ الجمعیە الاصلاحییە الروئیە... اتصالات و تعاونی کورد- عەرەب پیک هاتووە. لە دژ سەلتەنەتی عثمانی – تورانی بە توندی پیکەوە وەستاوون خەبات یان کردووە.. و لە سالی ۱۹۱۳ نهضە اللبانیە و لە سالی ۱۹۱۳جمعیە مهد العضیم، المصلحون العراقیون... لە عیراق- سوریە- لبنان دا... روشن بیران زعمایی کورد، کومیتەکان لە خاکی عثمانی- مصر- پاریس دا پی کەوە هاوکاری یان کردووە. بو استقلال و اوتو نومی عەرەبستان- کردستان- ئەرمەنستان خەبات یان کردوە. بەلام گەلیک یان ... اوتو نومی- پەرەست بوون، انفصالی نەبوون لە تورکیا...؟! جگە لەمانەش لە سالی-۱۹۱۳شاگردان طلابی عەرەب کورد لە پاریسدا، لەگەل (جمعیە العربیە الفتات)دا مؤتمریکی-مەزەنەیان لە ناو ژون تورک- اتحادیی کانی عثمانی تورانی زماندا... دەن گوو هەرایەکی مەزنەیان پیک هی ناوە... لە ناو عەرەبستا- یەمەن دا- خلیجی فارسدا.. لە ناو عیراقدا گەلی آژاوە- آلوزی سیاسی یان دروست کردووە. بەم رەنەگە کورد- عەرەب پیکەوە بو آزادی هاوکاری یان کردووە... لە ژیر سیاسەتی- تتریک: عەرب- کورد بە توون دی وەستاوون.

اسبابی مهاجەرەتی کورد؛ بو قاف قاس- رووسیا- آوروپا امەریقا چی بووە...؟ جەنگی قریم؛ برسیتی، سەر گەردانی، گرانی زوول موو زورداری، دیکتاتوری

عثمانی یان.. آلوزی پەشی وی کوردستان.. گەلی عیراقی داخلی خارجی سیاسیش..کوردی هان داوە، حساسی یەتیکی زۆر بۆ هیجرەت، بو دوورکەوتن لە کوردستان.. میشکوو گیانی کوردی بە جاریک جوولان دووە، بوو دوور کەوتن لە کوردستان.. هەتا ئەم روو لە ناو کوردا وەک- legend افسانەیک!! جەنگی قریم سی واستەپول.. بەناو بانەگە..؟ ئەم تراژیدی کومیدی یە.. زور بە آزارو داخی کەوە.. لە ناو عالەمی کوردا یاد ئەکریت. وەک .. لە ناو کوردا Mytho-logized – Ideology بەناوەبانگە. باوەر بکە هەتا بوورژووازی؛ لە ناو روژهەلاتی نزیک و ناوەراستا، حاکم و زال و پایەدار بیت.. ئەم تراژیدی کومیدی خونی یە.. هەر لە ناو کوردستاندا راوەستاو ئەبیت. کانوو سەرچەشمەکانی، ئەم تی روریستانەش: ایم پریالیزم – کاپی تالیستانە.. لای هەموو کەس روونە دوو کامپ هەیە؛ پرولیتاری زم سوسیالیزم- کاپیتالیزم ایم پریالیزم هەتا بمی نیت.. آرام و آشتی لە ناو روژهەلاتی ناوەندی دا هەر جی گر ئەبیت. بە تای بەتی سیاسەتی نەوت Oil policy– جی می کال ئی دوستەری جەنەگوو هەراکانی، روژهەلاتی درووست کردووە. یەکی لەم جەنگی خونی نەش "جەنگی اسرائیل عەرەب، جەنگی قب ریس- تورک- گریک..؟!" ئەمانە هەمووی بو سیاسەتی Hegemony Oil and Bases هەژەمونی- نەوت، و قواعدی بری، بحری- آسمانی استعماری یانە رووی داوە. ئەم جەنەگانە کاپی تالیستان- بورژوازیانی آنەگلو آمەریکی هەلی گیرساندووە بو مصالح و منافعی خویان، بو سەل نەتی خویان- بو زال بوونی بوورژوازیانە لە ژیرHumanism بە ناوی خزمەتی انسانییەت و بەشەرەی یەتەوە بو حاکمیت Hegemony Oil نەوت هەڵیانە گیرسان دووە.. بو جەنگی سە ۳ هەم ری گاو شوێن گەرموو خوشی آمادە ئەکەن. بو هەموو مروڤیک، روشن بی روو این سانیک؛ پیویستە لە دژ (...) اوهام و خەیالاتی ام پریالستان بە تون دی .. گشت لاییک، بە یەک دل، یەک آیدولوژی بەوەستین. عیراق بە تای بەتی، روژهەلاتی ناوەن دیش- لە زال موو زوورداران رزگار کەین نەهیلین ایمپریالستان بی نە ناو دلوو جەرگمان.

لای هەموو کەس روونە کورد- عەرەب: زوور نزیک بە یەک تەرەن، مصالح و منافع یان، دوژمن یان یەکە. لە خیر و شەر کورد وعەرەب پی کەوە بەش دارن. بەختوو شانسی یان یەکە. ژیان و ژی نی کورد- عەرەب پی کەوە لە وەتەنیکی عیراقدا، بە عەدالەت و ساداتیکی افخاری، سوسیوئەکونومی ژیان یان.. بو هەردوو قەوم حیات -و استقبال ادامەو احیا پایەداری ئەکات؛ لە مصیبەتی جەنگی اقومی امپریالیستان.. دوریان ئەخات رزگاریان ئەکات.

---

بەی نە سەر باسی(اطروحە) کەتان:- -الاطروحة-.... Thesisتێزس. نوومرە، ١:٢. قسەی پیشینان پروپوچی پی شی نان.. و مەتەل- لغز Enigma چون کو کراوەتەوە؟ دەستەو چینەکانی هەژارانی شارو و دیهات، دا پی رە، پی روو جووان ژنانی- لادی شارەکانی- سولەیمانی- کەرکوک- شاربازێر، کاوچەکانی هەلەب جەو پینج وین.. هەولیر – آکری و هەندی دیهاتی یان.. ئەم قسانە لەگەل روو شن بیرانی – کورد بەراورد کراوە تی بینی یان لی کراوە. ئەم قسە کۆ کراوانە ، مەتەلانە.. گەلیک یان لە ناوچەکانی کرمانەجانی بایەزید- آگری (آرارات..)، ماکو- چرواردی ران(چال دی ران) کە جی کایی- جەنگی یاووز سولتان سەلیم- شاە اسماعیل سەفەوی یە.. ساب لاخ (مەهاباد) سەقز- هەورامان- مەری وان.. لە تورکیادا: وان- بایەزید- دیاربکر- اوورفەدا بەراورد کراوە.. انجا ئەم فولک لورانە خراوەتە ناو بەیازوو، یاداشت نووسراوە، چاپ نووس کراوە.

لە هەموو پەتر ئەم قسەو مەتەلانە: لە دایی را و بابی ران کچانوو لادانی، چەوساوەکانی کوردیش بەراورد کراوە، لەی کول راوەتەوە. لە پاش ئەوە کە بووم ساغ بوتەوە کە ئەمانە لە ناو کوردستانی- عثمانی ایران عیراقەدا راستوو رەوانە.. بو یەکەم جار لە عیراق- بغداد چاپ کراوە.. لە سالی ١٩٣٣_١٩٣٧ دوکتور منی عقراوی کە سەردەمی مدیری عامی معارف بوو لە پاش بەندە (خروب امثال العربییە..) ی لە چاپ داوە کە لە ئەمەریکا تیزی – اطروحەی دکتورای پی وەرگرتووە... کاتب و ئەدیب محمد عامی حزب الاخاء- الوطن کە

باسی پاشا الهاشمی رئیس الوزراء زعامەتی کردووە، کە لە دژ سیاسەتی انتدائی- انکلیز جهادی کردووە حلف الشوقی الداودی -کاتب سر- لە روژنامەکانی عیراقدا، باس و ستایشی قسەی پیشینانی زوور بە ووردی نووسی وە، تقدیری فولک لورانی- کردووە.

M. Piesre Randot ئوری یا ئەتالیستی فرانس لە ساڵی ١٩٣٣ زوور بە باشی ستایشی قسەی پی شی نانی بەندەی کردووە. می ژووناس بە ناو بانگ- کوردستان Basil Nileiten باسی هەردوو کتی بەکەی کردووە ئەمەیش ئوریانە تالیست- کورد شوناسیکە قسەی پی شی نان: وەک نووک تەیەک... لادی یی شارەستانی یان - ئەم روژ کەموو زوور بەکاری ئەهینن. چوون کە کانوو سەر چەشمەی ژیانی، روژانەی کورد پی نی شان ئەدات، بالورە- دەنگ بیژانی کوردیش: لە کوری شایی کاندا بەکاری ئەهی نن. ئەم قسەی پی شینانە پروو پووچ.. مەتەلانە.. لە دلوو میشکی ژیانی، دەستەو چەوساوەکانوو، ئەرکوو زەحمەت کی شانی کوردەوە.. هەل قولاوە. گیان و ژیانی کورد بو عالەم دەرئەخات، طبیعت و چیاکانی کوردستان دەشتوو خاکی رەن گین یان، پیت وبەرەکەتی، سەر گەردانی، ژیر کەوتەنوو- سەرکەوتن یان.. رەوشت و رەف تاری کورد دەرئەخات. ئەم قسەی پی شینانە یک رەستە و دوو رەستە، کور توو معنا دار، آوازاروو و آهەنگ دارە، قافەیەکانی کورتە رەستە. گەلیک یان بە کوورتی چی روکیک، سەر گووررووشتەیک پی نیشان ئەدات. دینی سوسیو ئەکونومی، می وان پەرەستی یان جووامیری جەنگ جوویی - کورد بو عالەم دەرئەخات ژیانی زەحمەت کیشانی کورد آش کرا ئەکات... شادی نا سازی یان روون ئەکاتەوە، مسئەلەی تصنیعت- دەست کردیان کردری خومە. بەلام قسە وگەو هەرەکانەیان، کردەی کاتوو دەمەی رابردووی بابوو باپی ران مان.. بو عالەم دەرەکات.. گەوهەرەکانی هی بەندە نی یە خاوەنیان هی باپی ران- دا پی رانەمانە...

Proverbes of Enigmes Kurdes بەناوی Roget Lescot پروفیسور

١. Extroit de la roune des Etudes Islamiques. Ammea ١٩٣٧. Cahier N. Paris

hibraisie Orientalite Paul Geuthnes. ١٢, Rue Varin VI: ١٩٣٧ ڕوژە ڕەسکو، بە ناوی مەتەل- قسەی پی شی نانی کورد ئەلی:- لەم نامیلکەیەدا بە فرانزی بە کوورتی وا لە ژی ڕەوە نووسراوە:

"وەکوو کاروو کرداری کورد: مرحی و جاه و شهرەت یان، برایەتی یان، ڕوودارو ژیان، ژی ری، نەزانی یان.. تەبایی ژیانەیان، دروو دەلەسە، دوو زبانی یان. بەخ توو شانسیان.. نەرمی دل نەوازی یان، حوکم کردن یان، تاوان باری، نا ریکی یان، دوو بەرەکی یان.. شادی ناخوشی یان، قەرزوو قولەیان، ڕاستی حق پەرەستی یان- دل سوزی یان، صبر و تحمل- بەرگە گرتن خو ڕاگرتن یان، او مید و هی وایان. هی زوو توانایان.. قضاو قەدەریان! ژنان یان، سەرگەردانی، مال ویرانی یان، عەدالەتوو- خانە دانی یان، گیان جەنگی یان. ناموس و شەرەفوو وعدیان.. می وام پەرەستی یان، سەربەخویی، نان کوری یان، بەختی ڕەشوو- مصیبت یان... بەسەر هات یان، ئەدەبوو شەرمەنی یان.. آتاجی ژیان یان ... هتد"

جگە لەمانەش دووروودریژ باسی هەژارانی کورد، سەرگەردانی، پەری شانی مال ویرانی یان بەختی ڕەش یان.. آتاجی یا نیشی باس کردووە . بە مەتەلی کوردی: بە وی نە آهەنگی تطور- تجددی کوردیشی شەرحوو تفسیر کردووە، حال و ایەندەی کوردی بە قەسەی پی شی نانی کورد دارەشتووە. باسی ژیان و مردن، پی ری.. جون لیک دراوەتەوە ئەمانەشی دەرخستووە.

٢. Comptes Rendus Pullication Kurde en Cas acteres Latin: Par M. Piesre Randot. Le Caire imprimerie de l'imtitut Francois D'arch'lagie Ovietal- ١٩٣٣. Page. ٧

به پەلە ئەم نامەیەم نوسی تاکوو الاطروحەکەت Thesis بوو دکتورا بە اسانی وەرگریت.

ئەم تووانی بەسەریا برووەمەوە، لە توو دور بیت توزیک ناساغم.. لەبەر ئەوە لە هەلەکانم بەبورە، بە چاویکی دل سوزی تەماشای کەموو کووریەکانم بکە.. اگر بە چاکی ئەزانی ئەم نامیل کەیَم پی شانی مامۆستاکانی بەدە. بزانە ئەلین چی؟ چی ئەفەرموون..؟! ئەگەر خبردارم بکەی، گەلیک پەی شاد ئەبم. هیوا دارم ئەم نامەیم ، انشاالله بە دەستان ئەگات. وون نابیت بە ایزنی خوا.. دای کوو باب تان، خووشکوو براتان گش تیان فرە خاسن، چاوتان دەست تان ماچ ئەکەن، دووعایی سەرکەوتن، دوکتوراتان بو ئەکەن. هەموو لایک بە کەیفن الحمد ل لله ... ئی مەش سووپاس بوو یەزدان باشین.. نیازمان ئەوەیە بە خوشی سەربەرزی بگەرەی تە ناو عیراق.. ئیتر هەر بەژین

عیراق- سلیمانی: گەرەکی چوارباخ اسماعیل حقی شاوەیس

ترجمەی حالم:- Biography.. لە شاری موصل هاتوومە دونیا سالی ١٨٩٦. لە مکتەبی روشدی عسکری – اعدادی سلیمانی- بغداد خویندەنم تەواو کرد، سالی ١٩٠٣-١٩٠٨ لە استانبوول لە سالی ١٩٠٩:١٩١٢. لە مەکتەبی جریمەی شاهانە دەرچووم، بە رادەی شاهانە بە ملازم ثانی. چومە ناو جەنگی بالقان- گریک ١٩١٣ لە سالونیک دیل کرام، گەرامەوە استانبوول-١٩١٣- ١٩١٤ . چومە ناو جەنگی جیهانی – یەک ١٩١٤- ١٩١٨ گەرامەوە شاری سلیمانی- ١٩١٨- ١٩١٩ لەگەل شیخ مەحمود جەنگی کوردستانی عیراق-١٩١٩ بە نوو مایەندەی کوردستان چوومە کەرکووک، لەگەل ژەنەرال فرای زەر، حاکمی کوردستان- میجرسون مستشر دا ، لە بو مسئلەی کوردستان بوو صلح و وتوو وی ژم کرد.. پی یان وەتین بی قید و شەرط اسیرەکان-کوردستان تسلیم کەن.. انجا مذاکرەی استلالی کوردستان لەگەلتان ئەکەین. منیش وتم: "لە هەردوو لا گەلی خەسارەو کوشتار بووە.. انگلترە لەم جەنگە مسئولن بە پەی معاهدەی

کوردستان ئەبی استقلالی- کوردستانی عراق و محافضە بکریت و هەرچی خونیک رژاوە، لشکری حکومەتی، مەلیکی کوردستان شیخ محمود مسئول نییە. گوناهی هەر دوولا لە سەر انگلیزە.. انگلیز مەسئولە، ژەنەرال فرای زەر ووتی: بی جەنگ پیویستە کوردستان تەسلیم بکریت.. ئی مە لشکرمان زوورە، اگر پی ویست بەکات لە بغداد، بصرە، هندستانیش لشکر و سپاە دی نی نە کوردستان، ئەی گرین. من ووتم: مسئولیتی جەنگ ئەم روو دواروژی بار گرانی مسئولیتی لەسەر شانی ئیوەیە. قەومی کورد، مەلیک کوردستان لشکری کوردستان هیچ مسئولی یەتیک-دفاعی ناخاتە سەر شانی .. انگلیز ئەت وانی بە خونوو- جەنگی زوور بیتە ناو کوردستان لە سولەیمانی ئەگریت بەلام ناتوانن. بینە ناو جەنگی کوردستان .. سوولی مانی ئەگریت بە خونیکی زوور... بەلام ناتوانن بینە ناو دەلوو جەرگی کوردبەم رەنگە بە شەر جوابی ژەنەرال درایەوە. ئەم جا جنرال فرای زەر وتی: ئەدیلەکانی هند انگلیزتان بو کووشت، ۲ میل یون رووپیە خەزینەتان تالان کردووە.. جەنگی زووریش کراوە.. پی ویستە ئەمانەش بەدەن... جەوابا ووتم: غنائم حربی یەکی زوور کەوتووتە دەست لەشکری کوردستان... ژەنەرال ووتی: خو ئەت وانین توو بکوژین، ئەلەی چی؟ ووتم: بەلی ئەت وانن ئیوە من بکوژن.. بە خونی خوم ئەلیم دیلەکان برین دارەکان.. نە کووژراوون خزمەتیکی باش کراون بە مریشک و فرنی بریندااران تەداویەکی باش ئەکرین دیلەکانیش ژیانیکی مروڤانە ئەژین.. بەم قسەیەم دلیان خووش بوو.. بەلام هەر لەشکر بوون انگلیزەکان بە جەنگیکی خوینین هاتنە ناو سولەیمانی تەماشایان کرد قسەکەم راست دەرچوو. لە پاشان بە تبدیل قیافەت لە سلیمانیەوە، بە ریگای کوردستانی ایران – تەوریزە.. چومە (وان): ۱۹۱۹: ۱۹۲۵لە جەنگی ارمەنستان – آراس –قارص ایزمیر دا بەشدار بووم- ۱۹۲۰ لە دژ ئاشنامە لەشکری کەمالیستان بەرووبری کاپتانی بوزیاش Majer - خزمەتم بووە.. لە جەنگی استقلالی تورکدا.. هاتمە عیراق ۱۹۲۷ بووم بە معلمی مکتبی ابتدائی.. لەسەر سیاسەت انگلیز دەری کردم.. چومە پاریس ۱۹۲۷-۱۹۲۸. هاتمە ناو لەشکری عیراق بەویش تقاعد کرام لەسەر سیاسەت.. دوو جار لە پاریس – فرانسە بووم ۱۹۲۸-۱۹۳٤ لەگەل روژنامەکانی پاریسدا، دوورودریژ باسی

شورشی –کوردستانی- تورکیا شیخ سەعید کرا.. تورکیا فرانسەی پروستوی کرد. گەرامەوە عیراق- لە ١٩٣٦ لە زمانی پاشا. مستعد عالی گیلانی بووم بە قائیم قامی آکری – رانیە- مخمور- ١٩٣٩ لە سالی ١٩٤٠ فصل کرام. لە سالی ١٩٥٥؛ ١٩٥٧ لە زیندانەکانی سلیمانی کەرکوک – بغداد- دیوانیە و شامییە حبس و لە پاشان بو (رمادی) طرد وتبعید کرام "لەسەر شورشی درسیم – تورکیا ١٩٢١؛ ١٩٢٧؛ ١٩٣٩ بو عقبە الامم پروستو تقدیم کرا، داوایی لجنەیەکی تحقیق دووەلی بو کوردستانی تورکیا بو تحقیق — و قتل عامی کورد، لە لایەن تورک، بو احکام و ، داوای معاونت و احداد لە حکومانی عالەمی عەرەب – عیراق کرا.. لە کەرکووک محاکمە کرام و خرامە ژیر مراقبەوە.. ئەم پروتوستانە کە بەندە تقدیم کردبوو، دەنەگیکی باشی دایەوە لە عالەمدا.. تورکیایی پی شەپەرزە کردبوو..؟!

لە پاریسدا فرانسەدا: بە کری کاری، فوتوغرافچی

ژیانی رابووارد... ئی تر هەر بژین چاوەکەم

24/ ... /1974 سلیمانی – ...

[illegible]

**سوپاسی زۆر بۆ تۆ و بۆ چاوەکانت.**

نامەی بەختیار عەلی بۆ ئازاد بەرزنجی

ئازیزەکەم بەرزنجی

ئازاد گیان ئەم کاتەت لە هەر کاتێ جوانتر و خۆشتر و شیرینتر بێت، سوپاسی زۆر بۆ تۆ و بۆ چاوەکانت[1]، کارێکی جوان و وەرگێرانێکی نازک بوو. لەزەتیکی زۆرم لە خوێندنەوەی بینی. ئێجگار تامەزرۆی هەوالتم، خۆشحاڵیشم کە لەو گۆڤارەدا چالاکی، هەقە هەوڵ بدەیت باشتر بە دەستم بگات، ئاخر ئەگەر لە ڕێگای خەڵکانی ترەوە نەبیت، نایبینین. بەرزنجی گیان، باوەرت بیت بیرت ئەکەم، هەموو جارێ دەڵێم (بەرزنجی) مەملەکەتی خۆی هەبوو، لە مەملەکەتەکەشیا، شتەکان، بە پێی جوانیان ڕیزدەبوون.. باوەڕم پیتە وەکو یەکەم (چێژبینی) لە جوانی، ئیدی لە جوانی تێکستەوە تا جوانییەکانی تر. بەرزنجی بە ئومێدی ئەوەی ئەم ساڵ، ساڵیکی پر بەرهەم و ئاسودەیی بێت، دووبارە لە دەوەری مێزێک، بە دیار بیرەیەکەوە دانیشین، لە داهاتوودا هەندی بەرهەمتیان بۆ دەنێرم، شتێکم لەسەر دیوانەکەی کاک شێرکۆ [بیکەس] نووسیوە، بۆتانی ڕەوانە دەکەم. با زیاتر ئاگامان لەیەک بیت، سلاوی زۆرم بۆ کاک رەوئوف و کاک عەبدولا تاهیر (بەرزنجی) و مامۆستا حسین عارف . سەنا و بیریانی کچم ڕێزیان بۆ خۆت و مونیرە خان هەیە، هەروەها خۆشم حورمەتی تایبەتیم بۆ ماڵەوەتان هەیە. دەستخۆشی کورتە چیرۆکێکی جوانیشم لە ئێستا دا خوێندەوە.

ڕیزی زۆر و هیوای زۆر بۆ ٩٨

بە ئومیدی دیدار

بەختیار عەلی ٩٨/١/١٦ فرانکفۆرت

---

[1] مەبەست لە وەرگێرانی ڕۆمانی (چاوەکانی) بوزورگی عەلەوییە:
بوزورگی عەلەوی، چاوەکانی، و.ئازاد بەرزنجی، چاپی دووەم، ١٩٩٨

**ریسک؛ یەکێکە لە هەرە جوانترین ئەو قەسیدانەی کە..**

نامەی بەختیار عەلی بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

برای ئازیز کاک ئەنوەر(ی رەشی عەولا)

سەرەتا سوپاسێکی بێپایانْ بۆ نامەکەت و بەسەرکردنەوەکەت، هیوادارم سەرەتای پەیوەندییەکی بەتین و برایانە بێت لە نێوانماندا. لە راستیدا زۆر دڵخۆشم لەوەی کە لەم کاتە ناخۆشەی ژیانی مامۆستا شێرزادیشدا یەکێکی وەک بەڕێزتان لێوەی نزیکن و دڵنیام کە مامۆستا لە نزیک تووە هەمان ئەو رۆحە پڕ لە مەحەبەتە دەدۆزێتەوە کە مرۆڤ لە دۆخە دژوارەکاندا پێویستی پێیەتی.

شتێ کە من سەیرم لێدێت، ئەوەیە کاک ئەنوەر کە (من) چۆن لە هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا رێکەوتی ئێوەم نەکردووە، بە تایبەت تۆ پێدەچێت برادەرێکی نزیکی کاک (دلاوەر قەرەداغی) بوویبێتی. (دلاوەر) کەسێکی نزیک بوو لە من، یەکێکە لەو رۆحە پاک و بێغەشانەی ئەو واقیعە، جگە لەوەی کە شاعیرێکی نازک و شانۆکارێکی بەهرەمەندە.

هەروەها زۆر سوپاس کە دیوانەکانت بۆ رەوانە کردم، لە راستیدا بەر لە ئێستا هیچیانم نەبینی بوو. بەڵام هەڵبەت هەندێ لە شیعرە بڵاوکراوەکانتم بینی بوو. بە گشتی دەستخۆشیەکی راستت لێدەکەم، ئەوەی لێرەدا شایستەی گوتن بێت. ئەو جیاوازی و گەشە شیعرییە گەورەیەیە کە لە نێوان دیوانەکە و قەسیدەی (ریسک) دا لە گۆڤاری بینین[1] دا دەبینرێت. هەستەکەم پەرەسەندنێکی زۆر سروشتی و هەنگاو بە هەنگاو و قوڵ رویداوە. لێتناشارمەوە گەر بڵێم قەسیدەی ریسک یەکێکە لە هەرە جوانترین ئەو قەسیدانەی کە ماوەیەکی زۆر درێژە

---

[1] "بینین" گۆڤارێکی وەرزی کلتوری و سیاسی بوو، ساڵانی کۆتایی نەوەدەکان لە ئەمریکا دەردەچوو، ئەردەڵان هەردی خاوەن ئیمتیاز و بەڕیوەبەری هونەری ریبوار سەعید بوو.

نەمخوێندۆتەوە... قەسیدەیەکی یەکگرتوو و پتەوە کە بونیادێکی یەکانگیری هەیە، لە رۆژێکدا پێموایە یەکێک لە عەیبە کوشندەکانی شیعری کوردی وونکردنیتی بۆ (سەنتەر)ێکی یەکگرتوو.. سەنتەرێک کە قەسیدەکە کۆ بکاتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە قەسیدەکە گۆڕانێکی گرنگی تیایە وەکو (بابەت)، لەگەڵ قەسیدەکانی پێشوودا.

لە کۆی دیوانەکانیشدا پارچەی زۆر جوان هەیە، بە داخەوە کە پێدەچێت بە شێوەیەکی بەربڵاو نەکەوتبێتە بەردەست. بە گشتیش وا هەستدەکەم لە داهاتوودا شتی جوانتری بەڕێزتان دەخوێنینەوە.

هیوادارم لە داهاتووشدا بتوانم دیدەنیتان بکەم و پتر قسە بکەین. ئازیزم، پێخۆشحاڵدەبم لە داهاتوودا زیاتر لەسەر هەموو شتەکان قسە بکەین، هەرچەندە ئەم پەرش و بڵاوییە زۆرە، ئەم پەرتەوازەییە گەورەیە نەفسی هەموومانی لەسەر زۆر شت کوشتووە، بە ئومێدی ئەوەی هەموو ئەو هێزەمان تیا بێت کە بەسەر ئەو هەموو تەلبەند و دیوارە بینراو و نەبینراوانەدا سەرکەوین، ئەو هەموو لەیەکدووری و پەرتەوازەییە بشکێنین....

دواجار ڕێزی زۆرم بۆ خۆت و خێزانەکەت. سوپاسی زۆر کە بەو رۆحە گەورەیەوە مامۆستاتان لە ئامێز گرتووە.

برات/ بەختیار عەلی

**لەم کەلاوەیەدا، تەنیا موبدیع زەرەرمەندە...**

نامەی بەختیار عەلی بۆ شێرکۆ بێکەس

مامۆستای ئازیز کاک شێرکۆ

ریز و خۆشەویستی و سلاو

هیوادارم تەندرووست و پر لە ئیشراقی شیعر بیت. ئەمرۆ لیکۆلینەوەکەم بۆ پۆست کردیت، دوواجار هەست دەکەم بۆ ئەوەی تەواوی هەقی ئەو دیوانە گەورەیە بدەم، پێویستم بە نووسینی دیکەش هەیە، درێژی باسەکە دەلیلی ئەوەیە، کە هێشتا زۆر شت ماوون بگووترێت. هەندێجار میحوەرەکانم بە جۆرێ کورتکردۆتەوە کە بە ئەندازەی گوتارێک دەرچێت بە کەلکی بلاوکردنەوە بێت. لەو باسە دا تەنیا لەسەر ململانێی ژیان و مەرگ دوواوم، بەلام ئەزموونی ئێوە دەکرێت لە چەندەها گۆشەنیگاوە بخوێنریتەوە. لە داهاتوودا دەشێت لە دەلاقەی هەندێ ئەزموونی ترەوە جاریکی تر بچمەوە ناو ئەو جیهانەوە. بەلکو لە پاشەڕۆژدا بە کۆ ببیتە پرۆژەی کتێبێک.

سەرەتا حەزەکەم بەڕیزتان بیخوێننەوە و ئەوسا بڕیاری بلاوکردنەوەی بدەین، نازانم. ئایا دەشیت بۆ گۆڤارەکانی کوردستان کەمێ درێژ بێت، ئەگەرچی بە دلنیاییشەوە هێندە درێژ نییە کە بلاونەکرێتەوە. ئەگەر حەزت کرد لە کوردستان بلاوی بکەینەوە، کە هەلبەت حەزی منیشە ٤\٣٠ فارووق[رەفیق]دەگەڕێتەوە و فرسەتیکی زۆرباشە بەودا بینێرینەوە.

سەبارەت بە دووا قەسیدەشت کاک شێرکۆ، بۆخۆی بەلگەیەکی گەورەی توانای نوێبوونەوە و گۆرانکای فۆرم و بینینە لە ئەزموونی ئێوەدا، من دلنیام ئەگەر پرۆسەیەکی رەخنەکاری راستەقینە لە ئەدەبی ئێمەدا هەبووایە، دەبایە هەنگاو هەنگاو پەرەسەندنی فۆرم و ڕۆیای لەم ئەزموونەدا تۆمار بکردبایە، بەلام لەم کەلاوەیەدا تەنیا موبدیع زەرەرمەندە و موهەریج و کۆلکەقەلەم براوەیە. سالەهای سالە رەخنە و نووسینی ئێمە ئیبداعی ئێوە پشتگوی دەخات، هەر تەنها

سەردەلەقێنین و دەڵێن (جوانە) یان جنێو دەدەن. هەر دەم خواخوایان بووە (یەکیتی نیشتمانی) هەڵەیەک بکات تا ئەوان پەلاماری ئێوە بدەن..سەد ئەفسوس، کە بە قەڵەم و دوو قەڵەمیش ئەو کەلەپوورە فەرامۆشکراوە هەمووی ناخرێتەوە سەر ڕێگای خۆی. من دوای خوێندنەوەی ئەم دیوانە و ئەم هەوڵە نوێخواز و قوڵانەی ئێستاش پتر هەست بە نزیکایەتییەکی گەورە دەکەم لە ڕۆحی تەجروبەکەی تۆوە..

هیوادارم زوو نووسینەکەت بە دەست بگات و رات لەسەر ئەم هەوڵە بزانم، کە دڵنیام هێشتا ئاسۆی کراوەی دیکەی زۆر تیایە بۆ ئیشکردن.

(.....)

ئیتر هیوام سەرکەوتن و سەرفرازیتە

بەختیار عەلی

**تەنها تێکستە مردووەکان، لەیەک دەچن.**

نامەی بەختیار عەلی بۆ کاروان کاکە سوور

ئازیزم کاک کاروان عومەرکاکەسوور

هیوام خۆشیتە، بە هیوام ئەم ساڵ، ساڵی گەشانەوەیەکی گەورەتر بێت. ساڵێکی پڕ لە جوانی چیرۆک، بەش بە حاڵی خۆم لە دوای (ئەسپیدیلۆن)[1]دڵنیام کە لەبواری چیرۆک دا داهێنەرێکی ترمان هەیە. بۆ ئەم ژمارەیەی رەهەند شتێکی بچووکم نووسیوە، دوواتر بە درێژتر لەسەر ئەو چیرۆکانە دەنووسم. کاک کاروان، من لە دەنگی تۆدا، دەنگێکی نوێ دەبیستم، کە پێشتر فەزای چیرۆکی ئیمە نەیناسیوە. تکاشم وایە گوێ لە هەندێ وردە رەخنە مەگرە، چوونکە کەسانێ هەن تەنها مەبەستیانە خۆیان وا بخەنە روو، کە تێبینیان هەیە. لە ڕاستی دا من بە پیچەوانەی بۆچوونی (......) هەستدەکەم کە دونیای چیرۆکەکانی تۆ جیا و هەمەڕەنگە، بەلاّم خوێندنەوەی ورد ئەو هەمەرەنگییە دەبینێت، کێشەکە ئەوەیە کە لە ڕۆشنبیری کوردیدا، هەندێ جار هەموو شتەکان وەکو یەک دەبینن، هۆکەش ئەوەیە کە جیاوازی بینین، هونەرێکی گەورەیە، بینینی جیاوازی، واتە بینینی جەوهەر. چوونکە هەموو ئەو شتانەی لە دونیادا وەکو یەک دەیانبینین، لە قولاّیدا جیاوازن، تەنها تێکستە مردووەکان، لەیەک دەچن، بەلاّم من لە هەموو چیرۆکەکانی تۆدا، ژیانێکی گەرم و خەیاڵێکی نەسرەوت دەبینم، ئەو جیاوازییە تەنها جیاوازی، زمانی گێرانەوە نییە، بەڵکو جیاوازی وەسوەسە و ترس و مۆتەکەی پاڵەوانەکانە، دستۆیڤسکی لە رۆمانە یەکەمییەوە تا برایانی کارامازۆڤ، یەک زمانی هەیە، بەلاّم لە ناو ئەو زمانەدا تارمایی هەزارەها ڕۆحی پڕ ئەشکەنجەی جیاواز جیاواز، دەبینرێت، من دوواجار هەست دەکەم، کە تۆ ڕێگایەکت گرتۆتەبەر، من لەو دیویەوە، کاتێک دەخوێنمەوە، هەست دەکەم، لە قولاّییدام، چیرۆکنووسی گەورە ئەوەیە کە

---

[1] ئەسپیدیلۆن ناوی چیرۆکێکە، لە کتێبکدا بەهەمان ناوەوە چاپ بووە.

ئەگەرچی زمانەکەی سادەبێت، یان بابەتەکەی، بەڵام دوواجار، لە پشت هەموو ئەو کەرەسە شەفافانەوە، ئێمە هەست دەکەین لە قوڵاییداین.

من لە ناو جیهانی چیرۆکەکانی تۆدا، هەمان ئەو هەستەم تیادرووستبووە، کە لەگەل جیهانی چیرۆکە گەورەکاندا تیامدا درووست بووە. من بەردەوام دەمگووت: ئەمە ژیانە، ئەمە کەسە سادەکانی ژیانن، کەچی من نەمبینون، بەڕای من هیچ شتیک وەکو چیرۆک کەمتەرخەمی ئیمە بەرامبەر بە ژیان ئاشکرا ناکات. دووای هەموو خوێندنەوەیەک دەپرسم، چەند ڕووبەری تر و چەند زەمینی نەدۆزراوەی تر هەیە، کە ئێمە هەرگیز پیی تێناخەین، نایبینین... بۆیە من هەمیشە وا سەیری چیرۆک دەکەم، کە هێمای ئیلتیزامی ئیمەیە بە چارەنوسە یادکراوەکانەوە.

لە ڕاستی دا بۆیە ئەم کومەڵە چیرۆکە زۆر بە گرنگ دەبینم، چوونکە بە گەورەیی پانتایی، ئەو دونیا فەرامۆشکراوەمان پێدە ناسێنێت، وادەکات، ئەو چارەنووسانە ببینین، کە نەمانبینیوە..ئەو شتانەش ناهێنێتەوە یاد، بەڵکو کەمتەرخەمی خۆمان دەرهەق بە چارەنووسەکان، دەرهەق بە فەردە بچووکەکان، دەرهەق بە ئارەزووە کوژراوەکان لادەچەسپێنێت. وەزیفەی چیرۆک ئەوەیە نەهێڵێت، مرۆڤ ببێتە کائینێکی لەیادکراو، لە ئەسپیدیلۆنیشدا ئەو وەزیفەیە، بە هەموو مانا گەورەکانی هەیە..ئیدی ڕەخنە، هەموو ڕەخنەیەک، کە لەو ڕاستییەوە دەست پێنەکات، ڕەخنەیەکی درۆزنە.

هاوڕێم جاریکی دیش هیوام بەردەوامیتە، تکایە با نەهێڵین جوانی ببێتە ڕووبەریکی ئەتک کراو..

خۆشەویستی زۆر زۆرم قەبوڵبکە

برات
بەختیار عەلی
فرانکفورت - ٢-١١-٩٨

**تەنیا ئەو شتانە دەبێ بمیننەوە، کە دەبێ بمێننەوە.**

نامەی بەرۆژ ئاکرەیی بۆ دڵسۆز حەمە و...

(نامەیەکی کراوە بۆ دڵسۆز حەمە و چەند کەسێکی تر... و... خۆم) [1]

..هەر شیعرێکی سەرکەوتوو، ئازارێک لەگەڵ

خۆی دێنێ و ڕووتی دەکاتەوە یان بە :

پێچەوانەوە حەشاری دەدا. لەوانەیە

بتوانین بڵێین: هەر شیعرێک زادەی

ئازارێکە (تەنانەت ئازاری شیرینیش!)

شاعیری دەردمەندیش قاوغی پەیڤەکانپڕ

دەکا لە دەرد و ژان!

ئاکامەکەی؟...: تەنیا خوێنەری

وریایە کە بە گوللەی دەرد دەپێکرێ!

لەوانەیە بتوانین بڵێین: شیعر

زادەی حاڵەتێکە کە خەیاڵ تێیدا

تووشی ئازارێکی خوازیاری

مەرهەمی پەیڤە.

---

[1] دەقی ئەم نامەیە، هەر لەو سەردەمەدا لە مانگنامەی "پەیام"دا (لەندەن) بڵاو کراوەتەوە.

پەیڤەکان، بەڵام بە ئاوێتەبوون و لێکترازانیان، ماناکان دەگەیەننە مەبەست یان دیسان بە پێچەوانەوە. مۆسیقای هەر پەیڤێک، ڕەنگ و ڕوخسار و هەناسەی پەیڤەکەیە. هیچ پەیڤێکیش (نە لە ڕووی مۆسیقا و نە ماناوە) نە جوانە و نە کرێت. تەنیا بە تەنیایی خەوتووە و هەر کە بیرمان لێی کردەوە، یان هێنامانە سەر زار (یانژی کاغەز) لەخەو ڕادەبێ و ڕادەکاتە نێو توێکڵی مانا ئەزەلییەکەی خۆیەوە. شاعیر، بەڵام دەتوانێ توێکڵی ڕۆتین لابدا و لە چاوی پیت و هارمۆنیای پەیڤەوە بڕوانێتە چاوی مانایەکی دوور کە لەسەر کاغەز خەریکە چاو هەڵدەگلۆفێ. لە ڕستەیەکی شاعیرانەدا (نەک پەیڤی شاعیرانە، چونکە هیچ پەیڤێک بە تەنیایی شاعیرانە نییە) گەلێ جار، ماناکان ڕێگایەک دەگرنەبەر و دەنگی پێی پەیڤەکانیش، ڕیتمی هەنگاو هەڵهێنانیان دەچرپێننە گوێی خوێنەری وریاوە. ڕیزکردن و لێکدابڕانی وشە و ڕستەکان، چاوی وریا بەرەو سەرچاوەی چێژپەلکێش دەکەن، یان دیسان بە پێچەوانەوە.

لە زمانی ڕۆژانە و ڕۆژنامەدا، وشەکان خزمەتی ڕێکبوونی ڕستەکان دەکەن و ڕستەش گەرەکیەتی بگاتە مانای مەبەست. لەو شێوە زمان و داڕشتنەدا، هەر کە هاتین و گەیشتینە مەبەست، هەموو شتێک تەواو دەبێ. واتە: یان لەگەڵ دەربڕینەکەدا ڕێکین، یانژی: نا. دیارە مەبەستم ئەوەنییە کە شیعر (یان ڕاستتر بڵێم: شیعر زمانی)مەبەستی نییە. نەخێر و ڕێک بە پێچەوانەوە! بەڵام بەو جیاوازەوە، کە لە زمانی شیعر دا، جوانی و ڕازاندنەوەی پەیڤەکانە کە چێژێکی تر، چاو لە دەستمان دادەگرێ. واتە لە دەقێکی شیعری سەرکەوتوودا، نە تەنیا ڕستەکان، بەڵکو پەیڤە نووسراو و نەنووسراوەکانیش زەینی ئێمە بەرەو فراوانبوونی خەیاڵ پەلکێش دەکەن. "ڤالێری" لەو بڕوایەدا بووە کە پەخشان ڕۆیشتنە و شیعریش سەما. واتە: لە ڕۆیشتندا ئێمە مەبەست و مەخسەدیکمان هەیە و هەر کە گەیشتین بەو شوێنە پێچەوانەوە یان جووڵانەوەمان بە ئاکامێک گەیشتووە. کەچی کە سەما دەکەین، مەبەستی گەیشتن بە هیچ شوێنێکمان نییە وچێژی سەما لە سەماکردندایە نەک لەو مەبەستەی بۆی هەڵساوین.

ئەگەر ڕاستبێ کە گوتوویانە: "هونەر، واتە: جوانی و ئەفسووس!" لەوانەیە بڵێین: چونکە هەموو جوانییەک بەرەو سیسبوون و هەڵوەرین و فەنا دەچێ، هەر کە جوانیمان کەوتە بەرچاو، فەوتان و نەمانی "وەکو داسێک بە زەینماندا ڕادەبووری": ئەم جوانییە خەریکە بەرەو نەمان ڕێ دەکا و خاڵی برانەوەیشی، داخێک لە دەروونمدا بە جێ دێڵێ. شیعری جوان، هەمیشە ترسی تەواوبوون بەرجەستە دەکا و داخێک بەجێ دێڵێ.

لەوانەیە لە من چاکتر بزانیت کە شیعری کلاسیک (نەک "کۆن"! چونکە شیعری سەرکەوتوو، کۆن و نوێی نییە"!!) بە دەست چەند پاتەبوونەوەی میتافۆرەکانی خۆیەوە خنکا. یانی لە ماوەیەکی درێژدا، میتافۆرەکان بوون بە قاڵب. "برۆ" بوو بە "کەوان". "چاو" : "نێرگز". "دەم": "غونچە". "کۆنا": "هەنار" و هتد.. شیعری هاوچەرخ (نەک "نوێ"! چونکە..) بۆ ئەوەی بتوانێت هاوچەرخ بێت، دەبا ئەم قاڵبانەی وەلانابا. لە لایەکی ترەوە لافاوەکە بە چەشنێک بوو کە گەرەکی بوو گشت شتەکان، ڕامالێ و خۆی، دەنگی خۆی بێ، تا لە ئاکامدا هەر کەسێک ببێتە خاوەنی دەنگی خۆی. (لێرەدا هێشتا باسی ناوەرۆکمان نەکردووە. چونکە ئەو کەسەی لە شیعردا، تەنێ عەودالی ناوەرۆکە، بە هەڵە ڕێی کەتۆتە ئەم هەوارەوە!) حەزدەکەم بڵێم: شیعری جیلی بەر لە ئێمە (حەفتاکان؟) بەلەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتیی قۆناغەکەیانەوە، چەندین داهێنیان کرد و بارەکەیان لە مەنزڵێکەوە گەیاندە مەنزڵێکی تر، بەڵام هەوڵ و کۆششی ئەوانیش (لە نووسین دا) میتافۆرە سیاسییەکانی کرد بە قاڵب و زەینی خوێنەریان پێ سیواخ دا. واتە هەڵەیەکیان کردە باو کە زۆربەی شاعیرەکان پێیان وابێت: بە دۆزینەوەی فیکرەیەک مل لەبەر داڕشتن (نەک داهێنانی) شیعر بکەنەوە، ئەم فیکرەیەش بە لای منەوە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ "گەلخوازی"، "شۆڕشگێرییەت فرۆشی"، "دیلخوازی"، "کوتانی فیکرە یان کەس و کەسانی نەیار" و ... بەم دواییەش: "پۆست مۆدێرنیزم فرۆشی"! (لەوانەیە من لەگەڵ فکرەیەک لەمانەی کە لێرەدا ناویان هاتووە، تەبا یان ناتەبا بم، بەڵام مەبەستم ئەم ناوەڕۆکگەراییە نییە، بەڵکو دەمەوێ بڵێم: شیعرێک کە دەبێتە گۆچانی فیکرەیەک، خودی گۆچانبوونی شیعرەکە دەچێتە ژێر پرسیارەوە، نەک فیکرەکە.

دەتوانین لە دەرەوەی شیعردا لەو فیکرەیە بکۆڵینەوە یان لە ئاستیدا بێدەنگ ببین. هەر بۆیەش بینیمان لەم دواییەدا، چەند کەسیک (یان تەنیا یەک کەس؟) بە پاکتاوکردنی فیکرەی شیعرەکانیان هەڵسان. شیعرێک کە تۆ بتوانیت دوای سەردەمێک فیکرەکەی لێ دەرهاوێژی، کەمترین مانای ئەوەیە کە فیکرەکە بە چەشنێک ئاوێتەی شیعرەکە نەبووە کە نەتوانی لێی جیا بکەیتەوە و ئەم مەترسییە لە زەین دا دەڕوێنێ کە مەبادا لە سەردەمێکی تردا، (کە شێتکی تر دەبیتە مۆدە) ئەمەشیان لێ دەرهاوێژرێ و ..

" ئیلوار" لە وتاری "شیعر و بیری ئەبستراکت"دا دەڵێت: "دێگا"ی هونەرمەند کە جارجارە شیعریشی دەنووسی و شیعرەکانیشی خراپ نەبوون، ڕۆژێک بە "مالارمێ" دەڵێ: کاری ئێوە شاعیران کارێکی سەخت و پڕ لە ئازارە. من هەرچەند دەکەم ناتوانم ئەو شتەی بیری لێ دەکەمەوە بکەم بە شیعر، ئەمەش لە حاڵێکدایە کە زەینم پڕە لە بیری شاعیرانە. "مالارمێ" وەڵامی دەداتەوە: "دێگا"ی خۆشەویست، ئەو شتەی شیعری پێدەنووسرێت پەیڤە، نەک بیر!

کەواتە دەتوانین، پێمان وابێ: شاعیری ئێستا، دەبێ بیرێک لە شکاندن و داهێنانی نوێتر لە بواری زمان و فۆرمی شیعردا بکاتەوە و لە ئاکامدا: هەر شاعیرێ، خاوەنی دەنگی تایبەت بە خۆی بێ! دەنگی ڕەسەنی هەر شاعیرێک لە شیعرەکانیدا، ئەخلاقی ئەو شاعیرەیە. (دەنا من دەمێکە بڕوام بەو ئەخلاقە نییە، کە کۆمەڵگا گەرەکییەتی بە زەبری زەین و دین و دەست و دەسەڵاتە دیار و نادیارەکانییەوە بیکاتە قاڵب و ئێمەی تێدا بئاخنێ) .

پرسیار ئەمەیە: ئایا دەتوانین بە خوێندنەوەی شیعرێک، لە ڕووی زمان و فۆرم و داڕشتنیەوە بزانین ئەمە شیعری فلانە شاعیرە؟ نموونە: ئێمە کە لە ماڵێک دانیشتووین و چەند کەسێک سەر بەو ماڵە دا دەکەن، هەر کە دەنگیانمان کەوتە بەرگوێ، یەک دوانێکیان بە دەنگ دەناسینەوە. یان کاتێک ناسیاوێک تەلەفۆنمان بۆ دەکا، هەر کە قسەی کرد، بۆمان دەردەکەوێ خاوەن دەنگەکە کێیە. دیارە ئەوەی دەبێتە هۆی ناسینی دەنگەکە، ئەو بابەتە نییە کە ناسیاوەکەمان لە

تەلەفۆندا لێی دەدوێ (ناوەڕۆک!)، بەڵکو ڕێک ئەو شتەیە کە من خەریکم باسی دەکەم و نازانم مەبەستم دەگەیەنێم یان نا!

بە کورتی: ئەگەر قەرار بێ هەموومان وەکو یەک بنووسین، با یەکێکمان بنووسێ!

قەت بیرمان لەوە کردۆتەوە کە بۆچی ئێمەمانان تووشی ئازاری نامەنەنووسینین؟... زۆربەی ئەو خەڵکەی خەریکی نووسینن، نامەنووسینیان بەلاوە کارێکی سەختە. وابزانم بە وێستەکردن لە ئاست ئەم گرێیەدا بتوانین چەند پرسیارێک لە خۆمان بکەین. لە سەردەمی کەمێک کۆندا، هەموونامەکان یەک شێواز و فۆڕمیان هەبوو. واتە بێجگە لەو شت و کێشانەی لە نامەدا ئاماژەیان پێدەکرا (ناوەڕۆک) نامەوەرگر هەستی بە پەرژینێک لە نێوان خۆی و نامەنووسدا دەکرد. چونکە فۆڕمی نامەکان بووبوون بە قاڵبێکی ئەزەلی. ئێمە دەمانتوانی بە چاوخشاندن بەسەر پێشەکی و پاشەکی نامەکەدا، تەنیا مەبەستی نامەنووس بنکۆڵ بکەین. نامەکان بە گوڵ و ڕیحان و سڵاوی بۆنداری فلانە شاخوداغ دەڕازانرانەوە. واتە کۆمەڵێ میتافۆڕی ئەزەلی، لە گشت نامەیەکدا سەدپاتە دەکرانەوە. ئاکامیش: "ئەگەر لە هەواڵی ئێمە دەپرسیت، چاکین و چاکی تۆیش لە یەزدانی مەزن...". بەلام کاتێ لەو مێژوو و قۆناغە ڕاپسکێنراین و کەوتینە بەردەم کێشە تاکەکەسییەکان و هەستمان بە خەمی تاکەکەسی کرد، بینیمان تەنانەت لە ئاست تەنیاییشدا، تەنیاین. کەواتە ناچار بووین بە شێوەیەک نامە بنووسین (کە بەسەختی دەنووسین!) کە دەربڕی هەستێک بێ کە "پێی مەستین و بۆمان ناخرێتە ناو چوارچێوەی مەبەست"ـەوە. لەوانەیە ترسی ئێمە لە ئاست ئەو نامانە (کە ناوێرین بیاننووسین)دا ئەوە بێت، کە ناتوانین ڕووت ببینەوە. کە نەشمانتوانی لە ئاست خۆشەویستێکدا ڕووت ببینەوە، بێتاقەت دەبین. وابزانم **گۆران** گەیشتە ئەو بەربەستەی کە بۆ پەڕینەوەی دەبا ڕووت بباوە و لەو ڕووتبوونەوەیە نەترسابا و لە هەمان کاتدا هەم خۆی با، هەم دەنگی خۆی. (مەبەست ئەو شیعرانەیەتی کە شیعرن و فۆڕم و داڕشتن و ئاماژەکانی قەرزاری هیچ ڕووداو و سەرهاتێکی دەرەوەی خۆیان نین و تەنیا

دەگەڕێنەوە سەر خۆیان. شیعری خۆوەستاو!) شیعری ڕاستەقینەیش ئەو شیعرەیە، کە قەرزاری هیچ ڕووداوێک لە دەرەوەی خۆی نییە. بە واتا کۆن (بەڵام هەمیشە زیندووەکەی) "شیعر ڕووداوێکە، کە لە زماندا ڕوودەدات". واتە ڕووداوێک کە تەنیا دەکرا بەو شیوە دارشتن و لێکترازاندنەی وشە وڕستەکانی بمانهەژێنێ. دەنا... هیچی تر، نا!

بە وردبوونەوە لە زمانی کۆمەلایەتی و سیاسی و.. ڕۆژنامەگەری ئەم بیست ساڵەی دواییمان، بە داخەوە بۆمان دەردەکەوێ کە زمانی شیعری ئێمە بە پێچەوانەی ئەوانەوە، گەشەیەکی ئەوتۆی نەکردووە. دەتوانین تەنانەت بڵاوکراوە سیاسییەکانی بیست سال بەر لە ئێستامان بێنین و بخوێنینەوە تا بۆمان دەرکەوێ کە شیعری ئێمە لە زماندا (؟) نەیانتوانیوە ئەو قۆناغە ببڕێ. چەند هەوڵێک لەملاو لەولا دراون، کە مخابن سەقەتن! سەقەت بەو مانایەی کە بە لێکگرێدانی دوو پەیڤ، ناگەین بەو مەبەستە. نووسینی "گەلاوێژینوێ" و "خۆلەمێشمانرەنگکرد" و "دەنوکیبازیچرووکنگرمهەرەس" و...ناگەین بە هیچ شوێنێک. واتە ئەم چەشنە (نا)هەولانە لە جیاتی ئەوەی یاریکردن بن بە زمان، گاڵتەکردنن بە زمان! کەسیک کە نەختێک ئاشنای زمانی کوردی لە هۆنراوەدا بێت، ناکەوێتە بیابانی ئەم سەرگەردانییەوە. بۆ ئاوەدانکردن و داهێنانی زمانی ئەمڕۆ لە شیعردا، ناچارین هەڵگەڕێینەوە سەر میراتی ڕابردوو، ئەویش نەک بە کڕنۆشبردن و سەرسووڕمانەوە، بەڵکو بە قووڵبوونەوە لە زمانی شیعری ڕابردووە، کە دەتوانین بگەین بە زمانی ئەمڕۆ. زمانێک کە هی ئەمڕۆ بێ و لە زەمەنی زمان بدوێ. نەک لە زمانی زەمانە. پرسیار ئەمەیە: ئایا دەتوانین، تا بینە قاقامان مۆدێرن و پاشمۆدێرن بین و زمانی دەربڕینمان..! (پێویست بە نووسین دەکا؟..) دەمەوێ بڵێم: هونەر بە مانای داهێنان، واتە: دابڕان لە داهاتوو و بنیاتنانی ئاییندە. کێ بوو گوتی: هەموو هونەرمەندێک تووشی گرێی ئۆدیپە و گەرەکییەتی باوکی خۆی بکوژێ. باوکی هەموو هونەرمەندێکیش کلاسیزمە. ئێمە ناتوانین بە دوای کوشتنی کەسێکدا وێڵ بین کە نایناسین!؟

نازانم تا چ ڕادەیەک لەگەڵ قسەکانم دایتو لەوانەیە گرنگیش نەبێ.

گرنگ ئەوەیە کە شتێک لە نێو ئێمەدا نەبۆتە باو. ئەویش نووسینی خوێندنەوەکانمانە. خووگرتن بە شانهەڵتەکاندن و "شیعری چاکە" و " بەڵێ جوانە" و " خراپ نییە" و " جەسوورە"و .. تا دەگاتە ئەو شیکردنەوە و بۆچوونانەی لەمەڕ شیعرەوەن، بەلام فرپیان بەسەر شیعرەوە نییە. ئەم هەموو تەئویل و تەحویل و تەبدیل و بازنە و هێڵ و سێگۆشەکێشانەوە و ... گوتینی: "لەم سەردەمە ناسکەدا" و "لەم هەلومەرج و قۆناغەدا کە گەلەکەمانی پێدا تێدەپەڕێ" و "دەنگێکی تازە لە شیعری کوردی دا" و "شاعیری گەورەی گەلەکەمان بێت و بێکا بە هەلا" و "جەنابتان گەیشتوونەتە ئەو پەڕی شەفافییەت لە زماندا" و... ئاکامەکەی؟... کۆمەڵیک شاعیری فریوخواردوولەگەڵ کۆمەڵیک خوێنەری فریوخواردوو. یان هاوبیری سیاسی و فەلسەفی (؟) و گەڕەکچی و گۆڤارچی و ناسیاوچی و برادەرچی (یان خوشکەدەرچی؟).

با وازبێنم. من دەمێکە خۆم خوێنتاڵ کردووە و خووم بە خوێنتاڵیی خۆمەوە گرتووە.

بەلام...

شیعرەکانی ئەم دوایییەتم (؟) لە "ڕابوون" دا خوێندنەوە. بەر لە هەموو شتێک تا لەبیرم نەچۆتەوە، با بڵێم: شیعرییەتی شیعرەکان دەستمی گرتووە و ئەم شتانەی پێ نووسیوم. لە لایەکی ترەوە، چەند هەڵەی زەقی چاپیم بەرچاوکەوتن، کە لە هەندێ شوێندا توانیم بۆخۆمیان ساغ بکەمەوە و ئەوانی تریش... (لە لای گۆڤارچییەکانمان شتێکی هێندە گرنگ نییە. چونکە هێشتا دەوڵەتمان نییە و...؟!) باسەرت نەیەشێنم "کۆیستلەر" وتویەتی: ئەو شتەی دەبێتە هۆی مردنی نوسەرێک، گەلێک جار، نەخۆشی شێرپەنجە و وەستانی دڵ و مێشک نییە، بەڵکو ڕێک هەڵەی چاپی نووسراوەکانییەتی!

شیعرەکان بەسەر دەکەینەوە:

**شەڕی کازێوە و ئاوابوون**
**هەمیشە لە دەشتی خۆر و**
**پاڵ زناری تاریکیدا دەست پێدەکات**
**تاوێ خوێنی هەتاو دەڕژێ**
**قەدەرێکیش هی دارستانی ئەبەنووس.**

بۆ ئەوەی زەینت بورووژێنمحەز دەکەم نەختێک بدوێم. **ئایا** لە هەڵبژاردنی ئەم وشانە و دارشتنیانداچەندە تووشی دڵەڕاوکێی ئەوە بوویت کە ئەم شیعرە رێک بەم وشانە و بەم شێوە دارشتنە دەبێتە شیعر و هەرکامێکیان کە لابدەین، یان بگۆڕین، شیعر تێکڕا بەسەر زەینماندا دەڕووخێ؟ بۆ نموونە: بۆچی لە جیاتی "ئاوابوون" نانووسین: "زەردەپەڕ"؟ کازێوە، ناوی تایبەتە. کەچی ئاوابوون نا. هەست دەکەم کە شتێکمان بە ناوی تایبەت ناوزەد کرد و ویستمان حاڵەتی کۆنتراستی بۆ درووست بکەین، دەبیت بەرامبەرەکەیشی هەمان خەسڵەتی هەبێ. لەلایەکی ترەوە با بیر لە مۆسیقای شیعر بکەینەوە. "شەڕی کازێوە و زەردەپەڕ".

ئەوسا بۆچی "هەمیشە"؟ کاتێک دەڵێین "هەمیشە" بێ ئەوەی بمانەوێ حوکمێک دەدەین و زەینی خوێنەر لەو حوکمەدا بەربەست دەکەین. ئایا هەمیشە پێویستە کە بۆ حاڵەتەکان(کە هەمیشەیی نین) پەیڤی هەمیشە بەکاربێنین؟ ئەگەر ئەم "هەمیشە"یە نەبێ، منی خوێنەر ناچار دەبم، تەجروبەی وردبوونەوەی شاعیر لەمەڕ شتێکەوە تەجروبە بکەم (کەزۆریش باشە، چونکە هەر شیعرێک، گەرەکییەتی پیلی زەین و چاوی خوێنەر ڕابکێشێ تا لە زەین و چاوی شاعیرەوە لە شتەکان بڕوانێ.) دواتر هەر لە درێژەی ئەم شیعرەدا بەرەوڕووی ناموتڵەقییەت دەبینەوە (کە زۆریش سەرکەوتووە): **"تاوێک خوێنێ هەتا و دەڕژێ / قەدەرێکیش هی دارسانی ئەبەنووس"** (تا لەبیرم نەچۆتەوە، ئەو"هی"یەی دارستانەکە پێویست ناکا. فۆکنەر دەڵێ: بەرهەمی چاک بەرهەمی

ئارەقە ڕشتنی دووکەسە. یەکەمیان نوسەر و دواتر خوێنەرە. واتە خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەدا، سەرلەنوێ شیعرەکە دادەهێنێتەوە، کە بێین و پێمان وابێ خوێنەری ئێمە، خوێنەرێکی زیرەکە، ناچار دەبین چڕ وچاک بنووسین. بە واتایەکی تر: بەکەمترین وشە: زۆرترین مانا و نەک بە پێچەوانەوە!خوێنەری وریایش لەو حاڵەتەدا، شتە ئادیارەکان دەبینێ و لە کاتی خوێندنەوەدا جێگایان بۆ دادەنێ).

بێینەوە سەر شیعرەکەمان. ئەم "تاوێ" و "قەدەرێک"ە، ناموتڵەقکردنێکی سەرکەوتووانەیە. لەوانەیە بڵێین خودی "هەمیشە" کە لەگەڵ ئەم "تاوێ" و "قەدەرە" دا هاتووە، دیسان کۆنتراستێک درووست دەکا. ئاکام؟... : لە موتڵەقییەتی سرووشت دا، نا موتڵەقییەت هەیە. جوانە! بەڵام خودی ئەوەیش حوکمێکی ترە و خەریکە بەرەو موتڵەقییەت دەچێت. وەک ئەوەیە بڵێین: "هیچ شتێک موتڵەق نییە!" بە داخەوە ئەمڕستەیە خۆی، هەڵگری موتڵەقیەتێکی ترە! کە "هەمیشە" هەڵگرین، لە ناموتڵەقییەتدا، ناموتڵەقییەتێکی تر هەیە و ... ئەمەیش واتا: "دانانی ئاوێنەیەک لە ئاست ئاوێنەیەکی تردا".

دیسان دەبینین کاتێ کۆنتراست درووست دەکەین لە ئاست "دەشتی خۆر"دا، "لەپاڵ زناری تاریکی" دادەنێیت. پێ دەچێ ئەو "پاڵ"ە بێجگە لەوەی نەختێ زەین دوور بخاتەوە، کارێکی تر نەکا. پێویستیش ناکا. بەڵام ئایا بە مەبەست لە ئاست "دەشتی خۆر"دا "زناری تاریکی" دادەنێیت؟ پێتوانییە لە باتی "تاریکی" دەتوانین " نسێ" دابنێین؟ یان "مانگ"؟ .. نازانم. من تەنیا گەرەکمە ختوکەی زەینت بدەم و بڵێم: دەتوانین پێمان وابێ تەنیا بیست وشەمان هەن و دەبێ ڕێک بەو وشانە شیعرێک دابهێنین (نەک دابنێین، کە زۆر کەس وا دەکا!) هەر لەو حاڵەتەیشدایە، کە ناچار دەبین وشەکان ڕۆنەکەین و سنەیی وتەنی: فرەخەرجی نەکەین!

**خۆ هەر گۆڕێک سەرم دەخوات**
**لە کۆتایی ئەم سەفەرەم**
**ئیتر بۆ نەبم بە گردی ناشتنی**
**هەمو ڕقێک و**
**سەوزبوونی گەورەترین خۆشەویستی!**

نازانم بیر لە مۆسیقا و هارمۆنیای وشە و ڕستەکان دەکەیتەوە؟... مەبەستم مۆسیقای پەنجە و ... ئەم شتانە نییە. ئێمە کاتێ شتێک دەخوێنینەوە، هەناسەمان دێت و خۆی لەگەڵ پەیڤ و ڕستەکاندا ڕێک دەخا، بەڵام لەناکاو هەست بە "تەسە"یەک دەکەین. ئەگەر ئەو "تەسە"یە بە مەبەست نەبێ، شیعر بریندار دەبێ. یانی کە دەخوێنینەوە: "ئیتر بۆ نەبم بە گردی ناشتنی..." هارمۆنیاکەمان لە دەست دەردەچێ. دەتوانین بڵێین بۆ نموونە: بۆچی نەبم بە گردی ناشتنی... یان "چما نەبم بە گردی ناشتنی..." (کە پێموایە هی دووهەمیان لەبارترە). مەبەست لە "گردی ناشتن" چییە؟ گۆڕستان؟.. یان گردێک کە بۆتە گۆڕستان؟.. جوانە. ئا. زۆر جوانە! بەڵام نازانم بۆچی هەست دەکەم تەواو نییە. بۆ ئەوەی ئەم وێنەیە لە زەینمدا تەواو بێ، شتێکی کەمە، کە دەبێ بیری لێ بکەمەوە. دواتر، بۆچی "هەموو ڕقێک"؟ و نەک "گشت ڕقەکان"؟.. لەوانەیە بڵێیت فەرقی چییە؟ .. بەڵێ. لەرووی ماناوە هیچ فەرقێکی نییە، بەڵام لە ڕووی خوێندنەوە، هەم یارمەتیمۆسیقا دەدا و هەم دەتوانین بیر لە سێپاتەبوونەوەی پیتی "گ" بکەینەوە:

**چما نەبم بە گردی ناشتی / گشت ڕقێک و / سەوزبوونی گەورەترین خۆشەویستی!**

ئەری کێ بوو گوتی: "وشە هەیە سەدباری لێ دەگۆڕم"؟

کە جوانیشە. ئا. زۆر جوانیشە!

تووله‌ڕێیه‌ک خۆشی ویستم. ڕازی نه‌بووم

نه‌وه‌ک پێش من سێبه‌رێکی ماچ کردبێ

دارستانێک خۆشی ویستم، مه‌یلم نه‌دا

نه‌وه‌ک شه‌وێک له‌گه‌ڵ باراندا نووستبێ

وه‌رزێکی که‌ڵه‌گه‌تی شان و مل ڕێک خۆشی ویستم

ڕازی نه‌بووم

نه‌وه‌ک ئه‌و هه‌مووماتبوون و بێده‌نگییه‌ی

بۆ کۆنه عه‌شقی جۆگه‌یت له پێش مندا

جیاوازم من له‌باخچه‌کان

جیاوازم من له په‌رداخه به‌ربادەکان

که شکاون

نا... که ده‌شکێن وناشکێن.

ئه‌م شیعره‌یان به داخه‌وه زۆر "شێرکۆ"ییه. (هیچ مه‌به‌ستێکم له شێرکۆیی نییه. نه باش و نه خراپ. ته‌نیا مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه: شێرکۆ هێنده ئه‌م فۆرمه‌ی به‌کارهێناوه، که له شیعره‌کانی خۆیشیدا سواوه و ئێمه‌مانان به چه‌ند پاته‌کردنه‌وه، ته‌نیا...) ته‌نیا جیاوازییه‌که‌ی له‌و شوێنه‌دایه که "جیاوازم من له باخچه‌کان" ده‌ست پێده‌کا. "من"ه‌که‌یشی هه‌م له‌ڕووی مۆسیقاو و هه‌م له ڕووی ماناوه، زیاده. "جیاوازم" واته من جیاوازم. له هه‌ندێک شوێندا ده‌توانین ئه‌م "من"انه به‌کار بێنین که یان یارمه‌تیده‌ری مۆسیقای شیعر بن، یان جه‌ختکرنێک له‌سه‌ر "من"ه‌که هه‌بێ. به‌لام ئه‌و چوار دێڕه‌ی دوایی شیعرێکی جوان وته‌واوی سه‌ربه‌خۆیه و پێویستی به به‌شه "شێرکۆ"ییه‌که‌یش نییه.

ئەرێ کاتی ئەوە نەهاتووە بیر لەوە بکەینەوە کە: شیعر یان جوانە یان نا. شیعری مامناوەنجی هەر نییە. نابێ هەبێ.ئەم ئەڵماسە "واتە شیعر" هەرچەندە هەوڵی لەگەڵ بدرێ کە شتە زیادەکانی لێ جیابکەینەوە و تۆزی لەسەر هەڵگرین، جوانتر دەبێ. پێتوانەبێ مەبەستم خۆیشم نییە، نەخێر! بەر لە هەمووان مەبەستم خودی خۆمە!!من خەریکم بۆ تۆی دەنووسم، تا خۆیشم بیخوێنمەوە. یان بە پێچەوانەوە!

**بە کەناری ئەم وەرزە ئاڵتوونیەدا**
**تەنیاییم لێدەوەرێت و**
**خۆشەویستی لە پەنجەم دەچۆڕێتەوە**
**کەی ئەم گۆزانە پڕ دەبن بە ڕەنگی ماچ؟**
**کەی وتن لەسەری دەڕژێ؟**

بۆچی: "خۆشەویستی لە پەنجەم دەچۆڕێتەوە" ئەم "تەوە" هی چییە؟ ئێمە خەریکین تەجروبەی شاعیر لە ڕەتبوونی بە کەناری وەرزێکی ئاڵتوونیدا دەخوێنینەوە. هەموو شتێکیش لەو کاتەودا ڕوودەدا. کەواتە: "دەچۆڕێ".

**کەی ئەم گۆزانە پڕ دەبن بە ڕەنگی ماچ؟**

یان:

**ئەم گۆزانە / کەی پڕ دەبن لە ڕەنگی ماچ؟**

(تکایە هەردووکیان بە دەنگی بەرز بخوێنەوە تا هەست بە مۆسیقایەکەی بکەیت. لە لایەکی ترەوە کە دەڵێین: ئەم گۆزانە.. چاوەڕوانییەک بۆ خوێنەر درووست دەکەین. تاکو ڕستەکەمان نەک تەنیا بخوێنێتەوە، بەڵکو بیخواتەوە، تا بگاتە مەبەستەکەمان.

دوایین دێڕیش ئەم شیعرە جوانە، جوانتر ناکا.

دڵسۆزی بەڕێز...

کە دەنووسین، دەبێ: بنووسین! بنووسین! بنووسین!

دواتر دەبێ: هەڵگرین! هەڵگرین! هەڵگرین!

تەنیا ئەو پەیڤانەی دەبێ بمێننەوە، دەبێ! بمێننەوە.

هەر ڕستەیەک (تەنانەت وشەیەکیش) کە لە شیعردا مەبەستمان جوانتر ناکا دەکرێ لایان ببەین و لە شوێنی تر و لە کات و سەردەمێکی تردا، بەکاریان بێنین.

ئەم قسەم لە دڵ مەگرە. پێت وا نەبێ خوانەخواستە خەریکم وەعز دەدەم یان موکریانی وتەنی: فەرمایشتان دەفەرمووم. حەز دەکەم بڵێم: وەرن با لەمەودوا لە ئاست دەقی جیددیدا، بە جیددی بێدەنگ نەبین.

چونکە ناتناسم دەترسێم بەم قسانەم نەڕەحەت بیت، بۆیە درێژە بە نووسین نادەم و شیعرە جوانەکانی تر بەسەر ناکەمەوە، بەڵام دڵنیابە، جوانیی شیعرەکان، زەینمی ڕووت کردەوە و بۆچوونەکانمی خستە سەر ئەم کاغەزە. دەنا دەمتوانی وەک کەسانی تر، بێدەنگ بم و لەژێر لیوەوە ورتەیەک بکەم و ..

تێبینییەکی بەپەلە:

دووسێ ڕۆژ دوای ئەم یادداشتەم، شیعرێکی (؟) تری تۆم لە گۆڤاری (؟)ی "کوردستان"دا بینی کە سەدبریا نەمدیبا! من پێموایە خەڵکی تر هەن کە دەتوانن شیعری (؟) ئاوا بۆ سەرۆکەکانیان بنووسن... و تۆ هیچپێویستییەکت بەو شیوە شیعرانە نییە و نانی خەڵکیش مەبڕە. خەڵکانێکی بەستەزمانی شیعردانەر(!) گەرەکیانە بەو چەشنە نووسینانە بگەن بە شوێن و کورسی و ..

با بەس بێ!

ئەگەر لە قسەکانم تووڕە بوویت فەرامۆشیان بکە! دەنا لە هەر شوێنێک شێعرەکانی منت کەوتە بەرچاو، دەتوانی بە تەور هەڵیان پاچیت!

لەگەڵ ڕێزمدا

بەڕۆژ ئاکرەیی/ هاوینی ١٩٩٩/ ستۆکهۆلم

**ڕەنگە ڕۆژێک کەسێک، ئەم نووسراوەی بکەوێتە بەردەست،**

**لە قاقای پێکەنین بدا.**

نامەی بەڕۆژ ئاکرەیی بۆ ڕەفیق سابیر[1]

بیبینی یان نەیبینی، من داد و بێدادی دەکەم

پێ بزانی یان نەزانی، من ئاهو فەریادی دەکەم "مەحوی"

شاعیری خۆشەویستم، برای بەڕێزم ڕەفیق سابیر

حەزم دەکرد دەمێکی تر و سەردەمیکی تر بوایە تا دانیشتبام و چەند بیرو ڕایەکی خۆمم سەبارەت بە تۆی خۆشەویست و شیعرەکانت و خودی ئەم سەردەمە بۆ گەن و چلکنە دەربڕیبا. وەلێ مخابن... لە ئوتێلێکی پڕ لە دەنگەدەنگی مرۆڤە جۆربەجۆرەکاندا و لە ژووریکی تەنگدا کە دەنگی تەلەفزیۆن و هاڕەهاڕە کەربازاریانەکەی دالانی ئوتێل، وەک بیر و بۆچوون و ڕابردووەکەم هێندە هەرەسم بۆ دێنن کە ڕەنگە هەندێک جار داوی وشەکانم لە دەست دەربچێ. هەرچۆنێک بێ هەستم کرد چەند ڕستەیەکت بۆ بنووسم.

لە ماڵی "شاخەوان"[2] گەلیک بە زەقی ڕەئی خۆم بەرامبەر بە تۆ دەربڕیبوو. ماوەیەک لەمەوبەر. گوتم: "من هەرگیز ڕەفیقم خۆش نەویستووە، بۆ خاتری ئەوەی ڕەفیق حزبی[1] یە. بەڵکو بە پێچەوانەوە، من حیزبم خۆش ویستووە چونکە ڕەفیق لەگەڵ حیزبدایە" دیارە ئەگەر بمەوێ لەم بارەوە بدوێم ئەم هەویرە ئاوی زۆر دەبا. بەڵام گرینگ نیە. ئەوە لەلای ئیمە هەویری تر هەن کە

---

[1] وەلامی "ڕەفیق سابیر" بۆ ئەم نامەیە لە لاپەڕە( ٢٢٧ ) دا یە.

[2] شاخەوان: هاشم کۆچانی

خوێنی زۆر دەبەن. ڕەنگە پێت سەیر بێ کە بۆت بنووسم ئێستاکە دانیشتووم و ئەم شتانەت بۆ دەنووسم وەک ئەوەیە دڵداریک دابنیشێ و بیهەوێ شتێک بۆ حەزەکەی بنووسێ. ڕەنگە ڕۆژێک کەسێک ئەم نووسراوەی بکەوێتە بەر دەست لە قاقای پێکەنین بدا، کەچی من هیچ پەکێکم لێ ناکەوێ، چونکە من دەمێکە بەو کەسانە پێکەنیوم، ئەویش لەبەر ئەوەی کە من شیعرەکانت بە حەزی خۆم دەزانم. با لەم باسە گەڕێین. تەجروبەی شیعری و سیاسیی من گەلێک لە هی تۆ کەمترە. منیش ئەمسەر ئەوسەری جادەی پڕ لە فڕوفێڵی سیاسیم پێواوە و ڕەنگە یەکێک لە هۆیەکانی ئەوەی باوەڕ بە حیزب بینم ئەوە بوو کە: "ڕەفیق لەگەڵ حیزب دایە" (؟) هەڵبەت لێرەدا مەسەلە فەلسەفیەکە دادەنێمە لایەکی تر. چونکە من بەر لەوەی ببمە حیزبی، خاوەنی بیرو ڕا فەلسەفیەکە بووم. بەلام ئێستا گەلێک شت گۆڕاوە: ئەو سۆفیگەری و دەرویشبازییەی جاران بۆتە شوورەیی. (داخەکەشم ئەوەیە خۆمان نەگەیشتینە ئەم قەناعەتە. هەر وەکو لە کەربازاڕییەکەی ڕابردوودا گوتم: ئێمە وەک مۆدێل و خەنافسئەم شتانەمان وەرگرتووە، سبەیینێش ئەم مۆدیلە بگۆڕدرێ دیسان دەگۆردرییێت. بەلام برالە ئەمە کێشە و موشکیلەی سیاسییەکانە و هەرچەند بیری لێ دەکەمەوە بۆم ناهێتەوە سەر یەک کە بۆچی شاعیریکی وەک ڕەفیق دەبێ بکەوێتە ئەم داوەوە. جارەکەی تریش پێم وتی شتێکی زۆر سەیر لەم ناوەدا هەیە و کەس سەرنجی نەداوە. ئەویش ئەوەیە کە

---

[1] لەم نامەدا زۆر جار ناوی (حیزب) هاتووە، کە مەبەست حیزبی شیوعی عێراقە.

شیعری کوردیمان دوو کەڵەشاعیری هەن، کە شێرکۆ و ڕەفیقن. یەکەمیان کە شێرکۆیە هێما و ناوەڕۆکی زۆربەی شیعرەکانی بۆ لایەنێکی تایبەتی سیاسی تەرخان کردووە و کە لە کوردستان دادەنیشێ مقەرەکەی ئەولا نابینێ و لە هەموو شوێنێکیش دەڵێ من تەنزیمی نیم، بەڵام سیاسەت و بۆ چوونی ئەم لایەنەم پێ ڕاستە. دووەهەمیان ڕەفیق سابیرە کە تەنزیمیەن ساسییەو کاری ڕێکخستنی بۆ حزبەکەی کردووە و حزبەکەی زۆر جار، ئەمسەر و ئەوسەریشی پێکردووە (باسی ئەوە ناکەم کە چەند شیعرێکی ئەم شاعیرە لە ناخیدا خنکێنراون!) بەڵام ئەم ڕەفیقە سیاسەت و بۆچوونی ڕۆژانەی حیزبەکەی لە شیعرەکانیدا ڕەنگ ناداتەوە. باشە من پێم وایە هەردووکیان (ببورە) درۆ دەکەن. هەردووکیانیش درۆ یان ناتەبایی فکر و کرداریان [هەیە]. دیسان پێم وایە ئەگەر ڕۆژێک هەردووکیان ئاوێتەی یەکتری بکەین یەکی[یەکێکی] زۆر بە کەڵکیان لێ دەردەچێ و یەکێکی زۆر...

خۆت چاک دەزانی ئەو ڕۆژە ڕابرد شاعیر بڵندگۆی حیزبیک بێ. سیاسەتەکان، داب و نەریتەکانی وەرزی و کۆمەلایەتی و.. هتد دەگۆڕدرێن و شتی نوێتر دێنە کایە. بەڵام شیعر و جوانی و هونەرن کە هەمیشە دەمێننەوە، من نازانم مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و نالی و مەحوی و حافظ و مەولەوی و ئلیۆت و شکسپیر و پوشکین لەسەردەمی چ حاکم و سوڵتان و شایەکدا ژیاون و ئەو شاو سوڵتانانە چەند وەزیریان هەبوە. کەچی دەزانم چۆن لە مرۆڤ و خۆشەویستی و کێشەکانی مرۆڤ دواون. جاران پێم وابوو ئێستاش قەناعەتم بەوە هەیە کە شاعیر لە چوارچێوە، یان بازنەی هیچ حزبێک دا، جێ نابێتەوە. من ڕەفیق سابیر لەوە گەورەتر دادەنێم کە بە دەستووری ئەبو فلان لەم وڵات و ئەو وڵاتەدا سەرگەردان بێ و فەرخە ئستالینێکی وەک ئەبوو مەحمود ڕەئی لەسەر بڵاوکردنەوەی شیعرەکانی بدا و ئەبو نەبیلێک چۆن حەز دەکا وا قسەکانی ئاوەژوو بکاتەوە. ئەو قسەی تۆشم زۆر بە دڵە کە بە شێرکوت وتبوو،

شاملو شیعرەکەی خۆی کە بۆ"ڕوزبێهـ" [1][خسرەوی ڕوزبێهـ]ی نووسیبوو وەرگرتۆتەوە، ڕەنگە کاتی ئەوە هاتبێ کە تۆش هێندێک لە شیعرەکانت لەو کەسانەی کە پێشکەشت کردوون وەرگریتەوە. بەڵام کاکە ڕەفیق پێم وایە کە تۆش دەبێ ئەو شیعرەی پێشکەش بە جلال دەباغت کردووە (زۆرمان پێ وتن) وەرگریتەوە. (کارمان بە ناوەڕۆکی شیعرەکە نیە، بەڵام ئەبو مەحمود هی ئەوە نیە تۆ شیعری پێشکەش بکەیت).

برا گیان! با بەس بێ، ئەم بنێشتە خۆشەی ئەمڕۆ کەوتۆتە نێو زاری هەموو سیاسی و گولەبەڕۆژەفرۆش و فیتەرچییەک و باسی حیزبی فلانی سەربەخۆی کوردی دەکەن. شایەنی تۆ نیە. ئەم هەمووکاتەی بۆ خوێندنەوە و نووسینی ئەم وتارانە تەرخان دەکەیت، ڕەنگە مافی ئەو شیعرانە بن کە نەتنووسین. پاشان سەیر ئەوەیە کە کەسانێک خۆیان لەم کارە هەڵقورتاندوە کە مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێ. بە داخەوە زۆربەیان تا دوێنێ دژی ئەم "خەنافسە" بوون و ئەمڕۆ ڕوویان تێکردووە. ڕەنگە دانیشن و بڵێن جارانیش وامان دەگوت یاخود ئێمەفریو درابووین. بەڵام بە شێخ ئەحمەدی کاک لەگەڵ بایەکە کەوتوون. لێیان گەڕێ با ئەمە کێشەی خۆیان بێ. شاعیرێکی وەک تۆش بە دەربڕینێکی ئەدەبی زیاتر کەڵکی بۆ ئەم بابەتە دەبێ. تەحەزوب کە بوو بە بەرچیخ، هیچ جیاوازیەک لە نێوان گشت حزبەکاندا نامینێ. دونیا هەندەی پێناوێ. سیاسەتێکە دێت و دەڕوا. شاعیر باسی دەروونی مرۆڤ دەکا. کابرای سیاسیش باسی ئەوەی ئاخۆ ئەو کابرایەی چەند لێهاتوو و بەکارە و چۆنوەک کەرەستەیەک کەڵکی لێوەردەگرێ.

---

١ "خسرەوی ڕوزبێهـ" یەکێک لە شەهیدە گەورەکانی حیزبی توودەی ئێرانە. شاملوو سالانی زوو، شیعرێکی بۆ ئەو شەهیدە قارەمانە نووسیبوو. دوای نزیکەی سی سال، کە دەرکەوت بەشێک لە تیرۆرەکانی حیزبی توودە بە دەستووری خسرەوی ڕوزبێهـ ئەنجام دراون، شاملوو شیعرەکەی خۆی لە خسرەو وەرگرتەوە و ڕای گەیاند: من شیعر بە هیچ مرۆڤکوژێک پێشکەش ناکەم.

دەزانم خۆت باشتر لە من ئەم شتانە دەزانی. بەلام ئەمەش کولێکە و دەیپرێژم. بە داخەوە دەمەوێ پاش ئەم بەڕانەی کە فرێم دانە مزگەوتێ (هەندرێن گوتەنی) نەختێک باسی ئەو گۆڤارەی کە قەرارە دەری خەن و ئەوسا لەمەر "کاروانسەرا" بدوێم. ئەو گۆڤارە ئەگەر بەو بۆچوون و مەبەستەی لەگەڵ شاخەوان قسەمان کرد دەربچێ، ئەوە کاری من نییە و حەزیش ناکەم هیچ شتێکم لەو گۆڤارەدا بلاوبکرێتەوە. بۆیەش حەزدەکەم بەلای منەوە یەک دوو ژمارەی ببینم ئەوسا شتی بۆ بنێرم.

چونکە پێم خۆش نیە هیچ نووسراوەیەکی ئەدەبی هی هیچ ئەدیبێک ببیتە Annons[ڕێکلام، دیعایە]ی بیری ڕامیاری فلانە کەس. حەزیش لە شەڕە کەلەشێری پێنووس بە دەستەکانی ئەمڕوی کورد ناکەم. جارێ با بزانین چی لێ دێ. حەزم دەکرد هەلیک هەلکەوتبا و دووبەدوو ئەم قسانەمان کردبان، بەلام دیارە بۆمان ناکرێ.

---

لە بارەی "کاروانسەرا" دوان کارێکی ئاسان نیە. ڕەنگە چەند تێبینییەکی تایبەتی خۆمم هەبن کە بۆ چوونی منن و ڕاست و ناڕاستەکەشیان هەر بۆ خۆم دەگەڕێتەوە. بەلام بەر لە هەموو شتێک دەمەوێ ژیان و بەرهەمەکانت بکەم بە چەند قۆناغ. ئێستا کە تەماشای شیعری تۆو کومەلە شیعرەکانتدەکەین، دەبێ هەرکام لە کومەلەکان بە قۆناغێک دابنێین. لە "پشکۆکان"[پشکۆکان دەگەشێنەوە]دا، زمان و وێنەی شیعری تایبەت بە خۆتت هەیە، کە نەوعێک تەئسیری شەهیدە شیوعییەکانت پێوە دیارە (بیلا تەشبی وەک شێرکۆ، کە تەنیا بۆ —ینک- واتە شەهیدەکانی شیعری هەیە) لە "ڕێژنە"دا هەمدیسان ئەم شێوە و وێنانەن (سوڕیالی) کە بەهێز تر و پاراوتر خراونەتە بەرچاو. بەم دوو دیوانە ڕەفیق بناغەی شیعری خۆی بە وێنە و دەنگ و بابەتی تایبەتی داناوە. شیعری "سووتان لەبەر باراندا" کە یەکەم جار لە نووسەری کوردستاندا بلاوکراوەتەوە، زۆر بە زەقی نیشان دەدا کە شاعیر ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەم دیمەنانە ڕووبەڕوو بۆتەوە و ئیتر لەگەڵ کارەساتەکاندا هەلسوکەوت دەکا. کە خودی کومەلە

شیعری سووتان لە... بڵاوکرایەوە هەستم کرد ڕەفیق هەنگاوێکی تری هەڵێناوە. دیارە بۆچوون و ڕایەکانی بەرفراوانتر بیریان لێ کراوەتەوە. بۆ نموونە "گەڕەک" نموونەیەکی نوێیە لە شیعری کوردیدا. سەیر ئەوەیە لە سووتاندا سەیر باسی ڕۆح دەکرێ. بەچەند شێوە و چەند جاریش. (بە داخەوە هیچ کام لەمانە لەبەردەستم نین و دەبێ پشت بە بیرم ببەستم و ئەوانەی کاریان تێکردووم بە نموونەوە بینمەوە) خستنە ڕووی دوو شتی دژ بەیەک لە سووتاندا مانای سێ یەم دەخەنە بەرچاو:

تۆ لە بوون دەچی، بە چیت بچوێنم

لە نەبوون دەچی، بە چیت نەچوێنم    کە زۆر سەرکەوتوون!

نامۆیی و دوورەوڵاتی، گەردیان نەخستۆتە سەر وێنە شیعرییەکان. بەڵام هێشتا ماوە تا ڕەفیق ئەو هەنگاوە هەڵێنێ کە مرۆڤ بەرەو ڕووی سەردەم و دەروون و بیرو بۆچوون و سیاسەت و مێژوو و فەلسەفە بکاتەوە. ئەمە وەرزێکی گەرەکە. وەرزی سەهۆڵبەندان. لەم وەرزەدایە کە کاکڵی قسەکانی شاعیر دەکەونە بەرچاو. لە "وەرز" دا شاعیر یاخییەکە، کە لە هیچ کەس ناترسێ. تەنانەت لە حزبەکەشی. بەڵام مخابن هەندێک جار جڵەوی هەسپی شیعرەکە ئازاد ناکرێ:

بە بازوی پرۆلیتاریانەم،

یان: سروودی ئینتەرناسیونال و ..

بە داخەوە کەس ئاوڕێکی چاک یان سەرنجێکی وردی لەم شیعرە نەدایەوە. ئەمە با بمێنێ بۆ باسێکی تر کە دەمەوێ لێی بدوێم..

"لاوکی هەڵەبجە" هەرچەند بابەتێکی ترە بەڵام دیارە کە هێشتا شاعیر لە گەردومژی"وەرز"ەکە بە تەواوی نەهاتۆتە دەر. بۆیە زۆر لە یەکتری نزیکن و لە هەندێک شوێندا لەیەک دەچن. تا دەگەینە کاروانسەرا. (ببورە ئاوا بەم چەشنە سەرپێییە لەمەر دیوانەکانت دواوم. هەڵبەت دەزانم ئەمانە هەرکام چەندین

لاپەڕەیان دەوێ. بەڵام من تەنیا ئاماژەم بۆ کردوون). ئەگەر بمەوێ بە شێوەیەکی پلانیی ئەم چەند دیوانە بخەمە بەر چاو ئاوا دەبێ:

خۆ ڕەنگە من وەک خوێنەرێک مافی ئەم بۆچوونەم نەبێ، بەڵام ئێستاکە دێمە سەر وردبوونەوەیەک لەمەر "کاروانسەرا" دوایی ئەو شتانەی کە بە بیرمدادێن، کە بوونەتە هۆی ئەم نزم بوونەوەیەت بۆ دەنووسم. یەکێک لەو شتانەی لە "کاروانسەرا" بەرچاو دەکەوێ شیعرە کورتەکانە. یان با بڵێین کورتە شیعرەکان. من لەگەڵ ئەوەدا نیم کە دەڵێن هەناسەدرێژی لە شیعردا. یان بە پێچەوانەوە. لە چیرۆکنووسینیشدا چیرۆکی کورت Novel هەیە، چیخۆفی مەزن لە شوێنێکدا دەڵێ: ڕەنگە لێم بپرسن بۆچی ڕۆمان یان چیرۆکی درێژ نانووسی؟ بەڵێ پرسیارێکی جوانە. بەڵام بولبول دەڵێ: بۆیە چریکە ئاوازەکانم هێندە کورتن و هەرکام بە چەشنێکن، چونکە هێندە گۆرانیم لە دڵدایە، دەمەوێ هەمووتان بۆ بخوێنم و دەترسم تەمەنم دەرفەتی هەموویان نەدا. بۆیە بە چڕوپڕی دەیانڵێمەوە. لە "کاروانسەرا"دا ئەم شتە دیارنییە. پێم وایە ئەگەر ناوی شیعرەکان لابدەین (دوو-سێیەکیان نەبن) ئەوا دەکرێ ژمارەیان بۆ دابنێین و ببن بە مەنزومەیەک. دوایی زۆر سەیر ئەوەیە کە شاعیر لەم دیوانەدا دیسان دووراودوور لە ڕووداوەکان دەڕوانێ. زۆر بەیان بۆ کەسێک نووسراون کە ئێمە ئەو کەسە نابینین. یان نایناسین. بە واتای سینەماگەرەکان (کامێرایەکە "زۆم" ناکا. یان پاڵەوانەکە هیچ ڕووخسارێکی تایبەتی نییە. یان گشت دیمەنەکان "لانگ شات"ن)

بۆ نموونە:

لەسەر هەورێکی پەمەیی ناونیشانی خۆی نووسیەوە ل٣٩

چنگی پشکۆی لە نێو پەڵەهەورێکدا چاند ل٤٣

لە نێو یەکەم تریفەدا پاڵدەکەوێ ل ٥١

وەک برووسکە لەنێو هەورا گیرسایەوە ل٥٣

پێش گەردەلوول کەژاوەکە بە ئامێزی دادەپۆشێ ل ٤٥

دەیەوێ تاریکی و هەتاو بەیەکەوە لە پەردە کات ل٦٢

لەم هەریمە بەردینەدا

گۆرانیەک

بە گەردەنی تاریکیدا هەڵ دەواسێ ل ٦٨

قۆڵەکانی کرد بە کەپری ئاوارەیی ل٧١

کە بروسکەی کردە شانی ل ٧٥

یەکێکی تر لە شتەکان خۆ دووپاتکردنەوەیە:

وا لە ڕۆژانی دوور وڵاتیدا

خۆر لە نێو دڵما سێبەر دەچێنێ لاپەڕە ٥

لەگەڵ:

ئەوا دیسان خۆر، خۆری غەریبی ل٨

لە کێڵگەی ڕۆحما، سێبەر دەچێنێ.

یان:

ڕۆژەکان بەسەر ماوەدا شۆڕ دەبنەوە ل ٩

لەگەڵ:

ڕۆژەکان بەسەر شەپۆلدا شۆڕ دەبنەوە ل ١١

یان:

لەسەرزوقم مەمنووسەوە ل ٢٢

لەگەڵ:

لەسەر ئەم هەورە گەڕۆکە مەمنووسەوە ل ٤٥

یان:

دەیەوێ ئەستێرە زین کات ل ٦٢

لەگەڵ:

ئەمشەو ئەستێرە زین دەکەم هەڵت دەگرم. لاوک یان وەرز؟ ..

یان:

بەسەر پەنگردا ڕادەکات ل ٧٦

بەنێو ونبووندا ڕەت دەبێ ل ٤٠

بە نێو ونبووندا ڕادەکات ل٦٧

بەنێو بەیاندا ڕادەکات ل ٥١

لەگەڵ:

بەنێو سووتاندا ڕەت دەبێ ل٥٦

بەنێو گەرداودا ڕەت دەبێ ل٥٦

بە هەر حاڵ کاکە ڕەفیق گیان. ئەوە دەبێ ڕۆژێک پێکەوە دانیشین (ئەو ڕۆژەی قەت نایەتە دی) و هەندێک نمونەی تریان پێکەوە ببینین. هەرچەند نابێ لە وێنەشیعرییە جوانەکان چاوپۆشی بکرێ. لوتکەی شیعرەکانی کاروانسەرا:

لەسەر ئەم

بەلام دیارە خۆت لە من شارەزاتری کە هەندێک دیمەن بە تایبەت (وێنەی شیعری) کەیەکجار بەکار دێن جوانتر و بە تەئسیرترن. کە دووپات کرانەوە، یان هەندێک وێنەی تر هاتن و لە ئەوی تر نزیک بوون دەبن بە هەوێی وێنە ئەسڵییەکە.

شاملو دەڵێ: فروغ هات و لە شیعرێکدا وتی:

دەستەکانم لە باخچەدا دەچێنم

سەوز دەبن،

دەزانم، دەزانم، دەزانم.

کە گەلیک وێنەیەکی جوانە، بەلام داخ ئەوەیە لە دوای فروغ هەرکەسێ هات بە چەشنێک ئەم وێنەیەی دوپات کردەوە. یەکێک لاقی خۆی چاند. یەکێک چاوی خۆی چاند. یەکێک سەر و ئەوی تر لووت و ... هتد.

وەلێ کاکە گیان. دیارە من گەلێک توند ڕۆیشتم.دەمبووری. پێم وایە ئەو شتانەی کە نەیانهێشتوە ڕەفیق شیعرەکەی ڕەوتیکی ئاسایی بەرەو لووتکە چوونی هەبێ. سەردەمەکە و سیاسەتەکە و ڕەنجبەخەساری لە شوێنی نا تایبەتەکەدایە . هەموو حیزبێک بە تاقی تەنیا دەتوانێ گەورەترین کادری سیاسی

پەروەردە بکا، بەلام تێکرای حزبەکان ناتوانن شاعیرێک پەروەردە بکەن. ئیلتیزامی شاعیر ئیلتیزامی حزبی نیە. بەڵکو ئیلتیزامێکی ئینسانییە. حزبیش دەبێ لە پێناو ئینسانیەتەکەدا هەوڵ بدا. کەواتە شاعیر و حزب نەک لە دەروونی ڕێکخستندا یەکدی دەناسن بەڵکو لە دەرەوە. قسەکانی "شاکەلی"شم گەلێک پێ ناخۆش بوون. بگرە زیاتر لە تۆ. بەلام هەندێک جار بە خۆم دەڵێم: دەی بەڵکو یەکێکی تریش ڕەفیق دەکوتێتەوە بەڵکو ڕەفیق لە پڕ ڕاپەڕێ و هەموو شتێ ورد و خاش کا.

لە کۆتایی دا بە ماچێک و قسەیەکی شاملو وازت لێ دێنم:

هەندێک قسە هەن بۆ گوتن، کە ئەگەر گوێیەک نەبێ ناهێنە سەر زار.

هەندێک قسە هەن بۆ نەگوتن، کە ئەم قسانە هەرگیزاو هەرگیز

سەریان بۆ هیچ گوێیەک دانانەوێنن، قسە ڕاستینەکانیش هەر ئەمانەن!

کوڕی خۆت

بەرووژ ئاکرەیی

[signature]

کاترین هاوڵ ۱۹۹۱/۱/۱۰

**نەدەبوا، من نامەیەکی ئاوا تووندم بۆ تۆ نووسیبا.**

نامەی بەرۆژ ئاکرەیی بۆ ڕەفیق سابیر

"هەر کەس نە بەو ئەندازەیە کە هەست دەکا، هەیە!

هەر کەس بەو ئەندازەیە کە هەستی پێدەکرێ، هەیە!!

هێندێک قسە هەن، بۆ گوتن، کە ئەگەر گوێیەکمان نەدۆزیەوەنایانبێژین!

قسەی تریش هەن، بۆ نەگوتن، ئەو قسانەی هەرگیزاوهەرگیز لە ئاست پووچەڵی و بوودەڵەیی ئاخافتندا، سەریاندانانەوێنن.

سەرمایەی هەر مرۆڤێک بە قەدەر ئەو قسانەیەکە بۆ نەگووتنی هەیە.. قسە بە کەڵک و هەمیشە زیندووەکانیش هەر ئەمانەن!! (ئەحمەد شاملوو– غزل غزلهای...)

ڕەفیقی خۆشەویست و شیرینم

وێڕای سڵاو

ئەمڕۆ بەیانی نامەکەت گەیشت. هەر بەو ئەندازەیەی کە پێی خۆشحاڵ بووم، دڵمەندیشی کردم. دڵمەندییەکەی من لە دەست خۆم بوو. نەک تۆ!.. دیارە نەدەبوا من نامەیەکی ئاوا تووندم بۆ تۆ نووسیبا. بە هەرحاڵ پێم وایە قسەکانت ڕاستن و جێگای ڕێزن، تەنیا ئەوە نەبێ کە موقارنەکردنی ڕەفیق و شێرکۆ، یەکەمیان وەک نموونەیەکی بەرچاو و دووهەمیان نموونەیەکی نادیار (هەڵبەت بە چەواشەکردنی خودی دووهەمەکە)م مەبەست بوو. بەڵام نازانم بۆچی پێت وایە کە منیش قسەی باو دووپات دەکەوە. نەخێر من پێم وانیە کە شاعیر دەبێ بلندگۆی حیزبەکان بێ، حیزبەکان پێیان وایە. دەنا بۆچی تۆ دەبێ بە بیرهێنانەوەی "دڵزار" موچڕکت بە لەشدا بێ (هەروەها منیش) یان با هێندە دوور نەڕۆین، "شاخەوان"ی خۆشەویستمان. من پێم وایە ئەویش یەکێکە لەو کەسانەی دەزگای حیزب بە سپاردنی کاری ئیعلامی، سەنگەری شیعری پێ

چۆڵ کرد و کردی به وتارنووس. با ئەوەش بڵیم کە کاتێ باسی خۆمان دەکەم مەبەستم تەنیا ئەم حیزبە نیە. چونکە بێژینگی هەڵسەنگاندنەکەی من هێندە وردە (مەبەست کونەکانییەتی) کە گروپە حەوت کەسیەکانیشی لێ دەرناچێ. یان [تۆ] لەمەبەستم ورد نەبوویتەوە یا خود من نەمتوانیوە بە جوانی دەربڕم (هیوادارم دووهەمەکە بێ). من باوەڕی سیاسی و ئینتیمای حیزبی بەشتێکی فیکری دادەنێم، بە تایبەت بۆ شاعیر. (کە خاوەنی چاوی وردبین و پشکێنەرە) کە دەڵیم ئەم دوو شاعیرە خۆیان لادەدەن (یەکیان بەو شتەی بە زانینێکی فەلسەفی گەیشتۆتە قەناعەتێک، ئەوی تریان، خۆت وتەنی: بە ڕێکەوت گەیشتۆتە ئەو هێزە سیاسی یە) دیارە مەبەستم ڕوون و ئاشکرایە.

با ئەم باسە هەڵگرین بۆ کاتێ کە یەکتر دەبینین، چونکە هەردووکمان قەناعەتمان بەشتێک هەیە. تەنیا مناقەشەیەکی دەوێ کەزێتر لیک حاڵی بین.

بۆ ناردنی کتێبەکەی "ڕێبوار"[١] سوپاس. هەڵبەت بۆ تۆ، نەک بۆ ڕێبوار. چونکە بە ڕاستی تەرجەمەکان باش نین. گومانی تێدا نییە کە ڕێبوار کوڕێکی باشە.. بەڵام جەخار! (دوایی لەسەر ئەم مەسەلەیەش دەدوێین) تەنیا ئەگەر دەتوانی کارێک بکە. ببوورە دوو کار. یەکەمیان (دەنگی پێی ئاو- چاپی دووهەم)م بۆ بنێرە. دووهەمیش ئەگەر دەستت یان دەنگت یاخود نامەت بە ڕێبوار دەگات، پێی بڵێیت کاسێتی شیعرە فارسیەکەمان بۆ بنێرێ، هی دەنگی پێی ئاو. (یان وەکو بیستوومە دێتە ئێرە، با لەگەڵ خۆی بیهێنێ) بۆ پێداچوونەوە زۆرم پێویستە.

لە بارەی گۆڤارەکەیش هەروەکی بە تەلەفۆن پێم گوتی لەسەر قسەی تۆ ئامادەم حەماڵیشی بۆ بکەم. بەڵام بە شەڕ. دووهەمیش هەڵبژارتنی[هەڵبژاردنی] دەستەی نووسەران، باشتر وایە بە لێهاتوویی و کارامەیی بێ، نەک یەکێک بۆ یەکێکی تر ڕیش لە گرەو دانێ. دوایێ هیوادارم پێ چەقاندنی تۆ بۆ ئەوەی بتوانم حەماڵیتان بۆ بکەم هۆیە سەرکییەکەی هەمان پشت بەیەک بەستن بۆ چاکترکردن و پاکتاو کردن بێ. دەنا ڕەنگە هێندە بەکار نەیەم. فارسەکان دەڵێن:

---

[١] ڕێبوار: ڕێبوار سیوەیلی، وەرگێڕانی "دەنگی پێی ئاو" سوهراب سپێهری

عروس تعریفی گوزو از آب درمیاد. واتە: بووکیک کە زۆریان پێ هەڵگوت، ترکەن دەردەچێ. (ببورە مەبەستم خۆمە!).

ئەوە لەگەڵ ئەم نامەیەدا چاوپێکەوتنەکەی دەوڵەت ئابادی۳و سێ وێنەی خودی دەوڵەت ئابادی کە ئیمزای کردوون دەنێرم. وێنەکان لەم سەروبەندەدا ون نەبن خەراپ نییە. کاسێتێکی کوردی- فارسیش پێشکەشت دەکەم کە لە ئێرانەوە بۆم هاتووە. لەلایەن خودی ئاهەنگسازەکەوە. ئەمانە چوار بران کە خەڵکی "سنە"ن، من زۆرم بە دڵ بوو. تۆش کەیفی خۆتە. بەڵام لە مۆسیقای کوردیدا، شتێکی نوێیە (هەرچەندە لە ڕاستیدا مۆسیقای کۆنی دەروێشەکانە و زیندووکراوەتەوە).۱ بەهەرحاڵ..

بەم زووانە چاوپێکەوتنەکەی (قازی ڕیبحاوی)ت بۆ دەنێرم. لە دوای ئەویش چەند وتەیەکی شاعیری بەرزی ئێرانی (فروغ فەروخزاد) کە بە ئانقەست کردوومن بە کوردی بۆ ئەوەی ئەگەر خوێنەر و شاعیری کورد لێی ورد ببنەوە نەختیک بێنەوە سەرخۆ. قسەکان لە زللەیەک دەچن. هێندێک شتی تریش هەن کە بە داخەوە تەنبەڵی و سەر لێ شیواوی لێم بە دوا دەخەن. دیارە بەم زوانە ئامادە دەبن.

لە بارەی خۆمەوە: لە ئوتێلێکی چڵکندا دەژیم. هێشتا تەحقیقیان پێ نەکردووم. ئەوە هاتنەکەم بوو بە چوار مانگ. "نازلی" و دایکیشی لە مۆسکۆن. دیارە ڕێگا نیە. دوو مانگ لەمەوبەر لەگەڵ نازلی کچم بە تەلەفۆن قسەم کرد. داوای بووکەشووشەیەکی دەکرد کە بۆی بکڕم و هەر کە هات بیدەمەدەست. منیش ئەوە کڕیومە. بەڵام بووکەشووشەکە هێندە لەسە مێزەکە چاوەڕوانی خاوەنەکەی دانیشتوە، دەترسێم پیربێ. سەرگەردانی و عەودالێ منیش بە دوای خۆمدا هەر درێژەی هەیە. ئەگەرئەم شەڕفرۆشتنەی منیش بە خۆشەویستان نەبێ، ڕەنگە بیر لە بوودەڵەبوونی ژین بکەمەوە.

---

۱عەندەلیبییەکان. کاسێتی "هەی گوڵ"

۳ مەحموود دەوڵەت ئابادی.

سوهراب سپێهری گوتەنی:

" من لەم تاریکییەدا

بیر لە بەرخێکی ڕووناک دەکەمەوە

کەوابێت و

گیای ماندوێتیم بخوا."

ماچت دەکەم و سڵاو بۆ ئێکای دایک

کوڕی خۆت بەڕۆژ

١٩٩١/٦/٢

کاترێناهولم [سوێد]

## کێ دەڵێ ئەودیوی کەون، بەتاڵە؟

نامەی بەهرۆز حەسەن بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

۹۹/۸ /۳۰

بەهرۆز حەسەن- دانیمارک

ئەنوەر گیان.. ڕیکا گیان، ئەم کاتەتان شاد

بەسەری تۆ زۆر کەرەت ویستم نامەتان بۆ بنوسم،

بەڵام هەر نەبوو بە هیچ. ئەوە غیرەتم دا بەخۆم و دەستم

پێکرد.

ئەنوەر گیان ئەو ماوەیەی پێشوو زۆر ناخۆش بوو،

بڕوات و نەیەتەوە. وەسف ناکرێت، ئێستەیش بڕوا

ناکەم "ئازاد"[1]مردبێت... بەڵام لە هەمان کاتیشدا

هەقیقەتە و ئەشێ هەزم کرێت.

بە هەرحاڵ با لەو باسە گەڕێین. ماوەیەکی دی من

و تۆ و ئەویش هەر ئەمرین و لەوانەیە یەکێکی تر

بڵێت باوەڕ ناکەم، یان ڕۆحی بە شێنەیی ئازار

بچێژێ.. وەک ئێستەی من.

---

[1] ئازاد حەسەن برای گەورەی "بەهرۆز حەسەن"ە بە سەکتەی دڵ لە هۆڵاند کۆچی دوایی کرد.

ئەنوەر گیان ئازاری وا تەنها زەمەن چارەی ئەکات "لەوانەیە". نازانم، زۆرجار هەموو شتێ "بە هەقیقەت و ناهەقیقەتەوە" بەتاڵ دێتە پێش چاووم. بەتاڵ وەک ئەودیوی گەردون، بەڵام کێ دەڵێ ئەودیوی کەون بەتاڵە؟

با بێینەوە سەر زەوی، لەبەر ئەوەی هەموومان لەسەر سەرەکەی دەژین، ئەخەوین.. فەوت دەبین. مردنیش یان رۆحت وە خەبەر دێنێت یان بەرەو قوڵایی بەتاڵیت دەبات! یان چاوت بە دنیایەکی  دی دەکاتەوە یاخود بۆ هەتا هەتایە هەردوو چاوت ئەنوقێنێت.

لە ژیانەوە گەر تەماشا بکەیت: ئەوانەی کە مردوشن لە هەقیقەتی مردن نازانن، هەروەک چۆن ئەوانەی کە ئەژین لە هەقیقەتی ژیان تێ ناگەن. بە کورتی ئێمە زیندانی هەردولاین و ئازار دەچێژین. لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر هەمان کەری بۆرین، کلیلی زیندانەکەشمان لێ ون بووە.

ئەزانین هەیە، بەڵام دەرکی پێ ناکەین. چونکە هیچ زیندانێک ناشێ بوونی هەبێت گەر دانەخرا بێت، گەر کراوە بوایە ئەوسا دەبوە شتێکی تر، ئەوسا گرفتی گەورەترمان تووش دەبوو، ئەی چارە چی یە..؟

لای من دەشێ پیاو لە کاتی ژیانیدا بیر لە ژیان بکاتەوە و کاتێکیش مرد، بیر لە مردن بکاتەوە. ئەمەش ئەمانگێڕێتەوە سەر خەرەکە شکاوەکەی دوو هەزار ساڵ لەمەو پێش کە سواڵکەرەکانی نیپاڵ بە خەڵکیان ئەوت: کەرینە لە ئێستە و لێرەیا بژین! خەڵکیش جرتیان بۆ لێ ئەدان و وەک سەگ نانیان بۆ فڕێ ئەدان. ئێستایش بۆتە گرفتێکی فەلسەفی و ئەوسەری دیار نیە!

بەسەری تۆ هونەر[تۆفیق] ئەو نەگبەتی لە نەگبەت بووە لە ئەڵمانیا گروپێک لوتیشیان شکاندووە، بە هەرحاڵ بەشکم زوو ئیقامەکەی دەرچێت و نەجاتی بێت لەو دەردەسەری یە، ئەمەل زۆر هەیە لەم مانگەیا نەجاتی بێت، گەر ئەمەیشیان گرفتی تری بۆ نەیەتە پێشەوە باشە.

دەی ئەنوەری رەشی عەولا.... بە سەری تۆ زۆر بیرتان ئەکەم، خۆزگە بمتوانیایە بەم زووانە بم بینینایە.. با بزانین چۆن ئەبێت. با جارێ منداڵان لە دایک ببن "یەکێکیان کوڕە و ئەوی تریان کچە"، بەڵام ئەوی تریان جارێ تاقەتی نیە بە تەواوی خۆیمان نیشان بدات. بەڵام چاوەڕوانین لە دایک ببن.

ئەنوەری رەشی عەولا بە شەرەفم ئیحساسێکە تەصەور ناکرێت هەتا خۆت چاوەڕوانی نەبیت. هەڵبەت بە ئاگاین لەوەی دوان بە جارێ، کۆمەڵی گرفت لەگەڵ خۆیاندا ئەهێنن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ژیانی تازە و ئیحساسی تازەش لە گەڵیاندا لە دایک ئەبێ!

کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا لە ڕەگەوە ژیانمان ئەگۆڕن. بە ڕاستی کە بیریان لێ ئەکەمەوە، مانایەکم ئەدەنێ کە لەوەو پێش نەمبوە، زۆر تایبەتە.

ئەنوەر گیان یەک دوانێ دروست کەن و بیرکردنەوەی گەورەش لێ گەڕێن بۆ فیلەکان، ئەوان کەللەیان گەورەترە!

زۆرکەس ئەڵێن نامانەوێ منداڵ دروست کەین یان بیان هێنینە دونیایەکەوە کە پڕ بێت لە ئازار و سەر ئێشە، بەڵام ئەگەر لە خۆیان بپرسیت ئەی ئێوە چ کارەکەن لە ژیاندا..؟ ئەم هەناسەیە هەبێت یان نەبێت چ دەگۆڕێ..؟

بەڵام لێرەدا ونکردن و فەوتاندنی ئەو تاکەیە کە هەناسە دەدات کە بونی هەیە، ونکردنێتی لە ناو دەریایەکی گەورەتردا کە هەق نیە. مەبەستم ئەگەر بیر لە گەڵای درەختێک بکەیتەوە، بە نیسبەت ئەو هەموو درەختەی هەیە، رەنگە بڵێت جا چ دەگۆڕێ گەر بە دەرختەکەوە بێت یان هەڵوەرێت؟! بەڵام بە نیسبەت گەڵاکە خۆیەوە گەورەترین مانای هەیە کە بە درەختەکەوە بێت، کە بونی هەبێت، هەرچەندە کە زۆر گچکەشە و کەسیش نایبینێ؛ بەڵام تەنها لەبەر ئەوەی "هەیە". دەی گوڵەکەم با لە دار و دەوەن بگەڕێین، وەکی تر سەرقاڵی دوو کۆرسی فەلسەفیم، یەک دەربارەی فەلسەفەی زمان. دووەمیش دەربارەی فەلسەفەی دیانەت یان بڕوا، دوو کۆرسی خۆشن سودیان زۆر لێ وەرئەگرم.

ئەنوەر گیان بە تایبەتی چاوی ڕیکام بۆ ماچ بکە، زۆر بیری ئەکەم، گەرچی نامەشم بە ئینگلیزی بۆ نووسی.

سڵاو و ڕێزم بە هەموو برادەران بگەێنە بە تایبەتی کاوە، نازانم هەواڵی مردنی ئازادی بیستبێ.

دنیایەک خۆشەویستیم هەیە بۆتان.....

١٩٩٨/٥/٢٣

**مشوری ڕەقابەم بۆ بخۆی...**

نامەی بورهان قانع بۆ عیزەدین مستەفا

بەڕیز جەنابی کاک دکتۆر عیزەدین

ڕۆژتان باش

له پاش دووبارەکردنەوەی ڕیزگرتنتان، ئەوا لەسەر داوای خۆتان ئەو نامیلکەیەی کە باسی ئەمریکای لاتینە، بە تایبەتی سلفادوور و کوبا ئەکات، پێشکەشتان کرا، خۆ ئەگەر دوای خوێندەوەی وەکو برایەکی دڵسۆز مشوری ڕەقابەم بۆ بخۆی بۆ چاپکردنی ئەوا هەرگیز لەبیرناچیتەوە و پێشەکی شایانی سوپاسە.

تکایە: لە کەموکورتی دەستخەتەکەمان ببورن، چونکە بەپەلە، ڕوونووس کرایەوە.. ئیتر داوای سەرکەوتنتان دەکەین

**کتێبەکە بایەخدارە...**

نامەی بیمار بۆ عیزەدین مستەفا

مامۆستای بەریز و خۆشەویست کاک عیزەدین

رۆژباشیکی گەرمی و دڵسۆزانە

دیارییە بەنرخەکەتان کتێبی(رازی دوور)[1]م پی گەیشت، زۆر مایەی شانازییە بۆ من کە دۆستیکی مایەداری وەکو ئیوە هەمووەدەم دڵسۆزیی خۆتان بەرامبەر من بنوێنن..

زۆر سوپاستان ئەکەم

ئەوەی زیاتر شایەنی وتنە، کەم کەسی بەزاتی وەکو ئیوە، هەڵئەکەوێ کە لە هەموو تارکییەکدا چەشنە پرشنگیک و جۆرە تیشکێک بڵابکاتووە و بتوانێ تا دووا پشوو وابەستە لە مەیدانی ویژە و زانستی خوێندەواریی کوردیدا لە هەموو سەردەمیک دا خۆی بنوینێ.

کتێبەکە بایەخدارە، هەڵبەستەکانی لام وابێ، پایەیان لە چیرۆکەکان نزمترە، بەلام چیرۆکەکان نوخشەیەکی پیرۆزە_ وە هیوادارم وابێ.. بۆ ئەوەی بەرهەمبکی چیرۆکی بەپیت تر و زۆرتری لە دواوە بیت و تا ئیستا ئەم مەیدانە پیویستی بە نووسەریکی وەکو ئێوە هەیە و ئەم چیرۆکانە شایەتی بەهرەی چیرۆکنووسی ئەدەن. ئیتر سەرکەوتن و پێشکەوتنتان ئاواتمە.

دڵسۆزتان

بیمار

سلیمانی ١٩٦٩/١/١٧

---

[1] دکتۆرعیزەدین مستەفا رەسول، رازی دووری، "کۆمەڵە هەستیکی دوور وولاتی یە لە قالبی چیرۆک و نووسین و شیعر دا دەربڕراوە"، بەغدا١٠/٢٠/ ١٩٦٨

نامەی تۆماس ترانسترویمەر بۆ فەرهاد شاکەلی

بۆ فەرهاد شاکەلی

وێڕای سوپاس له ناخی دڵەوه بۆ گۆرانەکه[١]، هیوادارم وەرگێڕانی زیاتر له کوردییەوه بۆ سویدی بکرێت..[١]

تۆماس ترانسترویمەر

Till Ferhad Shakely
med hjärtligt tack för
Goran – hoppas det
kommer mer kurdiska
översättningar till svenska!
Tomas Tranströmer

---

١فەرهاد شاکەلی: چیرۆکی ئەم نامەیەیش وایە، کە ساڵی ١٩٨٥ و ١٩٨٦ بە سێ کەسەوە: شاعیری سویدی لارش بێکسترویم و بەختیار ئەمین و بەندە، بیست شیعری گۆرانمان کردە سویدی و ئەوجا وەک کتێبێک چاپمان کرد، بە ناوی (فرمێسک و هونەر) و بە سویدی (Tå rar och Konst)لەلایەن پەخشخانەی ئازادەوە ساڵی ١٩٨٦ چاپ کرا. دۆستێکی سویدیم وتی: بۆ دانەیەک نانێری بۆ ترانسترویمەر؟ ئەوسا من ترانسترویمەرم کەمۆکێک دەناسی، ئەویش ئەودەم وەک ئێستا ناسراو نەبوو. کتێبەکەم بۆ نارد، ئەویش کتێبی کۆی شیعرەکانی خۆی بە دیاری بۆ ناردم و لە لاپەڕەی ناوەوە بەو جۆرە پێشکەشی کردبوو. لەم ساڵانەی دواییدا دوو سێ نامەی دیکەی بۆ ناردووم، بەڵام ئەوانەی وەک ئیمەیڵ ناردوون.

ناوبانگ و بەرزبوونەوەی تۆ،

## ناوبانگ و بەرزبوونەوەی کەیسی نیشتمانەکەتە!

نامەی جەرجیس فەتحولا بۆ شێرکۆ بێکەس

جەرجیس فەتحوللا   مامۆستا کاک شێرکۆی بەڕێز   ٢٢حوزەیرانی ١٩٨٩

پاریزەر

لە ناخی دڵەوە سوپاست دەکەم بۆ دیارییەکان، بە تایبەت دوا دیوانت. بەرهەمە ئەدەبیەکانت بە من نامۆ نین، پێشتر شیعرەکانتم خویندۆتەوە و بڕیارمداوە کە تۆ شاعیریکی گەورەیت و کاریگەری و جێدەستی خۆت لە ناو ئەدەبی کوردی دا جێدێڵی، وێنەکانت دەوڵەمەندن و لێکچواندنەکانت پڕ مانان و لە راستی دا داهێنەرانەن. ناوبانگ و بەرزبوونەوەی تۆ، ناوبانگ و بەرزبوونەوەی کەیسی نیشتمانەکەتە، گەر بۆم هەبیت شتێک بڵێم، لەو روانگەیەوەی لە تەمەندا لە تۆ گەورەترم، دەمەوێت پێت بڵێم: لەم ڕیتمی نووسینەی کە گرتوتەتە بەر بەردەوام بە، چونکە ئەم ریگایە ڕاستە و نەکەی هەرگیز ئاوڕ بدەیتەوە بۆ دواوە و گوێ بۆ قسەی حەسودەکان و رەخنەگرەکان مەگرە ئەوانەی کە هیچ شتیکیان نییە و خەریکی هەوڵدانن بۆ کەمکردنەوەی نرخی کاری داهێنەران، چونکە خۆیان ناتوانن بەرهەمی باشیان هەبێ.

بەلام کتێبەکەی برامان "جەلال"[٢] لەکاتی خۆیدا ناردووتە لەم بیست و چوار سەعاتەی پێشوودا هەندێکیم خوێندەوە، بێگومان بابەتەکەی زۆر زۆر باشە، بۆنەکەی لەو باشتر نییە، بەلام هەندێک راستی مێژوویی هەیە، کە پیویست بوو جەلال تیایدا بگەرایەتەوە بۆ مێژوو و پێش ئەوەی بیان نووسێت بۆ نمونە: چاو لە پەرەی (٤١٨) دا چووە سەر ئەوەی کە دەڵێت: مەلیک فەیسەڵ باوکی حسین،

---

[١] ئەم نامەیە بە زمانی سوێدی نووسراوە.

[٢] مەبەست لە کتێبەکەی مام جەلالە:
جلال طالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، دار الطليعه للطباعه والنشر، ١٩٧١.

کوردستانیان نەخستۆتە ناو ولاتە عەرەبییەکانەوە، لە وتوویژەکانیاندا لەتەک "مەک ماهون" کە ئەمە هەڵەیە، ئەگەر جەلال خۆی ماندوو کردبایە و نامەکەی مەلیک حسینی بۆ مکما هون بخوێندایەتەوە کە لە ساڵی"١٩١٦" نووسیویەتی، تیایدا هاتووە سنوورە جیاکانی ولاتی عەرەبی دیاریدەکرێت، دەبینی لەو نامەیەدا کە کوردستان بە بەشیک لە ولاتی عەرەبی دانراوە و بگرە هەندێ وردەکاری زیاتریشی تێدایە.

بەلام ئەوە "جەلال"ە لەگەڵ زیرەکی و تواناکانی دا لەو کاتەوەی کە پەیوەندی درووست بووە لە نێوانماندا پێش (٣١) سال، هەندێک( ....)تیادەبینم[1]، کاتێک لەم دوو کتێبە دەبمەوە کە بە دەستمەوەن، بە باشی کتێبەکەی دەخوێنمەوە و تێبینی خۆمی بۆ دەنووسم، ماوەیەکی تر گۆڤاری ڕۆشنبیری کوردی لێکۆڵینەوەیەکی درێژم بۆ بلاودەکاتەوە بە ناونیشنانی "نەوت: لە بڕیاری چارەنووسی سیاسی کوردستان دا" کە بابەتێکە پێشتر کەس خۆی لێنەداوە و هەندێک راستی تێدایە کە ئێستا بلاونەکراونەتەوە. کە هەموو بیروڕاکانی جەلال دەچەسپێنن لە کتێبەکەیدا.

درێژەم دایە، دیسانەوە سوپاست دەکەم. هیوادارم دوا دیدارمان دەرگایەک بێت بۆ دیداری تریش کە بەرهەمی هەبێ لە پیناو ولاتەکەماندا..[2]

بمنێنی برات..

---

[1] ئەم وشەیە ناخوێنرێتەوە.

[2] ئەم نامەیە بە زمانی عەرەبی نووسراوە.

**وێرانەیەکی قووڵ، لە ڕۆحماندا هەیە.**

نامەی جەلیل قەیسی بۆ ئازاد بەرزنجی

کەرکوک لە ٢٠٠٣/٣/٨دا

ئازیزی دڵەکەم ئازاد بەرزنجی ی بەڕێز

ماچت دەکەم

لە میانی دوو دانیشتنەوە لەگەڵتدا سەرنجم دا کە سەرباری ئەوەی حەز بە بێدەنگی دەکەیت، ئەو بێدەنگییە شاهانە باڵایەی کە داتدەگرێت، کاتێک کە دەدوێیت، قسەکات زۆر چڕوپڕ و ورد و قووڵ و هەندێجاریش فەلسەفین و گەلێ مانا دەتەقێننەوە. وەختێ من سەردانی ئێوە دەکەم، تەنیایی و موعانات پاڵم پێوە دەنێت بێم بۆ لاتان و پڕم لە خەمۆکییەکی نەفرەتی. ئازادی خۆشەویست هەستدەکەم لە تەنیاییمدا ڕێک ئەو وشانەی شاعیری پورتوگالی "فێرناندۆ پێسوا"ی مەزنم بەسەردا دەچەسپێن کە دەڵێت: (من پەراوێزەکانی شارێکم کە بوونی نییە، من ئەو قسە ورد و درشتانەم سەبارەت بە کتێبێک کە هێشتا نەنووسراوە. من کەس نیم، کەس. من نموونەی کەسێکم لە ڕۆمانێکدا کە پێویستە بنووسرێ، بەبێ ئەوەی ئەو کەسە هەبێت). ئاە، شەوێکیان زۆر بە درێژی قسەمان لەسەر دەروونناسی کرد.

ئازاد، وێرانەیەکی قووڵ لە ڕۆحماندا هەیە کە دیکتاتۆری لەسەر حوکم لابراو لە ئێمەیدا چاند. بەڵام، ئای خودایا، بەتایبەتی کە لەگەڵ ئێوەدا دەبم لە نیوەی پێکی دووەممدا وردە وردە وەکو سیمفۆنیایەک بە خودی خۆم ئاشنا دەبمەوە، و لە دڵی خۆمدا دەڵێم: باشە بۆچی پێشتر هەست و نەستەکانم لە هەموو هەست و نەستێک خاڵی بوو؟ ئەی بۆچی ئێستا وەکو گڕکانێکی ڕاستەقینە دەتەقێتەوە؟ بۆچی هیچ شتێکی ساردوسڕ لە جەستەمدا نەماوە؟ ڕەنگە "ڤان گوخ" لە خۆشەویستیی زۆر و شێتانەیدا بۆ "گۆگان"ی هاوڕێی بووبێت، کاتێ لە شاری

ئارلی سەردانی کرد، بە ڕادەیەک هەست و سۆزی خرۆشابوو کە ویستی بە چەقۆ بریندااری بکات...

هاوڕێی ئازیز... لە کاتێکدا ئەم چەند دێرە کەمەت بۆ دەنووسم دەنگە هێمن و ناسکەکەت لە گوێمدا دەزرنگێتەوە و هەستێکی دیارینەکراوم تیا دەورووژێنێت.... هەروەها دەنگە زۆر نەرمەکەی "بێگەرد" و ڕوخسارە ناسکەکەی و سیمای خەواڵووی کە لە ڕاستگۆیی ئەدائیەوە سەرچاوەی گرتووە...

من وەکو نووسەرێک، لەڕێی سیمای دەموچاوەوە پەی بە گەورەیی دڵی مرۆڤ دەبەم. تۆ، بگرە هەمووتان، بە مانای وشە گەورەن.

ئەوپەڕی خۆشەویستیم قبووڵ بکە، بە کاک نەوزادیش[ئەسوەد] بڵێ کە نامەیەکی بۆ دەنێرم.

جەلیل قەیسی

نامەی جەلیل قەیسی بۆ ڕەووف بێگەرد

ڕەئوفی خۆشەویست

ئەگەڕێمەوە جارێکی تر تا نامەت بۆ نێرم، لە پڕدا گێژەڵۆکەی بیرکردنتان لێی داوم و بیرکردنی تۆ بە تایبەتی. دەوترێت زۆر خۆشویستن خەمە، مرۆڤی تەنها چی دەکات، ئەو مرۆڤەی کە خوی گرتووە بە تەنهاییەکەیەوە..

ڕەوئوف من لەو ساتەوەی هاتومەتە ناو دنیای ئەدەبەوە تەنهام، و تەنهایم دەگوزەرینم، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەندێ جار خەمۆکییەکی خەمبار دامدەگرێت، بێ ویستی خۆم هەستدەکەم کە خەتەکانی گەیاندنی مێشکم لە کار دەکەوێت کەوا دەکات، چۆنها نەبێت هیچم بیرنایەتەوە.. کاتی وا هەیە تۆم بیردەکەوێتەوە، هەمووتانم بیردەکەویتەوە، لە مێشکما پارچەی بریقەدار دەبریسکێتەوە لەو وێنانەی کە لە لاویماندا چەسپ بووە. لەو کاتەدا ئازار و دڵخۆشییەکی جوان دامدەگرێت، جاری وایە دەنگت لە گویما دەزرنگیتەوە کە دووبارەی دەکەیتەوە بە ئاوازیکی نەرم دەڵێی: جەلیل.. جەلیل.. چۆنی؟ ئەحواڵت. شێرکۆی[بێکەس] داهێنەر ڕاست دەکات کاتێک لە قەسیدەیەکی دا دەڵێت:

بە ڕەنگ دەزانم کە ئاوازی دەنگت غەمگینە یان دڵخۆشە..

بێگەردی خۆشەویست وەک چۆن لە ناو باڵندەدا خۆرسکانە هێلانە دروستکردن هەیە، ئاوهاش لە ناو ئێمەی نووسەر دا خۆشەویستییەکی جیاواز و ئاڵۆز هەیە بۆ نووسین و خوێندنەوە و هەروەها بۆ هەستە گەرمەکان، و سۆزە هەڵچووەکان، بێ هودەییەکی زۆر بۆ بیرە تێکەڵاوە فەوزەوییەکان، و دیقەتدانێکی ڕۆحی بۆ وەبیرهێنانەوەی یادەوەرییە غەمگینەکان، تێکشکانە رۆحییەکان.

ڕەئوفی خۆشەویست، ببورە بۆ ئەو ژاوەژاوە هەستیەم، تۆش هەندێ جار وەک من نیت؟؟ بە دڵنیاییەوە ئێمە واین دەناڵێنین بە دەست گرێگەلێکەوە کە لە هی ئاڵۆزی زمانی بارۆکییەکان دەچێ..

شاعیرە گەورەکەمان لەسەفەرەکەی گەڕاوەتەوە[1] ؟ تۆ هەواڵت چۆنە؟ ئاواتە خوازم خیزانەکەت باش بن، سەردەم[2]گەیشتۆتە کوێ؟ ژمارەی دووەمی لێ دەرچوو؟ ئاهـ ئەی خەیاڵ پڵاو بۆ بیر لە من ناکەیتەوە؟ بۆم بنووسە ئەگەر کاتت هەبوو و بۆت ڕێکەوت..

ماچم بۆ هەموو لایەک

هەر بمێنی

جەلیل قەیسی

کەرکوک لە ١٥/٧/ ٢٠٠٣

---

[1] شاعیرە گەورەکەمان مەبەست لە 'شێرکۆ بێکەس'ە.

[2] مەبەست لە گۆڤاری 'سەردەم'ی عەرەبییە کە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات.

بەلەمەكانمان، لە ناوەڕاستی دەریادا سووتاندووە.

نامەی جەلیل قەیسی بۆ ڕەووف بیگەرد

ڕەووفی خۆشەویست ماچ بۆ تۆ

بمبورە لە كورتی نامەكەم، لەبەر ئەوەی من بیتاقەتم و نازانم بۆچی؟ چ قەدەریكی قورسە نووسەر بیت.. ئایا بۆچی ئەم ناوەندەمان هەڵبژارد لە نێو ئەو هەموو ئیش و كارە جیاوازە دا. ئیشی خلۆركردنەوەی بەردەكەی سیزیف؟ هەتا كەی لەگەڵ ئەم بەردەدا دەمێنینەوە؟! خەڵك لە هەموو دنیا لە كارەكانیان بە ڕاست یاخود بە گاڵتەوە دەپرسن:

ئەی ئەستێرەكان دەڵێن چی بەختم؟ ئایا پلەكەم لە كاردا بەرزدەبێتەوەو ئایا دەوڵەمەند دەبم، بەلام ئیمە سوال لەكات دەكەین، وەك كازانتزاكی، وەكو خۆتت وتت لە نامەكەتدا بۆ ئەوەی بنووسین و بخوێنینەوە بەس..

وەكو شێت هەڵچوونەكانم زیاد دەكات كاتێك كتێبێكی زۆر جوان ئەدۆزینەوە، یان ئەو كاتەی كاریک دەنووسین و هەستەكانمان پێمان دەڵێن ئەمە كاریكی زۆر جوانە! "ئەلیەت" جاریكیان وتویەتی: "دوای ئەو هەموو زانینە چ لێخۆشبوونیک هەیە؟" لێخۆش بوون نییە، بەلەمەكانمان لە ناوەڕاستی دەریادا سووتاندووە، لەبەر ئەوەی ئێمە وەكو چۆن "ڕامبۆ" دەڵێت: خۆبەخشین بۆ دۆزینەوەی رووناكی خودایی.

باوكی ئاری جوان، چ زەرەرێكە ئەگەر سوال لە كات بكەین، چونكە بە ئاگری خۆنەویستی ئەدەب خۆمان (تەعمید) پاككردۆتەوە وەكو كاسۆلیكییەكی ڕاستەقینە خۆی تەعمید دەكات بە مەسیحییەت. پێویستە دوای ئەم تەمەنە قەدری كات بگرین تا تینەپەڕیت بێ فەڕ، پێویستە جێپەنجەی خۆمانی لەسەر بنەخشێنین. تۆ ئەڵێی چی؟

ڕێز و خۆشەویستم بگەینە بە ئازاد[بەرزنجی]، شێرزاد [حەسەن]، نەوزاد[ئەسوەد]، و هەموو ئەوانەی كاردەكەن لەگەڵتان، ڕیزی زۆرم بۆ

خێزانەکەت، و ئەگەر خۆشەویستی گەورە نیعمەت بێت لە سەر زەوی، هیچم لە دەست نایەت، تەنها ئەوە نەبێت کە چەند بەشیکی بنێرم بۆ شاعیری گەورەی داهینەرمان بیکەس..

هەر بمێنن

جەلیل قەیسی

**شێرکۆ؛ لە قاروون دەوڵەمەند ترە!**

نامەی جەلیل قەیسی بۆ شێرکو بیکەس

کەرکوک لە ١/٦/ ٢٠٠٤

براو خۆشەویستم شێرکۆی بەڕێز

سلاوی خۆشەویستی

لەم دواییانە دا لە دەفتەری یادەوەرییەکانمدا نووسیم

دوای تەواو بوونم لە دووەم خوێندنەوەی دیوانەکەتم

(سفر الروائح)[1] کە شێرکو تا ئێستا پیم وایە بۆ

هەمیشەش وەکو شاعیرێکی داهینەر بە ڕەنگی گەشاوە

قەسیدەکانی دەنووسێ. چونکە رەنگ و ڕۆحی

کوردستانە.. کورد بەهۆی دەوڵەمەندی سروشییەوە

بە تاقگەیەک لە رەنگ و رۆحی چاوەکانی بێ ئاگای

خۆی پڕن لە ڕەنگ.. شێرکو بە گەشتی و بە تەڕ

و تێراوی شیعرەکانی دەنووسێت، وەکو شاعیرێکی

تایبەت، قەسیدەکانی لەژێر قەڵەمە پیرۆزەکەیەوە

دەتەقن و دێنە بەرهەم.

---

[1] شێرکو بێکەس، سفر الروائح، ت. آزاد البرزنجی، الطبعة الاولی، ٢٠٠٠ سلیمانیة- کردستان

لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەنی لە شەستەکان،

هێشتا بە گڕوتینێکی زیاترەوە کاردەکات و بەخێرایی با و بڕوابوونێکی گەورە بە خۆیەوە بەرهەم دەنووسێ.

هەروەک چۆن وێنەکێشی گەورەی فەڕەنسی "دیلاکروا"، یاسا ڕەنگییە تەواوکەرەکانی دۆزیەوە، ئاوهاش شێرکۆ تۆنەکانی ڕەنگ، دەنگ، زمان، بە ڕیتمیکی شێرکۆیی و بە سادەییەکی سەرنجڕاکێش شێواز و ناوەڕۆکی شیعرەکانی دەنووسێ و شیعرەکانی دەبنە ڕیتم داڕێژراوێکی پڕ لە هارمۆنییەت.

شێرکۆ زۆر بە باشی وڵاتەکەی، خەڵکی وڵاتەکەی، زەمەنە قورسەکەی ناسیووە.. ئای خوایە چەند دەوڵەمەندە، بەڵکو لە قاروون دەوڵەمەند ترە! باوەڕ بکە باوکی هەڵۆ زۆر تامەزرۆی دیدارتم، جارجارە لەبەر خۆوە وشە جوانەکان دووبارە دەکەمەوە کە لە دیوانی "سروودە کێوییەکان"[1]دا هاتووە:

لە کوێوە بێم تا بنووسم، بۆ ساتێکیش بێ لە دەنگتا

بۆ ساتێکیش بێ لە ماچەکەت دا شتێک زیاد بکەم لە جوانیتدا!

"گوڵدانی" ڕەنگەکان

تۆ ئەزیزی لەلامان

ئەی گوڵدانی کریستاڵ تۆ ڕۆح و چاومانی [2]

لەگەڵ ئەم نامەیەمدا چیرۆکێکمت بۆ دەنێرم بە ناوی "فی لیس فی مکان ما" کە پێش پێنج ساڵ نووسیومە و پێشکەشی هاوڕێی غەریبم "سەرکەوت یولس"م کردووە کە زیاتر لە سی ساڵە هاوڕێمە و وەکو سوپاسێک بۆ دیارییەکەی کە

[1] دوو سروودی کێوی، بڕوانە :
شێرکۆ بێکەس، دیوانی شێرکۆ بێکەس، بەرگی ١

[2] وەرگێراوی عەرەبییەکە و کوردییەکە نییە.

یەکێک لە جوانترین شیعرەکانی بوو. بەهیوام بە دڵت بێ و لەسەردەم دا بلاوبێتەوە.

بۆ بێگەرد و ئازاد [بەرزنجی] و نەوزاد[ئەسوەد]و شێرزاد[حەسەن] کە لەگەڵیاندا یەکتایی رۆحی کۆی کردونەتەوە، رێزو خۆشەویستیمیان بۆ دەنێرم.[1]

بمێنی ئازیز

داهێنەر هاوڕێ

مرۆڤێکی جوان بۆ هەمووان

جەلیل قەیسی

---

[1] ئەم نامەیە بە زمانی عەرەبی نووسراوە.

**ئەی داهێنەر؛ گڕی وشەکانت لە گوێ و دڵدا ترسناکن!**

نامەی جەلیل قەیسی بۆ شێرکۆ بێکەس

٢٠٠٣/٨/٢١

برا و خۆشەویستی داهێنەرم شێرکۆی بەڕێز

سڵاوێکی جوان

ئەم نامە کورتەت بۆ دەنووسم راستەوخۆ دوای ئەوەی لە هۆڵی چالاکیی هونەرییەکان دێمەدەرەوە. وەک ئەوە وام کە هێشتا بە خشوعەوە سۆفیانە گوێ دەگرم بۆ وشەکانت، ئەو وشانەی کە بە دەنگی زوڵاڵەکەت دەتدرکاند. وەکو وابێ هەڵگری بۆنێکی توند بێت کە بە قایمی بە دڵادا دەدات و جارێک و جارێکی تریش وەک وا بێ بە دەستلێدانێکی ئاوریشمی خۆی لە گوێ بدات، پاشان لووت پڕ دەکات و هەستەکان دەخروشێنێ. ئەی داهێنەر گڕی وشەکانت لە گوێ و دڵدا ترسناکن. جارجار ئاوڕم دەدایەوە تا سیماکان ببینم، ئاە خودایە دەمبینین وەکو وابێ ڕوناکییەکی "طوبا" ڕوناکی کردبنەوە.. بۆ یەکەجار هەستم دەکرد، کە شاعیری باش پێویستە توانای باشیشی هەبێ بۆ خوێندنەوەی دەقەکانی. زۆرم خوێندۆتەوە دەربارەی جوانی خوێندنەوەی "مایکۆفسکی و ڤۆزینسێکی و هەتا یەفتەشینکۆ"ە گویم بۆ "جەواهیری و قەبانی" گرتووە، بەڵام تۆ ئەو توانایەی کە خودا پێیبەخشیوی بۆ خوێندنەوە شتێکی ترە.. هاتنەدەرەوەی وشەکان لە کاتی وتنییاندا لەو قورگە ڕاهێنراوەت، بەو دەنگە تایبەتەوە دنیایەکی ترە...

لە ڕاستی دا من مانای زۆر لە وشەکانی قەسیدەکانتم نە دەزانی، بەڵام ئەوانەی کە تێدەگەیشتن، وەکو وا بێ بە قوڵی ڕۆبچنە ناو قوڵایی داستانێک لە ئەندێشە، و ئەوان لە ساتەکانی ڕۆحرۆشتنیکی سەیردا بوون.

سیماکان ئەو دەمەی تۆ دەچوویتە دەرەوە بە جوانییەکی ڕۆمی تێت دەئالآن، کاتێک تۆش بە سادەیەکی جوانەوە مامەڵەت لەگەڵیاندا دەکرد، بەڵێ هەقی کوردە کە شانازی بە کیبریائی شاعیریەتی تۆوە بکات...

بە وشەی ناسک وەکو بەرەبەیان هەواڵی [ڕەووف]بێگەرد دەپرسم بە هێواشی بە گوێت دا دەچرپێنم و دەڵێم تۆ بە ڕاستی مرۆڤێکی جوانی. ڕێزم بۆ ئازاد بەرزنجی و شێرزاد حەسەن، نەوزاد ئەحمەد هەموو ئەوانەی لە سەردەم کار دەکەن.

لەگەڵ گەورەترین خۆشەویستیم بۆت ئەی شاعیری بەڕێز

جەلیل قەیسی

**ئەم قسانە بە یادی فەقێ سەعیدەوە...**

نامەی جەمال غەمبار بۆ ئازاد بەرزنجی

٢٠٠٢/٥/٢٤ شام

برا و هاوڕێی خۆشەویستم ئازاد بەرزنجی

سلاو و ماچ و خۆشەویستیم.. بەسەر ئاگری ئیشتیاقەوەم بۆ دیدارتان، وەختە باڵبگرم بۆ سەعاتێک دانیشتنی پڕ لە دەمە تەقێ و نوکتە و قسە و باسی تەڕ، ئیتر لە سەرچنار بێت یان لە ئێوارەیەکی ئەزمەڕ، یان لە یانەی کۆمەڵایەتی بێت، یان لە هەر جێگایەکی تر لە سلێمانی بێت...

ئازاد گیان: بەگەرمی هەواڵتان ئەپرسم، هەواڵی ماڵ و منداڵ ئەپرسم... پەیمان و ڕۆزا و ڕەوەز ڕێز و سلاویان بۆ خۆت و خێزان و منداڵان هەیە.

نازانم چی بنووسم؟ بەقەد دووری نێوانمان زوخاو و بۆڵە و قەلەق و عەزابم پێیە..مەگەر کاک شێرکۆ بێکەس (کەماوەیەک لێرە بوو) بزانێت لە چ عەزابێکدام، بە تایبەت بە دەست ئیش و کارمەوە لە مەکتەب..!

چی بکەم گوزەرانەکە ئەوەندە سەخت و نالەبارە، ئەبێ ڕایبکێشم، هەتا دەلاقەیەک بۆ سەفەر ئەکرێتەوە..ئەو عەزابەی من لە چاوەڕوانیدا چەشتم و بەردەوامیش ئەیچێژم، لە گێڕانەوە نایەت و مەگەر لە پاشەڕۆژدا عومر باقی بێت بە چەند (ئێوارە چەمێک) یان بە (چەند سیمینارە چەمێک) بۆتانی باس بکەم.

سەبارەت بە پەیمان و منداڵەکانیش بەڕاستی ئەوانیش بێزاربوون، چونکە وەک خۆت ئەزانیت منداڵەکانی یاسینیش ڕۆشتن، ئیتر ئەمانیش بێ هاوڕێ و بێ ئەنیس ماونەتەوە. وەکو پێشتریش بۆم نووسیبوویت، تێکەڵاوی کەس ناکەین بۆ ئەوەی سەرباری وەزعی خۆمان، دووچاری سەرئێشەی لابەلا نەبین.

سەبارەت بە خۆیشم و مەسەلەی نووسین و خوێندنەوە و تەرجەمە، سەرباری قەلەقی و چاوەڕوانیی و ئەو وەزعەی کە تێیدام، ئەوەی ماوەتەوە هەناسەیەکی پێ بدەم خوێندنەوە و نووسین و تەرجەمەکەیە. کۆمەڵێ شیعری عەرەبیشم ئامادەکردبوو، دووای یەک ساڵی رەبەق هێنان و بردن و ئەمسەر و ئەوسەرکردن، وا خەریکە چاپ ئەکرێت، چاپکردنەکەشی لە (دار المدی) یە، ئیتر نازانم لەسەر حسابی خۆیان بۆ خۆیانە، یان پارەم لێ ئەسەنن، ئەوەیان ڕوون نەبۆتەوە هەتا لەحزەی نووسینی ئەم نامەیە بۆ تۆ..ڕەنگە بەرگی دیوانەکەش بۆ ڕیکلام بنێرمەوە. ئیتر هەروا بە دەم عەزێتی چاوەڕوانییەوە خەریکین.

بەشداریکردنی کاک شێرکۆ لە هەفتەی ڕووناکبیری (المدی) شتێکی باش بوو، بەڵام ئیتر بۆخۆت کوردی حەیات ئەناسی چەند غیرەتکار و حاقیدن.. لەوەشدا دووچاری هەندێ ئەزیەتی نەفسی بووین، بەڵام گرنگ بەشداریکردنەکە بوو وەک شیعری کوردی.

پێشتریش هیوا قادر لێرە بوو، هەواڵی بێتاقەتی تۆی پیراگەیاندم، لە ڕووی دڵسۆزیشەوە وەک شتێکی نێوان خۆشمان، باسی پرۆژەیەکی رۆشنبیری کرد کە پەیوەندی بە سەفەرێکتەوە هەیە، بە ڕاستی زۆر زۆرم پێخۆش بوو، بەڵام تکات لێ ئەکەم هەتاکو سەرنەگرێت و نەکەوێتە ڕێ، باسی مەکە.

وەکو خۆم بکە ڕۆژی هەینی لە بازاڕ پیاسەم ئەکرد بۆ ڕۆژی شەممە بە ڕێکەوتم و نەمهێشت دایکیشم بزانێت.

ئازاد گیان: سەفەر و چاوەڕوانیی و گەیشتن بە کەنارەکانی حەوانەوە (کە بڕوا ناکەم لەم دنیایەدا ئێمەومانان پێی بگەین، تەنانەت ئەگەر سەفەریش بکەین بگەینە شوێنی خۆمان) لێوان لێوە لە عەزاب.. بەڵام بینینی دنیا سەرەتاییترین مافی هەر یەکێکە لە ئێمە کە لێمان بۆتە کێوی قاف و پێی ناگەین..

ڕێز و خۆشەویستیم بۆ سەرجەم برادەرانی سەردەم بە تایبەتی بێگەردی ڕەهبەر و شێرزاد (حەسەن) و ڕێبین (هەردی) وشاهۆ (سەعید) و هەڵکەوت عەبدوڵلا و دڵشاد عەبدوڵلا و ئیتر خۆت وەکیل بە. ببورن لەوەی ناتوانم یەک

به یەک نامەبارانیان بکەم، جگە لەوەی زۆر بێ میزاجم ئێستا بەهۆی ئینتەرنێتەوە ڕەنگە کەس تاقەتی خوێندنەوەی نامەی بە دەست و خەت نووسراوی نەبێت.

کاکە ئازاد: لەم گەشتە دۆزەخییەمدا، هەندێک لەوانەی ئەورووپا کە من وتۆ بەبرادەر و دۆستی زۆر نزیکی ئەزانین، شێرەبەفرینەی بەر هەتاوی درۆ و قسەی زل دەرچوون! نامەوێ لەم نامەیەدا ناوت بۆ ڕیز بکەم.. بەڵام ئەگەر مەرگ مەودا بدات و چاومان بەیەکتری کەوت بۆت باس ئەکەم. لەبەرئەوەی ئەگەر بیرت لە دەرەوە کردەوە، کەسێک جێگەی بڕوای تەواوت نەبێ، نەکەی بەقای پێبکەی!

دوا وتە هیوادارم هەرچی ئاواتێکی جوان و خەونێکی شیرینت هەیە بێنە دی.

ئازاد گیان: وابزانم سەرم ئێشاندی لەگەڵ ئەم نامەیەدا، نامەیکی کورت بۆ (بێگەرد) ئەنووسم. ئەرک نەبێت بۆی هەڵدەرە ژوورەکەی.

برات جەمال غەمبار

٢٠٠٢/٥/٢٤

پەراوێز:

هەروەها نامەیەکم بۆ (ئومێد)یش نووسیوە.

عەیب نەبێ بیدەرێ! ئەم قسانە بە یادی فەقێ سەعیدەوە.

**نوسەری ئەم نامەیە "خانی" کوڕی...**

نامەی جۆیس بلاو  بۆ محەممەدی مەلا کەریم

مامۆستای پایە بەرز و زانا، بەڕێز کاک محمدی مەلا کەریم

وێڕای سلاوو ڕێزی بێ پایانم، ئاواتە خوازم لەش ساغ و تەندروست بییت و بەسەر تەنگ و چەڵەمەکانی ژیاندا زاڵ بن.

زۆر بەخۆشییەوە نامەکەتانم بەدەست گەیشت و زۆر سوپاسی هەستی بەرزتان دەکەم. خۆشحاڵم کە گۆفاری "Islam de kurde" تان پێ گەیشتووە، هەرچەندە نازانم کام دانەتان بەدەست گەیشتووە؟ بەڕێز ئالەن گێش دانەیەکی بە دیاری بۆ هینابوون، چاپ خانەی ئەم گۆڤارەی چاپ کردوە ئەمیش لەلایەن خۆیەوە وتارەکەی جەنابتانی بۆ ناردوون. تکایە ئاگادارم بفەرموون کام یەکتان پێ گەیشتووە؟ ئەم ئادرێسەی نامەکەتان ناردوە تەواوە و زۆر منەتبارم دە فەرموو لە نامەی خۆتان و برادەران و ئازیزانی دوورە ولاتم بێبەش نەفەرموون. تکاتان لێ دەکەم پێویستیتان بە هەر بلاوکراوەیەک، کتێبێک یان هەر گۆڤارێک هەبێ ئاگادارمان بفەرموون لە خزمەتتاندایین.

دیسانەکە سوپاس بۆ نامە جوانەکەتان و بە ئاواتی سەرکەوتنی زیاترت

دڵسۆزتان

جۆیس بلاو

تێبینی: نوسەری ئەم نامەیە "خانی" کوڕی هەژار موکریانیی دەستتان ماچ دەکات و سلاوتان دەگەیەنێ.

**شێخ نوری فەقیرە کوێر بووە!**

نامەی حافز مەلا محەممەدزادە بۆ سەفوەت

جەنابی مەلا مستەفای بەڕێز

نامەکەم پێگەیشت مەمنوونم و تەشەکورت ئەکەم ئەو مەوزوعەی کە نووسراوە(...)ئەو تەفسیرەی کە بەڕێز حاجی مەلا سەعید پێویستەیەتی لەسەر ئەو شکڵەی خۆتان نووسیم، بەهۆی چییەوە ئەگەر تەعەجوبی خۆمان نیشان بدەین سزا ئەدرێ، چونکە دوێنێ ملوانکەی بۆ فاطمە خان نارد لەگەڵ بڕێک خوراک لەگەڵ ئەوانەشدا نامەکەم نارد. لەو نامەیەدا سەلامی تایبەتی جەنابی محمد امینم بۆ حاجی مەلا نووسیوە ئەو نامەیەی نەدۆزییەوە، حاجی مەلا(...) سەلامی تایبەت و ئیحترامم هەیە بۆی، سڵاوم بۆ ڕەفیقی موحتەرەمم مەلا مەحمود هەیە، چاوەکانی خاتوو فاطمە و خاتو نەزیە خان ماچ ئەکەم، عومەمەن سەلام لە هاورییان ئەکەم.

نامەی بەرێز کورانی سلیمانی کە کاتبی (محەمەد بەهادینە)ی نفووسە ئەو موحتەرەمە جەوانە، قەومە، لەوێ سەردانی ئێوەی کرد لوتفەن برایەتی خوت بنوێنە ئەخباری ئەوێی پێبدە رجائەن، رجائەن، چونکە لەوێ(....).

سەلام لە حاجی مەلا خالید ئەکەم نامەبەر بوایە ئیسفایەی ئەکرد، شێخ نوری فەقیرە کوێر بووە.[1]

---

[1] ئەم نامەیە کۆنینەترین نامەی ناو ئەم کتێبە و بە زمانی تورکی پیتی عەرەبی نووسراوە و خوێندنەوەی گران بوو، بۆیە هەندێک وشە نەخوێندرایەوە و بە خاڵیتی جێماوە.

نامەی حسێن عارف بۆ هیوا قادر

١٩٩٦ /١٢/١

برای بەڕێزم کاک هیوا

ئەم کاتە و هەموو کاتێکت شاد

ڕۆمانەکەت "ئاوێنە سەرابیەکان-ئاوێنە سەرابی یەکان"[1]م لای کاک جەلال بینی، لێم خواست و خوێندمەوە، هەر لە یەکەم لاپەڕەکانی یەوە هەستم کرد کە بەرهەمی دەست و قەڵەمیکی شارەزای لێهاتووی بە بڕشت دەخوێنمەوە. زۆر دڵشاد و خۆشحال بووم، بە تایبەتی بەرهەمەکە لە بوارێکدایە کە ئەوەی تا ئێستا هەیە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بۆیە من لەگەڵ خوێندنەوەی هەر ڕۆمانێکی ئاوەها سەرکەوتووماندا، گەشکە دەمگرێ.

کاکە: لایەنە ڕووناکەکانی زۆرن و من ئیشارەت تەنیا بەم سەرەکی یانە دەدەم:

١) خودی باسەکە خۆی. ٢) ئەو وەسفە هەرە وردانەی شتەکان کە دەیانکەیت.
٣) زمانە چڕ و پوخت و پاراوەکەی. ٤) تەکنیکە پڕ لە وردەکاری یەکەی.
٥) ئەو زانیاری یە فراوانەی، کە نیشانەی فراوانی ی باری ڕۆشنبیری ی خۆتن.
ئەمانە پێنج پایەی پتەوی سەرکەوتویی ی ڕۆمانەکەن و دەهێنن ببنە مایەی لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ.

---

[1] هیوا قادر، ئاوێنە سەرابییەکان، سلێمانی ١٩٩٤.

وەکی تر دوو کەلێنی گەورەی تیدا هەن کە خۆزگە نەدەبوون، یەکەمیان: کزی لایەنی درامی یە، کە ڕەنگە هەر یەکەمان بۆچوونی تایبەتی ی خۆی لە بارەیەوە هەبێ. بۆ چوونی من هەر ڕا کلاسیکی یەکەیە، کە دەڵێ: ڕۆمان دەبێ کە دەستت کرد بە خوێندنەوەی بەری نەدەیت هەتا تەواوی دەکەیت. ئەمەش بە رادەی کاریگەری ی لایەنە درامی یەکەی دیتە دی. من ڕۆمانەکەی تۆم "٢٢٣ لاپەڕە" بە چوار ڕۆژ تەواو کرد. لە کاتێکدا ئەوە هی یەک ڕۆژە. چونکە هەر جارە کە دەمگرت بە دەستمەوە "٢٠-٣٠" لاپەڕەم لێدەخوێندەوە و بەرم دا. بۆچی؟ چونکە ڕای نەدەکێشام و نەیدەبەستمەوە بە خۆیەوەو واتە مادەی موگناتیز "درامی یەکەی" کز بوو. ئینجا ئەگەر بۆچوونت لەم بارەیەوە وەک من بێ، ئیتر ئەوە ئیشی خۆت و ئەرکی سەرشانی خۆتە کە چۆنی بە جێدێنیت، دووەمیان: کە بەندە بەیەکەمەوە، مەسەلەی دیالۆگە، بە ڕای من ڕۆمان یانی دیالۆگ. ئەم ڕۆمانەی تۆ ئەگەر شان بە شانی ئەو وەسفە هەرە وردە بایەخی تیدا بە دیالۆگ بدرایە و لە گەڵیاندا لایەنە درامی یەکە، کە دیالۆگ یەکێکە لە مەرجە کاریگەرەکانی بەدی هێنانی، گەلێ سەرکەوتووتر و بگرە شاکاریکی لێدەردەرچوو.

بە هەرحاڵ پڕ بە دڵ پیرۆزبایت لێدەکەم، ئەم بەرهەمە بۆ داهاتووت زۆر مژدە بەخشە و نیشانەی لێزانی و لێهاتووییتە.

لەگەڵ گەلێ ڕێزمدا

حسین عارف

**لای ئێوە گوێ نادەنە قسە و نوزەڵەی ڕۆمانتیک و شاعیرانە!**

نامەی حەسەن قازی بۆ عیزەدین مستەفا

تاران شەوی یەک شەمۆ ٢٢- فیورییەی ١٩٦٨

برای خۆشەویست و لەبەر دڵان کاک عیزەدین. دوای سڵاوێکی زۆر و چاک و خۆشێکی گەرم و گوڕ، ئاواتی شادی و سەرکەوتنی زووبەزوو و بەلەزت دەکەم. ماوەیەکی زۆر دووروودرێژە لێکدی بی خەبەرین، دیارە هەمیشە سوچ و تاوان و کەمتەرخەمی لەلای بچووکانەوەیە و لێ بوردن و چاو هەڵبواردنیش لەلای گەورەکان رایە. دەی، هەر چۆنێکی لێکدەینەوە من لەو بابەتی نەنووسینی نامەوە خۆم بە ڕووزەرد دەزانم. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە دۆستایەتی بە بنج و بنەوان و سەقام گرتوو بەهۆی بێ خەبەری لێکدی و یەکتر نەدیتنی وەجاغی کوێر نابێتەوە و زیاتر ڕەگ و ڕیشە دادەبەستێ. وەک دەزانی جگە لە نێوان خۆشی و برادەریمان پێوەندی ئێمە لەسەر ئاخاوتن و وت و وێژ لەمەڕ زانست و ئەدەبی کوردیە. ئەگەر لەبیرت مابێ کە دیارە لەبیرت ماوە و لە یادت نەکردووە بەڵێنت دابوومێ هێندێکم کتێب و نوسراوی کوردی بۆ بنێری ڕەنگە لەبەر نەبوونی ڕێبوارێکی ناسیاو بۆ ئێران، ئێستە پەیمانت بەجێ نەگەیاندن بێ، ئەو کتێبانەی وا زۆرم پێویستن: وا لەسەر قسەی پێشینان پارەکەش داوام لێ کردبووی هەروەها بەهەر چەشن و کوێرەوەرێک بێ دەبێ دەورەیەکی تەواوی گۆڤاری هیوام بۆ پەیدابکەی ئەرێ داخۆڵا چیرۆکەکە چی بەسەر هات لە چاپت دان یان نا؟ بیستوومە کتیبێ کی خۆت چاپ بووە و گۆیا هێندێک لە هۆنراوە تازەکانی گۆران و ڕۆباعێ کانی خەییامیش چاپ بوونەوە ئەگەر ـانت بوو بۆم بنێرە.

بەیتی "لاس و خەزاڵ" م وەرگێڕاوەتە سەر فارسی و لە گۆڤاری "جیهانی نەو"[1] دا بە کوردی و فارسی بڵاودەبێتەوە و سەرەتایەکیشم لەسەر چۆنیەت بەیتی کوردی نووسیوە بۆت دەنێرم هەروەها کتێبێ کی تازەی قادری فەتاحی قازی بە ناوی "بارام و گوڵندام" لە داهاتوویەکی نزیک بە ناوونیشانی کلیة الآداب فەرعی کورد بۆت دەنێرم. دەی مەلا جەمیل کوتەنی زرمەت دێ یا گرمەت دێ. ئەو زستانە زۆر چاوەڕوانی هاتن و چاوپێکەوتنتان بووم، نازانم بۆ بەرەو ئێرە نەبوونەوە، زۆرم سڵاو و ڕێز هەیە لە خزمەت خوشکە ڕووناک دا و بەهەویام بە زوویی دەنگ و باسی گڕوکاڵی کۆرپەشتانم پێ بگات.

هەروەها لە خزمت دکتۆر عەزیز و کاک محەمەدی برام گەلێکم سڵاو هەیە، ئەوەش لە نێوان خۆمان دابێت، ئەو خوشکە ناسک و لاوازەی وا پار هاتبوو هێندێکیش ژیکەڵە و لەبەر دڵان وابزانم ناوی پەخشان (زەنگەنە) بوو نامەیەکم بە ئینگلیزی لێ نووسی داوای پێوەندی دۆستانەم کرد، بەڵام چ وەڵامی نەدامەوە وادیارە لە لای ئێوە زۆر گوێ نادەنە قسە و نوزەڵەی ڕۆمانتیک و شاعیرانە! و لێ ی دەسڵمێنەوە. تکایە وەڵامی نامەکەم ڕاستەوخۆ بە ئادرێسی خۆم بنێرەوە زۆرم قسەکرد و ماندوو بووم زۆر برایانە دەستەکانت دەکوشم و ماڵاوایی ت لێ دەکەم.

---

[1] جهان نو: گۆڤاریکی ئەدەبی کۆمەڵایەتی بوو لە چلەکانی سەدەی پێشووەوە لە ئێران چاپ دەبوو، کە بابەتی لە گۆڤاری زمانانی تر وەردەگێرایە سەر زمانی فارسی و بڵاویدەکردەوە.

نامەی حەسەن قازی بۆ عیزەدین مستەفا

تاران ١١- بانەمەڕی – ١٣٤٧ی هەتاوی

برای خۆشەویستم

بە هەویام ساغ و سڵامەت بی و هەر زرمەت بێ، زۆر لە مێژە بە هەویای وەرگرتنی نامە و هەواڵی تۆم کەچی هەتا ئەو کاتە هیچ باسیک و خەبەرێکت نیە، لانی کەم تۆش وەک دوکتور عەزیز کە نامەیەکی بۆ "کوڕی ڕەش"[١] نوسیبوو لاپەڕەیکت کاغەز ڕەش کردباوە، نە دەنگت هەیە نە ڕەنگ.

هێندەم تەماشای ڕێی هاتنت کرد چاو خێل بوون لە سەر سەربان و سەرگرد.

ئەگەرچی خانووبەرە سەربەرزەکانی تاران تەنگیان بە گرد و بانووکە هەڵچنیوە، جاری لە پێش هەموو شتیکدا دەستی خوشکە ڕووناک ماچ دەکەم و لەش ساغی و کەیف خۆشی ئەو ئاواتە خوازم، زۆر بە ڕێک و پێکی گوێ دەدەمە پرۆگرامی مێژووی ئەدەبت، بەڵام لەمەڕ وەرگێڕی "بەیتی مەم و زین و خەج و سیامەند" زۆرت لە دوو نادەم، دیارە ئەوە عەقیدە و قسەی منەو ئەتۆش کەیفی خۆتە بەیتی کەڵ و شێرم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی فارسی، بەلام بە پێچەوانەی کاک عوبەید و قادری فەتاحی، مەتنی وەرگێڕانی فارسیەکەی وشە بەوشە نیە، قەولی وەم داوە لە زمانی فارسی دا و بۆ خوینەری فارسی زمان زۆر پارا و تەر و بڕ بێ بەبێ ئەوەی هیچی لە خۆەوە لێ زیادکەم، ئێستا ئامادەی چاپە و بەیاریدەی سەرگورد ئەورەنگ چاپی دەکەم،

---

[١] " کوڕی ڕەش " لەقەبی تاکە کوڕی پێشەوا قازیی محەممەدە. لە مەهاباد زیاتر بەو ناوە بانگی دەکەن. پێشەوا ئەو ناوەی لە شێعرێکی مامی واتە "سەیفولقوزات " وەرگرتووە کە باسی "کوڕی ڕەش" و "کچی دزێو" دەکا.

ماوەیک لەوەو پێش "جیلوەی شانۆ"ی "گۆرانی"شمان کردە فارسی و لە "گۆڤاری فیردەوسی" دا چاپ کرا، هێندێک لەوە پێشتر نامەیەکم بۆ مامۆستا عەلائەدینی سەجادی نوسیوە چەند پرسیاریکم کردووە لەمەڕ بەیتی کوردی. تا ئێستا جە   نەداومەتەوە.

وابزانم د   نازەی چاپ کردووە ئەگەر هەڵدەسوڕی بۆم بنێرە ئەتۆش ئەگەر شتومەک و کراس و کتیب و شتت پێویستە بۆم بنووسە. هەروەها خەریکی هەڵسەنگاندنی مەتەڵی کوردی کە لەخۆرا نیوی "پەندیان" بەسەردا بڕیوە دەگەڵ زەربولمەسەلی فارسیم ئەو دوو کتێبەم پێویستە بۆم پەیدا کە: پەندی پێشینان و "قسەکانی گۆستاو لۆبۆن" لە نوسینی ئیسماعیل حەقی شاوەیس چاپی چاپخانەی ئەتیام ساڵی ١٩٣٢ی میلادی لە بەغدا بۆ جاری یەکەم و هەروەها "هەڵبژاردە و پەند"ی مەعروف جیاووگ چاپی ساڵی ١٩٣٨ ی میلادی لە چاپخانەی نەجاحی بەغدا وە فەرهەنگی خاڵ و شێعرە تازەکانی گوران دیارە ئەگەر بۆ خۆشت شتیکت هەبێ هەر زۆر زۆر چاکتر. زۆرم چەنە لێ داو شەو درەنگە و شەوی بەهاریش کورتە و قەڵەم سەرکێشە و بیریش مووقەڵێشە دواجار چاوەروانی نامەت دەکەم و بە هۆی تۆوە سلاوم هەیە بۆ کاک دوکتۆر عەزیز و دیسانەکەش ریزیکی زۆرم بۆ خۆشکە ڕووناک و کاک فارووق(مەلا مەستەفا) و حەمەی برام (محەممەدی مەلا کەریم)کە رەنگە نەمناسێ.

**نازناوی (دایکی کەلەپوور)ت پێ ببخەشم...**

نامەی حەمە بۆر بۆ شوکرییە ڕەسول

بەغدا : حەمەبۆر ۲۷/۱۱/ ۱۹۸۸

دۆست و خۆشەویستی گیانیم، مامۆستای هێژام دکتۆر شکوری یەی نازدار.

گیانی گیانم!! ئاواتەخوازی تەندروستی و کامەرانی خۆت و دۆستی خۆشەویستم دکتۆر خەلیل و وردیلەکانتانم، چاوەنواڕی گەشبوونەوەی پشکمم بە بای گەشێنەرەوەی بەرهەمە بە نرخەکانت.

شادمانم و مایەی شانازی و سەربەرزیمە کە ئەو شەوە بە تەلەفۆنە ناکاوەکەت لە دەریای خنکاندن لە خەم و ئەرک و پەژارە دا ڕسگارت کردم و سوپاس. هەرچەندە بەلای منەوە لە سپاس نایەت. دیسان شادم کە بەم نامەیەم ڕێزی خۆمتان بۆ دیاری ئەکەمەوە، هەر وەها ئەو گرانییەشم لە دڵ دەرناچێ کەلە هاتنە بەغدایەکت دا لەگەڵ خوشکتا (ئوتێل) تان کردبووە (خانەخوێ) لە کاتێکدا من خۆم بە لە پێشتر ئەزانم و بە داخەوە ئەو سەربەرزی و دەروون حەسانەوەیەتان پێ نەبەخشیم. کە لە ماوەی کارەکەی بەغداتاندا بە دەم ئاسانکاریتانەوە بوومایە، بەهرەی زانستی گیانیم لێ وەربگرتیتایە و بم توانیایە ڕاستی ئەم ڕێز دەربڕینەمتان بۆ جێگیر بکەم.

بە داخەوە بەند و باوی ئاڵۆزی ناو نەتەوەکەمان لە پلەو گێژو ئاڵۆزێکی ئەوەندە پاشکەوتوویی دایە کە هێشتە بەکارهێنانی هەندێ وشەی وەک دۆست، خۆشەویست، نازدار و گیانەکەم... و هتد، لە نێرینەیەکمانەوە بۆ مێ یینەیەکمان مایەی هەڵسڵەمینەوە و هەستەکێتی (حساسیة) یەکی بێ جێ یە. لە کاتێکا ئافرە[تی] ولاتێک و پیاوی ولاتێکی تر کە هەرگیز یەکیشیان نەناسیوە، بە دەیان شەو لە ئەستێرەیەکی دەست کرد دا بە دیاری چاوی هەموو جیهانەوە ڕۆژ دەکەنەوە، هۆیەکەشی پاشکەوتوویی و نەزانینمانە و هێشتە لە واتای ئەو وشە سادانەی نا[ناو] خۆمان نەگەیشتووین.

چونکە تا ئێستاش ئەم زۆری یەی خاوەن گەواهی نامە بەرزەکانمان (لە حەشری نێرەکەری حوجرەکەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی) تێ ناپەڕی و، بەشی زۆر ئەو خاوەن گەواهی نامانە بە بست لە و جاشە کەرانە جیاناکرینەوە کە لە تیپە (سێرک)ەکاندا دوورمان ئەکەن، بەڵام نازانن چی ئەکەن و دوورمان چی یە، هەر وەک سەگەکەی (پافلۆف) لەگەل بیستنی جۆرە مۆسیقییەکەدا دەمیان ئاو دەکات و ئەو ئەرکە زۆرەی مامۆستاکانیان لەگەڵیان داویانە هاتۆتە سەر ئەوەی فێری نەریتی (خەرمیز) بوون هەر کە میزی کەریکی تریان دیت، ئەوانی بۆنێکی پێوە ئەکەن و لووت بەرەو ئاسمان هەڵئەبڕون و ئەکەونە میز کردن و بەس. نەک هونەر و زانستی بەخشین، زانستی یەکەیان لەو جۆرە کاوێژکردنە سنور تەسکە تێپەڕ ناکات.

ئیتر ئیمەی ڕەشەگەل ئەبێ چی لەوانە فێر ببین؟؟، کە هێشتە لە سنووری پەندی پێشینانەکە دان: (بە کەریان وت مەعریفەت بنوێنە..)، بۆیە هێشتە لەو دوو وشە سادە و ئاسکە کوردی یانەی خۆمان نەکەیشتووین و واتاکانیمان بۆ لیک جوێ ناکرێنەوە ...

ئەمجا ئەمێنێتەوە ئەو بەشە کەمەی کە گەواهی نامەکانیان بە تێ گەیشتنەوە وەرگرتووە. وە یا بە بێ گەواهی نامەش تێگەیشتوون کە ئەوانە دەنگی دەفەکانیان ئەوەندە نووزەیان نی یە کە بە ئاسانی بگاتە گوێی هەمووومان. تاکو لەو گێژاوەی بەندو باوە ئاڵۆزە دەرباز بین و ، هیچ نەبێ بتواین واتای ووشەی (خۆشەویست) و (خۆشەویست) یێکی تر وە یان پایەی (دۆست) و (دۆست) و (نازدار) و (نازدار)ێکی کە، لیک جیا بکەینەوە و ئەو (هەستەکێتی) یەمان لە ناو نەمێنێ.

بۆیە من کە بۆت ئەنووسم دۆست، خۆشەویست، نازدارگیانەکەم ئەوە بە دڵنیایەوە کە لە بەشە خاوەن گەواهی نامەکەی دووەمت ئەزانم، چونکە، خۆشی لە خۆمان کە یەکەمین کچە کوردێکمان هەیە، ئاکامی خوێندگای بەرز و گەواهی نامە ڕاستەقینەکەی لەمەر کەلەپوورەکەمانەوەیە، ئەویش تۆی، تۆی بەڕێز، خۆشەویست، دۆست، نازدار گیانی گیانان.

خۆشی لە خۆمان کە فێری دروومان نەبووی، ئەگەر دروومانیش بکەی ئەزانی چی یەو بۆچ ئەیکەی. ئەگەر گرنگی و بایەخداری و مەزنی کەلەپوورەکەمانت هەست پێ نەکردبێ ئاوا عەودالّی چۆنیەتی شەوانی سەدان و هەزار سالّەی لەمەوبەرمان و گوێی ئاگردانەکانی باپیرانمان و داپیرانمان هەزارەها بەندوباوی نەنەدایەتیمان نەئەبووی...سا هەر پیرۆز بێ ئەو گەواهی نامەیەت... ئەمجا منی شەیدای کەلەپوورمان کە هەچی سامان بێ گومانی نابەم لە ٤٠-٥٠ مەتریکی چوار گۆشەیی لە پەڕ نووسراو بەولاوە کە ئەویش نە زگ تێر ئەکات و نە دروومانیش فێر ئەکا، تاکو بە تاشای دڵ پێی بژیم و بتوانم دیاری بە نرخ بۆ کەسانی وەک تۆ پێشکەش بکەم و ئالەم هەژاری یەم دا دەستم ناروات بە نرخترین تاجی گەوهەرینت لە کۆرێکی کەلەپووریی مەزندا بخەمە سەر سەر و تەنیا ئەوەندەم توا توانایە[1]کە لە قولایی دەروونمەوە، وەک دیاری یەکەی هەژارانە، نازناوی (دایکی کەلەپوور)ت پێ ببخەشم، هەتا ماوم، بەو ناوە یان نازناوەوە بت ناسم و پێناسەت بکەم.

ئەمجا ئەی (دایکی کەلەپوور) مان، ئایا دایکێکی ئاوا، خۆشەویست، دۆست و نازدار، دلّبەند و ..هتد نی یە؟؟

لەسەر خواستەکەی خۆت ئەوە ژمارەی (١١٧)ی (گۆڤاری رۆشنبیری نوێ)[2]م بۆ ناردی، کە نووسینە گرنگەکەتی تێدایە لە ئاکامی تێگەیشتنی کەرە دروومان کەرەکەوە قرتینراوە، چونکە ئەو جۆرە کەسانەی لە دوورومانەکەی خۆیان پتر نازانن، بەلام دوورمانی (میعر) (خیاطة) چاکە ئەزانن...

ئیتر هەر بژی ئەی دایکی کەلەپوور

---

[1] هەڵەی تایپ نییە

[2] ڕۆشنبیری نوێ گۆڤارێکی وەرزیی بوو بۆ لێکۆڵینەوە، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەریدەکرد.

**دەزانی خەریکە لافاوی شیعر دەمبا؟**

نامەی حەمەسەعید حەسەن بۆ فەرهاد پیربال

کاک فەرهاد پیربال ی هێژا

ڕێزی زۆر و سڵاوی گەرم

چاوەکەم:

- خەرمانە دەبێتە گۆڤارێکی ئەدەبی، تاک و تەرا بابەتی غەیرە ئەدەبی بڵاودەکاتەوە، ئەویش مەگەر بە دڵی دەستەی نووسەران بێ، یان یەکێ لە خۆمان نووسی بێت.
- خەرمانە دەیەوێت ببێتە زمان حاڵی نووسەرانی ئەورووپا، بەرهەمی ئەدەبیش کە لە کوردستانەوە بە دەستمان دەگا بە ڕێزەوە بڵاوی دەکەینەوە.
- کاری دەکردنی گۆڤارەکە تا ئێستا لە هەمو ڕوویەکەوە هەر بە سەر شانی منەوە بووە، هەر لە فەڕاشییەکەیەوە تا سەرنووسەریی، لەمەو دواش هەر وا دەبێ، لەبەر ئەوەی هەر یەکێ لە جێیەکین، هەرچی عەزێت و شەڕەشەق و ماندوو بوون و مەسرەفی هەیە، هەر لەسەر من بووە و وایش دەمێنێ. ژمارە ٣ دووهەزار دۆلاری تێ چووە نیو هەزاریش بۆ نەهاتۆتەوە.
- هاوکاریی ئێوە، هەر وەک جارانە، جاری ماددەیەک یان پتر بە مەرجێ هیچیان شیعر نەبن، دەزانی خەریکە لافاوی شیعر دەمبا. هەر ماددەیەکیش تۆ پەسندی بکەی و لە ڕێی تۆوە بێ بڵاو دەبێتەوە. ئەگەر بۆیشت کرا، چەند ژمارەیەکی ل پاریس بڵاو بکەیتەوە (بی فرۆشی) بەمەرجێ بە (مقایضە) ئاڵوگۆڕ نەبێ، ئەوا چاکە.
- هەر پرۆژەیەک، فایلێک بۆ بابەتێک، ئێوە پەسەندی بکەن و هەوڵ(ی) بۆ بدەن، بێ یەک و(دوو) پەسەند دەکرێ.

- ژماره ٤ له ماوەی دوو مانگی داهاتوودا دەگاتە دەست خوێنەر، هەفتەیەکی دی لای من دەڕوا بۆ لای تایپکەر و دواتر چاپخانە.
- بە هیوام چی توانای خۆت هەیە بۆ بەرەو پێش بردنی خەرمانە کە تاکە گۆڤارە ئەدەب لە پێشەوە سوار دەکا، تەرخان بکەی.
- لەبەر ئەوەی یەکی لە شار و ولاتێکین و منیش لەبەر نان پەیداکردن لە بەیانییەوە تا ئێواری کار دەکەم، ناتوانم هەرچی نامە و بەرهەم هەیە بۆتانی فۆتۆ بکەم و بینێرم. نەک هەر ئەوە بڕوابکە کاتم نییە کارت و نامەیش بۆ دۆست و هاوڕێیان بنێرم. من بڕوام بە ئێوەیە، بە هیوام منیش جێگای بڕوای ئێوەبم. مەبەستیشمان تەنیا ڕاژەی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردییە.

**کیماوی سامی نەماوە و سیحری شکاوە.**

نامەی خەسرەو خاڵ بۆ شێرکۆ بێکەس

برای بەڕێز کاک شێرکۆ                                    ١٩٨٧/٩/٢٤ شام

سڵاوێکی گەرم

هیوام سەرکەوتنی بەردەوامتە لەگەڵ شادی و بەختیاری و لەشی ساغ. ئومێد ئەکەم، نەخۆشییەکەت تین و تەوژمەکەی کەم بوبێت و لە گوزەرانێکی باش و ئاسودەیا بیت.

ئەم نامەیەم دەکەم بە دروازەی پەیوەندی نوێ کردنەوە و سەرەتای بەسەرکردنەوەی یەکتری، کە خۆی لە خۆیدا ئەم نامە جگە لەو دەروازەیە، تایبەتە بە پیرۆزبایی کردن بە بۆنەی ئەو پاداشتە مەزنەی پێت بەخشرا کە لە ڕاستیدا مایەی شانازی و دڵخۆشی و من و گشت دڵسۆزانت بوو، هەروەها شانازییە بۆ گەلی کوردستان کە لە ناوچەندین شاعیر و نووسەر و رۆشنبیری جیهاندا شاعیرێکی کورد کە ئەویش (شێرکۆ بێکەس)ە ئەو سەروەرییە بۆ کوردیبەو پەڕی هونەرمەندی خۆیەوە بپچڕێت. جارێکی تر پیرۆزبایی و بە ئومیدی بەرهەمی بە پێزی تر و ڕەهێڵەی بارانی وشەی جوان و دانسقە و داڕێژراوی پتەوی کوردی، کە هەر لە شاعیرە گەورەکەی کورد _شێرکۆ بیکەس_ چاوەڕوان دەکرێت.

کاکە گیام لە ٧-٨ دا منداڵەکانم گەیشتنە شام و ئێستاش هەر لە هەمان خانوودام کە لە

(ركن الدنب)ە و جاران مەكتەبەی شام بوو. پێش ئەو ڕۆژە بە دوو هەفتە پاش بیستنیی گەیشتنی ماڵی ئێمە و ئێوە کە پێکەوە بە ڕێکەوتبووم چوومە تاران و پانزە ڕۆژی لەوێ مامەوە، ئەو ماوەیە لەگەڵ منالانی ئێوە و خۆمدا پێکەوە لە یەک ئوتێل دابووین، پاشان ئەوان خانویان گرت و من گەرامەوە.

بەڕاستی کاک مولازم عومەر هیمەتێکی گەورەی کردبوو، هەروەها ئەمانیش تووشی نارەحەتییەکی زۆر بووبوون لەبەر ئەوەی ئەو ریگایەی کە دانرابوو پیایدابێن لەو کاتەدا هەندیک ئالوگۆری بەسەرداهاتبوو، هەرچۆنێک بێ گرنگ ئەوەیە بەسەلامەتی گەشتن. کاک م. عومەر زۆری پێناخۆش بووکە توشی نارەحەتی بووبون و دوو نامەی عوزرخوایی بۆ ناردبووم. لە ڕاستیدا ملازمزۆر پیاویکی دڵسۆز و بە ئەمەک و پیاوی پیاوانەیە.

کاکی برا، من هەرگیز تۆم وەکو برایەکی دڵسۆز و خۆشەویست سەیرکردووە، هەرگیزیش ئەم ڕایەم لە گۆڕاندن نایەت، سەرەڕای بەهرەی شاعیری و مەزنی شیعری شێرکۆ بێکەس لای من، بۆیە هەر ساردی و سڕی و وردە گلەییەکی نێوانمان، هەمیشە وەک شتێکی کاتی لای من تێپەڕبووە و گوزەری کردووە. هەڵبەتە براش لەگەڵ برای خۆیدا و لە ماڵیکدا جاروبار ساردی و وردە گلەییان لێ پەیدا ئەبێت، کە گومانی تێدانییە ئەمە سروشتی ژیانە و شتێکی ئاسایە، گرنگ ئەوەیە پیاو لەگەل براو دڵسۆز و خۆشەویستی خۆیدا ئێسکی یەکتری ناشکێنێت و پەردەی ڕێزو خۆشەویستی نادڕێنێت.

ئەم شەوی ڕابردوو کاک سامی شۆڕش لە سەقزەوە، تەلەفۆنی لەگەڵ کردم، زۆرم پێ خۆش بو گوێم لە دەنگی بوو، خەتی تەلەفۆنەکە زۆر خراپ بوو، نەمتوانی بە درێژی زۆر قسەی لەگەڵدا بکەم و لە بارودۆخ و کاروباری تێبەگەم و بزانم لە چ باریکدایە، چونکە ماوەیەک لەمەوبەر، بەدەست هەندێک نەگریسەوە هەراسان بوو، لەوچەند ماوەکەی تەلەفۆنەکەدا باسی تۆمان زۆر کرد و زۆر ئەحواڵی ئەپرسیت و پەرۆشی دەنگوباست بوو!

کاتی خۆی ڕۆژنامەی تشرین لێرە دەنگوباسی پاداشتەکەی بڵاوکردەوە بە ڕەسمیکی خۆتەوە، من خێرا ناردم بۆ وڵات و بە دە ڕۆژ گەیشتە دەستی مامە [مام جەلال] بێ گومان مەبەستم پاداشت (جائیزە) یە یان خەڵات.

بیستومە چەند بەرهەمیکی نوێتان هەیە و ناردوتانە بۆ وڵات، خۆتان دەزانن من دەوریێشی شیعری کوردیم بە تایبەت شیعری نوێ بۆیە ئومیدم وایە منیش بێبەش نابم!

نازانم ڕۆژنامەکەی بەدەستەوەبوو، لەگەڵ کاک مەحموود و کاک ڕیکەوت دا دەری بکەی بە چی گەشت، ئومیدەوارم ئێستا چاوی هەڵهینابێت و بشتوانیت کەلێنی کەموکوڕی ڕۆشنبیری و سیاسی کوردی لە ئەورووپا پڕبکاتەوە. بەو هیوایەی لەگەڵ بەروبوومی خۆتان و دەزگاکانی ئەورووپا بگاتە دەستی منیش.

باری کوردستان زۆر چاکە، چالاکی گەورە گەورە ئەکرێت، کە زەبری کوشندە ئەوەشێنێتە گیانی دوژمن. کورد هەنگاوی گەورە گەورە هەڵئەهێنێت بەرەو تەبایی، پاش ماوەیەکی تر بەیەکجاری بەرەی کوردستانی باشوور ڕائەگەیەنرێت.

دەزگاکانی سەرکردایەتی هەر لە شوینی خۆیەتی سەرەڕای خەستی تۆپ و فڕۆکە کە ناوبەناویش کیماویەکی خەست و خۆڵیشی ئەکات بەسەردا، لە یەک حەفتەدا دووجار بە فڕۆکە و تۆپ کیمای ڕشت بە ((بەرگەڵو، سەرگەڵو، هەڵەدن، یاخسەمەر و مالومەدا)). کیماوی سامی نەماوە و سیحری شکاوە.

لە جاران زیاتر کاروبارم هەیە و سەرم زۆر قاڵە، منالانیش ئەوەندەی تر دەوریان قەرەباڵغ کردووم.

ئومێدەوارم زوو زوو نامەم بۆ بنووسیت و لاپەڕەیەکی سپی و بێگەرد نوێ بکەینەوە. هەر لەش ساغ و سەرکەوتوو بیت

براتان خەسرەو خال ۹/۳٤

**تەمەنم ڕێک؛**

**حەفتا و یەک ساڵ و یانزە مانگ و دوو حەفتە و یەک ڕۆژ بوو.**

نامەی دڵزار بۆ بەڕۆژ ئاکرەیی

ستۆکهۆڵم ٢٦/١٠/١٩٩٢ دڵزار

براى بەڕێز و خۆشەویستم کاکە بەڕۆژ

گەرمرین سڵاوی دڵسۆزانە

بەهیوای تەندرووستی و گورج و گۆڵی ئەدەبیتانم، هیڤادارم لە خویندنەوەی بابەتی باش و بەکەلک و لە نووسینی ئەدەبی و داهینەرانە هەرگیز کەمتەرخەمی نەکەن و نەوەستن، چونکە ژیان بەلای منەوە خۆشەویستی و کردەوەی داهینەرانەیە.

ئەمرۆش پەرسڤی هەموو پرسیارەکانتم دایەوە و بۆم ناردیەوە بەلام، دەردی پیری، وێنەم لەبیرکردووە و بۆم نەناردویی ئەوە ئەمشەو هاتەوە بیرم، سبەی بەر لە نیوەڕۆ ئەویشت بۆ دەنێرم نوێترین وێنەمە کە گرتوومە، تەمەنم ڕێک حەفتا و یەک ساڵ و یانزە مانگ و دوو حەفتە و یەک ڕۆژ بوو.

زۆر زۆر حەزدەکەم کە گووتتان وینەکەی مامۆستا گۆران و تۆشیان بۆ دەنێرێن بە راستی کاریکی باشە بینێرە، ئەگەر ویستت دیوانی ئەمن دانەیەکی تری بە وێنەوەت بۆ پەیدا دەکەم.

- لەم رۆژانەدا گۆڤاری خەرمانە[1] دەردەچێ و مقابەلەیەکی تێدایە کە (پشکۆ) لەگەڵ منیدا کردوویەتی لە بارەی مێژووی کۆیە و بنەماڵەکانی لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ..بە ئیعترافی خۆیان دەڵێن باشترین مادەی ئەم ژمارەیەی گۆڤارەکەمانە بیخوێنەوە و رای خۆتم پێ بڵێ.

ئاوات و ئامانج ڕێز و سلاویان هەیە. سلاوم بۆ هەموو خانەوادەکەتان و تا بەیەک گەشتنمان هەر شاد و بەختەوەر بن.

تێبینی:

ئەوا وێنەکەی خۆم و گۆرانم پەیداکرد و ناردم

برای دڵسۆزتان

دڵزار

[1] لە نامەیەکی حەمە سەعید حەسەن بۆ فەرهاد پیرباڵ دا باسی خەرمانە کراوە.

**کوردستان دایکێکی بێ رەحم بوو،**

**نەیتوانی لەدەوری خۆی کۆمان بکاتەوە!**

نامەی دڵسۆز حەمە بۆ جەمال غەمبار

هاوڕێ ئاسنینەکەم، هاوڕی بەنرخ و بە ئەرزش و خۆشەویستەکەم

کاک جەمال گیان

غەریبیم هێندە فەرقی کردووە، لەوێ ئاوەدان بوو، لێرە چۆڵ، دەنا هەمووی هەر غەریبی بوو، چ ئێرە و ئەوێ! چاوەکانت ماچ ئەکەم، چاوەکانی براژنە پەیمان و ڕەوەز گیان ماچ ئەکەم و زۆر زۆر هەواڵیان ئەپرسم!

هەمیشە هەواڵی ئێوە و سۆراغی ئێوە و هەندێ لە هاوڕێیانی مەبەستم، جێگای مەراق و عەوداڵبوونمە، چوونکە ژیانی من بریتییە لە نووسین و هەندێ پەیوەندی پیرۆز لەم ئەتمۆسفیری غوربەتیکی ئەبەدی دا. بیستم بەرەو ئێرە دێی و سەدجار بەخێر بێی، هەتا زوو لەو نەهامەتییە دەرچیتە دەرێ، وەرە دەرێ، ئیتر سووتان و کاولبوون بەسە. وەرە هیچ نەبێ غەریبی ئێرە ماناو مەفهومێکی مادی و مەعنەوی و لۆجیکی هەیە. هیچ نەبێ غوربەتیکی هەڵبژاردووە، ئەگەر بتەوێ دەتوانی رووخانەکانت چاک بکەیتەوە و دووبارە بونیاتی خۆت بنێی..وەلێ لەمەڕ خۆمان ئەو ئەو مردن و کاولبوونە بەردەوامەیە کە بەزۆر سەپاوەتە سەر مرۆڤی شەریف و خاوەن قەڵەم و بە کەرامەت کە ناتوانن، ملهوڕ بن و کلکە سوتێ و ماستاو بۆ ئەم و ئەو سارد کەنەوە. هیوادارم بە جدی بیر لەو مەزوعە بکەرەوە، بەڕیکەوە تا زووتر یەکلایی بیتەوە درەنگە. من ناڵێم ئومیدم بە داهاتووی کوردستان نییە، بەڵام لە حاڵی ئەمڕۆ داو بۆ نووسەر و شاعیر و خاوەن قەڵەمێکی وەکو تۆ، بۆ ڕەوەزی تازە خونچە ئەوێ کاولگەیە، کوردستان دایکێکی بێ رەحم بوو نەیتوانی لەدەوری خۆی کۆمان بکاتەوە، ئەگەر هاتیە ئێرە پێش هیچش تێ ئەبێ یەکتر ببینین، ئێستا ئیمە پەناهەندەی سیاسیمان بۆ دەرچووە، کە بە ئاسانی پەناهەندەی لەو جۆرە نادەن. ئێستا لە

شاری (ئاسن)دەژیم، لە کامپی پەناهەندەکانتا خانووم بۆ دەردەچێ لە شاریکی تر، نزیک کاک عومەری برام، شیرین باشترە لە جاران، بە فەزلی تۆ، و هەوڵی برایانەی تۆوە، کە تاماوم، بیرم ناچێتەوە. بێگومان ئەم ناونیشانەم نازانم تاکەی دەبێت، بەڵام بۆ تۆ ئەگەر بەم زوانە هاتیت، ئەوا ژمارە تەلەفۆنی ئیمە، ئەمەیە:

(...)

ژووری ژمارە پانزە، ژمارەی ماڵی کاک عومەریش ئەمەیە

(...)

ئەمانە هەمووی بۆ ئیحتیات، کە من دەزانم کەماڵی برات لێرەو و ڕەنگە پیویستت نەبێت، بەڵام هەمیە چەند خوشک و برا زۆر بن، باشترە، ئیمە هەمیشە بچوکی تۆ دەکەین و سەرمان لە ڕێت دایە .

هەواڵی برادەران شار چۆنە؟ ئەو هەواڵانەی پێمان دەگات، بۆنی خۆشی لێنایەت، دووبارە سلاوم بۆ هەموو لایەک.

دڵسۆز حەمە

١٩٩٧/٥/٢ ئاسن

**پۆست و بەرید بۆ کوردستان نییە!**

نامەی دڵسۆز حەمە بۆ ڕەووف بیگەرد

هەندێک شەوان

سەیری دوورترین، گەشترین ئەستێرەکە

ڕەنگە دیتنمان لەوێ

یەک بگرێتەوە.

هاوڕێ ی ئەبەدیم.. هاوڕێ ی ڕۆژانی خۆڵەمێشی و تەنهایی و ئەو ساتانەی خەم داگیری دەکردم و دڵتەنگی تێکی دەشکانم، هاوڕێ بەهێز و بێ گەرد و دەگمەن و هەمیشە گەش بین و خاوێنەکەم، هاوڕێ خۆشەویستەکەم کاک رۆوف گیان. چاوەکانت ماچ دەکەم.. بیرت دەکەم بیر. پێم بڵێ چۆنی چۆن؟، چۆنی لەگەڵ شاری باوێشک و قسەی زۆر و کاری کەم و هەمیشە چاوەڕوانی و نوچ دان و وەنەوز دان؟ پێم بڵێ چۆنی لەگەڵ ئەو بڕیارەی کە ژیان بە ڕاوەستانی داوە لەو دەڤەرەی خۆماندا، چۆنی لەگەڵ نان و نەوت؟ و نوسینگە؟ چۆنی لەگەڵ چەم و چەمکاری ئەی سەرکردەی چەمخوازانی یاخی بوو؟ چۆنی لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کورتی و ناڕازی بوونەی هەمیشە باسکردنی ماندووکردبووین (ماندوویکردبووین)، من نەک هەر شەوقەکەی جارانم نەماوە، بەڵکو زۆربەی کات و لە زۆر شوێن دا ئاوات دەخوازم لەگەڵم بوویتایە چونکە تەنیا کەسێک بوویت کە هەستم بە پاکی و خاوینی و نوسەرێتی ڕاستگۆییت کردوەو یەکجار دڵنیابووم لێت.. ئاە.. دڵنیایی... هاوڕێ گیان نووسیوتە کە گۆڤارێکتان دەرکردووە بەڕاستی پیم خۆشەو کاری باشتان کردووە پیرۆزباییتان لێدەکەم، بەڵام برادەرگیان خۆ ئەوەی لە وولات دەرچوو مردوونیە تا ناوی لە شتی وادا نەهێنن، ئەوە گلەیی نیە بەڵام بۆ گۆڤارەکەش باشترە کە خەڵکی لە دەرەوە هەبێت، چونکە لەو[ئەو] کاتە بە دڵنیاییەوە من

دەتوانم زۆر کاری باش بۆ گۆڤارەکە بکەم. نەک هەر بەرهەمی خۆم بەڵکە نوسین لەسەر ئەو هەموو هونەر و پێشانگاو چالاکیە هونەریە بێ سنورانەی لەم وولاتانەدا دەکرێت و تا ئێستا خەڵکی ئێمە لێ ی بێ خەبەرە بەهۆی دابڕان و هەمیشە دابڕبونمان ئەوەش نەبێ دەبوو بەسەرمان بکەنەوە چونکە نەک نەمردووین بەڵکە بۆیە وولاتم بەجێهێشت تا ئەو بەشانەی کە لێم مردووە لەوە زیاتر نەمرێت، تا باشتر بنووسم، چاکتر بیربکەمەوە، ئازادانەتر وەختم ڕیک بخەم باشتر منالە ناشەرعیەکەم (شیعرنووسین) بەخێو بکەم.. ولاتم بەجێهێشت تا لەوە زیاتر ووشک نەبمەوە لە ناو کۆمەڵگای نوستوو کە بە دەستی خۆی دڵسۆزان و وشیارەکانی خۆی دەکوژێ، کۆمەڵگای سیاسەتمەدارانی داوێن پیس و بێ خەم و کەمتەرخەم لە وێران بوونی لەوە زیاترو نوسەران و روناکیبرانی زورناژەن و ماستاو ساردکەرەوە کە خۆت زۆریان لێ دەناسی، من دەمەوێ ژیانێکی نوێ دەست پێبکەم، دوور لە باوکم و زوڵمەکانی دوور لە زیندانیەک لە دوای یەکەکانی نەخۆشیە کۆمەڵایەتیەکان و ئەمە مانای ئەوە نیە ئێرەم یۆتۆپیا و بەهەشتی چاوەڕوان کراوەو مانای ئەوە نیە ئێستا بەختەوەرم، بە تایبەتی بە نیسبەتی منەوە کە خۆت دەزانی چ زیندانێک لە ناخم دایە و لەگەڵ خۆم دەیگێرم، گۆڕینی شوێن کار دەکاتە سەر چاک کردنی زۆر مەسەلەی فیزیاوی بەشەر، بەلام کاریکی وا ناکاتە سەر دەروون و هەستی بڕوا بکە هاوڕی گیان بۆ چوار مانگ دەچێ لە هۆلەندام تا ئەم دەقیقەیە هەستم بە گۆڕانێکی وا نەکردووە تەنها دڵتەنگی و بەراوردکردن نەبێ. بەراوردی روناکی ئێرە و تاریکی لای خۆمان، بەراوردی پێشکەوتوویی لە ڕادەبەدەری ئێرە و پاشکەوتووی لە ڕادەبەدەری ئیمە، ئازادی بێ سنووری کۆمەلایەتی ئێرە و سەرکوتی کۆمەلایەتی لای ئێمە. هەر شەریکەیەکی جل و بەرگ دەیان گۆڤارو بلاوکراوەی گران بۆ پروپاگەندەی جلەکانی دەردەکات وەلی ئێمەی کلۆڵ قنگمان دێتە دەرێ تا ڕۆژنامەیەک، گۆڤارێک، بلاوکراوەیەک تۆ بڵێ کتێبێکی خوێندن بۆ منداڵەکانمان مسۆگەر دەکەین، ئەو روناکیەی ئەوروپای تا دەژی لەسەر حسابی تاریک کردن و وێران کردنی ڕۆژهەلاتە بەلام تاکەی ئەو ڕاستەیە پشتگوێ بخەین؟ تاکەی ووریا نابینەوە؟

کاکە گیان شت زۆر بۆت بنووسم بەڵام پێویست ناکات چونکە تۆ خۆت باشتری دەزانیت مەگەر هەر خەمت بۆ زیادکەم. کارەکانی من زۆر بە باشی چووە بە ڕێوە پەناهەندەی سیاسیان پێ داوم کە باشترین جۆری پەناهەندەیی یە و هەموو مافێکی مانەوەو هات و چۆ و بە هاوڵاتی بوونت هەیە ئێستا لە شاری (ئاسن) دەژیم کە لە سەروو هۆڵەندایە تا خانووم بۆ دەردەچێ بە نیازم لە شاری (ئارنم) یان(ئایخمن) بژیم چونکە ئەو دوو شارە کاری تێدایە و دەتوانم بخوێنم، ژیانی پەناهەندە لە ئەورووپا بەرەو خراپ دەڕوات چونکە هەتا دێ ژمارەیان زۆر دەبێ، بەڵام بەو خراپیەش پەناهەندە روو لە زیاد بوونە ئەوەش مانای ئەوەیە ئەم خراپییەی ئێرە لە باشی وولاتی خۆیان باشترە، بێ تەنزیمترین و پەرش و بڵاوترین پەناهەندە، پەناهەندە کوردەکانن، بەداخەوە لێرەش پەرش و بڵاو بوینەتەوە و دایک و باوکێک نیە لە ژێر سەقفی ئازار و مەینەتی و کلۆڵیەکان دا کومان کاتەوە تا لە تەگبیرێک حاڵمان بکەین، نازانم کورد تاکەی لە شاخەوە نابیتە خەڵکی شار، بڕوا بکە نمونەی وا لەم ئەورووپایەدا دەبینی پشقلی شارەزوور بە پێڵاوەکانیەوەیەتی و بە دەیان گەنجی کلۆڵ و لێهاتووی داناش لە وێرانەیەکی کوردستان دا لە مردنێکی لەسەرخۆ دا دەژی.. باسی شێرکوت[بێکەس] کردبوو، بەڕاستی من لیرە دەتوانم ژماری تەلەفۆنی وەربگرم

و پەیوەندی پیوە بکەم بەڵام پیم باش نیە چونکە شیرکۆ بەو شاعیریەتەی خۆیەوە ناتوانێ دیفاع لە خۆشەویستی خۆی بکات (......) من زۆر ڕای ترم بەرامبەر هەیە کە خۆت دەیزانی و پێویست بە باسکردنێ ناکات، کە ڕەنگە خۆی پیکەنینی پێ یان بێت چونکە ئەو لە بورجێکی عاجی وا دا دانیشتوە کە کەس لە سەروو ئەوەوە نیە. ئەمانە هەمووی ناکاتە ئەوەی کە شیرکۆ شاعیرێکی مەزنە و شیعری مێژوویی نزسیوە و هەمیشە من ڕێزی دەگرم، ئەگەر ئەو ناونیشانی منی زانی و پەویەندی پێوە کردم ئەوە بە دڵنییایەوە دەیخەمە سەر سەروچاو وەکو نوسەریکو وەکو شاعیرێک، پیاوێکی ناوداری کورد، کاک بێگەرد گیان خۆت دەزانیت، من هەرگیز شوێن ناوبانگ و پول و منصب و شتی لەو جۆرە ناکەوم و ئەو شتانەشم زۆر لا بێ نرخە و پێویست بە باسکردنی ناکات، یان راستتر پێتان بڵێم من لێرە ژیانێکی نوێم دەست پێ کردووە ئەگەر لە ژیان و گوزەران لە کوردستان دا وای کردبێ هەندێک خەلک بناسم، لێرە ئەوەش قبوڵ ناکەم  و خۆم ئازادم لە بەڕێوە چوونی ژیان و پەیوەندیەکانم دا کە ئەوە مانای دڵخۆشی و مورتاح بونمە، تەنها لایەنی چاکەی ژیان لە ئەوروپادا ئەو ئازادیەیە کە لە خۆرهەلاتی لای خۆمان مەحاڵە، من ئامادەم خۆشەویستیەکی ئەبەدی دوراودور بکەم و خۆمی بۆ فیدا بکەم بە مەرجێک بەرامبەرەکەشم وەها بێت نەک بترسێ، ئەمە لە ئەوروپا دا دەبێ و دەتوانی وەلێ لای خۆمان بڤەیە، بە هەر حاڵ خۆزگە دەتتوانی تۆش خۆت ئازاد بکەیت یان (ئاری) بهاتایەتە دەرەوە با لەو نەگبەتیەو شەڕو شۆڕە رزگاری بێت کە ژیانی رووناکی ئێرە دەبینی، حەیفت بەو هەموو گەنجەت دێت کە لە پێناوی هیچ دا ئەو ژیانە جوانەیان بە هەدەر دەچێ، هەوڵ بدە بۆ (ئاری) با نەفەوتێ، پاشەڕۆژی کوردستان زۆر لە مەترسی دایە و خۆتیش دەزانی، هەواڵی نووسینەگە چی یە؟ کاک مصطفى و مامۆستا شیرین و ئەوان چۆنن هیوادارم هەموو باش بن. شیرین وەزعی باش نیە نازانم چی کردووە بۆ دەرچوون لەو حاڵە، تا ئیستا پول و پارەیەکی وەهام بە دەستەوە نیە کە یارمەتی تۆ و شیرین بدەم بەڵام لە داهاتوودا دڵنیا بن کە ئێوە هەمیشە لە خەیالم دان بە تایبەتی تۆی هاوڕی و نوسەر و خۆشەویست، ئەم نامەیەشم بۆ شیرین نووسیوە و هەندێک شتم بۆ روونکردۆتەوە چونکە

ئەم سەهۆڵبەندانەی ئەورووپا زۆر بەرەحمترە لەو چرا کز و بێ دەرەتانانەی کە ژیانمان لە پشتی دەرگا و پەنجەرەوە بە هەدەر دەدات و کەس ئاگای لیمان نیە ساڵ و رۆژە جوانەکانی تەمەنمان دەکوژێنێتەوە، تەنها رێگە چارەی شیرین خان هاتنە دەرەوەیە چونکە لە هەموو روویەکەوە یەکلایی دەبێتەوە و بە ئازادی ژیان دەباتە سەر و ژیَانی خۆی و کچەکانی مسۆگەر دەکات.

زۆر کەم دەنووسم، کەمیش دەخوێنمەوە چونکە شتی وەهامان لانیە بۆ خوێندنەوە تاماوەیەکیش لەوەوبەر هات و چۆم ئازاد نەبوو ئێستا هات و چۆم ئازادە بۆ هەر وڵاتێک هەر شارێک برۆم بەڵام کرێ ی هاتو چۆ ئەوەندە گرانە کە ناکرێ زۆر بەم لاو بەو لادا برۆی دەنا لە ئەمستردام ...کتێبخانەی زۆر گەورەی لێ یە، خەریکی زمانم و بەلامەوە مەبەستە کە بە زوترین کات فێری بم تا بەو زمانەش بخوێنم و بنووسم.. ئێ برادەر هەواڵی ژن هێنانەکەی کاک عمر وەکو قومبەلە تەقیەوە باشە بۆچی؟ ئەی مهاباد؟ هەندێک رووداوی وەها دەبینین ئەگەر لە فیلم دا بوایە هەزار جوێنمان دەنارد بۆ نوسەر و دەرهێنەر و ئەکتەرەکەش وەلێ کوردستان فیلمێکی ارتجالیە بێ ئەکتەر و بێ مونتاج و بە بێ هیچ شتێ تەنها دەرهێنەریکی زیرەک نەبێ کە تا ئیستا نەمان دۆزیەوەتەوە کێ یە؟ جەماعەتی زۆریش ... کە ناوەکانیان نانووسم بەڵام لێرەش خەریکی هەمان شتن و هەمان تاس و حەمامە، هیوادارم تۆ دڵ و دەروون و مێشکت ساغ بێت ئیتر ماباقی بە پولێک.

قەسیدەیەکم بۆ ناریت سەرەتاکەی دەڵێت

سێ هەمین ماڵ

ماڵی من و زستان و پەیژە بوو..هتد

ئەگەر لات هەیە لەو گۆڤارەدا بڵاوی کەرەوە کە دەری دەکەن، چیرۆکێکم لە بن دەستە بەم زوانە تەواو دەبێ، شتێکی جوانە لە فرسەتێکی تر دا بۆتان دەنێرم بۆ بڵاو کردنەوە. هات و چۆ و پەیوەندی کردن زۆر گرانە چونکە خەڵک کەم دەڕواتەوە ئەوەش دەڕواتەوە ئامادە نیە کە شت بەرێتەوە، ئەویش تەنها پەیوەندیە کە بە کوردستانەوە کە بە هۆلەندیەک دەڵێ ی پۆست و بەرید بۆ کوردستان نیە باوەڕت پێ ناکات چونکە ناچێتە عەقلیەوە وولاتێک خزمەتی پۆست و بەریدی نەبێت، هیوادارم بەردەوام پەیوەندی بگرین چونکە پێ ویستم پێتە و هەمیشە لە دەروونم دا هاوڕێیەکی هەمیشەییت، سڵاوم بۆ هەوار و نیگار و میدیا و ئاری و شوکریە خانم ڕێزم بۆ کاک شێرزاد و کاک کەماڵ جەماڵ و ڕاسان و ناصری حسامی تکادەکەم پێ یان بگەیەنە.. دیسانەوە چاوەکانت ماچ دەکەم..

هاوڕێت

دڵسۆز حەمە

Assen ١٩٩٧/٢/١

**تۆ؛ ژیری کۆمارەکەمان بوی...**

نامەی ڕەحیمی قازی بۆ عوسمان دانش

مامۆستای بەریز و خۆشەویست کاک عوسمان دانش!                    ١٩٦٦/٩/٢٧

گەلیک بەختیار بوم بە وەرگرتنی نامەکەت و بیستنی خەبەری ساغوسلامەتیت. بە راستی چاوم رون بووە و دلم گەشاوە چون لە میژ بو ئاگام لە وەزع و حالتان نەبوو نەم ئەزانی لە شاری سولەیمانی نیشتەجین .

کاکە باوەر بکە لە قولایی دلەوە لە لای من خوشەویست و بەریزن و هیچ کاتیک لە بیرناچی. یەکەمین لەبەر پیاوەتی و روح سوکی و چاکی خوت، دوهەمین لەبەر ئەوەی کە تاقە ماموستای کورد و ژیری کۆمارەکەمان بوی[١]، خوشەویستی پیشەواکەمان بوی و ئەبی بلیم دانەری بەردی بناغەی قوتابخانەی کوردی بوی لە نیشتمانەکە مانا. نازانی لەم غەریبایەتیەدا نامەی هاوری و هاوکاری لە میژینە تا چ رادەیەک کار ئەکاتە سەر پیاو. بەراستی جیگەی شانازی و بەختیاری یە بونی هاوری و هاوکاری دلسوز.

کاکە گیان! وەزع و کاروباری من زور باشە و وەکی ئاگاداری بە کاری لیکولینەوەی زانستی یەوە خەریکم و موتالا ئەکەم لە سەر میژو و رابردوی گەلەکەمان. وەزعی سلامەتیم هەندیک تیک چوبو و لە ماوەی ئەم ٩ مانگەی

---

[١] دیارە عوسمان دانیش، لە بنەڕەتدا خەڵکی سلێمانییەو باوکی شەریف ئەفەندی موختاری گەڕەکی "گۆیژە" بووە، دانیش لە لاویدا، هەر زوو تێکەڵی سیاسەت و چالاکی حیزبی بووە. پێش دامەزرانی لقی کوردستانی عێراقی کۆمەڵەی ژ.کاف/ پێوەندیی پێوە هەبووە.کە حکوومەتی کوردستان لە مەهاباد دامەزرێندرا،چووەتە ئەوێ و بووە بە مامۆستا لە قوتابخانەی گەلاوێژ. دوای رووخانی کۆماری کوردستان گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، ناسناوی دانش، لە کۆماری کوردستان پێی بەخشراوە، وەک ئینسانێکی کوردپەروەری دڵپاک و سادە و خۆش مەشرەب و بێ تەماع بووە، بۆیە لێرەش دا وەک مامۆستا و دڵسۆز ناودەبرێت.

ساڵی ٦٦ دا نیزیکەی چوار مانگ لە خەستەخانە کەوتبوم و گورچیلەکانم بەردی تیابو، بەلام بە بی پیداویستی چەقو بەردەکان بەهوی داو و دەرمان و ئاو هاتنە دەری و ئەوا دو مانگە باشترم.

لەمەر حەسەن [حەسەن قازی] ئاگادارم وەکی بیستومە بەم زووانە خەریکی زەماوەند و شایی ئەبی، خوا موبارەکی کا و لە دورەوە پیرۆزبایم لی کردووە. ئیتر ئەمە نمونەی پیر یە و پیم خوش بی و پیم ناخوش بی ئیتر قەدەریکی دیکە ئەبمە باپیر. نازانم ماموستا گیان، ئەتو با پیرت لی هاتووە یان نا؟ توخوا لەلایەن منەوە لاجانگەی منداڵە خوشەویستەکانت ماچ کە و زور بەختیار ئەبم کە مامی دورکەوتوی خویان لە بیر نەبەنەوە. بەلام هەرچەند بیرم کردەوە تی نەگەییشتم ئەم ناوانە چن لەو منداڵانەت ناوە. مەگەر ناوی کوردی برابو کە ناوی ناوی نەخچەڤان و یەرەڤان و پراڤدایان لی بنی ی؟ بە خوا بشم کوژی لەسەر ئەم ناوانە لە گەلتا نیم. جا ئیتر کەیفی خوتە. منیش لیر دو کچم هەیە و ناویان مریەم و کەتانەیە و دەستەکانت ماچ ئەکەن و سلاویان هەیە بۆ تانیا گەل و یەرەڤان گەل. بەریزی هەموو لایەکمان بو براژنمان.

کاکە گیان ! چەند ساڵیکە خەریکی کوکردنەوەی پولم (پولی پۆستە). جا ئەگەر بۆت هەلکەوت پولی عیراق و وەلاتەکانی تری عەرەبیم بۆ بنیرە، بە تایبەتی هی کویت و عەدەن و هتد. بی شک مورکراو، ئەگەر هەلکەوت هی مورنەکراو. نازانم تاقە پولیکی زەمانی شیخ مەحمود وەچنگ ئەکەویت یا نا؟

ئەگەر خوت و منداڵەکان پولی سوفیەت کوئەکەنەوە بۆم بنوسە. هیچ باسی هەژار [موکریانی] نی یە. ئەگەر ئاگات لی هەی بۆم بنوسە بەختەوەر ئەبم. هەروەها لە ساغ و سەلامەتی شیخ لەتیف [حەفید] ئاگادارم کە .

بە هەویام ساغوسەلامەت بی، زورم بەریزی بۆی هەیە. داخوائیستا رۆژنامە و کتیبی کوردی چاپ ئەکریت یان نا؟ هەلی ئەمە هەیە کە پیاو کتیبی کوردی بنیری بۆ چاپ کردن؟

براکەم. رەجائەکەم زو – زو نامەم بۆ بنوسە. نامەی برای دلسوز روحی پیاو ئەبوژێنیتەوە جا لە دوستایەتی و بەردەرادەری دوورەکە پیاو ئەم کارەی نەکات.

وەزعی کاک حەمەد و براکەی باشە و لە باغیکی زور خوشی نیزک بە باکو نیشتەجین . کاک عەلی(گەلاوێژ) سلاوی هەیە و سولتانیش [وەتەمیشی] لە مەسکەوە و بی شک سلاوت لی ئەکا لە قولایی دلەوە.

لەمەولا نامەکانت بەم عینوانە بنیرە:

(................)

ئیتر بە خوات ئەسپیرم و چاوەریی نامەتم

برای بچوکت

رەحیم

## بۆ کێ بنووسم و چۆن بکەم؟!

نامەی ڕەحیمی قازی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

ماموستای بەریز و خوشەویست و تیکوشەر کاکە محەمە مەلا عەبدولکەریم!

هەرچەند لە نیزیکەوە چاوم پیت نەکەوتووە و بوم هەلنەکەوتووە دەستەکانی بەهیز و پر لە بەرەکەتت بکوشم، بەلام لەگەل ئەوەشدا چاکت ئەناسم و بەباشی ئاگادارم لەو خزمەتە گەورەو بە نرخەی کە بەبی ووچان بە میژوو و ئەدەب و فەرهەنگی گەلە غەدرلیکراوەکەمان کردوتە و ئەی کەی.

ئەتو یەکیک لەو مرۆڤە هەلکەوتوانەی گەلی کوردی کە هەر کوردیکی نیشتمان پەروەر و خاوەن ویجدان ئەبی بە بەریزی یەوە سەرت بۆ دابنوینی و لە بەرامبەر تیکوشانە بی ووچانەکەت دا بە دلەوە و بە سەربەرزی "ئافەرینت" پی بلی! بەختەوەرم بوم هەلکەوت ئەم بیرە دەرونی یەی خومت بەم هویەوە پی را بگەیەنم.

کاکە گیان! لە قولایی دلمەوە سوپاست ئەکەم بو ئەمەی کە زەحمەتت کیشاوە و چەند کیتبی نایاب و بە نرخ و چەند ژمارەی رۆژنامەی "هاوکاری"ت بو ناردوم. بە راستی ئەمە دیاری یەکی زور بە نرخە و نازانم بە چ چەشنیک لە ژیرباری ئەو چاکەیە و مرۆڤ دوستی یەی تو بیمە دەری. دیاری وا، بەتایبەت بو کەسیکی کە دور لە نیشتمانی و لە غەریبایەتی دا ئەژی گرینگی یەکی زوری هەیە و ئەگەر بلیم چاوم روون بووە و دلم گەشاوە هیچ شتیکی دوور لە راستەقینەم نەکوتووە.

بە هەویام ئەو رووناکیی و گەشیی یەم لەمەولا لی نەبری و پیوەندی لەگەل رابگری و نامەم بو بنوسی و ئەگەر بوت هەلکەوت چاپەمەنیم بو بنیری. نازانم چۆن بکەین کە روژنامەی "هاوکاری" بەری و جی بگاتە دەستمان. بو کی بنوسم و چۆن بکەم؟!

کاکە، بیستومە "رشتەی مرواری" خولا لی خوشبو ماموستا سەج جادی سەر لە نوی چاپ کراوەتەوە ئەگەر شتیکی وا هەیە رەجا ئەکەم بی بەشەم مەکەن و تەواوی جیلدەکانیم بۆ بنیرن. هەر لە ئیستاوە سوپاس!

زورم سلاو هەیە بو کاک کەمال و کاک عیززەددین و یەکەمین ناسیاو بونی من لەگەل تیکوشانی زانستی و ئەدەبی و فەرهەنگی ئیوە بەهوی ئەم دو هاوری یەوە بووە. یانی بە راستی هیندە یان تاریف کرودی کە سنوری بو نی یە و وادیارە بە خورائیش نەبووە و بو چونیان بە تەواوی دروست بووە.

سوپاس ئەکەم لە کاک کەمال کە لە نوسراوەکەی دا لە چەند جیگە بە بەریزی یەوە باسی کردوم و هەول ئەدەم لایقی ئەم ویژراوانە بم.

سلاوی برایەتی

۲۹۹۰/۷/۱۹

**بەیەکەوە بۆ میللەت و وەتەن کاری بکەین.**

نامەی ڕەحیمی قازی بۆ مەلا مستەفای بارزانی

کوپیە برای بەرز و خوشەویست کاک محمد اوف (ملا مصطفی بارزانی) هومیدم هەیە ساغ و سلامت وکەیف خوش بن و هەروەها بە بونەی تەواو کردنی مدرسە پیروزبایی تان لی دەکەم. وضعی من باشە و ئەوا چەند روژیکە لە تاشکەند گەراومەتەوە. چاوم بە تەواوی هاوالەکان کەوت و گەلیک _ گەلیک چاوم رون و دلم شاد بو. ئەوەی کە بەر لە هەمو شتیک هوی دلخوشی منی پیک هینا ئەوەیە کە تەواوی هاوالەکان بونەتە خویندەوار و گەلیک وەپیش کەوتون و جیگای هەویا و هومیدن .بەلام، نازانم هەتا کەنگی دەبی هەر وا بی تشکیلات و بی سەر و بەر بین. لام وایە ایتر کاتی ئەوە گەیشتووە کە پیکەوە وەخر بین، تەواوی ناتەبائیەکان وەلابنیین و بەیکەوە بو ملت و وطن کاری بکەین. تەواوی مهاجرە سیاسیەکانی لە سویت وەخرهاتون و تشکیلات یان هەیە و بو دواروژی ملت و وطنی خویان کاری خو حاضرکردن بەریوە دەبەن. هەر ایمە کوردەکانین کە لەو نعمتە بی بەش بوین.

---

جنابت براگەورەی ایمەی و ایمە هەمومان ئەوەمان قبولە. ئەورو وظیفەی مقدس و وجدانی ایوەیە کە، بو خرکردنەوەی کوردەکان لەیک جی دەست با کار بن و ئەوەی بزانن کە، اگر بیتو ئەورو ئەو کارەی نەکەن سبەینی دەبی لە حاست ملت مسئولیت هەست بکەین. ئەمن شخصا بو هەمو چەشنە خزمەتیک بە آمانجی خربونەوە و یک کەوتنی کوردەکان حاضرم و اگر فرضا ئەمنیش قبول نەکەن، بەلام پیکەوە وەخربین و تشکیلاتیک ساز بکەن و دیسان حاضرم، چونکە بە قازانجی عمومە. ئەمن دەزانم کە ایستاش جنابتان دلتان نسبت بە من خاوین نیە. ئەمن دەزانم کە، بعضە کەسیکی غیری کورد بە آمانجی لیک هەلبرینی ایمە بە تەواوی هیزی خویانەوە تیدەکوشن، بەلام قەید ناکات. روژیک دیت کە، تەواوی حقیقتەکان روناک دەبنەوە و ئەو دەمی معلوم دەکات کە، ئەمن جیا لە حرمت و باوەری بە ایوە هیچ کاتیک فکریکی دیکەم نەبووە.

دیسانیش رەجام ئەوەیە لە مەر سازکردنی کونفرانس و یا مشاورەیکی کوردان بە آمانجی دامەزراندنی تشکیلات و ولابردنی دودلی و ناتەبایی نیو خومان تیبکوشن.

برای پچوکی ایوە

ئیمزای رەحیمی قازی

٥٧/٧/٣

نامەی ڕەفیق سابیر بۆ بەرۆژ ئاکرەیی

بەرۆژ گیان چاوت ماچ دەکەم

هیوام خۆشی و سەرفرازیتە.[1]

نامەکەتم بەوردی خویندەوە. هەفتەی پێشوو هەندێ میوانمان هەبوون بۆیە نەمتوانی زووتر وەڵامت بدەمەوە. پێشەکی دەبێ سوپاست بکەم بۆ سەرنج و تێبینیەکانت. بەراستی بەش بە حاڵی خۆم پێویستم بەو جۆرە تێبینییانە هەیە. چونکە خۆت دەزانی ئێمە لە ئاوارەییدا لە خوێنەری ڕاستەقینەی شیعر و ڕەخنەگرانمان دابڕاوین، لە کاتێکدا بەردەوام پێویستمان بە ڕاچڵەکاندن و بیدارکردنەوە هەیە.

سەبارەت بە مەسەلی حیزبایەتی و من. کە خۆشبەختانە بەتەواوی خۆم لێ دەربازکرد، بۆ خۆی جۆرە تراژیدیایەکە، هیوادارم ڕۆژێ لە ڕۆژان، بەپەیوەندی لەگەڵ تاقیکردنەوەی شیعریم شتێکی لە بارەوە بنووسم. بۆیە لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم کە من باجیکی زۆری ئەم مەسەلەیەم داوە، ئازارێکی دەروونی و ڕۆحی زۆرم پیوە چەشتووە.

- ئەو بەراوردەی لە نیوان من و شێرکۆدا کردووتە، هەندێ ڕاستی تێدایە، بەلام بەرای من مەسەلەکە پەیوەندی بەوەوە نییە کە (هەردووکمان درۆ دەکەین). ئەم قسەیەشم بۆ ئەوە نییە پاکانە بکەم. بەڵکو لام وایە بۆ باسکردنی قووڵ و وردی ئەم حاڵەتانە خراپ نییە لەو بنەما فەلسەفی و شیعرییەوە دەست پیبکەین کە شاعیر، خودی شاعیر (شێرکۆ بێکەس بێ، یان ڕەفیق یان کەسیکی تر) چۆن لە خودی شاعیر و لە پەیامی شیعر دەگات. چونکە ناوەرۆکی ئەم مەسەلەیە لەوەدایە کە ئایا فلانە شاعیر شیعر بە هۆکار و ئامراز لەوانەیە ئامرازی سیاسی و کۆمەلایەتی دەزانێ یان شیعر بە پەیامیکی جوانی و گیانی و ئینسانی دادەنێ.

---

[1] وەڵامی ئەم نامەیە لە لاپەرە (٢٢٧) دا یە.

(من له دیدهنییهکدا لهگەڵ(بەربانگ)١ به پەیوەندی لهگەڵ شیعره سیاسیەکانی گۆران، کەمێک باسی ئەوەم کردووه لەگەڵ ئەم نامەدا ئەویشت بۆ دەنێرم). بەش بە حاڵی خۆم هێشتا له عیراق بووم (واته بەر له هاوینی ساڵی ١٩٧٨ که عێراقم جێ هێشت) باوەرم بەوه نەمابوو که شیعر ئامرازه. بۆیه ئەگەر سەرنج بدەی له ماوەی سێ ساڵ و چوار مانگی پێشمەرگایەتیمدا دوو کورته شیعریشم نەنووسییوه که بۆنی دیعایه و ئامرازی سیاسی یان لێ بێت. لەوێ هۆنراوەی "سوتاون لەبەر باران" و ئەو کۆمەڵه شیعرەم نووسی که زۆربەیان له ژێر ناوی (چرای گۆرستان) دا له دیوانی "سوتان لەبەر.." چاپکراون و پێنج دانەشیان بەر لافاوەکەی پاییزی ١٩٨١ کەوتن. شیعرەکان زیاتر ئاوڕ دانەوەن لەلایەنی دەروونی و گیانی مرۆڤێکی تێک شکێندراو و کەم و زۆر بۆ ئەوه ناشێن له پێشمەرگایەتیدا چاپ بکرێن، هەر بۆیه له سەرەتادا به هاندانی هەندێ برادەر ویستم وەک دیوانیکی سەربەخۆ و بەهەمان ناو چاپییان بکەم، بەڵام هەر زوو ژێوان بوومەوه. چونکه دەرکم بەوه کرد که ئەم شیعرانه، بۆ بارودۆخی پڕ حەماس و تەقوتۆق و پڕوپاگەندەی سیاسی ناشێن. جا لەبەر ئەوەی من بۆ پانزه ساڵێک دەچێ باوەڕم بەوه نەماوه که شیعر بکرێته ئاوازێکی سیاسی، ئەوا بیرم لەوه نەکردۆتەوه که سیاسەت و ئامانجی حیزبەکەی جارانم له نێو شیعرەکانمدا بپەستێوم. یان شیعر به هەوای سیاسەتی رۆژی حیزبایەتی بنووسم. ئەگەر بەم جۆرەم بکردایه ئەوا 'مامۆستا دڵزار'ێکی حەفتاکان یان هەشتاکان (نەک پەنجاکان) دەبووم. به درێژایی ئەو ماوەیەش چەند دڵزارم دەهێنایه بەرچاوی خۆم، مچوڕک بەلەشمدا دەهات.

به هەرحاڵ، رەنگه زۆربەی خەڵک (داخەکەم تۆیش) ناکۆکی لەوەدا ببینن، که چۆن فلان شاعیر ئەندامی فلانه حیزبه، کەچی شیعر بۆ حیزبەکەی نالێ، یان

---

[1] بەربانگ: گۆڤاری فیدراسیۆنی کۆمەڵه کوردستانییەکانه له سوید. لێرەدا ئاماژه به چاوپێکەوتنێکی ئەو گۆڤاره دەدرێت که له ژماره ٦٩ ی مانگی جەنیوەری ساڵی ١٩٩١ بەناوی (گفتوگۆیەکی ئەدەبی لەگەڵ کاک (رەفیق سابیردا) بڵاو کراوەتەوه.

شیعرەکانی بە شان و باڵی سیاسەتی حیزبەکەیدا هەڵناڵێن. کەواتا دەشێ ئەم شاعیرە لەگەڵ خۆی راستگۆ نەبێ ـیان بە قەولی تۆ درۆ لەگەڵ خۆی بکات. لە کاتێکدا درۆلەگەڵ خۆکردن لەم حاڵەتەدا دەبێ ئەوە بێ کە مرۆڤ شتێک بنووسێ لەگەڵ فیکر و ئامانجی حیزبەکەی نەگونجێ. لێم ببورە ئەگەر بڵێم ئەم بۆچونەی تۆ پراوپڕ لەژێر کارتیکردنی بۆچوون و دیدی باودایە. چونکە دیدی باو و سەپاو، پێی وایە شیعر ئامرازە، شاعیریش زورناژەن و کەلەباب، یان شایەر، یان تۆ گووتەنی کوتەکە، ئیتر مادام ئەندامی فلانە دەبێ شیعرەکانیشی برژێنە رۆگەی سیاسەت و ئیعلامی حیزبەکەیەوە. ئەمەیش شتیکی سەیر نییە، چونکە کورد پێشتر نموونەی لەم جۆرە شاعیرانەی بووە کە داخەکەم کەمیش نەبوون و تا ئێستاش شێرکۆ باشترین و تاکە نموونەی ئەم جۆرە شاعیرانەیە. لەم بۆچونەوەیە کە دەبێ رەفیقیش هەر بە هەمان دەستوور شیعر بڵێ، کە ئەمە ناکات، کەواتا دەبێ درۆ لەگەڵ خۆی بکات! ئەمەیش بۆچوونێکی باوە، چونکە خەڵکەکە پێشتر هەر ئەمەیان لە شاعیری حیزبی دیوە. لەوەیش زیاتر شیعر لە سەردەمی حاجی قادرەوە تا ئێستاش رۆڵیکی تایبەتی لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی کورددا گێراوە، بۆیە خەڵکەکە بە گشتی چاوەڕوانی شیعری سیاسی، شیعری ئامراز لە شاعیر دەکەن ئەویش بۆ ئاوازی حیزبی یان لێ دەوێ. من نامەوێ قسە لەسەر شێرکۆ بکەم، راستە ئەو بە مانا تەسکە تەشکیلییەکەی ئیلتیزامی حزبابەتی ( واتا دانیشتن و کۆبۆنەوە لە شانەی حزبیدا) ئەندامی یەکیتی نییە. بەلام ئایا هەر ئەمە ئیلتیزامی حیزبییە؟ لام وایە ئیلتیزامی حزبی بەر لە هەموو شتێک ئیلتیزامی رۆحی، فیکری و ئەخلاقییە. بەلام خۆبەستنەوە، یان نەبەستنەوە بە شانەی حزبی (ئەمە لە دیدی لینیننەوە تەواوکەری ئەندامیەتەکەیە) شتێکی شەکلیی رووتە و هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، یان رەنگە تەنیا لە سەدا پێنج یان لە سەدا دەی ئیلتیزامەکە دیاری بکات. بەم مانایە شێرکۆ لە سەدا نەوەت ئەندامی یەکیەتییە. واتە لە رووی فیکری و رۆحی و ئەخلاقییەوە لەسەدا نەوەت بەوانەوە بەندە، جگ لەوەی پێشمەرگەی ئەوان بووە. جا لەبەر ئەوەی شیعر هەمیشە لای شێرکۆ هۆکار و ئامراز بووە نەک ئامانج، ئەوای لای من سروشتییە کە شێرکۆ بەم شێوە سیاسی و زۆر جار

ئیعلامییەوە شیعر بۆ یەکێتی بنووسێ. ئەگەر شێرکۆ کۆمەنیست یان پارتی بێت هەرهەمان شێوە شیعر لە دیدی ڕێکخراوە سیاسییەکەوە یان شعر بۆ ڕێکخراوە سیاسیەکەی و ئامانجەکانی ڕیکخراوەکەی دەنووسێ. ئەمە تەنیا ڕێکەوتە کە شێرکۆ لەگەڵ یەکێتی دایە نەک لایەنێکی تر، واتە شێرکۆ بەر لە یەکێتی شیعری بۆ خەڵکی تر نووسیوە، ئەگەر باوەڕی بە هیچ ڕێکخراو و لایەنێکی سیاسیش نەمێنێ ئەوا شێرکۆ هەر شیعری هۆکار، شیعری سیاسی زەق دەنووسێ کە دیارە ئەوسا ناوەڕۆکەکەیان مەودایەکی بەرینتریان دەبێ.

بەڵام من دەجاریش جێگۆڕکێی حیزبی بکەم، ئەوە مەحاڵە شیعر بێنمە ئەو ئاستە نزمەی ملکەچی سیاسەتی ئەم یان ئەو حیزبی بکەم، من ئەم تاوانەم بەرامبەر بە شیعر لە دەست نایە. ئەگەر ئەم بۆچون و هەڵوێستەم، کە دەمێکە وەک شاعیر پەیڕەوی دەکەم، بەپێی بۆچوونی باو درۆلەگەڵ خۆکردن بێ. ئەوا خۆم بە دڵسۆزی و دەستپاکیی دادەنێم بەرامبەر بە شیعر و تێگەیشتنی خۆم لە ماهییەتی شیعر.

سەبارەت بەو نەخشەیەی بۆ دیوانەکانی منت کردووە، ئەمە ڕای خۆتە و ڕەنگە منیش لەگەڵ بۆچوونەکەی تۆدا بم، تەنیا لەوەدا نەبێ کە "کاروانسەرا"ت لە ڕووی کات و سەردەمی شیعرەکانەوە خستۆتە دوای "لاوکی هەڵەبجە"، چونکە چەند هۆنراوەیەکی زۆر کەمی (ئێوە بێدارتان کردمەوە) نەبێ، هەموو دیوانەکە بەر لە لاوکی هەڵەبجە نووسراون، لەوەش زیاتر هەندێکیان بەرلە "وەرزی سەهۆڵبەندان" و هەندێکی تریان تەواو لە ڕۆژانی نووسینی (وەرزی سەهۆڵبەندان)دا نووسراون. ڕەنگە هەر بارودۆخی نائاسایی خۆمان و کارەساتەکەی هەڵەبجە بووبنە هۆی ئەوەی کە "لاوکی هەڵەبجە" بەر لە "کاروانسەرا" چاپ بکرێ بۆیە بەڕای من نەخشەکەی تۆ بەم جۆرە درووست تر دەبێت:

دیاره تۆ ئازادی چەند دێنیته خوارێ، بەڵام بەڕای من ناکری شیعرەکانی (١٩٨٥-١٩٨٨) کە بەشی هەرە زۆری کاروانسەران، بخرێنە دوای لاوکی هەڵەبجەوە و وەک قۆناغێکی سەربەخۆ دوای ئەو حسابیان بۆ بکرێ. لەوەیش زیاتر پێم وایە مەرج نییە داوای ئەوە لە شاعیر بکرێ لە هەموو دیوانیکدا قۆناغێکی جیاواز بخاتە روو. ئەم داخوازییە رەنگە بۆ سەردەمێکی دەساڵی یان کەمتر لە جێگەی خۆیدا بێ، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورتی نێوان (١٩٨٦-١٩٨٩) کە سەردەمی نووسینی ئەم سێ دیوانەن، زەحمەتە وەک سێ قۆناغ دابنرێن بەڵکو بە رای من دەشی وەک یەک قۆناغ یان یەک نەفەسی شیعری حسابیان بۆ بکرێ. رەنگە ئەم داخوازییە، یان ئەم چاوەڕوانییەی تۆ بۆ ماوەیەکی وەک (١٩٩٠-١٩٩٥ )یان دورتر لە جێی خۆی بێ. تا حوکمێکی تەواو لەسەر دابەزین یان هەڵچوونی بالای شیعری من بدرێ. ئەمەم بۆ پاکانەکردن نییە، بەڵکو وەک پرنسیبێکی رەخنەیی دەیهێنمەوە، چونکە لام وایە بەرهەمی شیعری هەر شاعیرێک لە چاو خۆی وەک زنجیرە لوتکە یان زنجیرە گردیک وەهایە کە هەندێ دۆڵ و نشێو و گرد و تەپۆلکە بەیەکیانەوە گرێ دەدات. واتە شتێکی ترسناک نییە ئەگەر لە نێوان دوو بەرهەمی باش دا، یەک دوو بەرهەمی خراپی شاعیرێک بەرچاوبکەون. لێرەدا گرنگ ئەوەیە کە ئەم دابەزینە شیعرە تا سەر نەبێ.

دەشی ئەم لێکنزیکییەی کات و سەردەمی هەر سی دیوانەکە هۆکارێک بن کە بووبنە هۆی ئەوەی کەمێک وێنە و بۆچوون و چەندان وشە دووبارە و چەندبارە ببنەوە. دیارە دەزانی دووبارەبوونەوەی وێنە یان کۆپلەیەکی شیعری لە هەمان هۆنراوەدا کاریکی هێندە لاواز نییە، بگرە زۆرجار تەواو بە ئەنقەستە و بۆ تەئکید کردنە. من ئەو کۆپلەیەی لە "هۆنراوەیەک بۆ دایکم" لە کۆتاییدا دووبارەم کردۆتەوە، تەواو بە مەبەستی (تاکید)، جەخت کردنە. هەروەها لە هۆنراوەی ئاو و بگرە لاوکی هەڵەبجە و خودی وەرزی سەهۆڵبەندانیش پەنام بۆ هەندێ شتی لەم جۆرە بردووە. دیارە ئەم قسەیەم بۆ ئەوە نییە کە پاکانە بۆ هەندێ وێنەی دوبارەکراوە یان وێنەی لەبەرگیراوەی کاروانسەرا بکەم کە تۆ بەهەق زۆریانت دەستنیشان کردوون. لەوەیش زیاتر هەست دەکەم کۆمەلە

وشەیەک کە کەم نین بە جۆرێکی بێ مانا خۆیان بەسەر بیرکردنەوە و گیانم دا سەپاندووە!! "کاتی خۆی لە نامەیەکی تر دا(لە ئێرانەوە) ئەمەیشت بە وردی دیاری کردبوو".

- سەبارە بە شیعرە کورتەکانِ، ئەگەر سەرنجت دابێ، من هەموویانم لە ژێر دوو ناونیشاندا کۆکردوونەوە. نامەوێ لم ڕووەوە قسە بکەم، چونکە تۆ ئەم هونەرەی شیعر وەکو من دەزانێ[دەزانیت]. دانانی ناونیشانیکی هاوبەش بۆ چەند کورتە شیعرێک وەک ئەوەی لێ دەکات کە ببنە یەک هۆنراوە، یان هەر نەبێ وەک چەند کورتە هۆنراوەیەک، کە یەک ئامانج و مەناخ و فەزایان هەیە و پێکەوە بەستراون و دەخرێنە ڕوو. نەک وەک هۆنراوەیەکی سەربەخۆ. ئەگەر سەرنجت دابێ هەندێ کورتە هۆنراوەی تر هەن (پۆرتریتی،، تەرم، ئەوێ شەوێ، سێوەخان) وەک هۆنراوەی سەربەخۆ خراونەتەڕوو، بەلاّم ئەوانەی تر تەواو تێک ئالاّون و پێکەوە گرێ دراون بۆیە سەردێڕی (ئێوە بێدارتان کردمەوە..) [ی] بۆ دانراوە. بۆیە حەزەکەم بەم چاوە سەرنجیان بدەی.

- بەڕۆژ گیان نازانم بۆ بەم جۆرە سەرنجی ئەو شیعرانەت داوە، کە باس لە کەسی غایب دەکەن. دیارە وا بە ئاسانی دەمتوانی لە جیاتی ئەوەی بڵێم:

چنگێ پشکۆی لە نێو پەڵەهەورێکدا چاند

یان: لە نێو یەکەم تریفەدا پاڵ دەکەوێ.. هتد

بنووسم :چنگێ پشکۆم لە نێو هەورێکدا چاند

لە نێو یەکەم تریفەدا پاڵ دەکەوم

مەبەستم هەر ئەم دووانە نییە، بەڵکو زۆربەی ئەوانی تریشە. یان دەکرا ڕوو لە کەسی بەرامبەر بکەم، بڵێم: چنگێ پشکۆت لە نێو... هتدڤ، بەلاّم لێرەدا بە ئەنقەست ئەم شیعرە غیابانەم بەکارهیناوە (بڕوانە لاوکی هەڵەبجەش بە هەمان شێوە دەستپێدەکات: بەتەنیا جیی مەهێڵێن..)، نالیم (بەتەنها جێم مەهێڵن..) من لەگەڵ ئەو بۆچوونە ڕەخنەییەدام کە لای وایە هەندێ جار کاتێ لە شیعر دا

سیفەتی غایب دەدرێ بە کەس، یان پاڵەوانی شیعرەکە_ ئەوا دەشێ ئەم کەسە غایبە مەودایەکی (بعد) دوورتر و قووڵتر وەربگرێ و هەندێ جار ئەو پاڵەوانە ئەفسانەییە، یان ئەو کەسە ئایدیالە بەرزە بیر خوێنەر بخاتەوە کە خۆی عەودالیەتی، یان بە هاورێ و دۆستی و هاورۆح و هاودەردی خۆی دەزانێ . واتا خوێنەر دەشێ لەو کەسە غایبە (نادیارە)دا هەر بۆ خۆی نەگەرێ، بەڵکو بۆ هاویار و کەسە خۆشمێرە نزیکەکەی خۆیشی بگەرێ. بەهەرحاڵ ئەمە رایەکە و بەس. لام وایە ئەم پرۆسەیەش تەنیا بەوە بەند نییە کە مادەم کەسەکە بە غیاب باسکراوە ئیتر دەبێ، ئەو شتە بە خوێنەر بدات. بەڵکو ئەمە بەسەرجەمی شیعرەکەوە بەندە.

ـ سەبارەت بەو شیعرەی بە (ئەبوو مەحموود)م پێشکەش کردووە. نازانم بڵێم بۆ نەگبەتی حزبی شیوعی عێراقی بوو، یان نەگبەتی من کە ئەبوو مەحموود و ئەم پیاوە (.....) ستالینییەی لێ دەرچوو. ئێمە کە لە سالانی حەفتاکانەوە پێکەوە لە (بیری نوێ) کارمان دەکرد پیاوێکی تر بوو(....). ئەو دژی بەرەی [بەرە لەگەڵ] بەعس بوو. زیاتر لەسەر ئەوە سەرکردایەتی خزب سزای دا و دووساڵ رەوانەی مۆسکۆیان کرد.

من کەلە سێپتەمبەری ١٩٨٧ بۆ بولگارستان هەلاتم، ئەو لە بەغدا و لە ژێر چەقۆی بەعسدا مایەوە. هێشتا لە بولگاریا بووم بە تەئسیری ئەو وەزعە و دۆستایەتی و برادەرایەتیمان ئەو شیعرەم پێشکەش کرد، کە رەنگە لەو ساتەدا بیرم بۆ ئەوە چووبێ کە دەگیرێ و نایبینمەوە. دیارە ئەو، نە عەزیز محەمەد و کەریم ئەحمەد و کێ و کێ بوو کە من بۆ مەبەستێکی تر شیعرم پێشکەش کردبێ. ئەوش بزانە کە لەرێگەی ئەوەوە لە کۆتایی ١٩٧٢ کاتێ پێکەوە لە رۆژنامە کارمان دەکردو بە ملی شکاوم سەر لەنوێ پاڵێورامەوە بۆ حزب. ئیتر دیارە هێندە خۆپەرست نیم بڵێم بۆ نەگبەتی من ئەو هیچی بەسەر نەهات، بەلام دەمەوێ بڵێم ئەم هۆکارانە و چەندان وردە شتی تر، سەرەرای وەفاداریم بۆ برادەرایەتی و هاوبیرمان، سەبارت بە هەندێ مەسەلەی ئەوکاتە هاندەری ئەوەبوون کە شیعرەکەی پێشکەش بکەم. لەگەل هەموو ئەوانەشدا ئەمرۆ کە

ئەبو محموود ئەو بەچکە ستالینییەی لێ دەرچووە (.....) لەوەیش زیاتر ئەو هۆنراوەی(لەبەر ڕێژنەدا) کە لەگەرمەی پەلاماری بەعس بۆ سەر حزب نووسیومە دوا وشەی (ئەی حیزبەکەم)، دەکەم بە ئەی گەلەکەم.. هەروا لە کاتی چاپی ڕیژنە دا بەهەڵە دیسان ناوی "سەلام عادیل" خراوەتە سەر هۆنراوەیەک ئەمیش روون دەکەمەوە کەَ لە چاپداوای لێ هاتووە، چونکە من تەنیا یەک هۆنراوەم بۆ "شەهید سەلام عادل" پێشکەش کردووە نەک دوو.

بەڕۆژ گیان هەندی وردە شتی تریش هەن سەبارەت بە نامەکەت و هۆنراوەکانی کاروانسەرا، کەی یەکترمان بینی باسی دەکەین. ئێستا ڕیگەم بدە لە گۆڤارەکەی بە نیازین دەری بکەین بدوێم١.

نازانم بۆ تۆ پێشوەخت پێت لێ لە کەوشان ناوین. هەروا نازانم لەگەڵ شاخەوان باسی چیتان کردووەو چۆن باسی ئەم گۆڤارەتان کردووە، کە هێند نیگەران بووی، بەڵام حەزەکەم لە منی ببیستی کە ئەم گۆڤارە گۆڤارێکی سەدلەسەد سەربەخۆ دەبێ. گۆڤاریکی کولتوریی گشتی دەبێ کە ڕیبازێکی دیموکراسی، ئازادیخوازانەی زۆر فراوانی دەبێ. واتا ئازادیی فیکر، داهینان، بیروڕا دەربڕین، ئازادیی مرۆڤ، ئافرەت، ئازادیی نەتەوە لە مافی بڕیاردانی چارەی خۆنووسی خۆی و نیشتمانەکەی، نزیک بوونەوەی ئازادی ئەو بیروڕاو بۆچوونە جۆراوجۆرانەی لە کۆمەلگای کوردستان و بزاڤی کورددا سەریان هەڵداوە، ئامانجی سەرەکی گۆڤارەکە دەبن. من وەک نووسەریکی سەربەخۆ سەرنووسەر یان ئەندامی دەستی نووسەرانی ئەم گۆڤارە دەبم، کە سەر بە هیچ حزبیک یان لایەنێک نییە. دیارە ئەم رایە ئەوە ناگەیەنێ کە گۆڤارەکە ڤیتۆ لەسەر نووسینی فلان کەس و لایەن دابنێ. لێرەدا گرنگ ئەوەیە نووسینەکە لە ڕووی ئاستی هونەری نووسینەوە بەهێز بێ، بەڵام فیکرەکەی مەرج نییە لەگەڵ

---

[1] مەبەست لە گۆڤاری (ڕابوون)ە کە گۆڤارێکی وەرزیی کولتووریی بوو.. لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ تا سەرەتای ٢٠٠١ لە سوید، ٣١ ژمارەی لێ بڵاو کرایەوە. رەفیق سابیر سەرنووسەر و کەمال میراودەلی و هاشم کۆچانی و کاروان عەبدوڵڵا ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە بوون.

فیکر و بۆچوونی مندا بگونجێ. نەخێر من ئازادی فیکری دادەنێم کە لەگەڵ فیکر و بۆچوونی جیاوازی خەلکی تردا هەلبکەین و ڕیزی لێ بگرین. هیوام بەوەیە کە بەشداری تۆ لایەنی ئەدەبی گۆڤارەکە و ڕێبازی سەربەخۆیانی گۆڤارەکە بەهێزتر دەکات. لەم کارەدا ئێمە پاڵپشتی یەکتری دەبین. من لەسەرەتاوە ئەوەم لەگەڵ ئەو برادەرانە بڕیوەتەوە، کە پشتگیری ئەم گۆڤارە دەکەن، کە ئەم گۆڤارە ئامانجی ئەوە نییە ببێتە ئۆرگان و زمانحاڵی ئەو هاورییانەی لە هەرێم داوای دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سەربەخۆ دەکەن. بەڵام لەهەمان کاتدا ئەگەر هەر بابەتێکی گرنگ لەم ڕووەوە بنوسن و بۆ بلاو کردنەوە بڵاوی ئەوا بڵاوی دەکەینەوە. وە نابێ گۆڤارەکە ڤیتۆ لە دژی ئەوان یان خەڵکی تر بەکاربێنین.

ئێمە داماننناوە دوای دەرکردنی دوو ژمارە، دەستەی نووسەرانی فراوان بکەین.. داوا لە کۆمەڵێک نووسەری سەربەخۆ و دیموکراتیخواز بکەین (دوای ئەوەی ڕێبازی گۆڤارەکەیان لێ روون دەبێ) کە وەک ئەندامی دەستەی نووسەران بەداری بکەن.

بە کورتی بەڕۆژ گیان دڵنیات دەکەمەوە کە ئەم گۆڤارە بایەخدان بە ژیانی فیکری و مێژوویی، ئەدەبی و کەلتووری و کۆمەلایەتی کوردستان و مەسەلەی گەلی کوردستان و مافی چارەنووسی نەتەوەیی کورد دەکاتە ئامانج و ڕێبازی دیموکراسیانە و ئازادیخوازانەی خۆی. لام وایە هێندەش خۆشەویستی و باوەڕپێکبوون لە نێوانماندا هەیە، کە پێویست نەبێ چاوەڕوانی دوو ژمارە بکەی ئەوجار بڕیار بدەی کە کۆمەک و بەشداریمان دەکەی یان نا..

چیتر بنووسم.. هیوادارم بەم نزیکانە چاومان بەیەکتری بکەوێ، بەڵام تا ئەو کاتە چاوەڕوانی ئەوەم بابەتێکی باشمان بۆ بنێری. چونکە گواستنەوەکەمان ڕەنگە چەند هەفتەیەکی تر بخایەنێ. ئێمە ماڵەکەمان پێچاوەتەوە، بەڵام لە کۆمۆنی ئوپسالا داوای هەندێ شتی فۆرمالیان کردووە کە پیوەندی بە کونتراک (عقد)ی خانووەکەوە هەیە. هیوادارم لە ماوەی دوو هەفتەیەکدا ئەمیش چارەسەر بکرێ.

ڕێبوار سیوەیلی ئەم کتێبەی چاپکردووە
لای خۆت باش هەڵیگرە
تا لە دەرفەتێکدا لێت وەردەگرمەوە.

چاوت ماچ دەکەم
ببورە ئەگەر ناوەکەم پەلەیەکی پێوە دیاربێ
[illegible]
١٩٩١/١١/٢٨

**بازاڕی ئەدەب، بێ ڕەواجە.**

نامەی ڕەفیق سابیر بۆ فەرهاد پیربال

برای هێژام کاک فەرهاد پیربال ١٤ /١٩٩١/٥

ڕۆژباش

هیوام خۆشی و سەرفرازیتانە

دوێنێ نامەکەتم بە دەست گەیشت. نازانم ئەم هەموو ماوەیە کێ لە فیدراسیۆن لای خۆی گلی داوەتەو و دوای ئەوە بە کراوەیی ڕەوانەی لای من [ی] کرد؟.

سوپاس بۆ ئەو دەستپێشخەرییە برایانەت. ئومێدەوام لەمەودا ئاگاداری هەواڵی یەکتری بین.

من بە وردی و بە چاوی پڕ لە بایەخەوە شیعرەکانت دەخوێنمەوە، مایەی خۆشحاڵیمە کە تۆ و هەندێ لە شاعیرە لاوەکانی تر

(ئەحمەدی مەلا، حەمە فارووق، بەڕۆژ ئاکریی، ڕێبوار..) لە سەرەتاوە هەوڵێکی زیرەکانەتان [illegible] کە لە دەنگی ئێمە نەچن و، فەزایەکی شیعری تایبەت بەخۆتان دابهێنن. لێرەدا ئەگەر ڕێگ[illegible] بە خۆم بدەم سەرنجێ دەرببڕم، دەڵێم ئاواتەخوازم زیاتر و زیاتر بایەخ بە زمان بدەیت، ڕەنگە ئە[illegible] شاعیرێک، لاو، بە[illegible]ڵاچوو

پیر، درووست بیّ، چونکە بەراستی زمان ئەو دەریا بەرینەیە کە چەند بە ناویدا شۆڕ ببینەوە قوڵتر و فراوانتر و پڕ ڕازتر دەبیّ.

سەبارەت بە پڕۆژەکەمان تا ئیستا تەنیا گۆڤاریّکی کلتوری گشتییە بە نیوی (رابوون) کە هیوادارم دە ڕۆژیکی تر لە بەندینخانەی چاپ ئازاد بیّ، ئەوسا یەکسەر بۆتان دەنیّرم. دیارە گۆڤارەکە ئازاد و سەربەخۆ و دیموکراتیخواز دەبیّ، کە مەسلەی ئازادی مرۆڤی کورد و سەربەخۆیی کوردستان لە نیّو ئامانجە سەرەکییەکانیدا دەبیّ، هەر وا بە ئاواتەوە بیّ بتوانین بە چاویّکی نویّ لە مەسەلە فیکری و کەلتوری و ئەدەبییەکانی کوردستان وردبیینەوە..هەروا یەکیّک لەو مەسەلە گرنگانەی کەلام وایە پیّویستە بایەخی تایبەتی پیّ بدریّ ئەو دەنگە ئەدەبییە رەسەنانەن کە لە ئاوارەییدا گەشەیان کردووە و گەشە دەکەن و داخەکەم کەم تا زۆر ئاوڕیکی ئەوتۆیان لیّ نادریتەوە..دیارە خۆت لە من باشتر دەزانی کە لە دەرەوە ژیانی ئەدەبی لە چ حاڵیکدایە و تا چەند بازاڕی ئەدەب بیّ رەواجە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەم ئیمەی نووسەران، بە تایبەتی وەچە یان نەوەکەی پیّش ئیوە ئەرکیکی زیاترمان لە ئەستۆیە بەرامبەری نەوە نویخواز و رەسەنەکەی دوای خۆمان. ئیمە لە ژمارەی دووەمدا هەوڵ دەدەین هەر جارە چەپکە شیعریّکی شاعیریک لەگەڵ کورتە باسیّک، یان نووسینیّکی پوختە دەربارەی شیعرەکان و شاعیرەکە بلاو بکەینەوە. نازانم تۆ لەم ڕووەوە، یان لە هەر بواریّکی ترداو تا چەند دەرفەتی ئەوەت دەبیّ کۆمەک و هاریکاریمان بکەی؟ دیارە دەکریّ و دوای بینینی ژمارە یەکی گۆڤارەکە بریاربدەی...

سەبارەت بە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە کە ئیستا ئەم برادەرانەین: من و کەمال میراودەلی و هاشم کۆچانی و کاروان عبدللا (کە چیرۆکنووسیّکی لاوە)، بە نیازیشین دوای ژمارە دووی گۆڤارەکە، واتە ئەو کاتەی نووسەران لە سەربەخۆیی و ڕیبازی دیموکراتیخوازانەی گۆڤارەکە خاتر جەم دەبن، دەستەی نووسەرانەکەی فراوان بکەین و ڕوو لە کۆمەڵیک نووسەری ئازادیخوازی کورد بکەین تا هاریکاریمان بکەن.

سەبارەت بە هەواڵی خۆیشم، ماوەیەکە لەگەڵ هۆنراوەیەکی درێژدا خەریکم کە نازانم بۆ کویم دەبات!

لەگەڵ ئەم نامەیەدا دوا کۆمەڵە هۆنراوەی خۆم (کاروانسەرا) ت بۆ دەنێرم. حەزدەکەم بە وردی وەرزی سەهۆڵبەندانەکە بخوێنیتەوە. بەر لەویش لاوکی هەڵەبجەم چاپکرد کە داخەکەم ئیستا لەبەر دەستمدا نییە تا بۆت بنێرم.

هیوام خۆشی و سەرفرازی و سەرکە وتنتە.

جاریکی تریش سوپاسی دەستپێشخەر ییەکەت دەکەم.

٥/١٤

براتان ڕەفیق سابیر

**چونکه چیرۆکنووسێکی پێناساندم...**

نامەی ڕەفیق سابیر بۆ کاروان کاکەسوور

برای هێژام کاک کاروان

سووپاس کە (ئەستێرە)[1]ت بۆناردم، ئەستێرە بو من حەپەسان و سەرسامییەکی پێوە دیار بوو، چونکە چیرۆکنووسێکی پێناساندم، کە بە توانایەکی ئەدەبی بەرچاو و جیهانبینییەکی تایبەت و زمانیکی تارادەیەکی زۆر ڕەوانەوە، ڕیگە دەبڕێت و دەیەوێت، لە نێوان هەردوو جیهانی خەون و واقیعدا جیهانیکی ترمان پیشان بدات، پیرۆزبایت لێدەکەم و هیوای بەرهەمی داهێنەرانەت بۆ دەخوازم.

جێی داخە کە (ئەستێرە) ئاوا بێ ناز چاپکراوە، دەکرا ئیمە وەک ڕابوون لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی ڕابوون، کۆمەکی بچووک بە بڵاوکردنەوەی بکەین، بەو مەرجەی چاپەکەی جوان بووایە. هەر نەبێ وەک (ئاوێنە و سێبەر)[2]بووایە کە لەگەڵ ئەم نامەیەدا بە دیاری بۆت دەنێرم.

هیوای شادیمانی کامەرانیت بۆ دەخوازم

برات ڕەفیق سابیر

١٩٩٧/٩/٢٣

---

[1] بروانە پێشەکی .

٢ ڕەفیق سابیر، ئاوێنەو سێبەر، سوید، ١٩٩٦ .

**ئەگەر ئێمە نەبین، لە جوانی فریشتە سەردەرناکەیت.**

نامەی ڕەووف بێگەرد بۆ شێرکۆ بێکەس

شێرکۆ گیان سڵاو:

ئەمشەوم بۆ شیعرەکانت[1] تەرخان کرد، چەند "شەیتانەکان"[2] لەسەر مێزی هەمیشە هەڵنیشتوەکانیانەوە چاوی هەڕەشەیان لێ زیت کردمەوە، وتم میوانەکەی ئەمشەوم لە ئێوە جوانتر و دلۆڤانترە و هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ کچە شیعرێکیاندا بوومەتە هاوڕێ و دەستی لێ هەڵناگرم.

یەکێک لە شەیتانەکان کە تا بڵێی سەرسەریوزۆڵ و فێڵزانە و هەر لەم ماوە کەمەدا درکی بە هەموو نهێنیەکانم کردوە. وتی: فشەمەکە و وەرە لای خۆمان. تۆ ترسنۆکیت و تەنیا بە پیاو دەوێریت نەک بە کچ، هیچ نەبیت شارەزای شتە شاراوەکانی ناوەوەی مرۆڤت دەکەین کە شیعر شتی وای لێ ناوەشێتەوە. وتم: نا، نایەم، ئەمشەو پێویستم بە گوناهو بەدکاریەکانی مرۆڤ نیە و دەمەوێت بە شیعر خۆم لەو شەوانە پاک بکەمەوە کە لەگەڵ ئێوەدا بووم. یەکێکی تریان وتی: ئاخر ئەگەر ئێمە نەبین لە جوانی فریشتە سەردەرناکەیت. وتم ڕاستە، دێمەوە لاتان، هەر ئەمشەو وازم لێبێنن، بەڵام تا دەهات چاویان زیت تر و بۆڵەبۆڵیان لە حەمامی ژنان جەنجاڵتر بوو. بە هەرحاڵ ئەم هەموو کچ و ژن و عەشق و دڵداریانەی تۆ بۆ ماوەیەکی باش ڕۆحیان تازەتر کردمەوە و لە هەندێکیشیاندا گەڕامەوە بۆ ئەو تەمەنەی کەپڕ بوو لە خەونی سادەیی و بەرائەت و تاڕادەیەکیش تێنەگەشتن لە دەورووبەر و بە شکتی لە ژیان.

---

[1] ئەم نامەیە دوا نامەی ڕەووف بێگەردە بۆ شێرکۆ بێکەس، پاش ئەوەی شێرکۆ بێکەس ڕەشنووسی (خێراکە خەریکە مردن بگات)ی بۆ دەنێریت تا سەرنجی خۆیی لە بارەوە بڵێت.

[2] مەبەست لە "شەیتانەکان"ی دیستۆیڤسکی یە، کە ڕەووف بێگەرد سەرقاڵی وەرگێرانییەتی بۆ زمانی کوردی.

شیعرەکانم باش خوێندەوە. دیارە قەسیدە و کۆپلەی جوانیان تیایە و بێگومان لاوازییشی تێکەوتووە، کە لە شیعری تۆ ناچن. من لە شوێنی خۆیاندا ئاماژەم پێکردوون و حەزیش ناکەم لە پاڵ کانیی زۆر ڕووندا جۆگەلەی لێڵ هەبێت. هەڵەی چاپیشیان تیایە چاکم کردوون. شیعری ئادان کۆپلەی زۆر سادەی تیایە کە دەبێت لایان بەیت. ئەوانەیشم دەست نیشان کردوە کە بۆ خوێندنەوە دەشێن- لەو بەرنامەیەدا کە نیازتە- خۆشەویستیم.

ڕەووف بێگەرد

٢٠١٣/٢/١٠

ڕەووف بێگەرد، شێرکۆ بێکەس، محەممەد موکری

## زۆربا و بودا هەڵیان تەکاندووم!

نامەی ڕەووف بیگەرد بۆ دڵسۆز حەمە

هاوڕێ دێرینە خۆشەویستەکەم دڵسۆز حەمەی بەڕێز

پڕ بە دنیایەک سڵاو و گلەیی

سڵاو چونکە ئەتوانم باڵی خۆشەویستیەکانم بقرتێنم و بەرەو دوورتین سنوور و تەریکترین دەڤەریان باڵ پێ نەگرم، گلەیش.. چونکە پێویست بە باس کردن ناکات و ئەوەندە بەسە وەک سوهراب بڵێم کۆترەکە لە ئاو مەکە..

دەنگوباسی تایبەتیت نیە، لێرە هەموو ڕۆژێک خۆت هەواڵ و سکاڵایەک بوویت، هەر ئەوانەش جوانتریان دەکردیت، ئێستا لەوە دەچێت سکاڵاو دەردە دڵ چکیان کردبێت و خەمێک نەبێت شەرمێکی درکاندن بخاتە سەر تەوێڵت، جا چ دەمێنێت

هەندێک لە هەوڵی چالاکیت دەزانم، ئەوانەی دڵی منداڵی خۆمانی پی دەدەینەوە و وادەزانین کۆلارەی ئێمە لە هی هەموو دنیا قەشەنگ و بەرزترە، وانیە بەڵام ناشتوانین دەست بەرداریان ببین، بێ هوودەییە کە سەری تەمەنمان سپی دەکات و کاتێک بە ئاگا دیین کە دەستمان بیجگە لە بۆشایی بە هیچەوە نە بەستراوەتەوە. ئەوەی دەمێنێتەوە چەند یادگاریەکی ئینسانیانەی خۆتە ئەگەر ئەوانی دی وازت لی بهێنن

قسەت لەگەڵ میدیا[بێگەر] کردبوو، تا ئێستا باری دەروونی چاکە، بەڵام بڕواناکەم هەروا بمێنێتەوە، لەوێ بێ کاری –مەبەستم داهێنان– تاقەت

پڕوکێنە، مەگەر بۆ یەکێک خولیای تری هەبێت و عەشقە ڕاستەقینەکانی لە بیر خۆی بردبێتەوە!! نازانم کێ دەگریتەوە!

ڕۆمانەکەت بوو بە چی؟ لە هەمووکات و شوێنێک و لە هەر حاڵ و باریکدا کاری جوان لە دایک نابن، ڕۆمان خەڵوەتی کازانتزاکی و هێرمان هیسەییان دەوێت. دەبێت هەموو ڕۆژێک لەو پلیکانانە وردبیتەوە کەسەدان جار دیوتن، ئەو بەردەی لەژێر پێتا، لە هەڵگڕانی چیایەکدا خلۆر دەبێتەوە. لەو دەنگی قازوقولێنگانەی کە دەیان پایز بەسەر شارەکەتدا بۆ گەرمیان کۆچیان کردووە. ئەو چاوانەی یەک جار شت دەبینن و هەست بە گەرمی و بۆن و ناوەوە ناکەن ناتوانن رۆمان بنووسن، ئەوانەی زوو یادەوەریەکان فەرامۆش دەکەن و دەست بەرووی خۆشەویستەکانیانەوە دەنێن دەتوانن باسی خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە بکەن؟! ئێ باشە ڕۆمان هەمووی قەناعەتکردنە بەو حەقیقەتانەی تیداچنراون، قەناعەتە بە هەناسەی نووسەرەکەی نازانم ڕۆمانی الحب و الطلا ی ئیزابیل ئەلیندت خوێندۆتەوە؟ بە ڕاستی تاقەتی خوێندنەوەت ماوە؟ لە دوابەشی وەرگێڕانی زۆربادام، زۆربا و بودا هەڵیان تەکاندووم، بە تاڵ بوومەتەوە لە گەلیک حەقیقەتی ڕابردووم، ئەشێ ئێستا لای من شوانێک لە پێغەمبەرێک پیرۆزتر و شوێنەوارێک لە شارێکی زیندوی ئەمڕۆ گەورە و پر مەبەست تر بێت. ئیتر وام لێ هاتوە دڵە گیان.. بە هیوای بەختەوەریت.. دڵسۆزتان

ڕەووف بێگەرد

٢٠٠٠/٤/١٧

**وایان دەزانی لە خزمەتی فۆکنەر دان!**

**نامەی ڕەووف بێگەرد بۆ میدیابێگەرد**

سەرچنار ١٩٩٦/١٢/١٣

بۆ کچی خۆشەویستم میدیا

ڕێز و سلاوم، هیوادارم شاد و سەرکەوتووبن، ئێمە باشین و ئومێدی بەختەوەری ئێوەین. من ڕۆژی ٩٦/١١/١٢ گەڕامەوە شار، شاری شیعر و ئەوین و یادگارە بە ڕەگ و گەلاکان. من لەوێ زۆر تر یادی سلێمانیم دەکرد، دوو جار بۆی گریام، شەوانی سنە کە لە ئابیدەر (بەرزاییەکە بەسەر سنە دا دەڕوانێت) ەوە دەڕوانیت هەر ئەڵیی ئەزمەرە و دەستی سلاوی بۆ شاری سلیمانی بەرزکردتەوە، تۆ بڵێی پیر بووبم وا بە یادگار و شوێنەوارەکان دڵخۆش دەکەم!

هەفتەیەک چووم بۆ تاران، ناخۆش نەبوو، دانیشتوان لە ڕۆژدا نزیکەی (١٥) ملیۆنە و، ڕیش و منارە و الله اکبر ٩٠% داگیرکردووە. نزیکەی هەزار دیناریکم پێ بوو دام بە کتێب و کرێی ئوتومبێل و ئوتێلم بەلاش بوو. ئەو دوو مانگەی ئێران ناخۆش نەبوو. زۆریان ڕێز لی گرتووم و وایان دەزانی لە خزمەتی فۆکنەر دان! لەوێ ئەدەب و شیعر و چیرۆکیان زۆر لاوازە، هەروەها هونەری شانۆشیان هەر نیە، ئەو تۆزە هەقە فەرهەنگیەکە- دو گۆڤاری کوردیە و جاری وا هەیە بە شەش مانگ جاریک دەردەچێ لایان زۆرە. هەر باشە. بەشێکم لە کاری میراتیەکە چار کرد و چاوی دایکتم پێ ڕووناک کردەوە. دوێنێ ٩٦/١٢/١٢ دایکت چوو بۆ بەغدا، وابزانم نزیکەی هەشتا هەزاری طبعی برد بۆماڵی باوکی هادی[مەهدی]، ئەوان زۆر هەواڵیان پرسیون و چەند جاریک تەلەفۆنیان بۆ بەغدا کردووە، شوکری ڕەنگە بچێ بۆ دیوانییە، هاوڕێیەکی پ.م ئاری لە هەولێر گیراوە ئێستا لە زیندانیکی بەغدادایە. ناوی ڕێبوارە ڕەنگە بیناسیت. چوە بۆ واسیطە و بە پارە بەری بدات، دایکت دایکەخەمەیە. ئاری بۆتەوە بە "پ.م" نیگار بە بێزاری لە بەغدایە، ساکار هەر خەریکی جرت و فرتی خۆیەتی. هەواریش کە چێشتەکانی خراپ دەردەچێ دەست دەکات بە گریان. نزیکەی دە چیرۆکم

کراوەتەوە عەرەبی نازانم دەتوانن وەک کۆمەڵەیەک بۆم چاپ بکەن! وەلامم لێ بگێڕنەوەو لێرە شار لە ڕەوی ئەوروپا و ئەمریکادایە. کەم کەسی ماون، بە ئێمەش دەڵێن بۆ چوون. بەلام من ئەوەم پێ ناکرێت و بیری لێ ناکەمەوە. حەنە هەر ماوە و خواردنی وەک جارانە، شنە و ڕەوەند و گۆڤە لە دەربەندیخان و باشن. هادی چۆنە؟ نووسینەکانی دەخوێنمەوە، شەمەندەفەرەکە دوا نووسینی بوو، دەستی خۆش، چاوی ماچ دەکەم. ئەی هیوای نامەرد، خۆش بوە، منداڵێکی ئاسایيە یان تایبەتمەندە؟ چاوە زۆر جوانەکانی ماچ دەکەم. سلاوم بۆ کاک دانا و مەریوان و منداڵەکانی، سلاو بۆ کاک صباح و تەلەفۆنەکەی. بەرامبەرمان ماڵی ئایشەخانە زۆر تێکەلاوین. تەلەفۆنەکەیان (٢٠٤٩٠)ە. وا چیرۆکێکی خۆمتان بۆ ئەنێرم تایبیدەنە گۆڤاری (المدى) پێش ڕەوەکە نووسینێکی برادەرێکی ئەوێمان لە کوردستان نویدا بلاوکردەوە کە لەسەر شانۆییەکی ئیوەی نووسیبوو. وابزانم ناوی خالیدەو سلاوم بۆ هۆشەنگ و ئەوانی تر. خۆشەویستیم

کاکت

ڕەووف بێگەرد

١٩٩٦/١٢/١٣

**ویستمان هەموو کوردستان بدەینەیەک،**

## کەچی ناو لەپێکمان بۆ مایەوە!

نامەی ڕەووف بێگەرد بۆ میدیا بێگەرد

سەرچنار ١٩٩٧/٧/١٢

میدیا گیان خۆشەویستی و سڵاوم، چاوە جوانەکانت ماچ ئەکەم و بە هیوای شادی و بەختەوەریتانم بۆ وا مەیلت لاناون و لیمان ناپرسیت، خۆتۆ جاران بەوەفا بوویت، ئێمە بەردەوام مەیلمان هەر ماوە و لەگەڵ کلوو بەفرەکانی ئەمساڵدا وامان هەست دەکرد، کیژێکی دەریایی ئەسمەریش دەگات و لەپەنجەرە داخراوەکەمان دەدات و یەکەمجار خۆی بە ژوورەکەی من دا دەکات، کەچی هەر نەهاتی! بۆ نەهاتی؟ "عادل مراد" وتی دیومە و بڕیار بووە نامەتان بۆ بنووسێت کەچی دیار نەماوە، ئێمە لێرە بووینەتە مەحکومی حەپسی ئینفرادی و بێجگە لە سلێمانی هەنگاو بۆ جێی تر نانێن. ویستمان هەموو کوردستان بدەینەیەک کەچی ناو لەپێکمان بۆ مایەوە. دیارە بە درێژایی مێژوو ئەمە چارەنووسی کوردی بووە و هەر لە ئێمەش دا ناوەستێت.

چی دەکەن و لەگەڵ شانۆدا لە چیدان؟ شێرکۆ [بێکەس] لە نامەیەکی دا دەڵێت دوو نامەی بۆ ناردوون و جوابتان نەبووەوە، هەواڵی نمایشی دەربەندی پەپوولەی پرسی بوو. اسماعیل هەور امیش حەزدەکات هادی[ مەهدی] شانۆگەرییەکانی خۆی بنێرێت تا لێرە نمایشی بکات. شێرزاد حەسەن گەیشتە فلندا.

من بە تەنیا ماومەتەوە و بێتاقەتم، بە تایبەت کە لەم ڕۆژانەدا برا ئەسمەرەکەشت سەفەری کردووە و نازانین گەیشتۆتە کوێ.ئێستا من سەرۆکی

(بنکەی ئەدەبی   رووناکبیری گەلاوێژ)م کە ڕێکخراوە دیموکراتیەکان سەرپەرشتی دەکات، هیچ دەزگا و دوکانێک نەماوە حیزب دەستی بەسەردا نەگرێت، منیان زۆر بە تەکلیف برد ئەگینا حەزم لیی نەبوو، بەڵام چالاکی زۆرە و گۆڤاری گەلاوێژی نوێ دەردەکەین، ڕەنگە دیبێتت. هەروەها لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری -ئێستا- دام کە سێ ژمارەی لێ دەرچووە و هیوادارم چیرۆکەکانی منت تیاخوێندبێتەوە، ئەگەر ناگات بە کاک دانا بڵێ با ئیشتراک بکات. ئەم ژمارەیە مۆنۆدرامایەکی منی تیابوو بە ناوی دۆزەخ- هادی لە چی دایە، بیری دەکەم، زۆریش، هادی لە هونەرمەندە چاکەکانە و هیوادارم لەوێ خۆی چەسپاندبێت، ئەی هیوا چۆنە، گەورە بووە، منداڵی کۆلانە یان خەریکی مۆسیقا و شانۆ و ئارەزوداره، وا دوو پاشکۆم بۆ ناردیت موناقەشەیە لەسەر شانۆ، ژنەکان و کامەران رەوف دەستیان داوەتە قژی یەکتر، کامەرانیش لەم ڕۆژانەیا دەچێتە دەرێ. ئێوە بۆ نارۆن؟ وتیان دەتەوێت بخوێنیت، پێم خۆشە. چیمەن زۆرت لێ دەپرسێت هەروەها گەزیزە و چەند جارێک دەیوت نامەی بۆ دەنووسم.

هەوار بووە بە داسک و دەرزی، ئەمیبا و حومەیمالطای گرتووە. وابزانم هەندێک کەس یارمەتیان بۆ ناردوون بۆ چونە دەرەوەتان حەزەکەم بزانم کێن؟ بە جیهاز هەواڵم پرسیوون مەریوان جوابی دابووەوە، سڵاوم بۆ خۆی و ژنەکەی و بۆ کاک دانا و هۆشەنگ و هەموو سڵاویان هەیە. نەنکت هەر ماوە و ڕبەیەک دەخوات. کەمال سابیر مرد و ڕەنگە اعتراف لەسەر هەندێ هونەرمەندی تریش بکات، چاوەڕێ بن. ئەو چیرۆکانەی بۆم ناردن نازانم بڵاوکراونەتەوە یان نا؟ ڕۆژنامەی آفاق ثقافیە هۆشەنگ چەند ژمارەیەکی بۆ ناردبووین بڵی با بەردەوام بێت. کتێبتان چی لایە؟ گیانم بە شێرکۆ (بێکەس) یە هەم کتێب و هەم دۆلارم بۆ دەنێرێت.

خۆشیتان

کاکت

ڕەووف بێگەرد ١٩٩٧/٧/١٢

ژیان ساڵح، نیگار حەسیب قەرەداغی، میدیا ڕەئوف بێگەرد
دڵسۆز، هەڵاڵە

**نه مەسیح دەبووە کوڕی خوا و، نە یەهودا خەجالەت دەبوو!**

نامەی ڕەووف بێگەرد بۆ میدیا بێگەرد

ئەگەر لە دەریا دوورەکانەوە

گەڕایتەوە بۆ دوورەگەکەی تەنیایی من

سەعات و قوتب نمکان

لەبەر پێکانتا دەشکێنم.[1]

میدیا گیان.. لەم ڕۆژانەدا زۆر پەستم، تا سنووری نائومێدی و لە پاپۆڕەوانێکی کەشتی شکاو دەچم و ئەستێرەکانی نادۆزمەوە، خەمیک تا سەر ئێسک ئەوکی گرتووم، هەستیش دەکەم کە تامێکی خۆشی هەیە، تامێک تەنیا تەنیایی پێم دەچێژێت و خەڵوەت گەری. تووڕەم لە دەنگ، تووڕەم لە هەموو دەوروبەرم، لە وانەی دەمناسن و نایان ناسم، لەوانەی خۆشەویستیەکانیان دووڕوویی و گۆرانییەکانیان فریودانە، نە ڕۆژێک چرایەک بە دەستەوە دەگرن و نە پەنجەرەیەک لە یەکێک دەکەنەوە.

نازانم بۆ؟ بەلام وا هەست دەکەم هەموو خواکان مردوون، هەموو پەیامەکان درۆن، هەمو فریشتەکانیش بێجگە لە شەیتانێکی دەمامەک کراو چی تر نین، ئەگینا نە مەسیح دەبووە کوڕی خوا و نە یەهودا خەجالەت دەبوو! وەک زۆرباش دەڵێت خوا و شەیتان یەکن و ..بە راستی کارەکانیشیان تێکەڵە.

بە هەرحاڵ لەگەڵ ئەو نائومێدییەشدا کە زۆر جار چنگێکی پێکەنینی پێ یە، وا بنتەکانم بۆ ناردیت، خوێنی خۆرهەلاتی، دۆزەخ، گۆڤارێک گشتێکی لەسەر نصوص فنیە تیایە. هەموو وەخت ئەنجام بێ خودەییەکە مرۆڤ ئاسوودە دەکات، مرۆڤی وەک ئیمەی بۆش، بێ ئایندە و خەونی گەورە، خۆشە هەموو

---

[1] شیعرەکە لە سەر پۆسکارتەکە و بە زمانی فارسی نووسراوە، شیعری کیومەرسی مونشی زادەیە

دنیات لا هیچ بێت و بیشتەوێت خەلقی تیا بکەیت! ئەمە کاری گەلۆرانەی ئێمەی نابووتە، ئیمەی خۆرهەلاتی و ئیسلام و کورد و خەڵکی سلێمانی و بە تایبەتی گەڕەکی چوارباخ.

میدە گیان.. خۆم بێ تاقەتم، هیچ نی یە، بێزارم، چەند رۆژێکە و بەرم دەدات، تاقەتی سلاو و ڕێزیشم نیە.

کاکت

رەووف بێگەرد

٢٠٠٠/٧/١٧

**یەکێتی نووسەران جەنازەیەکە، کە ئیتر ناتوانین هەڵی بگرین!**

نامەی ڕەووف بێگەرد بۆ هادی مەهدی

بۆ برای ئازیزم هادی..

سڵاوێکی جوان.. لەگەڵ هیوای سەلامەتی و تەندروستیتان، وە کۆنترۆڵکردنی ئەو هەڵچوونە سۆزییەی کە سیاسەت ئەتانگەیەنێت پێی..

نامەکەت و نامەکەی میدیا[بێگەرد] و وێنەکانم پێ گەیشت سوپاس. زۆر بیرمان لاتان بوو، نامەکان دڵنیاییان پێبەخشین ئێمە باشین سوپاس بۆ خوا. ئەم چەند مانگە پڕ بوو لە کارەسات، ناخۆشی و مردن و کارەساتی جیابوونەوە و جێهێشتن لە ترس و ناخۆشی دا دەژیاین، چاوەڕێی مەرگ بووین زیاتر لەوەی لە سەردەمی بەعس دا چاوەڕێی بووین، سیاسەتی کوردی ئەو خزمەتەی پێکردووین و ترسیکی دوو لایەنەی پێ بەخشیوین، ئەگەر مەرگ پێشتر مەرگی نیشتمانی و لە پێناوی وڵاتدا بوو ئێستا چ مانایەکی پێدەدرێت؟ وە ئێمە لە ژێر سێبەری حکومەتی کوردی و ئازادی و دیموکراتییەکە داین! ئای لەم کەشە نەفرەتییە، بە سەدەها بریندار و هەزارها مردوو هەن و ئیمەیش بە دەستبەتاڵی گەڕاینەوە، سیاسەتمان لە خۆمان داکەند ئەو بەرگە گەوجییە باشە بۆ ئەوەی کە تەمەرود ئەکات لە سوڵتانیی و سوڵتانی وڵات و خەلک و پرۆلیتاریا و.. و... جگە لە سوڵتانی عەقڵ و مەعریفەت. ئەو کەسەی لە سیاسەتدا کار ئەکات "بە لایەنی کەمەوە" نیوەی ئەخلاقی دەڕوات. کەسی سیاسی ئەگەڕێت بۆ شوێنێک بۆ مەڕە فەقیرەکانی ئەو سەرەی کە هیچ هێز و دەسەڵاتێکیان نییە. چاوەڕێی نانێکی هەرزانن.

بیرتە ئەوەی دەیەها جار دووبارەم ئەکردەوە، کە ئەگەر کورد نەبووایەم گرنگیم بە سیاسەت نەدەدا بەڵام لەگەڵ ڕقی زۆرم بۆی مەجبورر بووم چونکە خەڵکەکەم پرۆژەی مەرگی پێش وەختی بوو، بۆیە یان ئەبوو خۆم بە دەستەوە بدەم یان ڕوو بکەمە سیاسەت، وە من هەتاکو ئێستاش بڕیارم نەداوە خۆم بە دەستەوە بدەم مەگەر لەبەر دەم حەق دا. بیریشت نەچێت کە سیاسەتی کوردی

شەریفەکانی سوتاند پێش ئەوەی خراپەکان دیاری بکات. دەزانی چەند کەسمان بووین بە تەڵەی هاوڕێ و دۆستانمانەوە! چەند شۆڕشگێڕ زۆری لێ کرا تا گۆڕی خۆی بە دەستی خۆی هەڵبکەنێ. وە دوایش بڵاویان دەکردەوە کە بە سکچوون گیانی لە دەست داوە. هەورەکو ئاستیوراس دەڵێ: برام، لە سیاسەت تورە مەبە بە تایبەتی لە کۆمەڵگای رۆژهەلاتی د اچاوەڕێی چی ئەکەیت لە کەسانێک سەدام و خلمالی حوکمی کردین؟ ئەوانە جرجن، وە بیریشت نەچێ ئەو جیهانەی ئێمە دەمانەوێت درووست نابێت.

بە بیری من مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە هەوڵی بۆ ئامانجی مرۆیی داوە و بە دەستی نەهێناوە. جیهانی ئێمە و سیاسەییەکان جیاوازە تا ئاستی ڕق. خاوەن ئایدۆلۆجیا رێگای خۆیانیان هەیە و و خاوەن مەعریفەکان ریگای تر.

من دەخوێنمەوە، خوێندنەوەکانم خراپ نین.

دەنووسم، جارێکیان "عەبدولوەهاب تاڵەبانی" لە بەغداد پێی وتم: کاتیک کارەکانم هەڵدەسەنگێنیت عەدەسەیەک بۆ عەدەسەکانی زیاد دەکات تاکو هیچ وشەیەکی لێ نەپەڕێت. چونکە وەک وتی دڵنیانییە لێم، دەترسم ئەو نادڵنیاییە بگوازریتەوە بۆ نووسینەکانیشم، بە دەرەک، با پەنا لە کەرێتی بگرین تا واز لە نووسینیش بهێنین.

چی دەربارەی شانۆ و جوڵەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری هەیە لەوێ؟ ئێمە لە بۆشایی دا دەژین، زۆر کەم کتێبمان پێدەگات، یەکێتی نووسەران جەنازەیەکە کە ئیتر ناتوانین هەڵی بگرین. نووسینی کوردی خۆی لە پشت لاسایی و کلاسیکەوە حەشار دراوە چی بکەین هادی؟ مانگی پێنج میهرەجانی پەیمانگایە: کێ دەنووسێ، کێ دەخوێنێتەوە! گۆڤاری "مواقف" گۆڤاریکی باشە کەژاڵ هەندێ نوسخەی دەست خستم، سوپاس بۆ ئەو نوسخەیەش کە بۆت ناردم. ئەگەر توانیت چیت دەست کەوت بۆم بنێرە لە کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە، هەر وەرەقەیەک نووسینی لەسەر بێت، بە تایبەتی هی باش، نووسینەکانی (هادی عەلەوی، ئیدوارد سەعید، محەمەد ئاراگۆن، جەلال عەزیم، فالح عەبدولجەبار،

فوئاد خوری) یان هەر شتێکی تر خۆت هەڵیبژێری، میدیا چی دەکات! بووە بە بەخێوکەرێکی باش و پاککەرەوەیەکی گونجا بۆ شتن لە ماڵەوە؟ ئەی چی دەبارەی شانۆ! من خۆشم ناوێ تەنها لەبەر ئەوەی کە کچمە، بەڵکو هونەرەکەیشم خۆشەوێ. با لە ڕێگەی هونەرەکەیدا تەوازونی هەبێت. ماچی ئەکەم هەموو شتێکیم بیرە دایمە "منداڵی، شەرمەکانی، تواناکانی، هاوڕێیەتی لەگەڵما" ئەو هاوڕێمە بە هەموو ماناکانی وشە.

لە میهرەجانی شانۆ لە سلێمانی حسێن میسری خەڵاتی دەرهێنەری یەکەمی بە دەستهێنا، لە شانۆی(الدراويش يبحثون عن الحيقة)[1] و ئەمین حسێن خەڵاتی ئەکتەری لە هەمان شانۆیی دا پێ بەخشرا، وە لە نێوان هونەرمەندان دا (سێوە، ڕووبار، ڕێزان، شۆڕش) دەرکەوتون لە شانۆیی (رأس مملوک جابر)[2] کە کامەران ڕەوف دەریهێنابوو.

منداڵان هەواڵتان دەپرسن، بیر لە هیوا دەکەنەوە بە تایبەتی دەموچاوی زۆر لە میدیا دەچێت. دایکم نەخۆشە، ناتوانێ لە جێگادا هەستێت. ماڵەکەمان فرۆشت و دەچینە خۆرئاوا – ماڵەکەی سەرچنار- بۆ سەردانمان ناکەن لە پشووی نیوەی ساڵدا کە لە سەرەتای مانگی دوو دایە؟

وتت کە دەچیت بۆ بەغداد من بیرت دەخەوە کە ناشرینی دەموچاوی جرج جوانترە لە سیمای سەدام حسین، ئەو بوونەوەرە ناشرینە کە هەتا بەزەیی بە ئەسپیشدا نایاتەوە دەڵێن دەیکوژێ وا نییە؟ کۆمەڵە چیرۆکەکەی مارکیز "١٢ چیرۆکی هەڵبژاردەی کورت" زۆر سودیان پێ گەیاندم. وە لە کوردستانی نوێ دامبەزاند، بە تایبەتی چیرۆکی (کۆلۆنێلی لابراو) و (پاشماوەی خوێن لەسەر بەفر). من بە خوێندنەوە تازە ئەبمەوە و بە تەمانیم تەرکی بکەم. ئەگەر ئەو بەردەوامییەم نەمێنێ و ئەو فەزا ڕۆحییەم تازە نەبێتەوە بە دڵنیاییەوە دەمرم.

---

[1] بڕوانە: مستەفا حەلاج، دەروێشەکان بە دوای ڕاستی دا ئەگەڕێن، و.مەحمود مەلا عززەت، بەڕێوەبەریتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپی دووەم، ٢٠٠٠.

[2] سعد الله ونوس، مغامرة رأس المملوک جابر، منتدى حديث المطابع.

عەباس بەدری بووە بە سەرپەرشتی ئێسگەکە -بەشی کوردی وعەرەبی- هێشتاش بەڕێوەبەری ڕێکخراوی کۆمەڵەی چەمخوازانی کوردم، زۆر بە باشی بەڕێوەی دەبم (چەم) زاراوەیەکە بۆ بانگەشەی سەرخۆشی، تۆ دەزانی تێچوونی خواردنەوە زۆر گران بووە، بەلآم بەهۆی هاوڕێ سودمەند و بەپرسانەوە تەنها لەبەر باری ئەدەبی و هەندێ بۆچوونی منیان خۆشەوێ (چەم) دەبارێ بەسەرما. چ جۆرە خواردنەوەیەک باشترینە لای ئێوە؟ کتێبەکان و گۆڤارەکەت بیرنەچێت، گۆڤاری -شرق الاوسط-ی لەندەنی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ هەندێ نووسەر دا تیایە. کە تیایاندا وێنەی من و هەندێ لە قسەکانمی تێدایە. شێرزاد[حەسەن] هەواڵتان دەپرسێ، سلآوم بۆ مەریوان و ژنەکەی. چ جیاوازییەک لە نێوان دیمەشق و سلێمانی دا هەیە، دانیشتوانی نەبێ؟

سلآو و ماچم و هیوام بۆ ژیانێکی خۆش و پڕ لە داهێنان، و سوپاس[1]

ڕەووف بێگەرد

١٩٩٢/١/١٩

[1] ئەم نامەیە بە زمانی عەرەبی نووسراوە.

**ئەوەی بۆمان ماوەتەوە چەمە...**

نامەی ڕەووف بێگەرد بۆ هادی مەهدی

ئەزیزم هادی..

سڵاو و ڕێزم، ئێمە تامەزرۆی هەواڵ و بینینتانین، چی ئەکەن لە وڵاتی غەریبیدا؟ هەر چەند هەموو هەر نامۆین، تەنیاین، وە بۆشاییەکی گەورە باڵی بەسەر کونیلەی ڕۆحمانا کێشاوە، بەجۆرێک نەتوانین رزگارمان بێ لێی. ئەوە قەدەری ئێمەیە، ئێمەی بوونەوەری جانەوەر کە مێژوو و سرووشت و شتە جوانەکان تێکیان داوین، ئەم بەشەرییەتەی کە دونیای پڕ کردووە لە ژاوەژاو بۆ ملیۆنەها ساڵە، هێشتاش کەرێتی لە دوای کەرێتی ئەنجام دەدەین، چی دەکەین ئێمە؟

کامۆ ڕاستی کرد کە (سیزیف)ی خولقاند، سیزیف لە ناو هەمووماندایە، لە ناو بێتاقەتی و هەڵسوکەوت و ئامانج و بێ سوودیماندایە، بێ سوودی هەروەکو چۆن کامۆ ئەڵێ: ئەوە ئەو شتە جوانەیە کە ئەبێ پەروەردەی بکەین لە خۆماندا. گەیشتوومەتە ئەو ڕاستییەی کە بەبێ داماوی ژیان نە دەبوو. چی بڵێم برام دەربارەی خۆم و وڵاتەکەم و براکانم، هەموو قوربانین، ئەم قادرە چی کرد بە دروستکردنی ئەم کەونە؟ لێپرسینەوەی بەرامبەر بە تاوانەکانی لێ دەکەین؟ یاخود ئەو لێپرسینەوە لە دەبەنگیمان دەکات؟ نازانم.. نا.. نا..

ئەدەب.. شانۆ.. ئەو شتە بێ سوودانە- کە ئێمە عاشقی بووین بێ سوودن.. تاوانمان کرد، بەڵام خۆشترین تاوانە و هەزارەها جار لە شەریفی سیاسەت شەریف ترە. چەند بەشەرەفە ئەو کەسەی یەکەمجار کتێبێکی دەربارەی مێژووی درووست بوون داناوە. بێ گومان بەبێ ئەو هاوڕێ ئەزیزە پێش چەند ساڵێک مردبووم.

گۆڤاری ناقد و جلەکانی هیوا گەیشتن، هیوا هەر لە ئێستاوە دەم پیسە.. جنێو دەدات و داوای لێبوردن دەکات. لێمان دەدات و دەڵێت "کاکە کیان". ئێمە وامان

لێکرد و ئێستاش ئەو هەقی خۆیەتی وابکاتەوە. مۆنۆدرامایەکم نووسیوە بە ناوی (دۆزەخ)ەوە، بڕیارە بەرپرسانی دائیرەی رۆشنبیری میهرەجانێک رێکبخەن لە مانگی "٢" دا تەنها بۆ مۆنۆدراما، بە دڵنیاییەوە ئەگەر سیاسییەکان حیزبە گەندەڵەکان مەیلیان لێبێت.

زۆر دەخوێنمەوە و کەم دەنووسم، نووسین سوودی چییە کاتێک لە ناو بۆگەناوی مێشکی مردووان و رۆحە خراپەکاندا بژیت! نووسەر و هونەرمەندەکان لە کوردستان هەوڵیان بۆ ئەوەیە بەرماوەی سیاسەییەکانیان بەربکەویت، ئیتر چییان بۆ ماوەتەوە؟ تەنانەت کتێبە بەنرخەکانیش لەسەر رەفەکان خەوتوون کەس نییە بە کەمترین نرخیش بیانکڕێت. ئەمە قەدەری کتێبە لە وڵاتی "گورگستان". ئەوەی بۆمان ماوەتەوە (چەم)ە من و عەلی کەریم و حسێن میسری و کاروان و رەووف ئەگەڕێین بۆ دوای چەما، هەرکەس زیاتر بهێنێ ئەوە بەرزتر دەبێتەوە لە حیزبەکەدا. وە تا ئێستاش من سەرۆک و ئەوان شوێنکەوتوومن.

هەموو هەواڵت دەپرسن، شێرزاد[حەسەن]یش. شێرکۆ[بێکەس] گەڕایەوە بۆ سوید و لە دوا نامەیدا دەڵێت: (گەشتم کردووە بۆ لەندەن و پاریس و هۆڵەندا و ئیتاڵیا، بە بێ ئەو گەشتانە نەدەژیام تا ئێستا) بە ئینگلیزی و ئەڵمانی چاپی بۆ کراوە و لەم ڕۆژانەدا لەگەڵ "بڵند حەیدەری" دا دەچێت بۆ قاهیرە تا وەکو مەلیک بژی، ئاریش لە ریزی پێشەوەی شەڕە لە هەولێر!! پێش مانگێک دەیویست بێت بۆ سوریا، داناش بەڵێنی داوە واسیتەی کاک نەوشیروانی بۆ بکات، وە بۆی هاتەوە بچێت بەڵام بەبێ ئیش ئەبوو چونکە لە پەیوەندیەکان کار نەبو بۆ ئەو بۆیە سەفەرەکەی قبوڵ نەکرد. شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی، ئیسکی وەتەنییەکان و بەشەرەفەکانی هەڵکۆڵیوە، بە ڕاستی ئێمە زۆر ماندووین، ئەم شەڕە خێڵەکییە هیچ سوودێکی بۆ کوردایەتیمان نییە.

کتێبم بۆ بنێره، تابیرم بچێتەوەو حیزبەکانیان و ئایدۆلۆجییەکانیان و کورد و "گۆڕستان"م بیربچێتەوە، چی تر ماوە جگە لە خۆم لێی بێزار بم و لێی هەڵیم؟ با دنیا بدۆڕێنم و خۆم ببەمەوە (سلاو لە مەسیح).

ماچ بۆ میدیای ئازیز، زۆر زۆر ئازیز.. سلاو بۆ بەرزان و بەختیار و هۆشەنگ وە بۆ هەموو حەقیرەکانی دنیا کە ژیان رەفزیان ئەکات و ئەوان هەر ئەژین.[1]

سلاو جاریکی تر

رەووف بیگەرد

١٩٩٥/٢/١

---

[1] ئەم نامەیە بە زمانی عەرەبی نووسراوە.

**ئەم کارەتە بچوکەش، بە تۆی خۆشەویست...**

نامەی ڕێبوار سەعید بۆ فەرهاد پیربال

فەرهاد گیان سلاو

ڕێز و خۆشەویستیم هەیە بۆت

براگیان گەلەک مەمنونی ئەو ئەرکانەتین کە زەحمەتێکی چاکت لە وەرگێرانی مادەکانی "باڵندە باران"[1]دا کێشاوە. وردە وردە سودمان لێ وەرگرتووە بۆ چەند جێگایەک هەڵبەتە ناوی جەنابیشت وەک وەرگێڕ هاتووە. جگە لەوە مادەیەکم نارد بۆ مامۆستای کورد لەگەڵ بەشیکی کامل واتە یەکێک لەو مادانەی وەرتگێڕابوو لەگەڵ چەند وێنەیەکدا نازانم بڵاودەبیتەوە یان نا.

هەرچەندە بۆ فەرهاد شاکەلیشم نوسی بو کە فەرهاد پیربال بۆ ئێمەی تەرجەمە کردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی چالاکییەکە جگە لە کوردی کە هیچی لەسەر نەنوسراوە بە زمانەکانی کە شتی لەسەر بڵاوبۆتەوە. فەرهاد گیان برادەران ڕێز و سلاویان بۆت هەیە.

ڕێز و سلاوم بۆ خەسرەوی برات هەیە

ئەم کارەتە بچوکەش بە تۆی خۆشەویست

پێشکەشە

Rebwar

12-11-95

لندن -

---

[1] پرۆژەی باڵندەباران، پرۆژەیەکی ریبوار سەعید بوو، کە لە ساڵی ١٩٩١دا دەستی پێکرد. ئەم پرۆژەیە ئاماژەیە بۆ کەوتنەخوارەوەی باڵندەکان، کە وەک باران لە ئاسمانەوە دەکەونە خوارێ لە ئەنجامی هێرشی کیمیایی کوشندە بۆ سەر کوردانی باشوور.

نامەی ڕێبوار سیوەیلی بۆ ئارامی کاکەی فەلاح

ئارامی ماسی و برای ڕۆحم

سڵاوێکی گەرم و خۆشی و بەختیاریتان بۆ دەخوازم .دەزانم ئەو کورە قۆزە زیرەکە دەبێتە میوانت، وە دەزانم ئیوە چەند شەوێکی خۆش بە ویسکی و نۆکاو خواردنەوە وئەبەنە سەر و منیش لێرە قونم لەژێر تاقیکردنەوەکانا دەردێ..بەڵام هەر حەیفم لێهات بەسەرتان نەکەمەوە، گوتم خوایە بەڵکو بەم بەسەرکردنەوەیە، تۆزێ قۆزتربیم کە ئیدی هێندە دڵم بەخۆم نەمێنێ..ئەمبەرتۆ ئیکۆ سڵاوتان لێدەکات و دەڵێ: ئەگەر دووقۆز لە دونیادا هەبن، ئەوە ئارام[کاکەی فەلاح] و مەریوانن[وریا قانع]..

نەوەی شاعیر و نەوەی شێخ ڕەزا

ڕێبوار

٩٤/٥/٩

**گوارەکانی بریتین لە، خالخالۆکە و کرم!**

نامەی ڕێبوار سیویلی بۆ ئەحمەدی مەلا

هاوڕێ و برام کاکە ئەحمەد گیان ٩٦/٨/١٦

سووپاسی زۆرم بۆ ناردنی (کتێبی شیعر)[١]، ئەو دەم کە بەرهەمەکە گەیشت چۆمان [هەردی]ی هاوسەرم لێرەبوو، بڕیارماندا بەدەنگی بەرز بۆ یەکتری بخوێنینەوە.. چەند ڕۆژێ بەوجۆرە بەردەوام بووین، ئەوجا چۆمان کەوتە ڕەنگ تێکەڵکردن و تابلۆکێشان، بۆ بەشی یەکەم: کچێ سێوێکی لەدەستە و جلێکی تەنکی لەبەردایە کە دەتوانی لێوەی لەشی بەدی بکەیت، لەسەر مەمکی چەپی پەپولەیەک نیشتۆتەوە و گوارەکانی بریتین لە خالخالۆکە و کرم.. کچەکە وادیارە لەسەر پشت ڕاکشاوە، بەڵام نەک لەسەر زەوی، بەڵکو لە فەزایەکی کراوە و قوڵدا، ڕەنگە وا هەست بکەی زەوی بەهەزاران، کیلۆمەتر کەوتۆتە ژێر کچەکەوە، بەڵام وا هەست دەکەی کە لەسەر شتێکە، لەسەر شتێک کە نایبینت، ڕووخساری پڕە لە خەون و لێوەکانی پڕن لە دەربڕینی گوناه..هەردوو چاوی داخستووە بەڵام دەزانی کە نەخەوتووە، بەڵکو دەڕوانێت.. لەچی دەڕوانێت؟ ڕەنگە لە خۆی و لە ڕووتی خۆی، لە جەستەی، لە سێوی گوناە و..هتد.. من پێم وایە کتێبی شیعر کێشەیەکی زۆر گەورەی هەیە، وە پێشموایە ئەمە کێشەی ئەحمەدی مەلاشە: دەرچوونی بەردەوام لەو شتەی کە ناوی شیعری پەسەندکراوی کوردییە.. یاخی بوون لە خەیاڵی خوێنەر و نەهێنانەدی چاوەڕوانیەکانی.. شاعیرێ کە ئەم کێشەیەی هەبێ هەمیشە تەنیاش دەمینێتەوە و زۆریشی پێدەچێ تا بە جدی وەردەگیرێ و بە جدی ئاوڕی لێدەدرێتەوە. موشکیلەی تۆ ئەوەیە کە ئەوەی شاعیرانی بڕواپێکراوی ئێمە دەیکەن تۆ نەتکردووە، ئەوان بەردەوام لە جیابوونەوە و شکاندنی سنوورەکانی نووسین و خوێنەر دەترسن، بۆیە هەرگیز تەنیا نین، دەنووسن، چاپدەکەن و دەشخوێندرێنەوە، تۆ دەنووسیت بەڵام جیاوازی دەبێتە سنوورێ کە ڕێگەی

---

[١] ئەحمەدی مەلا، کتێبی شیعر، پاریس، ئاپکف، ١٩٩٦.

چاپکردنی خێرا و خوێندنەوەی بەردەوام و بڵاوبوونەوەی بەرفراوانت لێ دەگرێ.. ئەوان هەمیشە لەسەر ئەو لقانە دەنیشنەوە کە دڵنیان ناشکێن و ناکەونە خوار، تۆ ناتەوێ بنیشیتەوە و بەردەوام دەفڕیت، جاری وا هەیە هێندە دوور هێندە دوور دەفریت، کە لەو سەرەوە دێیتەوە زمانێکی ترت پێیە و فەنتازیایەکی تر.. من بەشی یەکەم لە زۆربەی بەشەکانی تری "کتێبی شیعر" لەم چوارچێوەیەدا دەبینم. وە دڵنیام ئەم کتێبە لە گۆڕینی زەوقی شعریم دا بێکاریگەر نابێ و لە شوێنی خۆیشیدا پێویستە قسەی لە بارەوە بکرێ..بەڵێ هاوڕێ تەنیاییەکان ئاسان نایەنە دەست، جورئەتی بوون بە ئەستێرەی دەوێ کە لە شەوی ئەنگوستە چاودا خۆی لە تاقی ئاسمان قاییم کا.. کتێبی شیعر جێهێشتنێکە بەرەو قوڵی بەرەو ڕەهەندەکانی جوانی کچێکە بە هەموو گوناهەکانیەوە، سێوێکی بە دەستەوەیە و خەون دەبینێ.

ڕێبوار

**ئەی هاوار ئەوانە چ دەکەن و**

**بۆچی ناخوێننەوە؟**

نامەی ڕێبوار سیوەیلی بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

١٩٩٥/١٠/١٦

برای خۆشەویستم کاکە ئەنوەر

سڵاوی گەرم و ڕێز و خۆشەویستی... لە کوردستان بووم و زۆریش نیە گەڕاومەتەوە و ئێستاس سەخت سەرقاڵی خوێندن و قەرز دانەوەم. گوتم با بە پەلە چەند دێڕێکت بۆ بنووسم تا نەڵێ ی ئەم برادەرە لە بیری کردین!

نا.. لە بیرم نەکردویت، دەشێت جاروبار یەکتر بەسەر بکەینەوە...

براکەم من ئەدرەسی تۆم داوە بە (یەکگرتن)[1] بۆ ئەوەی ژمارەیەک یان چەند دانەیەکت بۆ بنێرن، بەڵام دەزانم کە پارەیان نیە! بۆیە پێشنیار دەکەم کە ئەو برادەرانەی دەیانەوێ نووسخەیان بە دەست بگا با یەکی سەد کرۆنی دانیمارک بنێرن بۆیان، تا هەمووی بە جارێ ڕەوانە بکرێ.. ئەمە تەنیا پێشنیارە و هیچی تر.. ئەرێ بە ڕاست ناکرێ چەند نووسخە هەر بە زۆر بەو کوردانە بفرۆشرێ!

ئەی هاوار ئەوانە چ دەکەن و بۆچی ناخوێننەوە و پارەیان بۆ هەموو شتێ هەیە و بۆ گۆڤار و کتێبی کوردی نیانە..؟

هیوادارم لە شیعر نووسین بەردەوام بیت و سەرکەوتو بیت.. سڵاوم دووبارە دەکەمەوە.

ڕێبوار سیوەیلی

---

[1] گۆڤاری یەککرتن، گۆڤارێک بوو هەڵکەوت عەبدوڵا و هەندێ لە هاوڕێیانی بڵاویان دەکردەوە. ڕێبوار سیوەیلی لە ژمارە شەشەوە هاوکاری دەکردن.

**تەنانەت ئەخەوان سالس، زۆر کەیفی پێدێ!**

نامەی ڕێبوار سیوەیلی بۆ ڕەفیق سابیر

مامۆستای هێژا ڕەفیق.. دەستت دەگوشم.

لەم کاتی نەخۆشی و کەنەفتی یەکەمدا، نامەکەتان گەشاندمیەوە. ڕەنگبێ هەر ئەو خۆشحاڵیەشم ئاوا هەراسانم بکات تاوەکو، بێ گوێدانە سەر- ئێشاندنی ئێوە لێرەدا درێژەی پێبدەم؛ ئاخۆ خۆت دەزانی لێرە مرۆڤ دەمی بۆنێ دەکا تا "کەسێکی" لێ پەیدادەبێت و دوو دەردە دڵیانی لەگەڵ دەکات، دوو ڕاز درکاندن، دوو پێکەنین.. بەداخەوە برایانی ئاوارەی کورد لێرە هێندە بەپێر مەسەلەی جیدییەوە ناچن و خۆیان ماندوو ناکەن، ئەم وەزعەش کەسانێکی دی، نەک هەر بێ تاقەت دەکات، بەڵکو تەنیایی یەکەشیان دەبێتە دوو تەنیایی، دوو غوبەت.. هتد.

ڕاستیەکەی لە پێش ئەم نامەیەدا، نامیلکەی "دەنگی پێ ی ئاو"[1]م ناردە خزمەتت، دیارە بەهۆی برادەرێکەوە کە لەوێ دەژی "خالید ئەحمەد". بەڵام لەوەدەچێ هێشتا بە دەستت نەگەیشتبێ، داخی گرانیشم من نووسخەی دیکەم نەماوە تا لەگەڵ ئەم نامەیەدا بۆتانی ڕەوانە بکەم. بەڵام دڵی خۆم بەوە خۆشکردبوو کە بتوانم بەدیداری بەڕێزتان و کاک ئەنوەر و کاک شێرکۆ و برایانی دی بگەم، دیارە بارودۆخی ئەوێ و نەشارەزایی من ئەم خەونەی نەهێنامەدی. لەگەڵ ئەوەشدا خواکاری کاک حەمەسعید ڕاست کا کە لەوێدا بەڕێزتانی ناوبرد، دەنامنیش تۆم نەدەناسیەوە! بەڵێ ڕاستە، من ڕاسپاردەی چەند شیعرێکم دابوو بە کاک حەمە سەعید، دەمووویست خۆتان بڕیاریان لەسەربدەن. ئەو شیعرانەم تەرجوومەی فارسی دەکردن و .. بەڵام پاشان خۆم کەوتمە هەڵبژاردن و چەند

---

[1] ئەمە یەکەم وەرگێڕانی ئەم دەقەیە بۆ کوردی، کە بورهان ئەییووبی پێداچۆتەوە: سوهراب سپێهری، دەنگی پێی ئاو، و. ڕێبوار سیوەیلی، ١٩٨٩

شیعرێکم لە دیوانی سووتان لەبەر باراندا "هەڵبژاردن و تەرجەمەم کردن "کۆپی تەرجەمەکان لەگەڵ ئەم نامەیە دا بە دەستان دەگەن".

لە هەڵبژاردنی ئەم شیعرانەدا، ویستوومە ئەو خاڵە لەبەرچاو بگرم کە ئەمڕۆ شیعری فارسی خۆی لە کوێدایە و بەرەو کوێ هەڵدەزنێ؟ ئەو کەرەسە شیعریەی شاعیری فارسی زیاتر پشتی پێدە بەستێ چیە؟ ئەو جا من هاتووم ئا لەم خاڵەوە شیعرە کوردیەکانم هەڵبژاردون "هەمووی، لە گۆرانەوە - تا وەچەی ئاوارە، نزیکەی ٤٥ شیعر دەبن"[1]، بۆ ئەوەی هەم، شوێنی شیعری کوردی لە بەرامبەر دراوسێکانیدا پیشان بدرێ و هەم ئەندێشە و جەغدی شاعیری کوردیش لەسەر لایەنە شیعریەکان بێتە ڕوو: بە دەگمەن سووریالیزمی "وەرزی خۆڵ"[2] لە شیعری نوێ ی فارسیدا بەرچاودەکەوێ، مەگەر تەنیا لەلای سوهرابی سوپەهری و کۆنتریش لەلای "بێدڵ". تەماشاکە چ حەشاماتێکە:

---

[1] ئەم شیعرە کوردیان لە کۆمەڵەیەکدا بڵاوکراونەتەوە بەناوی (درامدی بر شعر معاصر کردی) در عراق. ١٩٩٠، دانمارک، انجمن ایرانیان دانمارک. کە بریتییە لە دەقی ١٨ شاعیری کورد لە "گۆران"ەوە تا شاعیرانی گەنجی هەشتاکان..

[2] وەرزی خۆڵ ناوی دەقێکی ڕەفیق سابیرە.

"خوب، امشب به دیدارت نمی آییم!

روی موجی می خوابم

جادەی سرما و تنهایی را خانه می سازم

..... روحم امشب کناری است خلوت شده..

پشت مدار زمان

فصل گردرا خانه می سازم.."[1]

ئەم ئەو نمونەی شیعرەیە کە خوێنەری ئێرانی تینوێتی دەشکێنێ، جا تەماشاکە ئەدەبی بەراوردکاری چەندە ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕێ.

بەڵێ، مامۆستا گیان: من شیعرەکانم تەرجەمەکردن و "بەهەموو کەم و کورپیەکەوە" ڕەوانەی ئێرانم کردن بۆ گۆڤاری "دنیای سخن"[1]. هەر ئەوانیش

---

[1] ئەم شیعرەی "وەرزی خۆڵ" بە کوردی :

باشە ئەمشەو نایەمە لات!

لەنێو شەپۆلێکدا دەنووم

شۆستەی سەرما و

تەنیایی دەکەم بە ولات.

ئەمشەو ڕۆحم کەنارێکی چۆل کراوە

باران روخساری مردوویە،

گەردوون تەمە و

شەپۆلی دەریاش نیازم.

وا ئەمشەویش نایەمە لات

لە پشت مەداری کاتەوە

وەرزی خۆڵ دەکەم بە ولات.

پەلەیان لێدەکردم، شایانی باسە لەگەل تێکستەکاندا وتارێکیشم بە نێونیشانی "شیعری هاوچەرخی کورد لە عێراق – پێشگوتنێک" نووسی، لەوێدا زۆرم سوود لە باسەکەی کاک ئەنوەر قادر وەرگرتووە و ئیشارەیشم بە دوورودرێژی بۆ گرنگی ئەو باسەکردووە، بە کورتیەکەی نزیک بە ٥٠ لاپەڕەی دەستنوسم بۆ ناردوون و ئێستاش وا چاوەڕێم بلاویان بکەنەوە.

حەزدەکەم منیش هێمایەک بەو وتارە بکەم، کە لە گۆڤاری ئێوەدا بلاوکرایەوە: "ئەزموونی شەوبێداری ئەخەوان". ڕاستەیەکەی من هەواڵی مردنی ئەو شاعیرە زۆری کارتێکردم، هەر ئەوەش بووە هەوێنی ئەو باسە. کەچی دوای چوار مانگ، گفتوگۆیەکم لەگەڵ ئەخەواندا خوێندەوە.. پاشانیش ئەم مەسەلەیەم بۆ نووسەرێکی ئێرانی نووسی، ئەویش ئەخەوان ئاگادار دەکاتەوە.. بە هەرحاڵ ئێستا لە ئێرانەوە بە گەرمی داوای تەرجەمەی ئەو وتارە دەکەن... تەنانەت "ئەخەوان ثالث"[٢] زۆر کەیفی پێدێ!

ئێستاش دەنووسم و تەرجەمەدەکەم. وتارێکم لەسەر گۆڤارە کوردیەکانی دەرەوەی وڵات نووسیوە، دیارە گۆڤارە سەربەخۆکان دەڵێم... لەوێدا ڕوو بەڕووی کێشەی زمان بوومەتەوە: بۆ نمونە دەکرێ لە بەرامبەری "خبیر"ی عەرەبیدا، بە کوردی "خەبیرکار" لەسەر ئاهەنگی، جوتیار، کاسبکارو چێوار.. هتد دابنرێت؟ تکایە خەبیر موورادیفی ڕەقیب – بە یان نەء؟

لەمێژە بیر لە پرۆژەی نووسینێک دەکەمەوە کە بتوانم زیاتر جەغد لەسەر زمانی ئەم بەرهەمانەی دواییتان بکەم، زمان وەک ئاهەنگ و سەمای ڕۆحێکی سەرگەردان و دڵێکی پڕ. دەمەوێ ئەم باسە جۆرێک بەراوردبێت لە نێوان دیوانی "شمس تبریز"ی مەولانا و چەند بەرهەمێکی ئەم دوایی یەی ڕەفیق سابیر..

---

[١] دنیای سخن: گۆڤارێکی ئەدەبیی بوو لە ساڵانی هەشتاکان و پاشتردا دەردەچوو لە ئێران، گرنگیان بە ئەدەبی بیانی و هاوچەرخ دەدا و نووسەرە هەرە باشەکانی ئەوسای ئێران تێیاندا دەنووسی.

[٢] لە بارەی ئەم نامەوە, بڕوانە پێشەکی.

دواجار حەزدەکەم خۆشەویستیمان پێ ببەخشم و

ماچتان دەکەم.

هیوادارم ماڵەوە لە نەخۆشی ڕزگاریان بۆبێت و بەختەوەربن.

ئەدریسەکەتان بە دڵنیایی یەوە

لە لای من دەپارێزرێ

براتان

ڕێبوار سیوەیلی

دانمارک ٩٠/٢/٢٨ RY

**شیعر هەستی ئینسانە، سەدای ڕۆحە!**

نامەی ڕێبوار سیویلی بۆ فەرهاد پیربال

شیرینەکەم کاکە فەرهاد..... ئەم کاتەت شاد

بەهۆی جێگۆڕکێ کردنمەوە لە جزیرەی سەرێ بۆ کوپنهاگن، وەلامی نامەی سێ یەمت دواکەوت. لەمێژبوو بیری سەفەرێکی سووریایش لەسەری دابووم، بەلام داخەکەم نەمتوانی.. جا ئەوانە گشتیان بەرەو جۆرە تەمبەلی یەکیان بردم.. بەهەر حال لێم ببورە، وەک چۆن ڕەنگە خوداش لە هەموو لایەکمان ببورێ..!

براکەم زۆر سووپاست دەکەم بۆ تێبینی و خوێندنەوەی شیعرەکانم دیارە لێرەدا هێما بۆ چەند خالێک دەکەم. زۆربەی لایەنەکانی دیش کە زۆر لێمەوە نزیکن، هەروا دەمیننەوە. دەزانی بۆ؟ چونکە هیدایەت گوتەنی ئەوە لەو دەردانەن کە مرۆڤ ناتوانێ باسیان بکات، بۆیە لە حالەتی تەنیایی و گۆشەنشینیدا بەردەبنە ڕۆح و وەک خۆرە لە ناوی دەبەن.

بۆ مەسەلەی سەرجەمی شیعرەکان، بەرهەمی سەرەتان.. بەرهەمی هەرزەکارێکی تەمەن ٢١ سالن، پێم وابێت لێرەوە مامەلەیان لەگەل بکرێ، جۆرێکی دی دەکەوێتەوە کاتی خۆی دوو مامۆستای رەخنە گوتبویان ئەوانەی لەو تەمەنەدا شیعریان لە چاپ داوە، هیچیان ئیحساسی فلانکەسیان نەبوە. کاکە فەرهاد ئەم تەمەنە، تەمەنی وەرگرتنە..تەمەنی کاریگەری بوونە بە کەسانی دی.. من بە نەنگی نازانم مرۆڤ لە شیعردا بچێتە ژێر کاریگەری شاعیری مەزن-ەوە. بۆ مەسەلەی ڕۆمانسیەت-یش، وای بە چاک دەزانم وەک قوتابخانەیەکی سەربەخۆ تەماشا بکرێ کە زادەی قۆناغیکی دیاری کراوە..نەک وەک ئەوەی فلانەکەس لەبەرئەوەی ڕۆمانسیستە ئیدی کەسی دی بۆی نیە بەلای رۆمانسیزمدا هەنگاوبنێ. قەیدی چیە با رۆمانسیزم ببێتە

مینبەری دەربڕینی هەستی هەموومان.

وەک شێوازیش دیسانەوە، دەبێ دوورتر بڕوانین.. چوارینەکان زۆربەیان و بگرە هەر هەموویان لەسەر وەزنی (لا حول ولا قوه الا باالله) نووسراون بەر لە خەیامیش ئەم وەزنە شیعرە هەبووە، بەڵام خەیام داهێنانی تێدا کرد. بەوەی کە ناوەرۆک و شێوازی وەک دوو رەگەزی گرنگ بەکارهێنا و "گۆرانی " هاتە ئاراوە.. کەواتە لە مەسەەی شێوازدا من لە ژێر کاریگەری "حەمە" دا نیم.. پێش حەمە عومەر [محەممەد عومەر عەسمان] خەیام، بابەتاهیرنادرپوور، فەروغزاد کاری خۆیان هەیە.. ئەوجا من کە دەڕوانمە دەوروبەری خۆیشم، ناتوانم لاقرتێ لە شیعرەکانی حەمە بکەم و لە ڕاستیدا بە جوانیان دەزانم.. هەڵبژاردنی چەند شێوازێکیش مانای سەرگەردانی شاعیر نیە، وا بزانم لەم بارەیەوە نمونەمان زۆرە..

لە ڕووی مەسەلە فیکریەکەیشەوە دوو قسەت بۆ دەکەم: شیعر ناتوانێت، مەقالەیەکی سیاسی بێت.. شیعر هەستی ئینسانە، سەدای ڕۆحە.. ڕۆحی تێکشکاوی مرۆڤ.. ئەو قسەیەتم زۆر بە دڵە کە فەرمووتە: "شاعیری نوێ دەبیت شتی نوێ پێبێت، شتی خۆی" خۆزگا هەموو رەخنەگرێک ئالیرەوە تەماشای شیعری کردبا.. واتە لە خاوەن شیعرەوە بۆ شیعرەکە و بە پێچەوانەوە.. نەک لە روانگەی کۆمەڵێک ئەدەواتی ڕەخنەیی یەوە و فلان وا دەڵێ و فیسار وای گوتووە... نەء.. کاک ئەحمەدی مەلا، ووتارێکی لەسەر شیعرەکانی ژمارە "٥"ی یەکگرتن ناردووە.. من ناتوانم هیچ لە قسە و تێبینییەکانی ئەو بەڕێزەوە فێر ببم، چونکە ئەو بەر لە هەموو شتێک لەسەر ئەو شیعرانە قسە ناکات! ڕەخنە لە شیعر یان سەرنجدانی هەر ئەوە نییە بڵێ ی روئیا + وێنەی شیعری= قەلافەتی شیعرەکە..

کاکە گیان، بەر لە ماوەیەک دەستم دایە تەرجەمەکردنی مەقالەکەی البرکامو - گواە آزادی- ئەگەر کرا بۆتی ڕەوانە دەکەم بۆ ئەوەی رای خۆتی لەسەر بڵێ ی. هەروەها نیازم وایە شتێکی کورت لەسەر عبدالخالق معروف – بەرزان عوسمان- سەمیر دهۆکی- محرم محەمەد ئەمین- بنووسم و باسی حوسێن مەروە و سەمیریش دەکەم.

رەفیق سابیر ئەوەتا لە سووریا.. شیعرەکەی من و تۆی زۆر بەدڵ بووە.

تەرجەمەی شیعرەکەی شاملوت چاکە، بەلام لەبری ئەوەی "بۆ ئەوەی نەکێشم ئازاری بە دوای قافیە عەودال بوونم"، بنوسی و بەلای منەوە بتنووسیبا "بۆ ئەوەی ئازاری بە دوای قافِیە عەودال بوون نەکێشم" جوانتر بوو. تۆ ئەگەر بەردەوام دەبیت لەسەر شاملۆ ئەوا کارێکی باشە، بەلام چەند شیعرێکی هەیە بەرای من زووتر تەرجەمە بکرێن باشترە..

ئەگەر ئەو تیپە شانۆیی یەی دانمارک، رازی بن، ئەوا حەز دەکەن شانۆنامەیەک دەربهێنم نامەوێت خوێندنی چەند ساڵەی پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە بۆتەیەکی تەسکدا بمێنێتەوە.. بۆیە ناچارم کارێک بکەم ئەمە لە کاتێکدا گومانم هەیە لەو تیپە و... بەر هەرحال من وەک برادەر پێشنیاریان پێدەکەم ئەگەر ڕازیبوون، بە خراپی نازانم.. ئیدی تۆ لەم بارەیەوە چیت هەیە.. بینووسە...

بە ئارامیت دەسپێرم

هەموو لایەک سلاویان هەیە..

برات ڕێبوار ٨٨/٦/٣

ئەدرەسی تازە لە پشتەوەیە

**لاچاوی کچانی پاریس ماچ بکە و**

**سلاوی منیان پێ بگەیەنە!**

نامەی ڕێبوار سیوەیلی بۆ فەرهاد پیربال

کاک فەرهادی خۆشەویستم

ماچ و سلاو

سلاو و ڕێزی زۆر گەرم و گوڕم بۆ کاک ئەحمەدی مەلاو کاک محسن و گشت برادەران.

نامەکەت خۆشحاڵی کردم. هەروەها ناردنی شیعرەکان؛ براکەم من لەگەڵ ئەم نامەیەدا سەرجەمی کارە فارسییەکەمت بۆ ڕەوانە دەکەم (نوسخەی یەکەم) ئەوجا لێرەدا چەند شتێکتان بۆ ڕوون دەکەمەوە چونکە زۆرم مەبەستە پێش ئەوەی ئەم بابەتە چاپ بکرێ گوێم لە ڕای ئێوە بێت. (بەلام تۆزێ خێرا!!) وەک لە پێشەکی باسەکەدا ڕونم کردۆتەوە تاقە سەرچاوەی من مەقالەکەی ئەنوەر قادر محمدە و سودی زۆرم لێ بینییوە و سەرجەم لە شێوە نوسین و دابەشکردنی باسەکەدا، (چەند حالەتێک نەبێت) خەتی ئەوم پەیڕەو کردووە. ئەلبەت تا خۆت دەزانی من سەرەتا دەمویست ئەم هەولەی من بە تەنیا تایبەت بێ بەو (تەوژمەی) کە دەشێ پێی بگوترێ (شیعری نوێی کوردی) بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە مەبەستمان لەم نوێیە چییە؟؟ بەلام ئەمە بە زمانی فارس و بۆ خوێنەری فارس زمان کارێکی بی مانا دەردەچێت ئاخر ئەوان چی لەسەر شیعری کلاسیکیمان دەزانن تا ئێمە پاروی نوێیان بەدەمدا بکەین...؟!

خالێکی تر ئەوەیە کە من لێرەدا نەمویستووە خۆم لە قەرەی ئەو مشت و مڕە بدەم کە لە ناوەوەی خۆماندا لەسەر شیعری کوردی هەیە (واتە ڕەت کردنەوەی گۆران و شێرکۆ و ڕوانگە و..) چونکی ئەوە شتێکە تایبەتە بە خۆمانەوە و خوێنەری فارسی زمان گوناهیکی لەوەدا نییە. خالێکی دیکە ئەوەیە کە من هیچ جۆرە شیکردنەوەیەکم بە ئەنجام نەگەیاندووە، واتە نەمگوتووە فلان شاعیر

لەبەر ئەم هۆیانە لاوازە و فلان لە قوللەدایە، ئەمەش وایکردووە مەقالەکە لە ئاستێکدا بوەستێت کە خوێنەر خۆی بڕیار بدات... بە نیسبەت هەڵبژاردنی شیعرەکانیشەوە هاتووم ئەو شیعرانە هەڵبژاردوون کە پێش هەموو شتێک خۆم لێیان تێدەگەم، دەتوانم بە زمانێکی ڕەوان تەرجەمەیان بکەم و هەروەها..

مەسەلەی ڕیز کردنی شاعیرەکان، تەنیا شتێکە دەبێت جەختی لەسەر بکرێت و منیش نازانم قوڕی کوێ بەسەرمدا بکەم؟! تکایە لێرەدا بە وردی تێبینی خۆتانم بۆ بنووسن. / ئەگەر دیقەت بدەی تەماشا دەکەین زیاتر ئەو شاعیرانەن کە بە ئاوارەیی ژیان بەسەر دەبەن، ئەمەش بەو هۆیەی کە بەرهەمی شاعیرانی ناوەوەم لەبەر دەستا نییە. ئەگەر چی هێمام بۆ ئەمە نەکردووە.

بە دڵ حەزم ئەکرد شیعری فەرەیدوون عبدول بەرزنجی تەرجەمە بکردایە.. بەلام...

خاڵێکی دی کە نەمتوانی جێگەی بکەمەوە، مەسەلەی کاک حەمە سەعید حەسەنە! ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک: یەکەم ئەو زیاتر وەک ڕەخنەگر ناسراوە نەک شاعیر، دووەم ئەو خۆی لە قۆناغی ڕوانگە نییە و نابێتەوە، سێ وەچەی ئاوارەش نییە و شیعرەکانیشی هەموو لە دەوروبەری ئەو لینینیەت و شتە باوانە دەسوڕێتەوە .. بە هەر حاڵ نەمزانی چی بکەم؟

تکایە جارێکی تریش دەیڵێمەوە پێویستم بە تێبینی ئێوە هەیە و هەرچی بە دڵتاندا هات بۆم بنوسن..

ئەوجا با بێمە سەر چەند خاڵێکی دی:

١. وەڵامی نامەکانم خێرا بدەنەوە مەگەر نازانی چاوەڕوانی دایکی پیاو.....؟!

٢. بە نیسبەت ئەو تێبینیانەت لەسەر سپهری کە دەتەوێ بۆخۆمیان بنوسی و هەر بۆخۆشمیان ڕەوانە بکەی، چاوەکەم پێویست بەوە ناکات.. چونکە منیش دەیاننێرم بۆ لایەک تا بڵاویان بکەنەوە... تەنیا حەز دەکەم دوبارەی بکەمەوە کە

من ئەو شعرەم لەبەر ڕۆشنایی چەند کتێبێکدا وەرگێڕاوە.. کە لە نامیلکەکەدا ناوم بردوون.

٣. گۆڤارە فارسییەکە بە جدیی کاری تێدا دەکرێ و لەوەیە بەم زوانە دەربچێ! بەهەر حاڵ دەبێ یارمەتییان بدەن.

٤. چاوەکەم من وتاری خۆرهەلاتی..... م بۆ ئەوە ناردبوو کە لە ژمارەی تایبەتدا بلاوبکرێتەوە (تایبەت بە شیعر) جا نازانم ئەوە ژمارە ١٠ یاخود یانزە؟!

٥. ناتوانم پەیمانت بدەمێ بۆ ژمارەی تایبەتی (واتە سیانزدە) چونکە سەرم ئاشەو قونم ماشە، کورە برنج و نۆکە.. بەڵێ کتێبەکانم بەدەست گەیشتنەوە زۆر سوپاست دەکەم بۆ گوڤاری مطالعات کردی... هەروەها سوپاس بۆ شیعرەکانی خۆیشت...

چاوەکەم تکایە لە هەمو بارەیەک تێبینییەکانتان بۆم بنووسن...

لاچاوی کچانی پاریس ماچ بکە و سلاوی منیان پێ بگەیەنە....

بەخێر هاتنتان لە مامۆستا هەزار دەکەم....

تکایە بەروار و ڕۆژی نامەکانت لە یاد **نەچێ**...

پێم وابێ تەلەفۆنێکتان کردبوو، چاوەکەم باشترە لە هەشتەوە تا ١٠ تەلەفۆنم بۆ بکەن ئەگەر پێویست بوو...

براتان لە دانیمارک ڕێبوار سیوەیلی

٨٩/١٠/١٩

**ئەورووپا بەبێ فیکرەی جەنگ ناژی...**

نامەی ڕێبوار سیویلی بۆ فەرهاد پیربال

فەرهادی برام ئەمکاتەت باش و ڕیزم قبوڵ بکە.. سلاوم بۆ هاوسەرەکەت و ئەگەریش منالتان هەیە لە برَی من ماچی بکەن.. ماوەیەکی زۆرە چیدی هەواڵی یەکتر نازانین!

من لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا، تەنێ لە ڕیگەی برادەرانی دوورەوە دەنگ و باسی تۆم بیستووە. دو دانە لە گۆڤارەکەشتانم دیتبوو: ژ١و٢ یان سێ.. پیم وایە کەمێ لەسەر ئەوە نیگەران بووم کە چیرۆکی "کابرای دانیمارکی"[1] تان چاپکردبوو، نەتان نووسیبوو لە کوێ وە هاوردووتانە.. ئایا نە دەشیا ئاماژە بۆ کتیبەکەم بکەیت..؟!

من هەر لە دانیمارکم.. سنوورەکانی تا دێن تەسک دەبنەوە و دەبێ وزەیەکی زۆر سەرف کەم تا ڕۆژیک وەک ئینسان بژیم.. یانی ناچار نەکرێم ڕقم لە کەس بێتەوە و کەس ڕقی لیم ببێتەوە، چونکە **ئەورووپا بەبی فیکرەی جەنگ ناژی..جەنگ لەناوەوەی مرۆڤ خۆی...** وەک بواری نووسین هەر خەریکم هەتا ئیستا ئەفزەلیەتی نووسین و کارەکانی خۆمم داوە بەسەر ئەرکەکانی دانیشگادا.. لە وانەیە لە داهاتوودا دوو کتیب چاپکەم: یەکەمیان کۆمەڵێ چیرۆک[2] و دوومیان دراسەیەک لەسەر رۆشنبیر و ئەخلاق[3].. ویستم بەشێکی بنێرم بۆ بڵاوبوونەوە، دوایی ژێوان بوومەوە.

---

[1] مەبەست لە (نیلس سکۆ)یە کە وەرگێراوی چیرۆکێکی بەناوی (تۆ تەنیا نیت) لەلایەن سیوەیلییەوە و لە کتێبی (دیاردەگەرایی تاراوگە)دا وەگێڕدراوە و خوێندنەوەی بۆ کراوە. پاشان لە چەند شوێنێ تر بڵاوکراوەتەوە: ڕێبوار سیوەیلی، دیاردەگەرایی تاراوگە، چاپی یەکەم دەزگای بڵاوکردنەوەی باران، ستۆکهۆلم، ١٩٩٥.

[2] کە پاشان ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بە ناوی (من و مارەکان) لە سلێمانی بڵاوکرایەوە.

[3] کە پاشان لە چوارچێوەی کتێبی (نووسین و بەرپرسیاری) بڵاوکرایەوە.

ئەها بەڕاست فەرهاد گیان، من و چۆمان[هەردی] ماوەی ساڵ و نیوێکە ژن و مێردین.. بەڵام تا ئێستا بە تەواوی شومان بەیەک نەکردووە، من تا ئێستا پەساپۆرتم نیە تا بچم بۆ لەندەن و لەوێ بخوێنم.

ئایا باسی چیترت بۆ بکەم..؟

ئاگات لە (....) بێت!!

ڕۆژەکانی پاریس خۆش بوون، بەڵام تازە ناگەڕێنەوە، سڵاو بۆ برایانی گۆڤاری گەلاوێژی نوێ نامەکەیانم بە دەست گەیشتووە.. زۆر سووپاس

ڕێبوار

بوودا: تابلۆیەک لە سەدەی دوازدەهەمەوە.

دەربارەی خۆت، وەک جاران بنووسە..منالانە و سادە..بنووسە...

فەرهادی خۆشەویست

سێ جارانم تەلەفۆن بادا، (دەمگوت: سانگ، صەنت سانگ، سیلڤووپلێ ی) وەلێ کابرا بڕی قسانی دەکردن و بە هەر حال من قەناعەتم دەکرد کە: لە ماڵ نی.ئیدی گوتم لی ی راسپێرم باشترە.

سیوەیلی

١٩٩٠/١١/١٦

**قاوەم فڕ دەکرد و تارکۆفسکیم دەخوێندەوە.**

نامەی ڕێبوار سیوەیلی بۆ فەرهاد پیربال

فەرهاد گیان ..

لە میوانداری و میهر و موبارەکیت سوپاس گوزارم، بە ناسینی "خلود"[1]ی ئەمنیش خۆشحاڵ بووم، ئەو کچە بۆی هەیە ببێتە سەرۆکی حیزبی "جوانانی پەناهەندە" ! ڕات چۆنە؟

دوێنێ کە هاتمەوە هەموو پاریسم لەگەڵ خۆم هێنابووە ژوورێ، بەڵام گەر کلیلەکەت نەبوایە ئەمشەو لە ئامێزی زستانەیی پاریسدا هەڵدەلەرزیم..هەموو دوێنێ لە باخی گەورەی خوار ماڵەکەت و ئەو شەقامەی بە "سۆربۆن" دا دەچێتەوە سەر "سین" و قاوەخانە و لەبەردەمی هەیبەتی شکۆمەندی پەرداخە بیراندا، ڕابووورد. شەوەکەی قاوەم فڕ دەکرد و تارکۆفسکیم دەخوێندەوە.

حەزم دەکرد نامەیەکی درێژی بۆ کاک ئەحمەد[ ئەحمەدی مەلا] بنووسم بە ناوی "ئەو ڕۆژەوەی بورسم تیا وەرگرت"! بەڵام ئیدی بەیانی ڕۆژی دوو شەممەی بوو، ئەز کاتم نەبوو، دەبوو بە فڕکانێ بگەشتمایە باڵەفڕێ. لە زمانی منەوە، سڵاوی گەرمی لێ بکە و هیوادارم پێکەوە سەفەرێکی کۆپنهاگن بکەن!

هەروەها سووپاسی زۆم بۆ برایانی ئەنستیتوت و ئەرکیان.

---

[1] خلود، کە لە زۆرێک لە بەرهەمی پیربال دا ڕەنگ دەداتەوە، لە کتێبی "بەڵێ من عاشقی فروغ بووم"دا، بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ ئەو کیژە باس دەکات، دەڵێت: خلود نیشتمانێکی ڕاستەقینە بوو بۆ من! بڕوانە: فەرهاد پیربال، بەڵێ من عاشقی فروغ بووم، ئەزموونی شیعریم(١)، هەولێر ٢٠١٠.

فەرهاد گیان: من لە کۆپنهاگنی را بە زوویی پارەکەت بۆ ڕەوانە دەکەم[1]. بە نیسبەت ئەو کتێبانەی لێرەش دەمێنن، دواجار چارەیەکیان دەکەین، ئەگەرچی من شەرم دامدەگرێ لەوەی ئەو هەموو ئەکرەت بەسەردا جێبهێڵم... کلیلەکانم لە هەمان زەرف دانایە و دامە دەست هۆتێل داری.. تەختی نووستنەکەت خەوگرە، شەوێ لەسەری نووستم، سبەی وەمزانی بوومەتە تۆ...

٥ی بەیانی
١٩٩٢/٩/٦

[1] ئاماژەیە بەو پرە پارەیەی کە سیوەیلی لە پیربال قەرزی کردووە، چونکە هەر کە سیوەیلی دەگاتە پاریس و دەیەوێ لە وێستگەی شەمەنەفەرەوە تەلەفۆن بۆ فەرهاد بکات، کیسەباخەڵ و جانتاکەی دەدزرێ.

**دەنا قەراتی هەولێریم، دەکردە شایەت!**

نامەی ڕێبوار سیویلی بۆ فەرهاد پیرباڵ

فەرهادی برا سڵاو کۆپنهاگن ١٩٩٥/١/٣

ساڵی تازەت پیرۆز و سەبارەت بە پڕۆژەی گۆڤارەکەیشتان داوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم منیش غەریبی تۆ دەکەم و بە ڕاستی حەز دەکەم لە هەولێرێ پێکەوە عارەقێ وەخۆین، هەڵبەت بە یادی پاریس و پیاسە بڵندەکانی ئەوێوە..

ئایا تۆ چۆن توانیوتە مانەوەت لە کوردستان بەبێ عەشق بژی؟ یا ئەمەت لە من شاردۆتەوە؟

سەبارەت بە گۆڤارەکە[1] داوای بینینی منت کردووە.. ئەوی ڕاستی بێت من هێشتا نوسخەی خۆمم نیە و ئەوەی دیومە و لامە، هی برادەرێکە.. تێبینیشم هەتا بڵێی زۆرن، بەڵکو زۆر پرسیاری بەرامبەر بە تازەگەری و پڕۆژەکانی لەلا درووستردم.. ڕەنگە بەشێکی سەرنجەکانم لە ژمارە ١٧ی یەککگرتندا بخوینیتەوە.. هەڵبەت لەسەر تازەگەری بەگشتی، نەک تەنیا گۆڤارەکەی ئیوە من پێم وایە دەبێ هەموومان بە جیدی بە پێناسەماندا تازەگەری کوردی، بچینەوە و مامەڵەیەکی مەعریفییانەی لەگەڵ بکەین، نەک لە چوارچێوەی هەندێ دروشم و

شیعاری حیسی دا بەندی بکەین.

زۆرم حەزدەکرد، لە جیاتی دەرکردنی گۆڤار، ئەو پڕۆژەیەت پیادەکردبا کە لەسەفەری سێهەمدا بۆپاریس باست کرد: پڕۆژەی کردنەوەی دەزگای چاپی کتێب و تەرجەمە... لەگەڵ پڕۆژەی دەورەی زمانی فەڕەنسی...

---

[1] مەبەست لە گۆڤاری "وێران"ە، کە ژمارەی یەکەمی لە بەهاری١٩٩٤ بڵاوکرایەوە.

لەگەڵ گزنگی [نەزەند بەگیخانی] پەیوەندیم باشە و جاروبار نامان بۆ یەکدی دەنووسین، هەڵبەت ئەو کەی پرسیارێکی هەبێ یان کارێکی هەبێ بەسەرم دەکاتەوە و منیش وەڵامی دەدەمەوە، بەڵام "هاورێ" بیدەنگە. دەزانم لە ڕێگەی گزنگەوەیە بەرهەمێکم هاتووە بۆتۆ لەسەر چیرۆکەکەی نیلس سکۆ. حەزەکەم دەقی چیرۆکەکە و باسەکەی خۆیشم پیکەوە بلاوبینەوە. نەک بە جیا.. سەبارەت بە ئەزموونە شیعرییەکەی پاریسیش ڕام نیە. بەڵام بە خراپی نازانم ڕوونکردنەوەیەک بنووسی لەو بارەوە کە چۆن شیعرەکانمان دەنووسین و بە شەو دەمان نووسین یان بە ڕۆژ، لە ژوورەوە یان لەسەر شەقام و قاوەخانان..

حەزدەکەم پەیوەندیمان هەبێ و حەزیش دەکەم لەگەڵ هەڵکەوتی پەیوەندیت بمێنێ و هاوکاری یەکدی بکەین.. من و ئەحمەدی مەلای نیوانمان خۆشە و ڕەنگە ئەو کوڕە ڕاستگۆترین شاعیری ئاوارەی ئێمە بێت.. بلێ ی بتوانم کۆمەڵەشیعرە نوێ یەکەمت بۆ بنێرم؟ بەهیوای دیدار

**تەئویلێکی تر لەسەر شیعری نالی...**

نامەی ڕێبوار سیوەیلی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

گەورە و بەڕێز کاکە حەمە گیان ١٩٩٦/٢/٢٦

سلاوی گەرم و ڕێزی بێ پایانم قبول بفەرموون..

دەستی مامۆستای مەزن ماچ دەکەم و ئاواتی تەمەنی درێژی بۆ دەخوازم.. هەروەها هەواڵی گشت کەس و کار و خزمان و دڵسۆزانی بنەماڵە بەڕێزەکەتان دەپرسم...

مامۆستای هێژا؛ جگە لەوەی کاتی خۆی لەسەرەتای سالانی هەشتادا یەک-دووجار بە خزمەتت گەیشتم لە بەغدا، لە ئێرانیشەوە هەوڵی پەیوەندی کردنم بە ئێوەوە دا... بەڵام لە کۆتایی ساڵی ٩٥ دا کاتێ لە لەندن بووم، لە ڕێگەی ڕەسمییە خانەوە زانیم جەنابت بۆ چارەسەر کردن هاتویتە ئەورووپا.. هیوادارم حاڵی حازر هیچ نەخۆشییەکتان نەمابێ و بەسەر ئەو کۆسپانەدا زاڵ بووبن..

ئەوی ڕاستی بێ لەو ساڵانەی ڕابردودا زۆر جار هەوڵمداوە لە گۆشەیەکەوە پەیوەندیت پێوە بکەم؛ چونکە بە جۆرێ پابەندی زەحمەتەکانی جەنابی باوکت و ڕەحمەتی مەلا فاتیح و تۆ بووم لەسەر "نالی" کە باس ناکرێ.. بەرهەمی ماندوو بوونی من لە بارەی نالییەوە ئەم دوو کتێبەیە کەوا دەیاننێرمە خزمەتت.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم بەرهەمانەی[1] من هەوڵدانێکی سنگ فراوانانەن بۆ خوڵقاندنی تەئویلێکی تر لەسەر شیعری نالی؛ ئەمەش بە هۆی بە کارهێنان و سوود وەرگرتن لە بوارە تازەکانی ڕەخنە و میتۆدی شیکردنەوە.. مەبەستی من ئەوە بووە کە مامەڵەیەکی تر لەگەڵ شیعر و شیعری نالی بکەم... زۆر بە ڕاشکاویش دەڵێم ئەم لێکۆڵینەوانەی من بە پلەی یەکەم شەرح و لێکدانەوەیان کردونەتە سەرەتای تێگەیشتن لە (نالی) لە ئێوە لە دیوانە گەورەکەدا

---

[1] مەبەست لە "کتێبی نالی"ی ڕێبوا سیوەیلییە.

خستوتانەتە ڕوو.. واتە من لای خۆمەوە ئەم هەوڵدانە لە پەراوێزی ئەو زەحمەتە گەورەیەدا دەبینم کە ئێوە لەگەڵ ساخکردنەوەی دیوانی نالی دا کێشاوتانە.. هەر بۆیەشە زۆرم بەلاوە مەبەستە، کە بە پێی بوار و حەوسەڵە لەبارەی بابەتی کتێبەکانمەوە سەرنج و بۆچوونت بزانم.. ئەویش سادەترین چاوەڕوانی قوتابییەکە لە مامۆستای خۆی...

هیوادارم لە ئایندەدا بتوانم بەرهەمەکانی ترمت بنێرمە خزمەت کە زیاتر بابەتی شیعر و لێکۆڵینەوەن لە ژیانی پەنابەران و هتد... تکایە ئەگەر ناردنی کتێب و نامەو بابەتی لەو جۆرە کێشەو دەردەسەریت بۆ دروست دەکات؛ ئاگادارمان بکەوە تا دەست لەو کارە بکێشینەوە...

جارێکی دیکە هیوای چاک بوونەوەت بۆ دەخوازم و لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە تەمەنێکی درێژتان لەبەردەم بێت...

ناونیشانی من:

Rebwar siwayli

Agerkar ١١ ١٣

٢٦١٠ Rodovre

Danmark

بچووکتان: ڕێبوار سیوەیلی
دانمارک.

تێبینی:

ئەوی ڕاستی بێت، هیچ گۆڤار و ڕۆژنامەو بەرهەمێکی کوردی ناوەوەم پێ ناگات، ئایا دەکرێ لەو بارەیەوە ڕێنومایی مان بکەن؟

**من لەسەر شەڕە بچوکەکانی خۆم بەردەوامم.**

نامەی ڕیبین هەردی بۆ جەمال غەمبار

سڵاو ئەی ناسکترین شاعیری وڵات

زۆر بیرت دەکەم و خۆشم دەوێیت، هیوادارم بارودۆخت باشتر و ئارامتر بێت، ئیمە لێرە تۆمان زۆر کەمەو جێگەت یەکجار دیارە. نازانم بۆ مەسەلەی سەفەرەکەت گەشتیتەچی. هیوادارم کوێت پێخۆشە بۆت ببێ. تۆ شایستەی هەموو شتێکی جوانیت، ئیمە لێرە جاریَ هەر دەژین، ئەگەرچی پڕ لە غوربەت... ئەگەرچی پڕ لە خەون تورەیی... من لەسەر شەڕە بچوکەکانی خۆم بەردەوامم، هەندێ جار قسەی خۆش و هەندێ جاریش قسەی زۆر ناخۆش لەسەر خۆم دەبیستم، بەڵام بیردەکەمەوە، ئیمە هەموومان وابووین،

هەموومان بەدەیان ڕۆژگاری خۆش و ناخۆشدا تێپەڕیوین، دواجار ئەوەی دەمێنێتەوە

هەر جوانی و پاکییە.!

ئازیزەکەم من بە کاک عەباسدا و کتێبێکی

فێربوونی زمانی ئینگلیزیم ناردووە، کە زۆر

مەمنون دەبووم ئەگەر بیگەێنیتە دەست بەڕەز و حەمە ڕەش.

بیرت ئەکەم و خۆشم ئەوێیت

سڵاوی من بە هەموو دۆستان بگەیەنە بە ئومێدی دیدار برات : ڕیبین هەردی

٢٠٠٠

**پێم وایە، تۆ هێشتا بەرۆژت نەدۆزیوەتەوە!**

نامەی ساقی قەهرەمان بۆ بەرۆژ ئاکرەیی

دەزانی[1] چەند ساڵە بۆ هیچ کەس نامەم نەنووسیوە... بیرم چووەتەوە... دواجار کە نامەم دەنووسین، نامەی دڵداری بوون، کە خۆم دەمگەیاندنە دەستی خاوەنەکەیان... زۆریکیش لەو نامانە هەر لەلای خۆم ماونەتەوە... ڕاستییەکەیت دەوێ نامە نەبوون... نازانم چی بوون... بەڵام نامە بوون ئیتر... ئێستا کە بیر دەکەمەوە دەبینم لەم ساڵەی ڕابردوودا چەندم حەز کردووە بتبینم و ئەو قسانە بکەین، کە چاک بوون و بۆمان نەلوا... ئەو ڕۆژانەی تۆ لە دەست ئەم میوانە داوەتنەکراوەتەوە بێتاقەت دەبوویت و منیش قاقاپێدەکەنیم... چونکە هەرچەندێکیتر بێتاقەت ببوایت، من هەر لەوێ دەمامەوە، چونکە لەگەڵ برادەرەکانی دیکەدا قسەیەکم نەبوو، یان... بەهەرحاڵ.... ئاخر تۆ چیت بەسەری خۆت هێناوە... مەگەر مرۆڤ هەر لەخۆڕا بەرەڵلای ئەم دنیایە دەبێ، دنیایەک کە هەناسەی تێدا هەڵکێشی دەبێ پارە بدەی... بەڵام ئەگەر مرۆڤ حەزی کرد و بڕیاری دا و ناچار بوو، کە بەرەڵلای ئەم دنیایە بێت، ئەوسا ئیدی دەبێ هەموو شتێک فەرامۆش بکا... دەبێ بانی ماڵ، قفڵی ماڵ، پێخەف، ئاسایش،نیشتیمان، سبەینێ، مۆتەکە، هەموو شتێک، هەر هەموو شتێک، فەرامۆش بکا و بەس بەرەڵلا بێت...

خۆشحاڵم کە گۆڤارەکەت لە کوردستانی عیراق سەری نەگرت، یان تۆ وازت هێنا و گەڕایتەوە... بە بڕوای من، کارێکی ناپێویست بوو... بە ڕای من تۆ نەتدەتوانی ماوەیەکی زۆر لەوێ بمێنیتەوە...

بەرۆژ، هێندێک جار کە دەگەڕێمەوە و تەماشا دەکەم...

دوو مانگێک بەر لە ئێستا کارێکی چاکم پەیدا کردبوو... هەر لە ماڵەکەی خۆمدا بووبوومە پەیامگری کۆمپانیایەک... کارێکی چاک بوو، بەڵام چونکە یەکێک لە بەرنامە کامپیوتەرییەکانی پێویستم نەدەزانی، لە کیس خۆمم دا... هەوڵێکی

---

[1] بەرۆژ ئاکرەیی: هاوینی دووهەزارویەک، لە کوردستان گەڕابوومەوە سوئێد. ماڵوحاڵ و کاروبارێکم نەبوو. ڕووم لە لەندەن کرد و دوو مانگێک بە دوای کاردا گەڕام و لای چەند برادەرێک گیرسامەوە. ساقی ئەم نامەیەی لە کاناداوە بۆ "زیبا کرباسی" ناردبووە لەندەن. تا نامەکە گەیشت، من گەڕابوومەوە سوئێد. زیبا نامەکەی لە لەندەنەوە بۆم ناردە ستۆکهۆڵم و پاییز بوو، کە بە دەستم گەیشت.

زۆریشم دا، کە وێڕای کارکردن خۆم فێری ئەو پرۆگرامە بکەم، نەکرا. کارێکی قورس بوو... هێندێک جار لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا، دوو- سێ سەعات زیاتر کاتی نووستنم بۆ نەدەمایەوە... ئێستا خۆم بە خولێکی خوێندنەوەوە خەریک کردووە، کە فێری ئەو پرۆگرامە بم... پێویستییەکی زۆرم بە کار هەیە... بەتایبەت هاوینان کە کاری شاپوور کەم دەبێ... شاپوور لەوانەیە هەر لەم پاییزەدا پێشانگایەک بکاتەوە... هەر خەریکی نیگارکێشانە، لەلایەکی دیکەوە، خەریکە لەنێو ماڵدا، قایەخی مودێل دروست دەکا... بۆ خۆی. کوڕەکەم ئەوە ساڵێکە هاتووەتە لای من و شاپوور و لێرە دەژی... تەمەنی بیست ساڵە... دوو سەگیشی هەن... یەکێک لە سەگەکانی هەر ئەمڕۆ تا سبەی، دەزێ... بە خۆیەوە خەریکی کردووم... من و ئیحسان، دەتوانم بڵێم هەرگیز لە یەکتر دانەبڕاوین... بەڵام وەک ژیانێکی ئاسایی دایک و کوڕانە، ئادی، لە یەکتر دوور کەوتینەتەوە. ئێستایش زۆرتر لە یەکدی نزیک بووینەتەوە و هێندێک جار وەک دوو مرۆڤی بەتەمەن، کێشەی مەزنی ڕۆشنبیرانەمان هەیە... موناقشەی ژنانە و پیاوانە... لەو کاتەوە کە هاتووەتە لام، هێمنتر بوومەتەوە، هێندێک جار هێندە بەسەر یەکتردا دەقیژێنین، کە دیوارەکان دەلەرزن، بەڵام وەک ئەوە وایە، هەردووکمان، باری شانەکانمان یەک بە یەک داگرتبێ، ئاسوودە دەبین...

هێندێک جار چاوەڕێی ئەوە دەکەم ئیحسان زۆر گەورە بێت...

ئەرێ بەڕاست، من و یەکێک لە برادەرەکانی "کانادا" خەریکین ئەم ژمارەی گۆڤاری "هومان" ئامادە دەکەین... دەمویست بە عەلی بڵێم بابەتمان بۆ بنێرێ... لەوانەیە ئەمڕۆ یان سبەی، ئیمایلێکی بۆ بنێرم...

بەڕۆژ، زۆر نیگەرانتم... چونکە پێم وایە تۆ هێشتا بەڕۆژت نەدۆزیوەتەوە... دەترسێم کۆڵ بدەیت... بەرپرسیارییەتیی سیاسی؟ یان فەرهەنگی؟ و ئەڤین... کە تۆ بە شێوەیەک کردووتە بە موگناتیس... خەریکن تێکت دەشکێنن... هێندێک جار دەمەوێ شانەکانت بگرم و ڕایان تەکێنم... لە ئیمایلێکدا بۆتم نووسیبوو، کە لێرە کار دەست دەکەوێ. لەوانەیە ئێوە لە ئەورووپا کەمتاکورتێک ئاگاتان لێرە هەبێ، لەوانەیشە نەبێ، ئاوا کە من بەرگوێم کەوتووە، بە بەراورد لەگەڵ ئەورووپادا، کار لێرە زۆر زۆرترە... یانی کارێک کە بکرێ پێی بژیت... بەڵام من نازانم... تۆ لەبەر فریشتە سوێندت بەجێ هێشت، یان بێکاری... یان لەبەر ئەوەی کە ئێش و پارە نەبوو...

من هەمیشە ئاوا فێر بووم، یان خووم گرتووە، کە دەسەڵاتم بەسەر خۆمدا هەبێ... یانی دەرفەت بە خۆم دەدەم، کە شێت بم و پاشان بە خۆم دەڵێم دەی باشە ئێستا ئیدی بڕیار دەدەم، کە شێت نەبم... من تەنانەت کە دەڕۆم خۆم بکوژم، هێندە ئاگام لە خۆمە کە ئەو کارە نەکەم... هێندێک جاریش هەر لەبەر ئەم هەموو گوشارەی بۆ خۆمم هێناوە، یەک- دوو پەردەم دڕاندووە، کە ئیدی چاک نابنەوە... بەڵام پێویست بووە... یانی دەبا بمتوانیبا بەسەر خۆمدا زاڵ بم... ئەی تۆ چۆن ناتوانی بڵێی: دەی، یارییەکە تەواو... ئاخر چۆن ناتوانی... مەبەستم فریشتەیە...

ئێستا سەگە ئاوسەکەمان هات و لە تەنیشتم پاڵ کەوت. چاوەڕێم کە تووتکەکانی بزێ... زکی هێندە هەڵمساوە و گوانەکانی هێندە گەورەن...

هەر بەڕاست بەرۆژ، ئێستا بیرم کەوتەوە کە زۆر چاکە مرۆڤ نامە بنووسێ... ئەو ڕۆژانەی من لەوێ بووم، تۆ هەر قسەکانمت دەبڕین و خۆت قسەت دەکرد، ئێستا ناچاری کپ بیت تاکو ئەم پێنج لاپەڕەیە بخوێنیتەوە... بۆم بنووسە بزانم ئایا دەتوانی بێیتە کانادا و بۆ هەمیشە بمێنیتەوە... یانی پێت وایە کارێکی چاکە هێندێک ئاگاداریت لەم بارەوە بۆ کۆ بکەمەوە، یان نا؟... دەی، شەو دیسان چەند دێڕێکت بۆ دەنووسم و بۆتی پۆست دەکەم...

شیعرەکانی "مریەم هولە"م لە ڤیدیۆدا بینین... شیعری گەلێک خراپ و لاواز و دەستی پێنجەمن... بەڵام خۆی زۆر باشە... زۆر باشە... ئەم کارانە هێی دەسپێکن... دواتر چاکتر دەنووسێ... چونکە زۆر زیندوو و پاکیزە و قەحبەدایکە. کتێبەکەی لێرە نییە، ئەگەر دەتوانی بینێرە.

بیرم کەوتەوە لێت بپرسم بۆچی هێندە بۆڵە دەکەی... منیش بۆڵە دەکەم... هەموو کەس دەیکا. ژیان ترسناکە و ئەو شتەیش کە لە سەری مرۆڤدایە لە هەموو شێک ترسناکترە، بەڵام تۆ بۆڵەت زۆرە، "ڕووباب"ت بیر خستمەوە... هەموو شتێک حسێب و کتێبی خۆی هەیە... ئاساییە کە دایکی منداڵەکەت تەلەفۆنت بەسەردا دادەخا... چونکە هەزار جار چاوەڕێی یارمەتی بووە و یارمەتییەکی پێ نەگەیشتووە... ئاساییە کە فریشتە، بار و خەمەکانی خۆی دەخاتە سەر شانەکانت... چونکە شانەکانت خاوێن و ئامادەی کێشە و گرفتەکانی فریشتەن... ئاساییە کە تۆ سەرگەردانیت، چونکە لە دانیشتن دەترسێیت... ئەمانەیش تێکڕا لۆژیکی خۆیان هەیە... هۆکاری خۆیان هەیە و بۆ گەیشتن بەم قۆناغەیش، خودی خۆت بڕیارت داوە... کەواتە یان بگەڕێوە دواوە

و سەرلەنوێ بژی... یان بڕۆ پێشەوە و بژی... چونکە تۆ بەرۆژی، زۆریش ناتوانی شتێک بگۆڕی... بەس دەتوانی بڵێی «خۆم کردم و چاکیشم کرد.»

ڕاستییەکەیت دەوێ من پێم وا نییە کە ئەم بۆڵەبۆڵە «پۆزی ڕۆشنبیرانە» بن، چونکە بڕوایەکی زۆرم بەوە هەیە، کە ئێمە ڕۆشنبیرین و شاعیرین و هونەرمەندین... ئەمانەیش پۆزلێدان نین، ئەمانە هەمان «ئاخ»ـە ئاساییەکەن، کە هەر جارەی سەرمان بە بەردێک دەکەوێ، لە قووڵایی دڵمانەوە هەڵدەقوڵێ... دڵم بۆ مەحموود تەنگ بووە... چەند گێژ بوو ئەو شەوە...

هەر بەڕاست، من زۆرم حەز لە موناقشەیە... بەتایبەت لەسەر لاپەڕە، کە تۆ نەتوانی قسەکەم ببڕی... چەند شەو بەر لە ئێستا، من و شاپوور باسی هەمان 'ئازیزی مردوو'مان دەکرد... پاشان قسە گەیشتە پێوەندیی ژن+ پیاو، یان پارتنەر+ پارتنەر، دوایە باسی ئەوەمان کرد، کە سێکس بەهۆی گوشاری فەرهەنگیی باڵادەستی پیاوسالار (مەبەستم پیاوەکان نین) بووەتە پێوەندییەکی دووکەسی، من وای دەبینم، دەکرێ چێژی جنسی تەنیا بە یەک کەس، خودی کەسەکە، یان خودی کەسەکە و کەسێکی دی، کە لە خزمەتی ئەو کەسەدایە، بهێتە دی... وەکو کاتێک کە پزیشکی ددان، لە خزمەت مرۆڤدایە. یان کاتێک سەرتاش لە خزمەت کەسێکدایە و هەوڵ دەدەن چێژ بگەیەنن...کەچی ئێستا، دوو کەس، بەو هۆیەوە لەو وێنەیەدا پەستراون، کە لە سێکس، جگە لە چێژی جنسی، سوودی دیکە وەردەگیرێ... یانی دوو کەس بۆ ئەوەی حەز و مەیلیان بە یەکتر بسەلمێنن، پێکەوە دەخەون. بۆ ئەوەی زاووزێ بکەن، پێکەوە دەخەون... بۆ ئەوەی، دۆستایەتی، وەفاداری و گوێڕایەڵبوون بە یەکتر بسەلمێنن، پێکەوە دەخەون و... شتی دیکەی لەم بابەتە. منیش پێم وایە ئەم شتانە ڕێک وەکو عەقدی زەواج، مەزهەب، دەمارگرژیی نەتەوایەتی، خێزان، سیستەمی شارسازی، پارە (پارە بدە تا تێر بخۆی) قۆڕن و ژیانی مرۆڤیان ئاڵۆزتر و پڕگرێتر کردووە...

بە کورتی... هەر ئەمە. ئەوەیش ڕاوبۆچوونەکانی من... ئەرێ بەڕاست ئەوە چی بوو نووسیبووت ئاغای شاپوور... کە خوێندمەوە زۆر پێکەنیناویم هاتە بەرچاو... وەک ئەوە بوو کە من بنووسم: فریشتە خانم...

سڵاوی تۆم بە ساسان نەگەیاند، چونکە چەند مانگێکە نەمدیوە...

شتێکی سرنجڕاکیش... تۆ، دیارە لە لەندەن، غەریب و بێکەسیت. کەچی لە سوئێد، هێندەی ئێران و بۆ نموونە عیراق، یان کوردستان، ماڵ هەیە... ماڵێک کە

خۆش نییە و شوێنی ژیان نییە، بەڵام ماڵە... کەچی لەندەن، وڵاتێکی دیکەیە و غەریبە و تۆ تێیدا غەریبیت...

هێندە بیری ئەو شەقامە درێژەی نێوان ماڵی تۆ و عەلی دەکەم...

شتێکی دیکەی پێکەنیناوی، من دۆستێکم هەیە تۆ و مەحموود و عەلی دەناسی و زۆریش لەمەڕ خەوشە ئەخلاقییەکانی ئێوەوە قسەی کرد، کە گوایە ئێوە پیاوی خراپن و منیش بەس پێدەکەنیم... چونکە خەوشەکان هەر ئەو خەوشانە بوون، کە هاوڕێیان، جاران، لە کارخانەدارەکانیان دەگرتن... بۆچی بیر لەوە ناکەینەوە، کە ئەمانە خوێنی کرێکاران دەمژن. سواری ملی چینی کرێکارن... خیانەت لە مرۆڤایەتی دەکەن،کە هاتیتە ئێرە دەیبینی...

"زیبا" باشە؟ تۆ کە لەوێیت یارمەتیی بدە، کە ئیمایلێک بۆخۆی دروست بکا، کە بتوانین، من بتوانم لەگەڵیدا پێوەندیم هەبێ... کتێبی نامەکانی "هیدایەت" بۆ "شەهید نوورایی" بخوێنەوە. ئەگەر پەیدات کرد. دەنا بڵێ بۆتی بنێرم... کوردی تێدەگەم، بۆ تێناگەم، کۆمەڵە شیعرەکەیشتم دەوێ. بۆمی بنێرە.[1]

---

[1] ئەم نامەیە بە زمانی فارسی نووسراوە.

نامەی سدیق بۆرەکەیی بۆ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

بسم تعالی

ئازیز نامەکەت وەدەسم یاوا          بۆ سام و نە رووی دو دیدەم ساوا

مامۆستای بەڕێز و هێژا مەلا کەریمی مودەڕپیس

سلاوێکی گەرم و گوڕت لێ بێ و هیوادارم کە هەر خۆش و ساخ و بێ وەی بی و لە تەنگ و چەڵەمە و ئاپۆڕەی رۆژگار دووربی. سەبارەت بە دیوانە دەستنووسەکەی مەولەوی ئەبێ بڵێم کە وەختی خۆی خوالێ خۆشبوو مامۆستا "د.حەمە صدێقی موفتی زادە" لەسەر ئەو دیوانە کاری ئەکرد و هۆنراوەکانی مەولەوی شی ئەکردەوە و بۆ ئەم کارەش نزیکەی بیست و پێنج نوسخەی دەستنووسی لە دەوەری فەقێیەتی لە هەورامان دا بەدەست هێنابوو کە بە داخەوە مامۆستا لەو ماوەدا توانی نزیکەی هەژدە پارچە هەڵبەستی "مەولەوی" شیبکاتەوە و دوو ساڵ لەمەوپێش کۆچی دوایی کرد و هەموو ئەو نوسخە و دەستنووسانەش بێ خاوەن لە پەرتووکخانەکەی خۆی دا ماوەتەوە و کوڕەکە و کچەکانی لە وڵات دا نین و هەر ژنەکەی لە ماڵایە. براکەی "دوکتۆر حەمە صدێق" خوا لێ خۆش بوو "مەلا خالدی موفتی" مەولەوی زانێکی[مەولەویناس] زۆر بەرز و بێ وێنە بوو، وە زۆربەی هۆنراوەکانی مەولەوی لەبەر بوو و بە سۆزەوە ئەیخوێندەوە و لەسەریان ئەکۆڵی یەوەو من لەوم بیست کە ئەو دیوانی وا بۆتانم ناردووە هی بنەماڵەی موفتی یەکانی وشە بووە و هەر ئەوان دیوانەکەیان پێشکەش کردووەتە زانستگا و دیوانەکە بە "خەتی میرزا یەحیای کوردستانی" یە کە لە رووی نوسخەیێکی دەستنووسێ مەولەوی نووسیویەتەوە و لەگەڵ دوو نوسخەی تردا ێیکی گرتووە و جیاوازی یەکانی لە نوسخەکەدا نووسیوە و ئەوسا مەولەیش لە چەند لاپەڕەی دا پەراوێزی بۆ نووسیوە. مامۆستا خالد ئەمانەی لە زوانی باوکی یەوە ئەگێڕاوە.

مامۆستا "سەی تایەری هاشمی"ش دیوانیکی گەورەی مەولەوی لە رووی چەند نوسخەدا کۆکردووەتەوە و پێشەکی ێیکی دووروودرێژیشی بە زمانی فارسی بۆی نوسیوە و پێشکەشی کرووەتە یەکێ لە پیاوانی گەورەی وێژەپەروەری وڵات و هێشتا لە چاپ نەدراوە. بەڵام سەبارەت بە دیوانەکەی نالی کە من نوسخەییکم لە لایە لەگەڵ نوَسخە چاپکراوەکەی ئێوەدا وەکوو بەراوردم کرد ئەوەندە تۆفیرو جیاوازی نیە، تەنیا ئەو پارچە هەڵبەستە دووروودرێژە نەبێ کە نالی لە بارەی مەستوورەوە هونیویەتەوە کە ئەڵێن بەندی دووەمی هی مەستوورەیە و لە وەڵامی نالی دا هۆنیویەتەوە کە ئەو بەندەش بە داخەوە لە نێو دیوانە کوردی یەکەی مەستوورەدا کە لە لامە نەنووسراوە، جگەلەوەش ئەز نزیکەی چل، پەنجا دیوانی دەستنووسی هۆنەرانی کورد لە سەدەی دووەمی کۆچی یەوە تا ئێستا هۆنراونەتەوە لەلامە و زۆربەیانم بۆ چاپ ئامادە کردووە کە بە داخەوە لەبەر بێ قاقەزی هەروا ماونەتەوە و خوا حەزکات لە داهاتودا یەک لە شوێنی یەک لە چاپ ئەدرێن. تکایە سلاو و رێزی من بە رۆلە زاناکانت مامۆستا حەمە و مامۆستا فاتح بگەیێنە. ئیتر بە دوعا .

صدیق بۆرەکەیی

٢٦٠٠/٧/٢ی کوردی

نامەی سدیق بۆرەکەیی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

مامۆستای بەڕێز و هێژا کاک موحەمەد

ئازیز نامەکەت وە دەستم یاوا    بۆسام و نە رووی دوو دیدەم ساوا

سڵاوێکی گەرم و گوڕت لێ بێ و هیوادارم هەر ساغ و سەرکەوتووبی و نامەکە گەیشت و دڵم بە جارێ روون بوەوە. سەبارەت بە دیوانە دەستنووسەکەی مەولەوی کە بۆتانم ناردووە ئەبێ بڵێم ئەو دیوانە کۆنترین دیوانی مەولەوی یەو چونکە لە دەوری خۆی دا نووسراوەتەوە و ئەو پەراوێزانەش وا لەسەری نووسراوە بە خەتی مەولەوی نەمرە. جا من ئەگەر توانیم و بۆم کرا فیلمی دیوانەکە ئەگرم و بۆتانی ئەنێرم.

ئەو بەیتەی کە نووسیوتە رەنگە خەتەکەی خەتی کەسێکی سنەیی بێ و لە جیاتی زامان کاری و زام گەل کاری نووسیوە لە راستەقینەدا "زام کول کاری"یە واتە بەیتەکە ئاوا دەست پێ ئەکا: "دەرد وەبان دەرد زام و کول کاری".
هەروەها لە نامەی پێشوودا رامگەیاند من تەواوی ئەو دیوانەم بە خەتی کوردی نووسیوەتەوە و پەراوێزەکانم راڤە کردووە و فەرهەنگۆکێکم بۆی داناوە کە خوا حەزکات بڵاوی ئەکەمەوە. سەبارەت بە نوسخەکەی "دکتۆر موفتی زادە" ئەبێ نزیکەی بیست تا سی پارچە هەڵبەستی لێک داوەتەوە، بەڵام دیوانەکەی بە تەواوی کۆکردۆتەوە و بووەتە کتێبێکی گەورە و تەنانەت رۆژێکیان لە ماڵا بەیەکەوە دانیشتبووین و لەسەر هۆنراوەکانی مەولەوی ئەدواین وتم مامۆستا ئەی بۆ سەرەتایێکت بۆ دیوانەکە نەنووسیویە؟ فەرمووی سەرەتای ناوێ و هەر سەرەتاکەی "مامۆستا مەلا کەریم" لەسەر دائەنم چونکە ئەو یەکەمین کەس بووە کە دیوانەکەی مەولەوی لە چاپ داوە و لەسەر هۆنراوەکانی کۆڵیوەتەوە، بەڵام دیوانەکە و نوسخەکان لە لای ژنەکەیەتی و بڕواناکەم بیدا بە من و مەگەر

کچەکان و کوڕەکەی بینەوە و داوایان لێ بکەن و ئەگەر رازی بوون بۆتانی بنێرم. بەسەرچاو من ئەو وتارانەی سەبارەت بە هۆنراوەکانی مەولەوی نووسیومە بۆتانی رەوانە ئەکەم. لە بارەی دانانی فەرهەنگی گورانیش کە پێشنیارت کردووە ئەبێ بڵێم کە زۆر کەس لە زانایان ئەم داخوازەیان لێم کردووە، چونکە نزیکەی شەصت، حەفتا بەرگی نامیلکە و پەڕاوی گورانی کۆنم لە لایە کە نووسینیان ئەگەڕێتەوە بۆ هەزار ساڵ لەمەو پێش. کە لە ناو ئەو نووسراوانەدا گەلێ وشە و زاراوی کۆنی گورانی هەن کە ئێستا بەکارنابرێن، جا وەکوو بیستوومە خوالێ خۆشبوو مامۆستا کاردۆخی فەرهەنگێکی هەورامی داناوە و لێرەدا دەست ناکەوێ و تکایە ئەوەم بۆ بنێرە تا خوا حەزکات لە داهاتوودا خەرکی دانانی فەرهەنگێکی گورانی بم و ئەوسا چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەخەمە سەر ئەستۆی خۆت و سەبارەت بە نووسراوەکانی خۆمیش ئەبێ بڵێم کە تا ئێستا گەلێک نووسراوم بڵاوکردووتەوە و هەرچیم لەبەردەستابێ بەرە بەرە بۆت رەوانە ئەکەم و لەگەڵ ئەم نامەدا نۆ نووسراوی خۆمت[خۆمم] بۆ ناردی: "هیوا، خەیام، بابەتایەر، زەمبیل فرۆش، عێل بەگی، دورەء بهلول، نویشتەهای پراکندە دەربارەء یارسان، بزرگان یارسان، طب سنتی" جار ئەگەر ویستت هەر کام لە فارسی یەکان وەرگێڕیتە سەر زمانی کوردی بە مەرجێ مافی دانەر لە چاو بگیررێ ئازادیت. یەکێ لە کارەکانی ترم نووسینی فەرهەنگی ماجە " بە کوردی و فارسی" کە لە سی بەرگدایە و بەرگی ئاخری ئەو فەرهەنگە ناو نامەیەکە داگری ناوی زانایان و هۆنەران و بڕیسکان و پادشایان و شارەکان و پەۆتووکەکانی کوردی و هۆزەکانی کوردە و لەم بارەوە گەلێ سەرچاوەم بە زمانەکان پەیدا کردووە و تا ئێستا نزیکەی سێ هەزار لاپەڕەم لەسەر نووسیوە و تۆیش هەر چیت دەست کەوت بۆم بنێرە.

نووسراوێکی ترم بە ناوی مێژووی وێژەی کوردی[1] نووسیوە و داگری بەسەرهاتی سێ هەزار هۆنەری کوردە بۆ ئەو کتێبە پێویستم بە وێنەی

---

[1] صدیق بۆرەکەیی(صفی زادە)، مێژووی وێژەی کوردی(١)، انتشارات ناجی، بانە کردستان، چاپ اول، ١٣٧٠.

قەڵەمکێشی هەیە، جا ئەگەر وێنەی هۆنەرانێت دەست کەوت یان وێنەکە یان فۆتۆکۆپی یەکەیم بۆ بنێرە. کتێبەکانی ئێوەش ئەمانەم هەیە : "علماؤنا، الفضیلە، یادی مەردان بەرگی دووەم، بنەماڵەی زانیاران، بارانی ڕەحمەت، سەرچاوەی ژیان، دیوانی نالی، دیوانی مەحوی، دیوانی فەقێ قادر، لە پێناو نالی دا، پووشکین". ئەگەر هەر کتێبێکی منت وەرگێڕا هەر بە ناوی "صدیق بۆرەکەیی" بێ چونکە ئەز لە کوردەواری دا بەو ناوە ناسراوم. تکایە سڵاوی من بگەێینە بابت و لەلایەن منەوە دەستەکانی ماچ کەرەوە، هەروەها گەلێ ڕێز و سڵاویشم بۆ کاکت هەیە. چاوەڕوانی هەواڵ و نامەتم.

صدیق بۆرەکەیی

١٩٨٩/٢/١٨

**بۆتم نووسیبوو کە...**

نامەی سدیق بۆرەکەیی بۆ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

بیسم تعالی

مامۆستای بەڕیز و هێژا مەلا کەریمی مودەڕڕیس

لە پاش ڕێز و سلاو ساخی و تەن دروستیت لە خوای مەزن ئاواتەخوازم. هەروەها کە لە پێشا بۆتم نووسیبوو کە میرزا یەحیای کوردستانی دیوانەکەی مەولەوی لەسەر دەستنووسێکی مەولەوی نووسیوەتەوە و لە نامەی دووەم دا ئەو باسەشم لە زمانی مەلا خالدی موفتی یەوە گێڕایەوە، هەر لەو نوسخەش دا بۆ خۆتم ناردووە و ئەوا لەگەڵ ئەم نامەش دا فۆتۆکۆپی یەکەی ئەنێرم لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەدا هەروەها ئەبینی نووسراوە: "این شعر در نسخه مرقوم بخط مرحوم معدوم معدوم است" ئەڵبەت ئەو پەراوێزەش بە "خەتی میرزا یەحیا" نەنووسراوە چونکە خەتەکەی لەگەڵ خەتی هۆنراوەکانی دا یەک ناگریتەوە و جگەلەوەش مەعدوومی بە ناوی (مرحوم) یادکرووە کەچی میزا یەحی نوسخەکەی لە دەوەری مەولەوی دا نووسیوەتەوە. مامۆستا "سەی تاهیری هاشمی"م لەم رۆژانەدا چاو پێ کەوت و پیم وت کە مامۆستا مەلا کەریم ئەیەوێ دیوانەکەی مەولەوی سەرلەنوێ پیابچێتەوە و لە چاپی بدا و منیش نوسخەییکی دەستنوسم بۆی ناردووە و ئەگەر بۆت ئەکرێ فۆتۆکۆپی ئەو نوسخەیەی خۆتیش بدە بە من تا بۆی ڕەوانە کەم و کەڵکی لێ وەرگرێ، فەرموی من خۆم لەگەڵ مامۆستا حەمە دا پەیوەندیم هەیە و بەسەرچاو لە رێ ی سوئیدەوە بۆی رەوانە ئەکەم. ئیتر من هەر ئەمانەم پێ ئەکرێ.

صِدیق بۆرەکەیی

٢٦٠٠/٨/٩

١٩٨٨/١٠/٣١

**نامەیەکی فزوڵیم لایە،**

**بابی تەسوفە لە هەرات نوسراوەتەوە.**

نامەی سەفوەت بۆ عیزەدین مستەفا

کاکە عزالدین هەردو چاوت ماچ اەکەم ١٩٦١/٦/١٨

نامەت بە تاریخی ٦/١٩ لە موسکووە نوسیبووا دونی پیم گەشت لە خوشی سەرکەوتنت بەسەر امتحانا هەمو لەشم اەفری کەم خوشی وام دیوە لە ژیانا خوا بە خۆشی بە یەک شادمان بفرمویت، پیری لە بەغدا گرابومەوە چوبووم بو ایشی خانەقا وە وەرگرتنی پارەی مەعارف کە بو معاونەی ایوە تخصیص کرابوو بەلام وەکو لەویوە بوم نوسیت مالیە موافقەی نەکرت دلگیر مەبە لە سایەی خواوە هیچ پیویستم بە پارە نیە خدا ایوەم بو بیلی بو من هەمو شتیکە ٣ کتیبت بۆ ناردبوم مخزن اسرار و لە دیوانی فضولی و مطلع الاعتقای گەشتن سوپاس.

گیانەکەم هەوڵبدە بەشکو انشاالله لە ساڵی دوایا اتروحەکەت بنوسە بگەریتەوە سالی پیشکەوتن گالتە نییە بو توش و بو ایمەیش وە هیوام وایە هەر وابیت ایتر هەر لە شوێنی رابی یت خوت اەیزانیت. خوا اگای لیت بیت ئەوەندە هەیە نامەمان لی مەبرە کتیبەکانی تریش بنیریت دەگات لەگەل دیاری بو دایکت لە سایەی خواوە فاروق لە هەمو لایەکەوە چاکە. بو تەموز بە ئیجازە دیتەوە بو ماڵی مامە محمود خوت مانو مەکە اەوەی نوسیویانە درویان کردوە تەنیا خوم و خوی یەک اەبینین خوا مناڵەکانی بە کەس نەدات.

گیانە دو شیعرە هی شیخ مەحمود اەلی: چون بخرم[1] این سفر پا از میان برداشتیم: دست از جاه جلال خانمان برداشتیم: صد هزاران نوجوانان را به خاک انداختیم: تا که زنگ کفر از کردستان برداشتیم

---

١ دەشێت (بمیرم) بێت.

جا بیخود کردبوی به غەزەلیک بزانم لای رمزی دستم کەویت بوت انیرم غەزەلیکی حەمدونم لە بەغداد بو ناردی نامەیەکی فضولیم لایە بابی تصوفە لە هرات نوسراوەتەوە شەویک کە سپای نادرشا دەوری هراتی گرتبوو بە زمانی فارسی ئەویش بو اەوی نوسیوە بوت اەنیرم لەوی لە ئازربایںجان زور بە قەدر بیت اەگەر لەوی نەبیت عەنتیکە اەژمیریت.

وا دوزیمەوە پی اەلین رسالەی صحت و مرض ناوی لە ناو تالیفەکانیا هەیەو پیویست نیە پیت بنیرم چیت لازمە بوم بنوسە نوری خیات پورزامان وا لیرە سەلاوی هەیە بەکرەفەندی و سەید حسەین و ماموستا بەشیر سەلامیان هەیە کاکە جەلال سەرخوشیم لی کرد لە زمانی تووە تا نامەت اگات او ابراهیمی مەلا مارف سەلامیان هەیە محمود اەحمد وە مەحمود توفیق بریاری رەوانە کردنی کتیبەکانیان دا هەردوکیان و فواد رەشید و مامۆستا موسی سەلامیان هەیە فەرهەنگەکە بە فواد گەیشتوە  مامە نەجم الدین چاوت ماچ اەکا اەلی بە جیا نامەت بو نوسی بویە لە نامەی منا باسی نەبو شیخ قادر وە مستەفا اەوە دایکت و باجیت و مالی سەید رەزا و اەحمد و مالی شیخ احوالت ئەپرسن سەروەر و یاسین و تحسین و دلسوز دەستت ماچ اکەن چیمەن و فەرەیدون دەست ماچ اکەن دلسوز کچی فاتمە و فەرەیدون کوری تەلعەتە دوای تو پەیدا بون سەلامم هەیە بو عەلی حاجی قادر و ماجد وە زەکەریا وە هەر کەس تو خوشت اویت دکتور محمود علی عوسمان دراوسیمان سەلامی هەیە احوالت ئەپرسی عبدالقادر وە جەلال و اەختەر و منالەکانیان وە جەلال احمد مەلا محی الدین چاو دەستت ماچ اکەن مامە محمودت چاوت ماچ ئەکات لە بیرم چو کوریک هەیە شیخ محی الدین برزنجی معلم دراوسیمانە زور سەلامی هەیە. ایتر لە پەنای خوا بیت

**چی لە راپۆرت نووسەکان ئەکەیت؟**

نامەی سەلاح شوان بۆ رەووف بێگەرد

خۆشەویستم کاک رەووف

نازانم تاکەی هەروا لەیەکتر ناگەین؟! راستە وەک عەبەسییەکان دەڵێن لێک گەیشتن گیروگرفتێکی گەورەی مرۆڤایەتییە، بەڵام خۆ ئەبێ هەوڵێکیش بۆ سووک کردنەوەی ئەم مەسەلەیە بدەین بە تایبەتی ئێمەی کە خۆمان بە هۆشیار ئەزانین.

تۆ بڵێی من ئاگام لەو فیکرە سۆفیزمە نەبیت کە د.ه. لۆرانس هەموو چیرۆکەکانی بۆ تەرخان کربوو، کە کورتەکەشی گونجان و تێکەلاوبوونی ئادەمیزادە لەگەڵ سرووشت وەکو سرووشت دا و، سروشت وەکو غەریزیە پاک و بنەرەتییەکانی ئادەمیزاد؟! تۆ بڵێی کاتێ باسی فەلسەفەی (کامۆ)، باسی (زۆربا) وەک نمونەیەک ئەکەم، بەبێ ئاگابوون لەم فەلسەفەیە باسیان بکەم؟!

نە وەڵاهی وە بیلاهی وە تەلاهی نە، من تیدەگەم و بەشێکی هەر گەورەی فیکریشمە، بەڵام کاکە ئەی چی لە

راپۆرت نووسەکان ئەکەیت کە ئیستا بە تایبەت چاویلکەی زەرەبینیان بۆ (بەیان) و بۆ ئەوانی تریش لە چاوکردووە، تا بڵێین: بزانە ئێمە ئەمان وت و ئیوە- واتە دام ودەزگاکە لەسەرەوە- باوەڕتان پێنەدەکرین[دەکردین]!

دوایی ئەو قسەیەی لەلای ئەو برادەرەش کردم، خۆ دوووڵای هەبوو، بۆچی هەر یەکێکی گێڕاوەتەوە، من وتم جاریَ ناڕوات و، با چەند ژمارەیەک بەبیَ هەڵا دەرکەین، ئەوساکە دەزانین چۆن وردە وردە بەرەو پێشەوە بچین، بەڵام ئێستا.. برا من هەر لە خۆت ئەپرسم: خەڵکەکە، نەک هەر تەنها راپۆرت نووسەکان، یەکەم سەرنج چۆنی لێک دەدەنەوە؟ زەلامێکە بێزارە لە هەواپیسەکەی شار و ئەچێتە دەرەرەوە و تیکەڵ بە جوانی و عەفەوییەتەکەی سروشت ئەبێت و پاشان بە ناچاری ئەگەڕیتەوە شارە بۆگەنەکە. نوکتەیەک هەیە ئەڵێت: زەلامیَ لە مریشک ئەترسا و خۆی بە دانەوێڵە ئەزانی، دکتۆر پێی وت پێویست ناکا وابیر بکەیتەوە، چونکە تۆ ئادەمیزادیت و دانەوێڵە نیت، کابراش وتی، من ئەزانم وایە، بەڵام کیَ مریشەکەکان تیَ ئەگەیەنێت کە من دانەوێڵە نیم!

ئینجا چاوەکەم من خۆشم ئەزانم تۆ ڕاست ئەکەی، بەڵام مەسەلەکە لەلای من نییە و، کە ئەڵێم ناڕوات ئاگام لە جۆری تێگەیشتنی مریشکەکان هەیە. بەهەرحاڵ چیرۆکەکەم داوەتە کاک حسەین و چەند برادەریکی تریش، ئەگەر رایان لەسەر بوو لە ژمارەی داهاتوودا ئینشائەڵا بڵاوئەبێتەوە، وەڵا زۆریش حەز ئەکەم، بەڵام ناوێرم. کورە ئەی ئەگەر تۆ لەمە تێناکەی، کێ تێبگات؟! بۆ نازانی ئێستا هەموو شتێک هەر بە لای (حەقپە- سیاسەتە) کەدا دەبرێت و وای لیهاتووە ئادەمیزاد لەلای ئێمە لەم زەلکاوە زیاتر نابینێت.. ئیَ چیبکەین؟! وا وایە.

بۆ کۆرەکەش بە زۆربەی ئەو برادەرانەم وت، زۆرمان پێخۆشە و سووپاست ئەکەین، بەڵام توخوا با نەبێتە گەرە لاوژەی شیعر خوێندنەوە، تاکەم و پوخت تر بێت باشترە.

ئەو شتانەشی بۆ هاوکاریت ناردووە، کاک حسەین [عارف] ئەڵێت: یەکەم وەرگێرانە و دووەمیش جارێ خراپ لێک دەدرێتەوە، واتە جارێ.. بەلام با وای لێنەیات[لێنەیەت] هیچیان بۆ نەنێرن.

سلاوی سوهاو شوانی خزمەتکارتان و خۆیشم بۆ شوکریە خان، کە هاتیت بۆ کۆرەکە بە ماڵەوە دێم و ئینشائەلا سەرتان لێ دەدەین، بێ قەزابی ئەوەندەش دڵناسک مەبە بەتایبەتی لەم جەنگەڵەدا کە ئێمەی تیا دەژین.

تێبینی: کاک حسەین ئەڵێت لەبەر ئەوەی زۆر ئاشکرا نییە

قابیلە بڕوات، بۆیە خرایە ژمارەی داهاتووترەوە.

سەلاح شوان

مەبەست چیرۆکەکەتە... ببورە لە ڕایەکەی پێشووم

بەیانی ١٠:٢٣ ١٩٧٧/١٠/٢٢

**تا ئەبەد مەمنونی ئەو کەسەم،**

**کە یەکەمجار شیعری تۆی بۆ خوێندمەوە.**

نامەی سەید عەلی سالحی بۆ لەتیف هەڵمەت

هاورێی نەبینراو بەڵام ئازیزم، شاعیری گەورە بەرێز لەتیف هەڵمەت

سڵاو ..رێز لە رۆحی مەزن و پەیڤ و شیعری شایستە وگەورەی ئێوە دەگرم. ساڵانێکە لەرێگەی وەرگێڕانەوە بە شیعری تۆفانئاسا و بەهێزی ئێوە ئاشنام. ئێوە، بێکەس، پەشێو و رەفیق سابیر، لەیەکەمینی ئەو شاعیرانە بوون کە ـ بەدرێژایی نۆزدە ساڵی پێشوو ـ تا ئێستا پێی ئاشنابووم. هەرچەندە کوردی نازانم، بەڵام لەو رۆژگارە دوورەدا بۆ یەکەمجار کە ناوی ئێوەم بیست پرسیم ئایا وشەی هەڵمەت، هەر هەمان هێرشی لەناکاو نییە؟ هاورێی کوردەکەم "بەرۆژ ئاکرەیی" خەڵکی سلێمانی کە ئێستا لە سویدە- وتی: بەڵێ! و بە زاری خەڵکی بەختیاری و خێڵی منیشدا هێرش بە (هەڵمەت) ناودەبەن. و ئیدی بەدوای تێگەیشتن و کەشفی شیعرەکانی ئێوە، هەموو ئەگەرێکم خستەکار. بە دانپێدانانی زۆر کەس من توانیم وێنەیەکی رۆشن لە هەلومەرجی شیعری ئەمرۆی کوردی بە ناوەندی ئەدەبی ئێران بناسێنم. چەندینجار شیعرێکی ئێوەم ـ بەزمانی ئەسڵی ـ دەست دەخست، شەوان رێگەیەکی درێژم دەبڕی تا بگەمە هاورێیەکی کورد. شیعرەکەی ئێوەم دەدایە دەستی و دەستبەجێ دەموت: خێراکە! وەری بگێڕە، سەرزای وەریبگێڕە، ئەمەوێ بزانم هەڵمەت چی وتووە.لە ماوەی سی ساڵ کاری بەردەوامدا لە بواری شیعر، لە ناو هەر میللەت و نەتەوەیەکی سەر ئەم هەسارەیە لانیکەم چەند شاعیرێک دەناسم. لە مەغولستانەوە تا چین و تا زیمبابۆی و تا نیکاراگۆی و دورگەکانی ترینیناد، بەڵام شیعرەکانی ئێوە و شێرکۆ و ناوە دیارەکانی دیکەی کورد لای من شتێکی دیکەن، بەدەگمەن کەس هەیە لە ئێراندا وەک من هەموو کون و قوژبنەکانی ئەو هەسارەیەی لە پێناو شیعری نایابی رەسەن دا سۆراخ کردبێت. لە چاوپێکەتنێکدا وتم شیعری

کوردستان شیعرێکی جیهانییە. لەتیف هەڵمەتی ئازیز ببورە کە بەقەڵەمی سوور دەنووسم، قەڵەمەکانی تر تەواو بووبوون. هاورێ کوردەکانم سەردانی ئێران (تاران) یان کردبوو، وتیان لەتیف هەڵمەت دەبینن. لای خۆم وتم با چەند دێرێک بۆ لەتیف بنوسم کە ئێجگار شاعیر و بەتوانا و ئینسان و گەورەیە! لەرێگەی پەیوەندی لەگەڵ شیعرەکانی ئێوەدا، وەک بڵێی هەزار ساڵە ئەتانناسم. تا ئەبەد مەمنونی ئەو کەسەم کە یەکەمجار شیعری تۆی بۆ خوێندمەوە.[1]

لەگەڵ رێز و خۆشەویستی زۆرم:

هاورێتان: سەید عەلیساڵحی

با احترام و علاقهٔ بسیار:
دوست شما: سید علی صالحی

[1] ئەم نامەیە بە زمانی فارسی نووسراوە.

**لێره دا مافیای ئەدەبیش هەیە.**

نامەی سوزان سامانجی بۆ ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل

خۆشەویست ئەحمەد ئیسماعیل ..

لە پێشدا سوپاست دەکەم بۆ ئەو هەڵسەنگاندنە جوانەت. چیرۆکەکانت و ئەو هەڵسەنگاندنە نیشانەی شارەزایتان دەردەخات.. نووسەر جوان نییە باسی بەرهەمەکانی خۆی بکات، من لەمەدا خۆم دەدزمەوە، بەڵام ئێوە لێرە نەژیاون و وەکو پێویست شارەزای ناوەندە ئەدەبییەکەی ئێرە نیین، بمبورە کە ناچارم ئەمەتان پێ ڕاگەیەنم: وەکو کوردێک بە تورکی دەنووسم، توانیومە لە ناو ئەدەبی تورکی دا جیگای خۆم بکەمەوە و شوێنێکی دیارم هەیە، کتێبەکانم لە دەزگا بڵاوکراوە ناودارەکاندا چاپ دەکرێن و لە بارەی چیرۆکەکانمەوە کتێبێکی ١٧٠ لاپەڕەیی بڵاودەبێتەوە ئەمساڵ دەکەوێتە دەستی خوێنەران.. باردۆخی ناوەوەی تورکیا دەزانن، نووسەرێکی کورد هەرچەند باشیش بنووسێ، نایانەوێ پێشکەوێ و ناودار بێ، ئەگەر دەست لە ناسنامەی خۆی هەڵگرێت و ئینکاری بکات هەموو دەرگاکانی بۆ واڵا دەبێت، لێرەدا مافیای ئەدەبیش هەیە.

بەلای منەوە هەڵوێستی نووسەر زۆر گرنگە زەمەن و مێژوو و هەموو شتێک ئاشکرا دەکات. هەست دەکەین چی دەنووسین، ئەو هاوڕێ خۆشەویستانەی وەک تۆشن دەزانن ئەمەش جێگای خۆشحاڵییە..

رۆمانەکەم کە بڵاوبۆتەوە "ڕۆمانێکە بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە نادات".. بەڵام لەبەر ئەو شەڕەی لە ئارادایە و واقیعی کوردیمان نووسیوە خۆیان لێ نزیک نەکردەوە، بەلامەوە ئەستەم نییە.. چیرۆکەکانم وا بۆ زمانی فەڕەنسی وەردەگێڕێن.. دەمەوێ چیرۆکەکانت بخوێنمەوە، بە وانەی سەردانی دیاربەکر دەکەن دەتوانی بۆمیان بنێری دەتوانم لێرە بە چاپیان بگەیەنم، ئێمە دەبێ یارمەتی یەکتر بدەین.

نازانم ئەو کتێبەی کە لەبارەی چیرۆکەکانمەوە بڵاوبۆتەوە کە لەلایەن ڕەخنەگر "توفان ئاربارشتران"ەوە نووسراوە، بۆم ناردووی؟[1]

هیوای بەردەوامی و سڵاو و ریزم

سوزان سامانجی

[1] ئەم نامەیە بە زمانی تورکی نووسراوە و وەڵامی نامەی "ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل"ە کە لەم کتێبەدا هاتووە لە لاپەرەی (٦١) دا یە.

## من و تۆ بەرهەمی هەڵکەوتێکی سەرسوڕمێنین!

نامەی سیمین دانیشڤەر بۆ بەڕۆژ ئاکرەیی

هاوینی ١٩٩٤

سۆمای چاو و خۆشەویستی نەبینراوم بەڕۆژ... چ نامەیەکی جوانت نووسیبوو، کە ناچاری کردم دەستبەجێ وەڵامت بدەمەوە. لەو نامانەی بە دەستم دەگەن، لە بیست دانەیان، وەڵامی دوو- سێیەکیان زیاتر نادەمەوە. هەرچەند نامە بێوەڵامەکان پڕ بن لە مامەحەمەیی و سەرم بە سەرشیر بزانن.

من نەمگوتووە گریان شتێکی خراپە و نەیشمگوتووە، کە پێکەنین دەبێ و دەتوانێ شتێکی چاک بێت. جارێ ڕۆژگارەکەمان بە شێوەیەکە کە نە دەتوانین پێ بکەنین و نە تەنانەت بگرین، ئەمەیش خراپترین شێوەی ڕوودانەکانە، بەڵام من لە ژیانی خۆم و دیتران دەڕوانم. «شاد بژی لەگەڵ چاوڕەشانی شاد». ئەرێ تۆچاوانت ڕەشن؟

لەم دنیایەدا دەرفەتمان کەمە و بۆ نابێ ئەم دەرفەتە بە هەل بزانین، لە دنیاکەی دیکەیشەوە هیچ کەس نەهاتووەتەوە، کە بزانین هەیە یان نا؟ تا ئەو جێیەیش، کە زانستی مرۆ بڕ دەکا، دەزانین کە لە نێوان ئەم هەموو ئەستێرۆکەیەدا تەنیا لەسەر گۆی زەوییە، کە ژیان ڕسکاوە. کەواتە من و تۆ بەرهەمی هەڵکەوتێکی سەرسوڕمێنین، کە زیندوومانەوەیە، ئێمەیش چاکترە ئاهەنگی ئەم هەڵکەوتە بگێڕین، چونکە مرۆڤ لە شادیدا، مرۆڤترە تا لە خەمدا. خەم ڕەگوڕیشەی مرۆڤ وشک دەکا. ڕاستە کە جیلی ئێمە و جیلی تۆ، جیلێک بووە سەرڕێژی ترس و سەرگەردانی و بێ ئۆقرەیی، بەڵام لەوانەیە جیلەکانی مرۆ هەر هەموویان بەم چەشنە بووبن و ئێمە نایزانین. تۆ مافی خۆتە کە بە کوردی بگری و بە فارسی پێبکەنی، چونکە قاچت لەسەر پانتایی ئەم زەوییە قایم نییە، هاوجیلەکانی منیش، قاچ لە هەوا بوون و هەن. کەواتە دەبێ «ئێستازەدە» بین، بە واتای سات بە هەل زانین. نەک «ئێستازەدە»یئێرانی، بە واتای هەرچییەک دەبێ با ببێ. ژیانی بە تەمای خودای. ژیانی بەردەوام بیستنی بۆنی گریان.

خەڵکی ئێمە، (ئێمە میللەت بە واتای Nation نین) خەڵکانێکن پسپۆڕی شینگێڕی. سێ مانگ لە دوازدە مانگی ساڵ، بۆ شینگێڕی تەرخان کراوە. موحەررەم و سەفەر و ڕەمەزان. دوازدە ئیمامان هەن کە هەر هەموویان شەهید کراون

(جگە لە دوایینیان کە غەیب بووە – دەستغەیبا، گیان گڕی گرت لە چاوەڕوانیی تۆدا/ کوا دەرکەوتنت؟ درەنگ کەوت کاتی هاتنت) دوو مەعسوومی دیکەیشمان هەن، کە کۆچیان کردووە. کەواتە لە ساڵدا دەبێ بۆ١٣ کەس بگرین. ئایا هەمان "دیوانی شەمس" کە تۆی شەیدا کردووە و منی واقوڕماو، بەردەوام بانگێشتی شادیمان ناکا؟ ئایا ناڵێ: من گریان بووم، بووم بە خەندە، ناڵێ خەم ڕۆیشت و گریان ڕۆیشت؟

ڕاستە کە تەنیایی نەساغییە هەرە باوەکەی ئەم چەرخەیە، ڕاستە کە زۆرتر دەستەویەخەی شتگەلی پڕوپووچین، بەڵام تۆ بیرمەندان بدۆزەوە و هاودەمی ئەوان بە. هەرچەند وەڵامی شیعرە کوردییەکەی تۆ لە فارسیدا لەم چەشنە بێت: "لەگەڵ سەدهەزار کەسدا تەنیام، بێ سەدهەزار کەس تەنیام". شیرازییەکەیشی دەبێتە: ئامان، کە لەگەڵ تۆدا هەڵناکرێ، ئامان کە بێ تۆ هەڵناکرێ. واتا نە لەگەڵ تۆدا دەکرێ و نە بێ تۆ.

بەڵام تۆ، ئەی بەڕۆژی خۆشقەڵەم، بیر لەو شتانە بکەوە کە خاوەنیانیت. بەڕاستی قەلەمێکی بێوێنەت هەیە و چ باشتر لەوە، کە دەتوانی بە دوو زمان بنووسیت. کەواتە بنووسە و بنووسە، دەنا: گوڵشەن دوانە گەر سیس هەڵگەڕێت/ هەر گەمژەیەک بە دڕکەزارت دەزانێ. سەیرە، هەر لە بەیانییەوە کە تەمام گرتووە نامەت بۆ بنووسم، ئەم شیعرە لە زەینمدا دێت و دەچێت، کە دوو دێڕی بەر تۆ کەوت. کچێکی ژیر و وشیارت هەیە. تۆ گەنجیت و ئەم هەموو دەرفەتەت لە پێشە. لە وڵاتێکی شەختەگرتوودا دەژیت، کە هەر هیچ نەبێ خەڵکەکەی چاوچنۆک و فریودەر نین و دەتوانیت چیرۆکەکانت بە ئاسانی چاپ بکەیت و گەلێک شتی دیکەیش. ئەو شتانە فەرامۆش بکە کە خاوەنیان نیت. بەڵێ دەکرێ.

بابێینە سەر چیرۆکی "دزرێک لە ئاوێنەدا". چێژم لە خوێندنەوەی بینی، بەڵام لەژێر کاریگەری گوڵشیریدایت. بە هەمان شاردنەوەی ڕاستینەکان و دۆخە کافکاییەکان و بنەماگەراییەکی زێدەڕۆیانە و ناکڵێشەبوونێکی ستایشئامێزەوە. ئێستا بیر لەوە بکەوە کە ئەگەر حەزت کردبا ئەم چیرۆکە لە ئێراندا بڵاوبکەیتەوە، جارێ هیچ گۆڤارێک خۆی نەدەخستە ئەو مەترسییەوە، کە بڵاوی بکاتەوە. ئەگەریش سەرنووسەرێکی بێ کەللە قبووڵی کردبا، دەبوایە بینێرێتە بەشی سانسۆری "ئیرشاد" و تێبینییەکانی ئیرشادیش لەم چەشنە دەبوون: ١- بۆچی پیاوێکی نامەحرەم تەلەفۆن بۆ ژنێکی نامەحرەم دەکا و ژنەکەبۆچی،

خرکەبەردێک ناخاتە ژێر زمانییەوە تا پیاوەکە دەنگی ڕەسەنی ژنە نەبیسێ؟ ٢- بەشی گۆڕستانەکەی باشە. چاکترە ئەدەبیات هەر لەمەر گۆڕستان بدوێ. بەڵام لە باتی خاچ، "انا لله و انا الیە راجعون" بخرێتە بەرچاو. ٣- بۆچی کەسایەتییەکان مەشرووب دەخۆنەوە؟ حەرامە. لە باتی مەشروب با پارس کۆلا (هەمان پیپسی کۆلاکەی زەمانی شا) بخۆنەوە. ٤- بۆچی ژنەکەی ناو چیرۆکەکەت پیاوێکی نەناس و بێگانە دەباتە نێو ژوورەکەی خۆیەوە؟ دەبێ مەلایەک سیغەیان بکا، یان خۆیان خوتبەی سیغە بخوێنن. دەنا ئەم کارەیان زینایە و دەبێ شەللاق بدرێن یان سەنگسار (قصاص) بکرێن. باقییەکەیشی خۆت بیری لێ بکەوە.

ژیانت لە خۆت تاڵ مەکە و بێتاقەتبوونەکەیشت بە هێند وەرمەگرە. هەموو شتێک تێدەپەڕێ. ئێمە دەبێ گرفتەکانی ژیانمان بە پێی ئیمکاناتمان چارەسەر بکەین. لەو شوێنەی کە تۆ تێیدا دەژیت، ئیمکاناتێکی زۆرتر هەیە. لێرە ڕۆژبەڕۆژ باسی لابردنی گرژییەکانی دوێنێ دەکرێ، چونکە ژیانی ئێمە لەم وڵاتەدا ڕێک وەکو سەردەمی "ستالین"ـە.

بۆچی ئەم مافە بە خۆم دەدەم، کە بە هۆی تەمەنی زۆرمەوە، گەنجێک بخەمە بەر تیروشیری پەند و ئامۆژ، هەرچەند دڵمی داگیر کردبێت؟ مەگەر من چکارەم؟ هەر کاتێک لە قسە زل زلەکانم ماندوو بوویت؛ بنووسە و لە وەڵامدانەوەیشدا پەلە مەکە. کەی تاقەتت هەبوو وەڵامم بدەوە...

لەگەڵ جوانترین ئارەزووەکانمدا بۆ دڵخۆشی و پڕبەرهەمبوونت/ دایکی خۆت کە لە ئەستێرەیەکی کز زیاتر نییە و تۆ نووسیبووت مانگ.

بە هیوای ڕوانینێکی تازە بۆ ژیان لەلایەن تۆوە، یان لەوانەیە لەلایەن منەوە!

سیمین دانشڤەر

**ڕەوا نییە!**

نامەی شکور مستەفا بۆ ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل

بەڕیز کاک احمد محمد ئیسماعیل

سڵاو ...

دیاریەکەتم وەرگرت، پیرۆزباییت لێ دەکەم. کوردییەکەی ڕەوانە، دەستت خۆش بێ.

لە ئەورووپا لەمەڕ ئەم ڕۆمانەی

یەشار کەمال یەک دوو ڕەخنەم

خوێندەوە، لایان وایە "دایک کوشتن" بە هەر بیانگەیەکەوە بێ، ڕەوا نییە...

ئیتر خۆشیتان

مەلا شوکور

١/ ٢٠٠٢/٤

**ڕەخنە لە کچی قازیش دەگرێ...**

نامەی شکور مستەفا بۆ محەممەدی مەلا کەریم

هەولێر ١٩٩٩/٢/٧

برای خۆشەویست و تێکۆشەرم حەمەی برام

برادەر زۆرتان بیردەکەم، بێ تۆییم پێوە دیارە. من ناڵێم وەڕزم، بەڵام بۆ خۆت دەزانی دەگەڵ بارودۆخێکی تازەنەفەسدا ڕاهاتنی هێندێکی سەبر دەوێ. برادەر، فەرمووبووت دەگەڵتدا ساردیم نوواندووە، باوەڕبفەرموو ئەوەندە یان ساردوسڕ بەبەرگوێمدا درابوو، وام دەزانی زۆرم لێ زوێری، منیش نەم ویست زۆری لەسەر بڕۆم، من کابرایەکی کەمێ سەرەڕۆم، بەڵام ڕکم لەکەس نابێتەوە ناو بە ناویش کە تامی زارم دەگۆڕێ، تۆ دەزانی ١٨ کەسی زۆر نزیکم ئەنفال کراون... ئەوانەی کە ئەنفالیشیان کردون عەرەبی حەوێجەن... من بۆ خۆت دەزانی هەژار بووم و ئێستاش دەستی چینەکیم تا دێ تیدا تیژتردەبێ، ئەوەش بزانە پێش وەی ئیسلام بم، شی بم، هەستی کوردایەتیم تیدا گەرمتربووە و هەرواش دەبم، ڕەنگە عەیبیش نەبێ. فەرمووبووت موڵکیەتی فەردی، نەخێر برادەر، من هیچم نییە، هەر ئەوەندەم سەروبەر مانگێکی پێ بەسەر بەرم.. دەی نەیسە نامەکەتم زۆر پێ خۆش بوو، فەرمووتە عادیل گەرمیانی کاغەزت دێنێ، چم بە دەست نەکەوتووە. ئەو کوڕە رام سپارد، سەرم بدا، هێندێ شتت بۆ بنێرم سەری نەدامەوە.. بە فەلسەفیم گوت شتت بۆ بێنێ گوتی بارەکەی قورسە و ناکارێ و بۆ جارێکی دی. وا ئەوانەم ئەم جارە دەگەڵ ناردون..تکا دەکەم گوێ مەدە قسەی پیاوی حەسوود و قسەلۆکچی..

کاکە حەمە تا ئێستا دوازدە ئاڵقەم لەسەر ئەحمەدی خانی نووسیوە، ڕەنگە کە بۆم ناردون و خوێندتەوە بفەرموون کاکە مەسعود ئاسایی زۆرم درێژدادڕی کردبێ، بەڵێ ڕاستە، بەڵام ویستم پێشینەی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵەکێتی

خانی زۆر ریشەدارتر و داوێنەدارتر بنووسم، ڕەنگە بە ڕای خۆم کارێکی خراپم نەکردبێ. زۆر منەتبارم بۆ ناردنی هێندێ کتێب، أبو مروان هیچی لای من نییە، ئەدۆنیسەکەم هەر زوو داوەتەوە، لە بیری نەماوە. ئەگەر لام (بووایە) لە ناو کتێبەکانم دا دەبوو. بۆ بابانەکەش پیم وایە مامۆستا مەلا جەمیل هیچی وای وای[1] ناخاتە سەر و لێی گەڕێ، ئەمن لەبیرمە لە تەرجەمەکردنی ئامون بەگەکەدا، چی دەکرد.. مامۆستا بۆ خۆی دەڵێ "من کەس لە خۆم پیاوتر و زاناتر نازانم" وەک دەڵێن: "ڕەخنە لە کچی قازیش دەگرێ". زۆرم پێ خۆشە تەشریف بێنی و لێرە کارە سەروبەرنێین. فرسەتە بەڵکو بۆمان لە چاپ دەن. ئەگەر هاتی ڕەنگە شتی دیکەش هەیە بیکەین. واخەریکە جەلیلی جەلیل و شاکیرۆف و شامیلۆف کەمەندکێش کەم. وەرە بچین بۆ ئەرمەنستان، خەریکین کۆنگریەک لە ئەورووپا بگێڕین.. نازانم کەی بڕیاری دوایی دەدەی بۆ یەکلاکردنەوەی هاتنت؟ جەژن چوومە لای عەتیە خان، باشن. نازانم عیززی لە چدایە؟ برادەرانی (شینی) ڕێزیان هەیە... حەزدەکەم زوو بێی. سەرێکی ئەبو سۆران بدە، و با کاغەزم بۆ بنووسێ. دەستی مامۆستا ماچ دەکەم سەلام لە کاک سەلاح دەکەم، چاوی منداڵان ماچ دەکەم، سڵاو و ڕیزم بۆ کاک سەعید، پەروین سڵاوتان لێ دەکات، دەیگوت، کاکە حەمە دەیگوت تۆ خۆشکی گەورەمی، ئەی بۆ سەریکی لەم خوشکەی نەدا؟ سڵاوم بۆ شیرین خانم. کاکە برا بە د.حەسەن بفەرموو، ئەگەر تەرجەمە عەرەبییەکەی "حروفیە"شم بۆ نانێرێت، با کتێبەکەم بۆ بنێرێت، جارێکی دیکەی وەردەگێڕم. بە مریەم خانم بێژە زوو یاداشتەکانی قازیم بۆ بنێرێ..بڕی نامەم بۆ برادەران نووسیوە، وتارمان، بۆ کۆواری تازەنەفەسی کۆڕی زانیاری کوردستان بنێرن، بۆ خۆیشتم نووسیوە، نامەکانم بەهۆی مامۆستا مەلا جەمیلەوە ناردوە بۆ کۆڕ...نەختێ دنەی د.کەمال مەزهەر بدە، بنووسێ. حەوت ڕەحمان، لە خۆرایی خۆی کردووە بە دەمڕاستی ئەولا و بێ شان ئارداوی کردنی بەلاش هیچی دیکەی لە باردا نییە. بە ئەبو مەروان بڵێ دیاری بۆ دەنێرم. شکور مستەفا ئیتر خۆشی

[1] هەڵەی تایپ نییە

**ێر بە دێر، موو بە موو...**

نامەی شکور مستەفا بۆ محەممەدی مەلا کەریم

برای خۆشەویست و ئازیزم کاکە حەمە.

چۆنی چاکی؟

کاکە برا نامەکەتم دوێنێ ١/٣ بەدەست گەیشت، زۆر سوپاس هەرچییت نوسیوە منیش دێڕ بە دێر، موو بە موو خوێندمەوە.

بۆ هاتنت خودا یار بێ دێی. بۆ کتێب ناردن بۆت دەنێرم. ئەوەی لەسەر خانیم نوسیوون، بە راستی هەرچەندە دوازدە ئاڵقەم لێ بڵاو کردۆتەوە، بەڵام زێتر هەر باسی پێشینەی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵەکی و ڕۆشنبیری خانیم کردووە، بەڵێ لە پێشان لەمەڕ هونەرو داهێنان و ئیستاتیکای ئەدەب و هونەرم نووسیوە، ئەویشت بۆ ئەنێرم.

مەسەلەی هاتنیشت: زۆرم مەبەستە....

پەنیریشت بۆ دەنێرم .. بەداخەوە مامۆستا مەلا جەمیل هەنگوینی سیدەکانم کە بە تایبەت بۆ هاتبوو، بۆم ناردووە، کەچی دەڵێ شیرە شەکری بازاڕی بۆ ناردوم..

بۆ وتارەکەت جارێ هێشتا بەبەریەوە هەیە خەریک بە بەڵکو فریای ئەم ژمارەیە بکەوێ.

کاکە بۆ دیدەنی برادەرانی ئەولا وا دیارە خۆم سەردانێکیان دەکەم.. لە پاریسەوە بۆ مۆسکۆو تفلیس و باکۆ و تا شکەند و ئەڵماتەو شوێنانی دیکە دەڕۆم —بەینی خۆمان بێ- ئەگەر زوو هاتی قسەی لێ دەکەین.

سڵاوی زۆرم بۆ شیرین خان و کاک سەعید چاوی منداڵان ماچ دەکەم، دەستی مامۆستا ماچ دەکەم سڵاو لە صلاح دەکەم. پەروین و ژیان و زاگرۆس دەستتان ماچ دەکەن، چاوی منداڵان ماچ دەکەن. سڵاو لە ئەبو سۆران دەکەم، سڵاو لە کاک خوسرەو دەکەم سڵاو لە هەموو برادەرانی کۆڕ دەکەم.

ئیتر هەر بژین

شوکور

١٩٩٩/٣/٧

**لێرەش سەدای هەبوو...**

نامەی شێرزاد حەسەن بۆ ئارامی کاکەی فەلاح

ئارام گیان ..سڵاو ..نامە جوانەکەتم بە دەست گەشت و دڵخۆشی کردم، چیرۆکەکانتم بە دل بوو، بەڵام لە هەموویان جوانتر (بەیازی گولفرۆشەکان)[1] بوو، بەڵام تۆ خەمخۆری ئەدەبی و پێشکەوتووی، دیارە دوواجار خوێندنەوە و مەعریفەتی زۆر، و تێروامان و ئەزمونی ژیان دەوڵەمەندترمان دەکات!

بابەتەکەت لەسەر بەختیار[عەلی]جوانە و هەوڵدەدەم لێرە بڵاوی بکەمەوە .بەڵام هیوا قادر حەز دەکا تا لە (ڕەهەند) بڵاودەبیتەوە، وا چاکە من لێرە دوای بخەم!

هەردوو چیرۆکەکەت یەکیکیان دەدەم بە گەلاویژی نوێ[2] و ئەوی تریان بە ڕامان[3] هەر دووکیان لە کوردستان تا ئێران بڵاودەبنەوە. پێم خۆشە کە لە ڕەهەند[4] چاوپێکەوتنەکەی منت خوێندۆتەوە و بەدڵت بووە، لێرەش سەدای هەبوو... ئەرێ براکەم تۆبۆچی سەرێک لە سلێمانی نادەی؟

من گەڕاومەتەوە سەر ئیقاعی خۆم و لیرە ئاسوودەم، سەدەها شت هەیە لێرە، بۆ من کە سەرقاڵ و خۆشحاڵم بکات..بۆ من ئەوروپا یان با بڵیم فیلەند هیچی تیانەبوو جگە لە ئازاری ڕۆحی و تلانەوە، من ئێستاکە لە ڕیکخراوە( UNESCO) کار ئەکەم و حاڵم باشە، بەڵام کاتم بە ئیشەوە زۆر

---

[1] بەیازی گولفرۆشەکان لە ناو کۆمەڵیک چیرۆکی تر دا بە هەمان ناوەوە بڵاوبۆتەوە، بڕوانە:
ئارامی کاکەی فەلاح، بەیازی گوڵفرۆشێک، لە بڵاوکراوەکانی نێوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی، ستۆکهۆڵم ١٩٩٨.

[2] گەلاویژی نوێ: گۆڤارێکی ئەدەبی و ڕووناکبیرییە، بنکەی ڕووناکبیریی گەلاویژ دوو مانگ جارێک دەری دەکات.

[3] ڕامان: مانگانەیەکی ڕۆشنبیری گشتییە- ڕامان دەری دەکات لە هەولێر.

[4] ڕەهەند: ناوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی بڵاوی دەکاتەوە.

ئەڕوات و وەختی خوێندنەوە و نووسینم کەم ماوە، بەڵام هەر هەوڵ دەدەم لە کات بدزم!

پێم خۆشە ـپیاسەی پەپولەکانی ئێوارانتـ[1] دیوە هەندێ لەو شێوازە ناسکانەم لا خۆشە، ئەمەیان زیاتر قەسیدەیەکی کراوە بوو، بوو بە چیرۆک، هیوادارم چاک و ساغ بیت، چاوەڕی نامەیکی درێژترم بە، ئەمەیان کەمێ پەلەم تیاکردووە.

چاوت ماچ ئەکەم، هی خێزانەکەت و منداڵەکانت..

سلێمانی

٣١/٧/٩٨

شێرۆ .ع

[1] ڕەنگە مەبەست لە چیرۆکی پیرە پەپوولەکانی ئێواران بێت.

**یەکەم پێشوازیمان بە گوللە بوو!**

نامەی شێرزاد حەسەن بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

سلێمانی/ ژوورەکەی خۆم ١٩٩٨/٤/١٠

ئێوارەیەکی دڵگیری بەهارە و زەردەپەڕە.. من هێشتا بڕوا ناکەم وام لە سلێمانی.. بۆ خۆم شادومانم، بەوەی گەڕامەوە ناو خەم و میحنەت و سۆز و ڕق و موحیبەت.. دنیایەکی تێکەڵ لە جوانی و ناشیرینی.. دنیایەک کە ئاشنام پێ ی.. دونیایەک کە دەبێ لێی نزیک بم.. چونکە دونیایەک قەرزم لە سەرەو دەبێ بیاندەمەوە.

ئەنوەر گیان.. دیارە هەمیشە بیرت دەکەم و لێرە لە لای هەمووان باسی گەورەیی و جوانی و ماندوێتی تۆم بۆ هەمووان کرد. من پەشیمان نیم لەوەی فینلەندام بە جێ هێشت.. جوانە بۆ خەڵکی خۆی، بۆ کەسانێک کە لەوێ خۆشەویستیان دۆزی یەوە.. نانێک..ماڵێک.. تەنها شتێکی جوان بۆ من ئێوە بوون.. ئەو چالاکی یەش کە لە موکولا بوو.. ئەو پردانەش کە لەگەڵ ئەدیبانی هەندەران دروستم کرد..!

پاش ئەوەی منتان جێ هێشت لە ناو قیتارەکە، زۆر گریام.. لە دووری ئێوە.. دەیەها خەم و ماڵئاوایی ترم هاتەوە یاد بۆیان گریام..! سێ شەوی تر لە هێلسنکی بووم و بەرەبەیانی ٣/٢٣ گەیشتمە دیمەشق.. شارێکی جوان و ماندووە.. هەژارە بەڵام هێمنە.. دوو هەفتەی خۆشم لێ بەسەر برد.. دوو ڕۆژ پێش جەژن گەیشتمە سلێمانی.. شەو لە دهۆکەوە یەکسەر بۆ سلێمانی.. لەگەڵ میدیای ڕەئوف بێگەرد و مێردەکەی چووینەوە سلێمانی.. سەعاتی دوانزەی شەو لە ڕێگای نزیک دۆڵی بالیسان چەتە و دز بۆمان دانیشتبوون.. تەقەیان لێکردین.. سەیارەکە نەوەستا.. سێ گوللە بەر دەرگاکە کەوت و بەر خۆمان نەکەوت.. ناچار هەر زوو لە گوندێکی ناو دۆڵی بالیسان ماینەوە و تا بەیانی لە ماڵی کابرایەکی هەژار نووستین.. بە ڕێکەوت نەمردین. واتا یەکەم پێشوازیمان

به گولله بوو.. که سەیری شوێنی گوللەکانمان دەکرد.. تاس دەیبردینەوە.. ئیدی نازانم رۆژهەڵات و کورد و فەوزاکانی.. بەڵام گرنگ قەناعەتی خۆم.

گیانی گیان.. هەر ئێستا عەلی هات، کە دێتە هێلسنکی و ئەم کاغەز و کارتانە ئەو دەیانهێنێ.. بۆیە زۆر بە پەلە بەشی دووەمی ئەم نامەیەت بۆ تەواو دەکەم.. لە دەرفەتێکی تردا لە وردەکارییەکانی ئێرە دەدوێم.. ئێرە وەک جاران نەماوە قسەی خۆمی تیا بکەم، دەبێ کەمێ ئاقڵ و بێ دەنگ بم.. هەرواش دەکەم.. گرنگ ژوورەکەم و خەمە بچکۆلەکانی خۆمە.. نامەوێ چیتر کەژاڵ و منداڵەکان هیلاک بکەم.

شیعرەکەت وا لە گەلاوێژی نوێ.. هەموو دەڵێن قەڵەمەکەی ئەنوەر جوان بووە.. منیش هەروا دەڵێم.

دەی دامنابوو نامەیەکی درێژت بۆ بنووسم.. بەڵام هاتنی کتوپڕی عەلی لێی تێک دام.

ئەو شەوە باوکت دەستی لە ملی کردم.. گوتی وا دەزانم ئەنوەر هاتۆتەوە.. منیش گوتم: من ئیدی بۆ ئێوە ئەنوەرێکی ترم. چاوتان ماچ دەکەم.. بیرتان دەکەم.. هەزار و ئەوەندە جار لە باوەشتان دەگرم.

برات/ شێرۆ

**به دەست خەیاڵەکانی خۆمەوە هەلاهەلام...**

نامەی شێرزاد حەسەن بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

٢٠٠٠ نەورۆز

ئەنوەر گیان.. لێرەوە تا ئەوێ جگە لە خۆشەویستی بۆ تۆ هیچم نی یە.. خۆشەویستی یەکی زۆر کە ماندووی کردم. من وا هەست دەکەم من و تۆ لەوەدا براین کە بە قەد یەک لەم دنیایەدا ماندوین. ماندوو .. زۆر ماندوو.. هەر دەڵێ لەوساوە کە لە دامێنی دایکمان کەوتینە خوار.. بە واقەوە زۆر ماندووبووین کە هاتینە دەرێ لەو منداڵدانە.. لەوساوە تا هەنووکە ئەو ماندووبوونە بەری نەداوین. زۆرت بیر دەکەم.. یەکجار زۆر.. وا مەزانە ئەو بێدەنگیەم فەرامۆشکردنە.. نا.. بە تەنها ئەوەیە کە زۆر ماندووم بە دەست خەمی خەڵکەوە.

هەر دوێنێ من شەش سەعات بە دیار ڕۆحێکی برینداڕەوە گریاوم.. چونکە موحاوەلەی ئینتیحاری کردبوو..

بە موعجیزە ڕزگاری بوو.. من چی بکەم؟ چ زەمەنێکی نارێکە تێ ی کەوتووم کە دەبێ من ڕێکی بخەمەوە (هاملێت).

ئاە ئەنوەر گیان.. من غەرقم.. غەرقم.. غەرقم لە خۆشەویستی.. ئای لەو ژمارە زۆرەی دۆستان کە من هەمە.. ئای لەو ژمارە زۆرەی دوژمنان کە من هەمە. ئێرە.. ئێرە پڕ لە ڕق و خۆشەویستی، دونیایەکی گەورەیە لە بێ بەشی.. لە نەهامەتی.. لە نسکۆ.. لە دەرد.. لە کارەسات.. لە دزێوی.. لە جوانی.. لە میهر.. لە تاسە.. لە سۆز.. لە غەدر.. لە ڕسوایی.. لە زەوق و بێ زەوقی.. من لە ناوەڕاستیا دانیشتووم.

ئەم ژیانە چ سەرابێکی جوانە ئەنوەر.. چ عەزابێکی خۆشە.. ئای لە ئازاری بوون.. بوون چ زەحمەتە. ئای لە دەردی هوشیاری ئەنوەر.. کاشکێ ئەوەندە هوشیار نەبووینایە. ئێستا کە ئەم چەند دێڕەت بۆ دەنووسم.. لە دڵمەوە

دەگریم.. من ئەوەندەی بەهێز و تۆکمە و وەستاوم.. ئەوەندەش بە دەست خەیاڵەکانی خۆمەوە هەلاهەلام..

دەی قەدەرە و تێیکەوتووین. من لە رۆژێکدا ئامادەم وەک کانی یەکی تازە تەقیو ئاسوودە بم.. من ئامادەم لە هەمان رۆژدا بۆ ماندووبونی پەپوولەیەک لە وەختی فڕیندا بگریم.. من غەریبم لەسەر ئەم ئەرزە.. ئەوەندەی گەمارۆ دراوم بە موحیبەت، ئەوەندەش گەمارۆ دراوم بە کینە.. لە کاتێکدا هیچ گوناهێکم نەکردووە.

ماوەیەکە بۆنی پیری دەکەم.. بۆنی مەرگ.. وە نی یە بترسێم.. بەڵام سەیرە.. من فریای هیچ لە خەونەکانم نەکەوتم و وا دەمرم.. من دەبوو زۆرتر بژیم.. لە کوێ تەمەنێکی تر قەرز دەکرێ تا جارێکی دیکە هەمان هەڵەکان بکەینەوە و بەڵام ئەمجارەیان بێ پەشیمانی.. هەمان هەڵە جوانەکانی ژیان.. من لێرە خەریکە بە دەست ئیحساساتی خۆمەوە شێت دەبم. دوای گەڕانەوەم لە فنلەند من خاوەنی مێژوویەکی تازەم، من دەیان شێرزادی ترم لە ناو خۆمدا ناسی کە پێشتر نەمناسی بوون.. ئەوانە لە کوێ بون کە من نووستبووم لە ژوورەکەی تۆدا.. من دەبێ سەرلەنوێ لەگەڵ خۆمدا ئاشت ببمەوە.. من لەوێم.. یەکێک لەوێ ماوەتەوە.. منم و من نیم.. کێ لەگەڵ مندا هاتەوە.. کەمێکە منم و منیش نیم.. دەترسێم فریا نەکەوم تا تەعاروفێکی دیکە لەگەڵ خۆمدا دەکەمەوە.. من بەردەوام رادەکەم.. رادەکەم دەمەوێ فریای هەمووان بکەوم.. من لە نۆڤلێتی (دوا دابەزینی مەسیح) کە بە تۆ پێش کەش کراوە.. باس لەوە دەکەم.. دەمەوێ لە ناو مەسیحدا قسە لەسەر مەسیحێکی دۆڕاو بکەم کە منم.. کە تۆیت.. ئێمە دەڕۆین و پەیامی شەرمنمان بە هیچ شوێنێک نەگەیشت.

ئەنوەر گیان.. دڵنیابە.. دڵنیابە.. دڵنیابە تۆم لە ناو خۆمدا هەڵگرتووە.. تۆ جوانترین و سیحربازترین و قووڵترین پیاو.. بەڵام بێ دەنگ.. زۆر بێ دەنگ.. وەک بێ دەنگی دەریا.. وەک هێمن بونەوەی زەریا و ئۆقیانووسەکان.

ئەنوەر گیان.. من دوێنێ.. هەر دوێنی بە دەم رێ وە دەگریام، هەروەک ئەو شەوەی(١/٢/ ٩٨) کە جگە لە خرمەی بەفر لە ژێر پێمدا هیچ نەبوو.. بەرەو ماڵەکەی تۆ دەهاتم و دەگریام.

ئەنوەر من زۆر ماندووم.. بەڵام بە دەست خۆشەویستی خۆمەوە بۆ خەڵک.. خەڵکێک کە پێ ی نازانێ.. خەڵکێک وا دەزانن ئەوە لە زەلیلی یەوە هاتووە.. ئای لەو رۆحە هیلاکەی من هەمە.. هەناسەم سوار بووە.. شپرزەم وەک ئەو نامەیەی بەردەستم.. وەکی تر بەو هەموو هەرایەوە هەست بە گەرمی ژیان دەکەم.. لە ناوەوە لە ناوەوە ئەو مناڵە هەر گەورە نابێ ئەنوەر. خەمم ئەوەیە کە هیچ خودایەک نی یە ببێ بە پاسەوان بەسەر ئەو خەمانەوە.. لە مندا کانی یەک هەیە لە فرمێسک.. کێوێک لە قەهر.. هەندێ جار هەر دەڵێ ی بەفری تەواوی زستانی فنلەند لە مندا باریوە.. هەندێ جار هەست دەکەم لەسەر کورسی یەکی گڕ دانیشتووم لە ناوەڕاستی خۆردا.. من دڵێکم هەیە لە پەنگر..

دەزانم لە پشت ئەو حەرفانەوە رۆحێکی رووتی من دەبینی. ئەوەندەش زۆرە بۆ من.

با دەنگت هەبێ.. وا مەزانە ریکا م بیر چووە. نا.. نا.. نا ئەو.. ئەو نەورەسێکە لە نەورەسەکانی سەر دەریای بەڵتیق.. دەنا نەیتوانی لەگەڵ پیاوێک بژی کە تەنێکە لە خەم و مەدهۆشی.. ئای کە ئێوەم لا جوانە.. خۆزیا دراوسێ دەبووین.. لە گەڕەکێکی ناو ئاسمان.. لە یەکێ لە کۆڵانەکانی بنی دەریا.. خۆزگە دەچووینەوە ناو ئەشکەوتەکان.

ئەنوەر گیان.. خەریکی کورتە رۆمانێکم زۆر هیلاکی کردووم پێت دەگات" هەموومان بۆنی ئەو ژنەمان گرتبوو"

ئەنوەر گیان. بۆ شیعرەکانت شەیدا بەڵێنی وەرگرتبو کە وەزارەتی رۆشنبیری بۆی چاپ بکەن.. هەفتەیەک لەمەوبەر

نائومێد بوو، نەک لەبەر هیچ.. لەبەر ئەوەی حوکمەتی هەرێم پارەی نەبوو.

من به تەمام چاپی بکەم.. هەر نەبوو لەسەر ئەرکی خۆم دەیکەم.. دڵنیابە ئەنوەر.. دەزانم زۆر حیسابی بۆ ناکەیت و دواجار لە تۆ تێ دەگەم.. بەلام من ئارەزوومە.. کە چاپ بوو هەوڵ دەدەم چەند دانەیەکت بۆ بنێرم.

دەی ئەنوەر بیر لە سەفەرێکی دیکە بکەرەوە. هەرچەندە دەزانم ئاسان نیە.. بەلام هەر خۆشە یەکدی ببینینەوە.

ببوایە من دەهاتم.. بەلام ئاسان نی یە بۆ من کەسەکەم.

ئەنوەر زۆر بیرت دەکەم.. ئاخۆ لە ماڵە تازەکەت پەنجەرەیەکی تیایە لەوێوە سەیرێکی شەقامێکی چۆل بکات..؟

با هەواڵتان بزانم.. ماچتان دەکەم.. باوەش.

شێرۆ

**ڕۆژهەڵات؛ بە هەموو پۆخڵی خۆیەوە.. جوانە!**

نامەی شێرزاد حەسەن بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

ئەنوەر گیان سڵاو.. لە تۆ و ریکا چاوی ماچ دەکەم

براکەم هێشتا لێرەم و زۆر خۆشە . شانۆگەرییەکی دکتۆر
عەونی کرومی م بینی خەمی ئەو دە مانگەی بیر
بردمەوە. چوومە ئاهەنگی سیمفۆنیای جیهانی و گوێم
لە مۆسیقا گرت سیبیلیوسی تیابوو.. کات جوان
دەڕوا و هەستی پێناکەم.. دیمەشق جوانە، پڕە لە ئافرەتی
شۆخ و تاکسی پڕ.. پڕە لە برسی و دەوڵەمەند.. سۆزانی و
عاشق.. گەواد و جوامێر وەک هەر
شوێنێکی دنیا. لە ماڵی میدیا[بێگەرد] و
هادی [مەهدی]م ، برادەرم زۆرە
لێرە. لێرەش نازانم روو لە ماڵی کێ بکەم.

من پیاوێکی بەختەوەرم.. هەمیشە خەڵکێک دەدۆزمەوە،
خۆشیان بوێم.

گوێم پڕ بوە لە مۆسیقا و ئاوازی ڕۆژهەڵات. لە
حوزنی بێ کۆتایی رۆژهەڵات. لە شەرم و
ترس و تووڕەیی رۆژهەڵات. ئاسودەم و ژێر
حاڵم.. جوانە رۆژهەڵات بە هەموو
پۆخڵی خۆی.. جوانە! دەچمە سەیری
شانۆگەرییەکی تر.. پێشانگاش زۆرن.

بیرتان دەکەم.. رەنگە بۆ جەژن
بچمەوە کوردستان.. ئەم یارمەتی
یەی تۆ فریای ماڵی باوکت

دەخەم و بە زیادەکەی کە وتم.

سڵاو بکە لە هاوڕێیان.. هەموویان مرۆڤی جوانن و خۆشم دەوێن.. بیرتان دەکەم ئەنوەر گیان. با ئەم کارتە دەلیلی موحیبەت بێ، چاوەڕێی نامەی درێژم بکە.

چیرۆکەکەم وا تەواو دەکەم (دوا دابەزینی مەسیح)[1] پێشکەش بە تۆم کردووە، نووسیومە. بۆ هاوڕێم ئەنوەری ڕەشی عەولا. بە یادی شەوانی غوربەت. بە یەکەوە دەگریاین بۆ دۆڕانی هەموو شتەکان.

دیمەشق ١٩٩٨/٣/٢٨

شێرۆ

---

[1] ئەو نۆڤلێتەی شیرزاد حەسەن چاپ نەکراوە و بڕیارە چاپ بکرێت.

## من باسی تۆشم کرد!

### نامەی شێرزاد حەسەن بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

هاوڕێ و خۆشەویست ئەنوەری ڕۆح سووک.. هەزار جار ماچت دەکەم، بیرت دەکەم، بیری ریکا دەکەم.. شوێنەکەم لە ماڵی ئێوە.. لێرەوە لام جوانە.. دۆشەک و لێفەکەم، خواردنەکان.. بیرەی پاش ساونا.

بەڵام دڵنیابە کە ئێرەم لا خۆشترە.. لەبەر ئەو هۆیانەی بۆیان گریام و تۆم گریاند.. دواجار چی بکەم هەر لێرە دەتوانم هەراو شەڕەکانم بکەم.. لێرە جارێکی تر خۆشەویستی خەڵکی گەمارۆیان دامەوە، بەڵام ئەو ترس و دڵەراوکێیەی جاران تیابووم، بە هۆی ئەو دە مانگەی فنلەندا، خاوتر و کەمتر بۆتەوە، بەڵام ماوە، وەک جاران نەماوە، دەبێ وردتر ئاگام لە خۆم بێ، چونکە هێزە پاشکەوتەکان لە جاران وردتر و زیرەکترن، تا هەنووکە بێدەنگم و قسەم نەکردووە... باسی هاتنەوە و گەڕانەوەم لە هیچ کەناڵێکی راگەیاندن نەکردووە، گەرچی دەیەها کەناڵ پەیوەندییان پێوە کردووم، سەبارەت بە گەڕانەوە و هۆیەکانی گەڕانەوە یەک وشەم نەدرکاندووە. جارێ وام، وا بزانم ئەو دە مانگە فێری کردم کە بێ دەنگیش هەندێ جار مانای جیا جیان هەیە.

حەوت برا.. لێرە باس لە جوانیەکانی تۆ دەکەم، دلاوەر نامەی بۆ ناردیتەوە. ئەو هەر خۆی تۆی لا ئازیز و گەورەیە.. منیش بۆ هەموان باسم لە گەورەیی و جوانی تۆ کردووە، خەڵکەکەش بڕوام پێدەکەن.

ماڵی ئێوەش دەچم و پەیوەندییم خەراپ نیە لە گەڵیان.. پێم وتوون من لێرە 'ئەنوەر'م.. بەڵام هێشتا ماویانە بڕوام پێبکەن.. دیارە مەبەستم شەیدا نیە.. ئەو دەزانێ بە راستمە.. بەڵام خەریکە لێم دڵنیا بن، ئەوەندەی من ئاگام لێ بێ باشن و بەڵام ئەوانیش خەونی زیاتریان هەیە، وەک هەموو کەسانی ئێرە، بە تایبەیت کە دەزانن دوو رۆڵەیان وا لە ئەوروپا.. واتا تەوەقوعاتیان زیاتر دەخوازێ، بەڵام من لە حاڵی ئێوە ئاگادارم کردنەوە. زیاتر رۆشناییم خستە سەر باری ئێوە کە زۆر لایان دیار نەبوو، دیارە ئەوان هیچیان نەوتووە.. بەڵام من خۆم

وام هەست کرد.. ئەوەش ئاسایی یە.. چونکە لێرەوە خەڵکی بەجۆرێکی دیکە سەیری ئەوروپا و ئەوروپانشین دەکەن..!!

نیوە شەوە و ماوەیەکە لە سەرچنار و لە گازینۆیەک دانیشتبوم لەگەڵ رێبین ئەحمەد هەردی و فاروق رەفیق کە لە کەنەدا بە سەردان هاتبۆوە، باسم لە ئەڤین و سیاسەت و سێکس و هاورێیەتی و شتی جوان کرد.. قسەی خۆشی وەک ئەو قسانەی من و تۆ تا بەرەبەیان لێ ی دەدواین.. من باسی تۆشم کرد! زۆرجار ناوت دێنم.. پەیوەندی بە منەوە

نی یە.. تۆ لە کۆمەڵێ شتی جواندا هەیت و دێیتە مەیدانێ.

خەڵکی هێشتا دوو دڵە و سەرسامە بە هاتنەوەم، دەپرسن بۆ؟ وەچەی تازە پێ یان خۆشە کە پشت و پەناهێکی ئەوان گەڕایەوە، کەژاڵ زۆری پێ ی خۆشە چونکە دەڵێ: ئیدی چیتر بەرگەی دووریتم نەدەگرت.. رەزێ و سۆنیا و لاس پتر پێ یان خۆشە کە لێ یان نزیک کەوتمەوە.. ئیدی هەن دەڵێن: بۆ هاتیتەوە ناو ئەم گۆڕستانە؟ هەن دەڵێن: ئافەرین بۆ تۆ  بەرد لە جێ ی خۆی سەنگینە و هەن دەڵێن: سەگ لە قەسابخانە نەمرێ عومری بە زایە چووە.. هەن بەدگومان و دوودڵ و هەن خۆشحاڵ و ئاسوودە بە گەڕانەوەم. دیارە هەریەکە و لە دیدی خۆیەوە، من پەیوەندیم بە هیچ کام لەم روانگە و دیدانەوە نی یە.. تۆ هەموو جار دەتوت: لەسەر زمانی رامبۆ: ژیان شەڕەشەقێکە ... هتد

گەڕامەوە ژێر تینی خۆری بەهار.. جاروبار وەرزش دەکەم.. بەڵام وەک فینلەندا نیە.. بواری وەرزشم لێرە کەمترە.

ریکا چۆنە..؟ وا هاوین هات لێرە زوو بۆ کەژاڵ و ماڵی ئێوە و هەندێ لە هاورێیان باسی ریکا دەکەم.

من هێشتا شپرزەی پاش سەفەرم و کۆ نەبوومەتەوە.. خەڵکی دێن و سەرم لێ دەدەن و پرسیاری زۆر دەکەن.

من تا هەنووکە کەم کەم دەخوێنمەوە و نانووسم.. جارێ تاقەتی نووسینم نی یە. شەممە و یەکشەممەی داهاتوو فاروق رەفیق لێرە دوو کۆڕ دەکا.. یەکێکیان لەسەر هایدیگەری فەیلەسووف.. یەکێکیان لەسەر ئەمریکانیزم.. فاروق زۆر پێشکەوتووە و پیاوێکی زۆر خوێندەواری لێ دەرچووە.. ئەمشەو زۆرمان باسی پرۆژەی رەهەند کرد.. رەنگە تاهەنووکە ژمارەی تازەت پێگەیشتبێ، هیوادارم ئەو دوو شیکردنەوەیەی رێبین و بەرزان لەسەر (حەسار)[1]بخوێنیتەوە.. لەگەڵ گفتوگۆکەی من.. لێرە هەمووان ئەو قسانەی منیان بە دڵە..!!

شیعرەکەت لێرە بە تەمان لە گەلاوێژ بڵاوی بکەنەوە.. من زۆر باس و خواسی تۆم بۆ کردن.. پێشکەوتنی تۆ.. دەشزانن من لە خۆمەوە خەڵکی هەڵنادەم.

من باشم و خەراپ نیم.. حەز دەکەم بزانی کە رۆژ بە رۆژ پتر تێ دەگەم کە من بۆ ئێرە خوڵقاوم، گەرچی ئێرە بێ گرفت و کێشەی خۆی نی یە.. بەس دواجار ئەوە قەدەری ئێمەیە و هەڵهاتن لێ ی بێ کەڵکە.. بە تایبەتی بۆ من. دواجار ئێرەم لە لا قەبووڵە بە هەموو جوانی و ناشیرینی یەکانی خۆیەوە.. چونکە بۆ من بێ ئەو ململانێ یە ناژیم کە ساڵەهایە لەسەر راهاتووم.. گەرچی پووچی و بێ هوودەیش بێ.. دواجار مێژووی پیاوە رۆشنفکرەکانی دونیا هەر لە بێ هوودەیی یەوە دەستیان پێ کردووە. هەرچەندە من هێشتا قوتابیم..!

قەت بیر لەوە ناکەمەوە ئەنجامی کارەکانم بە کوێ دەگەن و بۆچی وا دەکەم.. لای من گرنگ ئەوەیە ئەوەی بڕوام پێ یەتی بیکەم. ئیدی دەرئەنجامەکان چی دەبن.. ئەوەیان جێ ی بایەخی من نی یە. لێرە گۆڕانێکی گەورە رووی نەداوە.. خەڵکی چاوەڕێ یە.. وەچەی تازە خەونی سەفەر و سەرهەڵگرتن لە لای رەوایە.

خەڵکە رەشۆکی و عامەکە بە ئازووقە و ئەو خۆراکە تۆزێ هەناسەی هاتۆتەوە بەر. نێوەندی هونەری و ئەدەبی هەر بازاڕ و دوکانەکەیە کە لەوێ باسمان کرد.. زۆریان خیانەتیان لەو وەزیفە پاکەی هونەر و ئەدەب کردووە.

---

[1] مەبەست لە لێکۆڵینەوەیە لە بارەی نۆڤلێتی "حەسار و سەگەکانی باوکم". بڕوانە ژمارە (٥) ڕەهەند.

بە تەمام نامەیەک لە شەیدا وەربگرم و لەگەڵ ئەم نامەیە بینێرم.. زۆر دڵی پەوە خۆشە کە ستایشت دەکەم.

سبەی شەو چلەی "ڕەهبەر جەلال"ە[1] لە سلێمانی لە تەلەفزیۆنی خاک، لێرە کورتەیەک لە ژیان و بەرهەمەکانی قسەی لەسەر دەکرێ. من پێنج تا شەش دەقیقە قسەم کردووە لەسەر جوانیەکانی ڕەهبەر.. حەیف کە ئەو کوڕە ڕۆیشت. خوڕپەی نەخۆشی ئەو لە دڵی دام، هەر بۆیەش پتر تاقەتم چوو. ئەرێ حاڵی میریا و مناڵەکانی و براکانی چۆن بوون..؟

ئێوە چوونە سەرقەبران..؟ بۆم باس بکە چۆن بوو..! هەستی تۆ چی بوو ئەنوەر گیان..؟ من لەوێ بوومایە زۆر هیلاک دەبووم.. بێ شک هیلاک دەبووم..! بیرتان دەکەم.. لەگەڵ شیعر چۆنی، خوێندنەوە، کار و کاسبی؟ هەروەک جاران درەنگ دەخەویت..؟

زۆر لە خەمتدام ئەنوەر گیان. تکایە جگەرە کەم بکێشە.. تکایە ئاگات لە خۆت بێ.

سڵاو لە هەموو کەسە جوانەکان بکە.. ریکا.. ئاگاتان لە یەکتری بێ.. پەیوەندییەکەتان جوانە.. با هەروابێ.

دەی تێر نابم لە نامە نووسین و قسە کردن لەگەڵ تۆ.. چاوە جوانەکانت ماچ دەکەم و بە ئومێدی یەکدی لە باوەشکردن.

شێرۆ

١٩٩٨/٥/١٨

---

[1] ڕەهبەر جەلالی بەهەشتی . شێوەکار بوو خوێندنی لە چیکۆسلۆفاکیای ئەوسا وروسیا تەواو کردبوو. گۆڤارێکی دەردەکرد بە ناوی "دلانپار" لە بواری سیاسی دا خۆی بە سەربەخۆ و ناسیۆنالیست دەزانی.

ڕەووف بێگەرد، شێرزاد حەسەن ، ئەنوەری ڕەشی عەولا

**تۆ مەحکومی هیلاکی و ئازاریت!**

**نامەی شێرزاد حەسەن بۆ جەمال غەمبار**

جەمال غەمباری برام کووی؟

سڵاوم لە پەیمان خانە و چاوی منداڵان ماچ ئەکەم، وەک بە نامە و شیعرەکانتا هەمیشە، دیارە، تۆ مەحکومی هیلاکی و ئازاریت، تێدەگەم و منیش چەشتوومە، زۆریش، بەڵام پیری و تەمەن و ساڵان فێریان کردم، کە زۆر بێ باک بم، گرنگ هەنووکە بەم تەمەنەوە شەرم لەسەر ئەوەیە، کە خۆم لە ناوە بۆگەن نەکەم و پیس نەبم، دەنا وەکی تر بەلامەوە گرنگ نییە، خەڵکی و دونیا چۆنم دەبینن، هەقە کەمەکێ بێباک بیت و بزانی لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە، شتەکان چۆنن، من حەزم نەکرد بڕۆن، بەڵام دوواجار، مرۆڤ هەقی سەفەر و ئەزموونی دیکەی هەیە، بەڵام زۆرجاران هەر ئەو سەفەر و ئەزموونانە هیلاکمان دەکەن، هەندێک جار شتێک فێر دەبین و هەندێک جار نا..!

یادت دەکەین، دەرچوونی دیوانەکەت پیرۆزە و دەست خۆش..! من وا بەتەمام ڕۆمانەکەم چاپ بکەم، فریاتی دەخەم..

حورمەتی زۆرم

شێرزاد حەسەن

٢٠٠١

**ئایندەش لە شیعرێکدا، نادیار و ونە!**

نامەی شێرزاد حەسەن بۆ شێرکۆ بێکەس

تامپێری شەوی 97/9/9

ئازیزو خۆشەویست کاک شێرکۆ ..سڵاو..

سووپاس بۆ کارت و نامەکەت.. پێم خۆشە هەروا پۆستم بەبەرەکەت بێ.. دیارە لەم بارە دەروونییە خراپەی من نامە و هەواڵ و دەنگ و باسی برادەرانی وەک ئێوە کەمێ ئاسوودەم ئەکا.

بە هەرحاڵ... من لە هەفتەی رابردوو تەلەفۆنیکی درێژم بۆ کەژاڵ کرد... هەمو دەردە دڵی خۆم پێ وت: وەڵامی ئەوە بوو: کە عاقڵ بم و جارێ بیر لە گەڕانەوە نەکەم، هەر وەختێ باری ناوەوەی وڵات پوخت بوو.. کە نابێ! خۆی بانگم ئەکاتەوە.. ئەو برادەرەی سویدیش دەنگی نەبوو.. ئەوە بوو بە چوارمانگ لێرەم.. تازە خۆم تەسلیمی ئەم قەدەرە ئەکەم، خۆ تازە من بووم بە گەمەیەک لە گەمەکانی ئەم قەدەری کۆچ و سەفەرە.. ئیدی بیر لە بردنەوەو دۆڕان ناکەمەوە، چونکە لە ئەساسدا مێژوویەکی دۆڕاو وا لە دواوە..ئایندەش وەک خۆت دەڵێی لە شیعرێکدا نادیار و ونە..!

سەبارەت بە ناردنی چیرۆکی خۆم بە عەرەبی: دەبێ خۆم لێرە بیانکەم بە عەرەبی.. حەوسەڵەم نییە.. لە کوردستان هەمە.. وادەکەم بۆمی بنێرن..

ئەوە چییە کاک شێرکۆ: یەکەمجار بیستم کە من حول حولیم.. خۆی وایە.. هەڵبەت ئەم قۆناغەی منی تیام یانێ دڵەڕاوکێ و ترس و حول حولی.. ئیدی وایە.. بەڵام ئەوە سێ ڕۆژە هەموو ختورە و خەیاڵیکی وڵاتم داناوە و دەمەوێ بۆ ئەوماوەیەی لێرەم خۆم بە هەندێ پرۆژەوە سەرقاڵ بکەم..دیارە باشترین بوارە بۆ خوێندنەوەی خەست و خۆڵ..گەر کرا نووسینی: بە پێی

سرووش..چاکه..! تەواو دووا بڕیار مانەوەیە لەتامپێریَ[1]تا لایەک بە لایەک دەبیَ.. هیوادارم خۆم بگرم و عاقل بم.. دیارە بۆ هەولێری زۆر زەحمەتە عاقڵ بوون..!

کتێبەکانت پاریزراون.. گەر کرا پۆستیان دەکەم و یان وەک خۆت فەرمووت: لای مام سالّح دایان دەنێم..!

دڵخۆشم بەوەی کە ئەو وتارەی منت بە دڵ بووە، هەرچەندە من بە دەم ڕیی سەفەرەوە نووسیومە، لە ئوتێلە ئەنقەرە... و کەمیکی، یان سەرەتاکەی کە لە سلێمانی دەستم پیَ کرد.. یەک مانگ کۆنفرانسەکە پێشخرا.. ئەوە وای کرد بە پەلە پرۆزیَ پرۆژەی وتارەکە ئامادە بکەم.. دەنا دەکرا چاکتر بیَ.. بەڵام لە میانەی گفتوگۆ و دەمەتەقیَ کەمیَ لەو رازانەی تۆ وتوتە سەبارەت بە ستەمی ڕۆژئاوا دەرهەق بە ئێمە کردم وتم: هەتا لە ناو مەحازەکەدا_ ناوم لە سیستمی نویَ ی یان نەزمی نویَ جیهانی دەنێم (بەربەرییەتی تازە) خۆ بە ئاشکرا وتومە.. کە بوار لەبەردەم میللەتی بچووکی وەک ئێمە نەماوە خەون ببینیَ، خۆی دووسیَ ڕستەی وا قورس بەسە بۆ ئەوەی ئەوان دەرک بەو ستەم و ناهەقییە بکەن، هەندیَ لە ئەدیبەکانی کۆنفرانس لەبەر ئەو کوچەبەردانەی وەشاندومە شارستانیەتی ئەوان ماچیان کردم و ستایشیان کردم.. حەزدەکەم بزانیت بە ئینگلیزی جوانتری دەکەم، بەڵێنەکە لە لینیگراد و چیک و ئیتالّیا و هەندی وڵاتی تر بۆمی بلاوبکەنەوە.. جگە لە ئەمریکا و لەندەن و ئیرلەندە.. دیارە ئەدیبەکان خۆیان داوایان کرد.

---

[1] شێرزاد حەسەن، لەهاوینی سالّی (١٩٩٧)دا بەبانگهێشتێکی ئەدەبی چووەتە فنلەنداو لەحوزەیرانی هەمانسالّیشدا لەکۆنفرانسێکی جیهانیدا لەبەردەم ژمارەیەکی زۆر لەنوسەرانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوا، موحازەرەیەکی ئەدەبَی پێشکەشکرد لەسەر (زمانو کەسێتی نووسەر). بۆ ماوەی (١٠) مانگ وەک پەنابەر لەشاری (تامپێری) فنلەندا ژیاو پاشان چیرۆکی پەنابەرییەکەی بەتالّکردەوەو لەبەهاری سالّی (١٩٩٨) گەڕایەوە کوردستان.

قسەکانی تۆ راستە.. بەڵام خۆی ڕۆژئاوای ڤان کوگ و رامبۆ و بیکاسۆ و کێ و کێ جیاوازاوە لەگەڵ خۆرئاوای کیسنجەر و هیتلەر و مۆسۆلونی و بگرە کلنتن و کێ و کێ..دیارە من باسی قەلەقی بەردەوامی فیکری ڕۆژئاوا دەکەم.. کە لە پرسیارا نەوەستاوە.. عەقل بەرهەم دێنێ و هەر هەمان عەقڵ رەخنە لە عەقڵی پێشووتر دەگرێ.. بەهۆی کەلتوری نازداری ئیسلامەوە.. لای خۆمان هەموو پرسیارێک وەڵامی ئامادەی هەیە.. یان هەر پرسیار ڕەوا نییە.. ئەوە گوناهی ڕۆژئاوانییە کە دەرەنجامی ململانیی پارتی و یەکێتی: ئەم دوو حیزبە دەبنەوە بە هەڵگری ڕۆحی گەنیوی ئیسلام.. ئەو هەموو باجە قورسانەی خۆمان سەپاندوومانە.. بەهەرحاڵ قسە زۆرە لەسەر ئەوە.. گەر حەزت کرد لەسەری دەڕۆین.. دیارە من لە کۆنفرانسەکە و لابەلای هەموو ئەو دەردەدڵەم باس کرد.. بەڵام خۆ دیسانەوە حوکمی وڵات و قەدەری ئێمە و هی خۆشیان لای کۆمەڵی سیاسی گەلۆرە.. نەک لای ئەوان.. هەر چەندە شیللی شاعیری ئینگلیزی دەڵێ: دەبوو شاعیرەکان حوکمی دونیا بکەن..بەلام تا هەنووکە ئەوە مەحاڵە!

لەم شەوەوە دەست بە وەرگێرانی شیعرە جوانەکانت دەکەم، بزانم کوو دەبێ؟

من ئێستا ئارام و بەجەرگم..ئیدی بۆ پیشەوە و زستانیکی بەبەرەکەت!

ڕیزم قەبوڵ بکە.سڵاو لە نەسرین خان و منالەکانت ..

کاک شێرکۆ: زۆر بیری ڕەئوف [بێگەرد]و هاورییان دەکەم پییان بڵێ هەڵەی وانەکەن.. بێنە دەرەوە.. رەئوف لێرە دەمرێ..!

برای بچووکت شێرۆ حەسەن

**بووین بە گەمەیەک، لە گەمەکانی قەدەر.**

نامەی شێرزاد حەسەن بۆ هیوا قادر

هاوڕێی خۆشەویستم.. هیوا قادر.. سڵاو

دیارە زۆر قەرزاربارتم کە بەردەوام تەلەفۆنم بۆ دەکەی، لە هەواڵمان دەپرسی.. بە هەر حاڵ.. دوای دڵەڕاوکییەکی زۆر لە مەڕ چوونەوە و نەچوونەوە، قسەکردن لەگەل هاوڕێ یان و کەژاڵ-ی خیزانم بە تەلەفۆن واچاکترە، کە لێرە بمێنمەوە و خۆم مات بدەم تا لە دوورەوە چاودێری بارودۆخی ناوەوەی ولات بکەم، دیارە تا ساڵێکی تر هەندێ شت ڕوون دەبێتەوە........ کورد لەوەتەی هەیە ساڵ دەداتە دەم یەک.. من هەوڵ دەدەم خۆم بە خوێندنەوە و نووسین خەریک بکەم، هەرچەندە ئیقاعی نووسینم نەدۆزیوەتەوە هێشتا لێرە، وەرزش ئەکەم، کەم کەم لە زمانی فیلەندی ورد دەبمەوە کە پتر لە جنۆکە ئەچێ. دەی تازە خۆم تەسلیمی قەدەر کرد، بووین بە گەمەیەک لە گەمەکانی قەدەر، هیوادارم ئەم نامەیە لە ڕێی هەر هاوڕێیەکەوە بگاتە دەست کەژاڵی خێزانم.. ئەم نامەی دەردە دڵی خۆمی تیایە.. حەزەکەم بگات.. دیارە هەر کەس لێی ڕانابینی مەیدەرێ... تکایە.. خۆت وەکیل بە.. دەکرێ لە ڕێی "ئاری" براتەوە بگاتە ماڵی ئێمە.. ئەگەر لە سلێمانی مابێ.. وابزانم ئاری هەر لە "M A G" ماوە.

دڵم خۆشە کە لە "ڕەهەند" دا کاردەکەیت و چالاکن، بەلام هەوڵدەن بگاتەوە کوردستان.. ئایا ژمارەکانی ئایندە بابەتی سەرەکی چی یە؟ گەر ئەدەب نی یە.. ع محوەریکی سەرەکی خەمی ژمارەکانی ئایندەیە.. بەڵکو بکرێ بەشداربم.. بە داخەوە من هەموو ئەرشیفەکەم لە سلێمانی یە.. دەنا هەندێ بابەتم هەبوو بەکەڵکی ئێوە بێ.

بە هەرحاڵ وەک ئەو ڕۆژە لە تەلەفۆن پێم وتی: زۆر سوپاست دەکەم گەر ئەو باسەی لەسەر "لۆزان" نووسراوە.. لەگەڵ چیرۆکی "پیرەپەپوولەکانی ئێواران"[1] و باسێک لەسەر هەمان چیرۆک بۆم کۆپی بکەیت و بینێریت..هەر چەندە دەزانم ماوەیەکە بوومەتە مایەی ئەزیەت.. کاکە گیان پیاو کە بووە دراوسێ ی هەولێریان دەبێ تەحەمولی هەبێ.. چونکە (...) وەک خۆیان لە دونیا نەوعی نی یە.

نوکتەیەک کە برادەرێک لە سلێمانی یەوە بە نامە بۆی ناردبووم، لەسەر هەولێر.. سەروەت ئەنوەر سەوز ناردوویەتی: "گاشەبەردێک لە دوورەوە دێ و بەسەر سینگی هەولێری یەک دەکەوێ و کەچی ئاوڕی دواوە دەداتەوە، دەڵێ: ئەوە چ قوندەرێک ئەو بەردەی پێامدا کێشا؟".

(...)بەرد بەر سینگی کەوتووە ئاوڕی دواوە دەداتەوە.

دیارە بەردەوام پەیوەندیم دەبێ..ئەو بەرهەمانەی لەلامە بۆتی دەنێرم ئەگەر پاکنووسم کردن.. تۆش لە شتی خۆت بێبەشم مەکە.. پێویستم بەوە هەیە جارێکی تر لێرە بە شێنەیی "ئاوێنە سەرابی یەکان"بخوێنمەوە.. وابزانم لای ئەنوەر هەیە.. لێ ی وەردەگرم.

ئێوە بەرهەمی ئەدەبی خۆتان بۆ سلێمانی چۆن دەنێرنەوە؟ هەر بە بەریدی دەستی. گەر شتی تازەی کوردستانت دەست کەوت با ئاگام لێ بێ.. شتی شاز.. بەڕاست دیوانەکەی بەختیار [عەلی]چۆن دەست دەکەوێ.. بە تەمام لە خۆی بپرسم.. یان نامەی بۆ بنێرم..

ڕێزی من بۆ تۆ و خێزانەکەت و چاوی منداڵەکانت ماچ دەکەم.

برات شێرۆ . ح. ٩٧/٩/٨

---

[1] لۆزان ناوی چیرۆکێکی "شێرزاد حەسەن"ە لە کۆمەڵە چیرۆکی گەڕەکی داهۆڵەکان. پیرە پەپوولەکان ناوی چیرۆکێکی "شێرزاد حەسەن"ە و لەگەڵ کۆمەڵێک چیرۆکدا بە هەمان ناوەوە ساڵی ٢٠٠٤ چابکراوە.

**من هەر لەوە ئەترسم،**

**کە لەم دەربەدەریەدا گۆڕغەریب بم!**

نامەی شێرکۆ بێکەس بۆ فەرهاد پیرباڵ

ستۆکهۆڵم ٩٨٩/٤/٤

برای خۆشەویست و ئازیز

کاکە فەرهاد! ئەم کاتەتان شاد!

بە هیوای هەمیشە خۆشی و چاو و دڵ ڕونیتانم. ئەمڕۆ نامەکەی ڕۆژی ٣/٢٤ تان گەیشتە دەستم پێشتریش ئەوە بوو بە تەلەفۆن قسەمان لەگەڵ یەکتردا کرد لەم دەربەدەری و غوربەتی گیانەدا، هەندێ جار نامەی ئازیزان. هەتوانی ئەو برینانەن کە ئەم ڕۆژگارە دژوارە کردویانەتە جەستەی خۆشەویستی یەوە.. زەمانی لێک دابڕانی ئازیزان زەمانێکە (خەونیش) نایگرێتەوە! من هەر لەوە ئەترسم کە لەم دەربەدەریەدا گۆڕغەریب بم! تۆ بڵێی جارێکی تر بۆن بەو خاکەوە بکەین و پڕ بە سینەی شەقار شەقارمان هەوای ئەو وڵاتە هەڵمژینەوە؟! نازانم بێ هیوا نیم بەڵام گەمژەیەکی خۆشبینیش نیم! لێرە ون بووین بوینەتە جرجی ژێر زەمینی و مشکی کونی هەتیتە! چیبکەین؟!.. هەر پەنجەرەی ئەدەبەکەیە لێوەی هەناسە بدەین و خەمێ بەبا بدەین. بەڵام گەلێ جاریش ئەو پەنجەرانەمان لێ ئەگیرێ. دەی ئێمە عاشقین و عەشقیش قوربانی خۆی ئەوێ و کە لە خاکیش دابڕایت دەبێ باجی ئازاری خۆت بدەیت "جا ئیتر دابڕانەکە بە ئارەزوو ویستی خۆت بوبێت یان بە زۆری زۆردارەکی بەدەر لە دەسەڵاتی خۆت!" لەگەڵ ئەو چەند حەرفەدا ئەڕۆین تا بڕ ئەکەین ئەڕۆین..

کاکە: هەڵبەت منیش لەلای خۆمەوە دڵنیام لەوەی کە تەرجومەی ئەو شیعرانە باش نین، بەڵام وەک من بزانم (داڕشتنەوە) هەیە (پێداچونەوە) هەیە تا ئەخرێتە سەر سەتی ئەو زمانەی تر. هەموو شیعرێ لەم دونیایەدا کە تەرجومە کرا،

مۆسیقا و ئاهەنگ و زەنگی زمانە ئەسڵیەکە ون ئەکات لە دەمێکەوە ئیتاڵیەکان وتویانە: (تەرجومەی شیعر خیانەتە) من تێ ناگەم هەندێ لەو برادەرانە بۆ وا بیر ئەکەنەوە؟! مێشکیان لەکوێیاندایە؟! یانی لەبەر ئەوەی ئەوان (وەتەنیین)؟! باشە هەر ئەو ئەنستوتە نییە کە مەسعود و جەلال تاڵەبانی و عەزیز محمد و هەر هەمویان باوەشی پێدا ئەکەن و ماچی ئەکەن؟! ئەی ئەمانی تر چیین؟! زەمیان بەسەر ئێمەوە هەیە؟! فس فس پاڵەوانی ئەوروپان؟! نازانم چی بڵێم! دوای ئەم هەموو کارەسات و کوێرەوەرییە هێشتا هەر وەکو جاری جاران بیر ئەکەنەوە؟! سەیرو سەمەرە! بە کورتی چییت پێ کرا باشە ئەوەی نەیشکرا گوێ مەدەرێ. کە کەندال و ئەوان لێرە بووم خۆیان باسی ئەو هاتنەیان بۆ کردم و منیش بە پێویستم زانی ئەو شتانەیان بۆ بنێرم هیچ نەبێ خۆ دواتر ناڵێن ئەو خۆی (نەی ویست)! مەسەلەی هاتنیشم هەر بەندە بەوانەوە گەر خۆیان بانگم نەکەنەوە من پێیان ناڵێمەوە.. من ئەزانم کە ئەوان لەگەڵ ئێمەو ماناندا ساردن. ئەوەندەی تۆ مەبەستتە ئەوان ئەوەندە مەبەستیان نییە. بەلام گوێ مەدەرێ. لەولای ترەوە ئەو عەرەبانە هەرچییەک کرا وەلامم لێ بگێڕەرەوە.

لە تێکرای ئەوروپادا سەنگ و کێشی ئێوە بەو جۆرەیە کە تۆ باست کردوە، بەڵم لای ئێمە پێچەوانەکەیەتی من لەم قۆناغەدا پێچەوانەکەیم مەبەستە. لە لایەکی تریشەوە هیچ هونەرێ جێگە بە هیچ هونەرێکی تر چۆڵ ناکات وانی یە؟! بەڵکو ئێستا چونەتە ناو یەکەوە. شانۆگەرییەکەتم خوێندەوە لەگەڵ هەندێ تێبینیدا بەدڵم بوو. خۆزگە زیاترت ئەدا بەدەمەوە واتە لە چەند دیمەنێک زیاتر بێت_ کە بەبەریەوە بوو ئەو کارەساتانە بخەیتە ڕوو. ئەکرا شانۆگەرییەکی تەواوی لێ دروست بکەین. ئەو (حاڵەتە) لق وپۆپی دەیان (حاڵەتی) ترن. هەر چۆنێک بێ ئومێد ئەکەم بەردەوام لە نوسییندا بیت.

دەربارەی ئەم تاقی کردنەوەی نێو غەریبی و دەربەدەری یە کومەڵێ پرسیارت کردبوو.. جارێ کارێکی وام بە ئەنجام نەگەیاندووە کە پڕ بە پێستی ئەم ژیانە جیاوازە بێت. جیاواز لەگەڵ رابردوودا. جارێ وەک ئەستێرکێکی پەنگ خوراوە

وام نازانم کەی لێم ئەڕژێ. ناشمەوێ کە لێم ڕژا وەک لێڕژانەکانی تر وابێ. لەو بەینەدا هەندێ گۆڤار و ڕۆژنامەی وڵاتم بەدەست گەیشتن. دیارە ئێوەش لە ڕێگەی ئەنستیتوتەوە هەر پێتان دەگات، لە نێو ئەو چاپکراوانەدا (باڵندەکانیش کۆچیان کرد)ی یەشار کەمالیشم بۆ هاتبوو کە ئەحمەد ئیسماعیل تەرجومەی کردبوو، هەروەها ژمارەیەکی تایبەتی (بەیان)یش بە چیرۆکی کوردی ڕەنگە بەدەستت گەیشتبێ.

لێرە زۆر جار گێژ گێژ ئەسوڕێمەوە، جاری وا هەیە -کە زۆربەی جارە- تاقەتی هیچ شتێکم نییە. غەریبی و کارەسات و یادگارەکان نووسین دەرەقەتیان نایەت. پێیان ناوێرێت. ئەوانە زاڵترن. وەک لە ژێریاندا بتاسێ وایە. ناچار وەک واق وڕماوم لێ دێت. ببورە ئەگەر نامەکەیشم بزڕکابێت هەڵبەت من و تۆیش دوو حاڵەتی جیاوازمان هەیە. ماڵ و منداڵ و مشورخواردن و بەسەرکردنەوە و لە لایەکی تریشەوە وا ئەم زمانە نەگریسە بووە بە تۆشمەوە، ئەبێ فێر بم و لە هەمان کاتیشا فێربوونەکەی وەک سەرئەنجام هیچ ناگەیەنێ چونکە زمانێکە تەنانەت لە ئەوروپادا دوای خۆیان وەک پارەی قەڵبی لێ دێت.

براتان شێرکۆ بێکەس

## هەژیە

چواردەی مانگ بوو
لە سەر (گۆیژە) "با" ئەڵقەکەی چیرانم
کە ڕۆژیەوە پێم نووسی
پێول .. پێول .. خەریکی وشەمانم .
پازدەی مانگ بوو
(سیروان) ئەڵقەکەی بردم
وەختێ گەڕایەوە پێم نووسی
بووە بە ماسی شیعرەکانم .
شانزەی مانگ بوو !
ئاخ ! شانزەی مانگ !
کە "شارەزوور" ئەڵقەکەی لێ وەرگرتم
وەختێ دایەوە بیبوورم
تەماشام کرد .. وەکو (هەژیە)
وشەی بووبووە مەرجانم !.

---

## خۆشەویستی

خۆشەویستی لە "با" ئەچێ
وەختێ هەڵدەکێ دائەگیرسێم
دێتەوە ئەمکوژێنێتەوە .
خۆشەویستی لە "با" ئەچێ
کە دائەگیرسێم
دێتەوە ئەمگەشێنێتەوە !

**له هەرچوار لاوە قەدەغەم!**

نامەی شێرکۆ بێکەس بۆ کاروان کاکە سوور

ستۆکهۆڵم ١٩٩٩/١٠/١٩

برالەی خۆشەویستم کاک کاروان

بە هیوای چاو و دڵ ڕوونیتانم

ئەگەرچی هاتنەکەتان بۆ سلەیمانی کورت و کەم خایەن بوو وەک ئەڵێن بۆ ئاگر هاتبوون! بەڵام بۆ منیش هەر مایەی خۆشحاڵی بوو کە ئیوەم بینی .ئەوە دوو مانگ و نیوە زیاترە گەڕاوەمەتەوە، ئەبوو ئێستە لە سلەیمانی بوومایە بەڵام ئاگاداریان کردوم کە ئیران فیزەی گەڕانەوەم ناداتێ! لە هەرچوار لاوە قەدەغەم!. تا کەی نازانم ؟! ڕەنگە دوای مانێگی تر ڕوبکەمە شام تا دەرویەکم لێ ئەکرێتەوە. بەڵام تۆ بۆ رۆمانەکەت هەر دەرفەتی هەڵکەوت بینێرەوە و با بگاتە دەست کاک رەووف بیگەرد. ئەو جێ بە جێی ئەکا و خۆم ئاگاداری ئەکەم. ئێمە پەیوەندی بەردەوامان هەیە. لەو بارەیەوە دڵنیابە. هیچ کارتێکم لە بەردەست نەبوو، ئەم وێنەیەم لەم گەشتەی دوایدا لە دەنهاخ – لاهای لە هۆڵەندە و کۆڕەکەمدا گیراوە.

دیسانەوە بەهێوای خۆشیتانم

هەر بژین

براتان شێرکۆ بێکەس

**(بۆننامە) دووا قەسیدەی درێژم بوو.**

نامەی شێرکۆ بێکەس بۆ ئەحمەدی مەلا

هاوڕێی شاعیر و برای ئازیز

ئەم کاتەت باش و بەهیوای هەمیشە لەش ساغی و خۆشحاڵیتانم، لەکاتی خۆیدا نامەکەتم بەدەست گەیشت، بەڵام وەڵامدانەوەی دواکەوت، چوونکە لەسەفرێکی دووروودرێژدابووم بۆ لەندە و لەوێوە بۆ ئەمستردام و زنجیرەیەک لە شار و شارۆچکەی تر (ئێمە بەم سەفەرانە ماوین). تۆش بوویت بە (ئیبن بەتوتە)ی کوردی و هەر مانگە و لە شوێنێکی و پێشم وابێت یەکەم ئەدیبیت کە خاوەنی زۆرترین ناونیشان بێت، بەبێ ئەوەی خاوەنی تاقەماڵیکیش بێت! بەهەرحاڵ من لە ڕێگەی کاک ڕێبوارەوە نووسینەکانم وەرگرت و ئێستە لای خۆمن، تۆ دڵنیابە لەوەی کە ڕێزی تایبەتی و خۆشەویستی بێ غەل وغەشم بەرامبەر بە ئەزموونی شیعری تۆ هەیە (دەنگدانەوەی ئێمەومانان نیت و بەرزای و ڕوانگەی شیعری خۆتت هەیە) ئەفراندنیش هەر بەو جیاوازیانەوە جوانمان دەکات. لەبەر ئەوە من بایەخی تایبەتی بە کارەکانی تۆ ئەدەم، بۆ ئەم مەبەستەش، بەهیچ جۆرێ درێغی لە بڵاوکردنەوەی ناکەین! بەتایبەت لە ئێستادا کە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە سلیمانی یەکێکە لە گەورەترین دەزگاکانی کلتووری لە کوردستاندا و چوار گۆڤارمان هەیە: ئاییندە، سەردەم، ڕۆڤار، زانستی سەردەم.. ئەمە جگەلەوەی لە ماوەی نۆ مانگی تەمەنی دا، نزیکەی ٣٣ کتێبی باشمان بە چاپ گەیاندووە، ڕەنگە خۆشت لەم بارەوە زانیارییەکت هەبێت.

من ئەگەر ڤیزەی ئیران دوام نەخات، بەنیازم لە ناوەڕاستی مانگی داهاتوو تا کۆتایی ئەو مانگە بگەڕێمەوە وڵات. چونکە هیچ کاریکم لێرە نەماوە، و لەوێش کاریکی زۆرمان هەیە ونامەوێ لێی دووربکەومەوە .تکایە لای خۆتەوە جگە لەکارەکانی خۆت، ئەگەر بتوانیت لە زمانی فەرەنسییەوە، پرۆژەی ترمان پێشکەش بکەیت، واتە تەرجەمەی تێزە فکری و فەلسەفییەکان، لە بوواری مەعریفی و کەلتووریدا، ئەو کتێبانەی کە بۆ ئێمە لە نان و ئاو پێویست ترن..

نازانم هیچت لایە؟ یان لە داهاتوودا ئەتوانی کاریکی لەو بابەتەمان بۆ بکەیت، لە بووارەکانی ڕەخنە و ڕۆشنگەری نوێدا؟

براگیان من ئەوە ماوەیەکی درێژە خەریکی خوێندنەوەم، لە تێڕامانیکی قوڵدام بەرامبەر ئەو کارانەی کردوومن، ئەمەوێ خۆم لە بازنەی شیعرەکانی رابردووم قوتار بکەم، زۆر گرانە، بەڵام هەوڵ ئەدەم بەرەو ناخی خۆم بگەڕیمەوە.. نازانم ئەتوانم یان نا.. (بۆننامە)[1] دووا قەسیدەی درێژم بوو، هەوڵیکی تر بوو بۆ ڕەنگین کردنی بەلایەنی کەمەوە.

حەزەکەم تا لێرم پەیوەندیمان هەبێت، چ بە نامە و چ بە تەلەفۆن، یان چیت هەیە بۆم بنووسە. بە کورتی من ئەمەوێ بە تایبەتی کاری بۆ تو بکەم، بۆ چاپکردنی ئەو بەرهەمانەی خۆت دەتەوێت و تا نزیکەی ٤٠٠-٥٠٠ لاپەرە، ئیتر خۆت سەرپشک بە. حەزەکەم ئاگاداری ئەوەش بیت، ئیستا ڕۆژگاری هاتوتە ئاراوە، ئەو بەرهەمانەی لە سلێمانی چاپ ئەکرین، ئەگەنە شارەکانی ڕۆژهەلات..سنە، سەقز..سابلاخ، بۆکان و لەویش نەوەیەکی نوێ لەسەرهەڵداندایە..

لە کۆتایی دا دیسانەوە

بە هیوای خۆشیتم و هەر بژیت

تیبینی: لە ٢-١٠وە تا ٧ -١٠ لە سویسرا ئەبم بە دەعوەتی تایبەتی شارەوانی زیوریخ، دوو ئیوارە کۆڕی شیعر خویندنەوەم ئەبێت هەر لەوێ، کی ئەڵێ لەوکاتەدا باڵ ناگری بۆ ئەوێش، من بڕوا بە نیشتنەوەی تۆ ناکەم، چونکە بەردەوام لە باڵە فڕیندایت!

برات شێرکۆ بێکەس

١٩٩٧/١٢/٢٩

---

[1] شێرکۆ بیکەس، بۆننامە، قەسیدەی درێژ، ١٩٩٨

**سەروملت لەم پەلکە ڕەنگینەیەوە ئالاوە!**

نامەی شێرکۆ بێکەس بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

ستۆکهۆڵم ١٩٩٧/٨/١٩

برای ئازیز کاکە ئەنوەر

بە هیوای چاو و دڵ ڕوونی و لەش ساغیتانم. لە دەمێکەوە ئەمویست پەیوەندیتان لە گەڵدا ببەستم، واتە دوای ئەوەی کە هەندێ لە شیعرەکانی خۆتان بۆ ناردبووم.. بەڵام هیچ ناونیشانێکی لەگەڵ دا نەبوو.. هەرچۆنێک بێ وا لە نامەکەی کاک شێرزادا ئەو ناونیشانەم دەست کەوت. حەز دەکەم ناو بە ناو یەکتر بەسەر بکەینەوە. کاک عوسمان شەیدا لە چیدایە؟! ئاگات لێ یە یان نەء؟! خەرکی چی یە؟! لەگەڵ بادە دا هەر بەینی گەرمە؟! ئەی شیعر؟!

وەک بیتەوە بیرم تۆ زۆر منال بووی- وەختی گاگوڵکێ کردن- من تۆم لە ماڵی حەمەعەلی دیووە؟! ئەوەتا وا ئێستەیش لە دنیای شیعردا بەیەک دەگەینەوە.. پێم، خۆشە سەروملت لەم پەلکە ڕەنگینەیەوە ئالاوە!

سوید و فینلەندە دووانەی ناو بەستەڵەک و ساردو سڕیی کۆمەڵ و تاریکین.. چی بکەین ئێمەیش کەوتینە ئەم قوتبە شینەوە. باشە وا کاک شێرزاد هاتۆتە لاتان. شێرزاد بەهرەیەکی جوانی ئێمەیە. لە گۆڤاری (بینین)یشدا شیعرێکتم خوێندەوە، وێنەی جوانی تیا بوو. ئەی ئێستە خەریکی چیت؟! با پەیوەندی هەر هەبێت.دیسانەوەبەهیوایخۆشیتانم

**خەریکە وەک داریکی کلۆرم لیدێ.**

نامەی شێرکۆ بێکەس بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

برالەی خۆشەویست کاکە ئەنوەر

ئەم کاتەتان باش و بە هیوای خۆشیتانم. دەمێکە وەک خۆتان نوسیوتانە دەنگتان نیە؛ من بە دەنگی ئێوە هەرگیز ئیقاعم تێک ناچێ چونکە لە ولاتی شیعرەوە ئەدوێن! .. لە سەفەر بووم و دوێنێ گەڕامەوە.

ئێ لە چیدان؟! شێرزادیشمان گەڕایەوە.. من بڕیارەکەیم گەلێ پێ باش بوو، چاک بوو خۆی دەرباز کرد.

چونکە ئەگەر ژن و منداڵەکانی بگەیشتنایە ئەو خۆ دەربازکردنە رەنگ بوو سەرنەگرێ.

ئەوەی راستی بێ ئێمە هەموو ون بووین، من هەرچەند ئەکەم لەگەڵ ئەم ولاتە رانایەم، هەر لەبەر ئەوەیشە خۆیشم و بەرهەمیشم هەر لەولا ئەژین!

بە نیازم لە سەرەتای مانگی هەشت دا لە ریگەی شامەوە بۆ تاران و لەوێوە بەرەو ولات بگەڕێمەوە. رەنگە بۆ سەردانێکی دوورو درێژ و نازانم چەندم پێ ئەچێ، ئەوە بۆ دوو ساڵ ئەچێ دابڕاوم!

هەست دەکەم بێ تاقەتم خەریکە وەک دارێکی کلۆرم لێدێ. پێم وایە ئەگەر بچمەوە سەر لە نوێ ئەژێمەوە. جا ئەوەش لەسەر ئەوە وەستاوە کە ئایا ڤیزەی ئێرانم ئەدەنێ یان نا؟! لە شام داوای ئەکەم.. بزانم چۆن ئەبێ؟

سلاوی تایبەتیم بۆ کاک عەبدوللا سەراج. بە هیوام دەنگتان هەبێ. دیسانەوە سوپاست دەکەم. هەر بژین

براتان شیرکو بێکەس

## داستانی هەڵۆی سوور و کەشکۆڵم بۆ نووسیون!

نامەی شێرکۆ بێکەس بۆ ڕەووف بێگەرد

سێروان ٢٦-٧/ ٢/ ٩٨٥

زۆر خۆشەویست و جگەرسۆزم

کاکە بێگەرد..

چاوەکانت ماچ ئەکەم. بەهیوای لەش ساغی و سەرفرازی و چاو و دڵ ڕوونیتانم. ڕێز و سلاوم بۆ ماڵ و منال و ئومێدم بەختیاریانە. هەواڵی گەرمی برادەران کاکە قالە [عەبدوڵلا ئاگرین] و کاکە عەبە و کاکە مچە و هەر برادەرێکی تر ئەپرسم کە پرسیارم ئەکات.

کاکە گیان: ئەم نیوەڕۆیە نامە و دیاری یە بەنرخەکانت گەیشتن. چاوم ڕوون بۆوە. - نامەی ماڵەوەم پێ نەگەیشتوە. تا ئیستاش موکریم [محەمەد موکری] نەدیوە- من ئەوا نزیکەی مانگێکە دامزراوم و ڕێ و جێ و ژووری خۆم هەیە. باری دەروونیم زۆر باشە. خۆیشم بۆ ڕۆژانی زۆر تاریک و ناخۆشترە هەڵگرتووە. لێرە تێکرا هەر هەموو لە "مام"ەوە تا ئەگاتە سەر دوایەک ڕیزی منیان بە زیادەوە لە لایە. (پ.م)ەکانی دەروپشتم یارمەیتم زۆر ئەدەن، زۆر کاریان بۆ ئاسان کردووم. کتێبێکی زۆرم لە بەردەست دایە و خوێندنەوەم ناهێڵی بێ تاقەت ببم. ناوبەناویش سەردانی نزیک بۆ لای برادەرانی دەروپشتم ئەکەم. زۆربەی کات هەر لە ژوورەکەی خۆم دام، لەگەڵ ئەدەب و فیکر و فەلسەفە و بیری و جوان و ئیبداعدا ئەژیم ناوبەناویش ئەنووسم. ئەوەتەی هاتووم -دوو شیعری پێشمەرگانەم- نووسیوە. کە ئێستا من ئەوەبە کاری گەورەی خۆم ئەزانم. دوو کوڕی بچووکیشم گێڕاوەیەکەمیان بۆ ٤٠-٥٠ کادێرێ کە دەورەی تایبەتیان هەبوو لە کانی تو. دووەمیان بۆ ٢٠ پێش مەرگەی دەزگای پێشمەرگایەتی لە شوێنەکەی خۆم. حەزەکەم بجولێم حەزەکەم گوێم لێ بگرن و گوێیان لێ بگرم، ئەو مرۆڤە سادە و ساکارانە ئەو پێشمەرگە دلێرانە،

ئەوانە کەرەسەی زیندووی منن. هەر ئەوانەش ئینسانی ڕاسەقینەی پاکی ئەم خاکەن. هەر لەم بەینە دا بەشی دووەمی -کەشکۆڵی پێش مەرگە-[1] چاپ ئەکەم کە بریتیی یە لەم سێ قەسیدەیەی لەم دوایە دا نووسیومن.

کاکە گیان: هەروەکو لێرەش پێم وتی، دیسان دووبارەی ئەکەمەوە. من ڕاونەنرابووم دوژمنیش نەهاتبووە سەرم. ڕەنگ بوو زۆر ئاسایی بێ مانەوەیشم. خۆ ئەگەر یەکێ بیەوێ دەست بە کڵاوی خۆیەوە بگرێ ئەوە باشتر و بێ وەی ترە، من ئەمتوانی دەست بە کڵاوی خۆمەوە بگرم؟ ڕاستە دەرکەوتوو بووم ڕاستیشە ئەوان ناردیان بە شوێنمدا، بەڵام من بەویست و ئیرادەی خۆم ئەم شاخانەم هەڵبژارد بەڵێ ئەبوو بێمە لای شیعرەکانم. ئەبوایە لەوە زیاتریش بەلەشیش دوور نەبم لەو "پ.م"انە کە "داستانی هەڵۆی سوور و کەشکۆلم"[2] بۆ نووسیون. بڕواشم بەوە نەماوە کە ئەفەندەکانی ناوشار باسی دەکەن. مردنیشم لەوە باشترە کە بە حیزی و سەلامەتی بژیم. کوردیش تەواو بوونی بۆ نی یە نەوە لە دوای نەوە هەر شاخ چارەنووسە و ئەم ژیانە دوا مەنزڵی هەموو یەکێکی وەکو ئێمەو مانانە. ئەبوایە لەم قۆناغەدا ئێرە هەڵبژێرم، کۆتایی بە کوڕی و فیز و نادی و قاچ خستنە سەر قاچ بهێنم ئەبوایە کردەوەم بخستایەتە پاڵ شیعرەکانم. کردەوەیش ئەمڕۆ هەڵبژاردەی ئەو شوێنەیە کە سووتەمەنیەکانی شۆڕشی لێن. خەڵکی زۆر لەوە وریاترە کە تصوری ئەکەن، حساب بۆ هەمو هەنگاوێ ئەکەن ئەپرسن لە شتی ئەوتوۆ، بڕواشم بە ئەدەب نەماوە کە ئەدەب بتوانێ لە ژێر سایەی داگیرکردن و زەبروزەنگ و کوشت و سەربڕیندا هەناسەی ڕەحمەتی بدا و نشەونما بکات. لەم ڕووە دووژمن هەرچی یەک بکات بۆ ئەوەیە، چۆن داوەکانی بچێنێت. چۆن سبەیینێ زمان و ئەدەبی کوردی لە ناو بەرێت. شەڕی گەورەی ئێمە شەڕی ناو سەنگەرە، ئەوەت بردەوە هەموو شتەکانی تر ئەبەیتەوە، دۆڕاندت ئەوانی تریش ئەدۆڕێنی، ئەمە حەقیقەتە و کەس ناتوانێ نکوڵی لێ بکات. ئەبوایە کۆتای بە ئەفەندێتی و گوێ

---

[1] شێرکۆ بێکەس، کەشکۆلی پێشمەرگە، ١٩٨٥

[2] شێرکۆ بێکەس، داستانی هەڵۆی سوور، ١٩٨٤.

گرتن لە کوڕی فشە و پیاو و خۆپەرست  و بێ بار بهێنم. ئەبوایە بێمە لای شیعرەکانم، حەزەکەم ئەوەیەش بزانی یەکەم جارە پێت دەڵێم: 'من لەو وەختەوە کە وازم لە چوونە نادی هێناوە -ئەگەرچی نەخۆشییەکە هۆیەک بوو- وازم لە خواردنەوە هێناوە بەو ئیصرارەوە... تێکەڵاوکردنم کەم کردۆتەوە.. لەو وەختەوە بڕیاری خۆم دابوو، لە بڕیاردانیشدا بڕوام بە ئیرادەی خۆم هەیە' ئەوەتا ئەم خەڵکە هەژار و رەش و ڕووتەی لادێ ئەسووتێن، بەدەیان هەزار هەڵئەکڕوزێن، تۆپ باران ئەکرێن، ئیتر هەندێکیش سەودای یەکێتی نووسەران و مووسەرانیان لە سەر دایە و بە تەمای ئاهەنگ و زل بوون و مێ بازی و گان کردنن،،ئەوان درۆزنن.

ئەیانەوێ لە پاڵ ئەو ناوەدا، خۆپەرستی خۆیان بکەن و من بەش بەحاڵی خۆم لە بیروهۆشی خۆمدا کۆتاییم بەو مەهزەلانە هێناوە و تەواو. من لەگەڵ ئەماندام تا مردن. دنیای سیاسەت ڕووناکی تێخستمەوە ئەوا وەک ئەو خەڵکە، تاریکیش بوو هەر وەک ئەو خەڵکە. من لای خۆمەوە شەرمەزار ئەبم، تک تک ئەرەق دەرەکەم کە چۆن کەسانی وەک (...... ...... ......) نموونەی ئەو جۆرە، ئەفەندیە بەزیوانە ڕوویان دێت قسە بکەن. لێرە دیوانیان دەرکردووە و سەری زمان و بنی زمانیان شیعریانە - شۆڕش و شۆڕشگێڕیتی بوو کەچی لە ئاواش.. سەیر نی یە چونکە ئەوان هەر لە بنەڕەت دا هەر ڕاڕاو ودوودڵ و بە بڕو بیانوو و بێ ئیرادە بوون. ئەمە سەرەرای ئەوەش چونەوە بەلام بشبن بە دەلالی یەکێتی نووسەران کردنەوەی دەوڵەت؟! چەندی بە چەند چۆن شەرم ناکەن؟. دەربارەی یەکێتی نووسەران رای من زۆر ڕوونە ئێمە لە ئەساس دا و لەم دواییەدا کە نەچووین بۆ کۆنگرەکەیان لە هەولێر دیارە لەبەر ئەوە بوو کە بڕوامان پێ ی نەبوو مەسەلەی ئەو مەرجانە جێ بەجێ ئەکەن نایکەن ئەمە جەوهەری مەسەلەکە نی یە بەڵکو (لە وەختێکدا پێشمەرگە و گەلی کورد لەم زروفەدایە، ئیتر ئەو یەکێتیانە ببن یان نەبن چین؟! دەوڵەت پێی خۆشەو هەوڵ ئەدا ببن، مانای چی؟ مانای ئەوەیە لای ئێمەوە نابی ببێت. موعادەلەکان ڕوونن. بۆ ئەوەی ڕۆشنبیران و ئەدیبیان لە شۆڕش دابڕن. بە چەند دەستکەوتنێک وەختی دەست خەڕۆ بکرێن؟! لەم لایشەوە بمان سوتێنن، دەربەدەرمان بکەن، چۆن یەکێتی

نووسەران لە ئازارو دەربەدەری ئەم میللەتە جیا ئەبێتەوە؟! ئێمە ڕەنگە لەو بەینە دا بە ڕەسمی ڕای خۆمان لەو بارەیەوە دەرببڕین. لەبەر ئەوە ئێوە بە هیچ جۆرێک خۆتان لەو بوارە مەدەن. چونکە هەر هەمان تاس و حەمام و پەیوەندیشی _بە بارودۆخە گەورەکەوە_ هەیە هەر کە دەسەلاتیان بوو، هەموو ئەو ئەدیبانە بە ئسلوبی خۆیان رسوا ئەکەن و چیشیان بۆ ئەکریت؟!) بە کورتی ئەو جۆرە خزمەتانە ئەبنە فشە خزمەت و من براوام بەو شتانە نەماوە. لە ڕۆژگاری وا ئاڵۆزیشدا کە نەتوانی بەرەنگاربوونەوە درووست بکەیت ئیتر چی ئەکەیت؟! بەیانی تووشی دەیان هەڵوێستی پڕ لە "ئیحراج" ئەبن، نایکەن؟ هەر تەنها کۆنگریەک بەسە بۆ ئەوەی بیانخاتە دەیان هەڵوێستی تووش و نارەحەتەوە، پێم وایە ئەو دەورەش بەسەرچوو ئایا یەکێتی نووسەرانی کورد ئەدەنەوە؟! نەء.. بێگومان من لێرە هەڵوێستم توندوتیژتر ئەبێت. حەددی تر ئەبم. ئەگەر برادەران لەگەڵم ڕێک بکەون هەر ئەبێ یەکێتی نووسەرانی کوردستان یەکێتی ڕاستەقینەکەی ئێمە بێت و ئیتر کێ لەگەڵماندا ئەبێت و کێ نابێت بەو پێیە مەوقیفی ئەدەبی و فیکری خۆمان دیاری ئەکەین. ئەمە ڕاستگۆییەو حەزیش لە مجامەلە ناکەم.

براگیان: من ئەو برادەرانەم بینی، ئەو پێشمەرگانەی کە لە شەڕەکانی ئەم دوایەدا بوون، لە گوێ گرتنی تفاصلێ دا هەر سەر ئەسووڕمێ کە چ قارەمانێتییەک کراوە و چ داستانێ تۆمارکراوە. بەڕاستی شەڕی وا زۆر کەم کراوە ئەوەی زۆر جی ی دڵخۆشیشە سەرکردەکانە، کاک عومەر و هەموو سەرتیپ و کەرتەکان خۆیان لە پێشەوە بوون یەکەم دەست ئەوان وەشاندوویانە، ئەزانی پێشمەرگەیەک چۆن شەهید بووە؟! تفەنگەکەی وەستاوە ئینجا خۆی هەڵداوەتە ڕەبابیەکەوە و لەوێدا لە ناو سەنگەری دوژمناندا کوژراوە. ئێمە پێویستە گوێ لەوان بگرین، نەک ئەفەندییە بەزیوەکان. ئێستە کە ئەم نامەیەت بۆ ئەنووسم، بەسەدان پێشمەگە لە سەر لوتکەی شاخەکان لەم لا بنگردەوە تا ئەگاتە لای ئێمە لە ناو بەفردا بەسەر شاخەوەن. هەموو خۆقایم کردنێ کاری بۆکراوە، چونکە ڕای زۆربە ئەوەیە کە دەوڵەت هێرشێک ئەکات و ڕەنگە هەر بۆ -دابان-یش بیکاتەوە.. بەڵام دەوروبەری سەرکرادایەتیش توند

گیراوە. هەموو لایەک گیراوە. دەربارەی شەڕ ئەمان شەریان کردۆتەوە. ئەی شەڕکردنەوە چی یە؟! مفاوضات ناکەنەوە بەڵام شرووتی خۆیان بۆ -هدنە- داوە بە دەوڵەت کە تا ئێستا هیچ جوابی نی یە. شرووتەکان قورسن، وەکوو "چۆڵکردنی هەندێ ناوچە بۆ پ.م ڕێ ی بوونی هاتوچۆی دەرەوەی عێراق، تەحدید کردنی وەختێ کە هەردوولا لەسەری ڕێبکەون" طبعا ئەمە لە بەرژەوەندی ئەوان نی یە. شەری لێدانی ئەو ماڵە عەربانەش تا سەر ئێسقان ئازاری داون. وە پێشیان وتون کە بەسەر هیچەوە نارۆن. وە ڕەنگە لەماوەیەکی کەم دا وەشێنێکی گەورەتر لە شوێنێکی ترەوە بوەشێنین. ئەمانە هەمووی لە لایەک لە لایەکی تریشەوە "هەوڵی کردنەوەی لاڕێ ی تر دراوە" کە ژیانی داهاتوی پێوە بەستراوە.

کاکە گیان: یەک دوو ڕۆژ لەمەوبەر نامەیەکم بۆ ماڵەوە و نامەیەکی بە پەلە و کورتیشم بۆ باوکی کرمانج نووسیبوو. چونکە ئەوەی ڕاستی بێ باوکی کرمانج تا ئێستە دوو نامەی بۆ نووسیووم، نازانم بە دەستان گەیشتوە یان نا؟ شتێکی تازەی وا نەبوو بۆ ماڵەوەی بنووسم. ئیتر ئەبێ ئیدارە بکەن و تەحەمولی بکەن و ئەوە ژیانی کوردە و هەرواش ئەبێ بۆ نەسرینم نووسیبوو کە زوو زوو هەندی لەو -براژنانەی- لێرە ببینێ، یان بە تەلەفۆن قسەیان لەگەڵدا بکات و ئاگاداری یەکتر بن، طبعا ئەبێت ئێوە ئاگاتان لە دەنگوباسی بێت و ئەگەر شتێک دەربارەی -خێزان گرتن- لە ئارادابوو پێیان بڵێن بۆ ئەوەی شوێنی خۆیان بگۆڕن (ئەمەیان پی مەڵین با نەترسن) بەڵام من خۆم وەختی خۆی هەموو شتێکم پی وتوون، با هەندێ کەلوپەیش لە وەختی خۆیدا بەرنە ئەودیو. بە کورتی وریا بن و هیچی تر.

کاکە گیان: لە زمانی منەوە سوپاسی ڕووناک خان بکە، دیارە بە ئصولی ئیتر دوای ئەوە کتابی خۆیان نووسیوە و با دوای نەخەن، چونکە ئتیر حەزناکەم درێژەی بدرێ بە ئیجازە و نیشمە. نان کردن بە دووکەرتەوە لەگەڵ حوکمەت با کۆتایی پی بێت.. وا دیارە فەرەیدوون واز لەوە ناهێنێ..ئەمانە لیرە خستویانەتە دەست خۆیەوە وا دیارە ئەو شاری پێخۆشترە. گرنگ سەلامەتیەکەیەتی و تکایە

سلاوی منی پی بگەیەنە. بیستم کاکە مچە [مستەفا سالح کەریم] گوللەی ویڵ خەریک بووە خوانەخواستە کوتای پێ بێنێ بەلام چیغی کردووە، بەهیوای سەلامەتی ئەویشم وا ئەمجارەش خەلەست ئەو رۆژە پێشمەرگەیەک هەوال ی ئەپرسیت ئەیوت "ئەو ئەدیبە لە کوێ یە کە لە مێرگەپان عەریف حەفلە بوو هەرتا ئەوێ لەگەلماندا بوو؟!" فەرموو ئەلێ ی چی.. منیش وتم "ئەو لە شار خزمەت ئەکات" کەچی پێشمەرگەکە زەردەخەنەیەک گرتی و وتی "ئەو قسانە سواوە" دە فەرموو دەی!

کاکە گیان: بێ گومان نووسەران لێرە بێ سەروبەرن، بڕوایش ناکەم بە ئێمە و مانان ڕاست بکرینەوە، دووسێ یەکیان چوونە بالیسان/ سەعدولا، خەلیل.. سامیش نیازی وایە لە الشرارە دا کار بکات. ئیتر نازانم چۆن ئەبێت. بەکورتی کاری ئێرە هەر یەکە وبە خۆیەوە بەستراوە. کاری بە کۆمەل لەگەڵ ئەواندا گرانە، ئاژاوەن. "مارکسی و عەبەسی و بادینانی و قەومی و هەموو لە ناو ئەواندا بەسەر یەکدا ترشاوە".. نزیکەی مانگێکە نەمدیون، هاتوچۆ هەندێ جار ئاسان نییە حەمە[محەمەدی حەمەباقی] یەک دووجار سەری داوم، منیش چوومە ئەوێ، بەلام گرنگ ئەوەیە من ئیستە جێ خۆمم هەیە، بەلام تاکەی لەم ناوەیش ئەمێنینەوە و ناڕۆین ئەوش مەعلوم نی یە و بە بڕوای من ڕەنگە لە بەرهار تێپەڕ نەکات چونکە ئەگەر شەڕی باشیشی تێدا بکرێت ئەنجام هەر ئەبێت چولکرێت... ئیتر کوچەرێتی یە.. هەر بووە و هەر وایش ئەبێ.. بەلام پێم خۆشە توندوتیژن بە تەمای زۆر شتی... مەسەلەی سازبوونەوەیان لەگەڵ حوکومەت دا ئیحتمالیکی زۆر دوورە- مەگەر بە شرووتی ئەمان رازی بێ- ئەمە جگە لەوە دەولەت وازی لە بۆردرومان کردن و تۆپ باران هێنان نەهێناوە، ڕۆژانی داهاتوو.. روون بوونەوەی وردتر ئەخەنە پێش چاو.. دیسانەوە سلاو و خۆشەویستیم بۆ هەموو لایەک وَ هەر بژین.

براتان

**بەشکوو مسوەدەی دیوانی ڕەنگالەم بۆ وەربگریتەوە!**

نامەی شێرکۆ بێکەس بۆ ڕەووف بێگەرد

سێروان ٩٨٥/٦/٢٥

برای خۆشەویست وهاوڕێی بەڕێزم

کاکە فەرهاد [ڕەووف بێگەرد]

بە هیوای خۆشی و چاو و دڵ ڕوونیتانم.. سڵاو

و ڕێزم بۆ هەموو لایەک.

کاکە گیان: یان دەرفەت هەڵناکەوێ یان کە هەڵیش

ئەکەوێ بەم جۆرەیە. هەر لەم ڕۆژانەیا لە ڕێی ژوانەوە

[محەممەدی حەمە باقی] نامەیەکی ترم بۆ نووسیبوون.

هەروەها نامەیەکیش بۆ شەریف! "لە هەڵبژاردنی ئەم

ناوانەشدا هەر بێ زەوقە یان قالە یان شەریف"

کاکە گیان: هیچ شتێکی تازە لە ئارادا نی یە. گواستنەوە بەردەوامە

چەند ڕۆژ لە نێوان ڕانیە- چوارقورنەوە دەستێکی باشی لە دوژمن

وەشاند و معاونی قائید فیرقە بریندارێکی سەختە و سێ ئەفسەری

گەورەش کوژراون و (٣) ئۆتۆمبیل سوتێنراوە. احصایەی کوژراوی

دوژمن لە شەڕی کەتوو دا نزیکەی هەزار ئەبێت!! لێرە بە

ڕەسمی و خۆیان پێ یان ڕاگەیاندم (دوێنێ) لە

هەر لایەکەوە ڕێی دەرەوە بکرێتەوە. بۆ ماوەی چەند مانگێک و بەمەبەستی گەشتێکی شیعری لە وڵاتانی ئەورووپادا ئەچمە دەرەوە. دیارە ئەمە چ بۆ شیعرەکەش و چ بۆ خۆم زۆر باشە. ئەوەی بۆ ئاسانکردنی ئەم گەشتەش بکرێ چ وەک ڕابەر و چ وەک مەسەلەی تەرجەمەکردنی هەڵبژاردەیەک لە شیعرەکانم هەر هەموویم بۆ جێ بە جێ ئەکەن. سەفەرێکی ٤-٥ مانگی وا ئەگەر ڕێ بکەوێ فرسەتی عومرە، دڵنیاشم دەنگدانەوەی گەورەی ئەبێ. وا لەگەڵ ئەم نامەیەشدا نامەیەکیشم بۆ کاکە محی [محێدن زەنگەنە] نووسیوە. طبعا ئەمیش و هەندێ برادەری تریش وەک (ج)[1] پێویستیان بەوە هەیە هەندێ بڵاوکراوەی ڕابردوو بە تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندی یان بە شەڕەکانی پشت ئاشان و قڕن قاوە هەیە ببینن نازانم بینویانە یان نا؟! لەلای عزی هەموویت دەست دەکەوێت. حەزەکەم محێ بیانبینێ تەنها لەبەر مەبەستێ چونکە بەڕاستی ئەوان ڕەنگە زۆر خراپ ئەو ئیتطباعەیان لەسەر ئێمە وەرگرتبێ. خۆ لەبیرتە عەرەبەکەی بەغدا چی وتبوو؟ حەزیش ئەکەم بە تفصیل هەموو شتێ بۆ محێ و ج بگێڕێتەوە؟ من دۆستایەتی ئەو دوو ئەدیبەم زۆر مەبەستە.

کاکە گیان: "تەنها بۆ خۆت و بۆ مەعلوماتی خۆت" حەزم ئەکرد ئەوە بزانیت، کە مەسەلەی خیلافاتی فیکری لە ناو کۆمەڵدا لە زیادبووندایە، طبعا ئەو بڵاوکراوانە کە ڕەنگە بزانیت بڵاوئەکرینەوە بە ناوی ئاڵای شۆڕشەوە بەشێکی نیشانەی توندی ئەو خیلافانەیە. یان چەپەکان و متطرفەکان بەم کۆمەڵەیە ڕازی نین و بە مارکسی نازانن! لە ناو شۆڕشدا زۆر کەمن لە جێی نەبووانن. بەڵام لە ئەورووپا لە زیادبوون دان؟ بەختیار ئێشیان لەگەڵ ناکان بەڵام هەرشتێ ڕوودات لەگەڵ ئەواندا ئەچێ.(سالار- نجم ایە) لە ئەورووپا بەرەو ئێران گەڕاوە و یەک دوو کەسی تریشی لەگەڵدایە!! ڕەنگە لە ئێشەکەدا مەترسی دروست نەکەن؟ بەڵام ئەمانیش حسابیان زۆر بۆ ئەکەن؟ هەڵبەتە ئەمە زۆر ناخۆشە و بۆ شۆڕشیش بەم وەزعەوە سەرئەنجامی خراپی ئەبێ کە هەمووی لە ساڵحی دووژمن ئەکەوێتەوە؟ ئەوە ئینجا هەیە بە خەستی دژی خەتی نەوشیروانی، لێرەوە

---

[1] لە نامەکەدا (ج) نووسراوە، کە مەبەست لە "جەلیل قەیسی"یە.

کۆمەڵێ نامە بۆ سالار و ئەوان نووسراوە کە لەم ڕۆژەدا ئەم کارە ئەبێتە هۆی کەلێنێکی گەورە بخاتە ڕیزی شۆڕشەوە. طبعا هاوڕیانی خۆی بۆیان نووسیوە. من و حەمەش [حەمەدی حەمە باقی] وەک دوو ئەدیب نامەمان بۆ نووسیوە و رای خۆمان لەباری سەرنجی بێ تەرەفی سیاسی و یەکێتی نووسەرانەوە خستۆتەڕوو ئەوەی حەقیقەتە نووسیومانە داوامان لێ کردوون کە ئیتر کوردو ئەم تۆزە تروسکای یەی هەیە بەرگەی ئەوە ناگرێت پارچەی تری لێ بێتەوە "مەیمون خۆی جوان بوو ئاوڵەیشی دەردا" نەگبەتی ئەم کوردە بێ کۆتای یە.. حەزم کرد ئەمیش بزانێت.. بەڵام بڵاوکردنەوەی باش نی یە. طبعا کوڕی گەنجی متطرفی مارکسی ناوشارەکانیان بەشێک لەگەڵدایە هەروەها بەشێکی لە ئەوروپا و ئەوەیەش نی یە بڵێ وەڵاهی هیچ نین.

بەڵام بەوە باشە کە بەختیار لەگەڵ تەقینەوەکەیدا نی یە و ئەگەرچی بڕوای بەم کۆمەڵەیە وەک مارکسی و لینینی نەماوە! ئێمە طبعا ئەبێ دەوری بێ لایەنی تەواو و تەبایی و برایی لەم مەسەلەیەدا ببینین. ئەگەرچی وەک ئەزانیت ئەوەی تەعبیر لە ڕای سیاسی ئێمە ئەکات و یان ئێمە بەلامانەوە خەتی درووستە هەموو کاتێ هەمو مەسەلەی بیرباوەڕی نەتەوەیی شۆڕشگێرانە بووە. بهڵام من بەش بە حاڵی خۆم بەرژەوەندی شۆڕشەکە کە یەکێتی و تەبایی لە سەروو هەموو شتێکی ترەوە تەماشا ئەکەم و ئەو نامەیەی کە بۆ سالاریشم نووسیوە (هەرچەند هیچ ناسیاوێکم لەگەڵدا نی یە) هەر بەو پێودانە نووسیوە. بڕواش ناکەم دەوری هەبێ! بەڵام لەم ڕووداوانەدا بێ دەنگ نەبم باشە!

کاکە گیان وەکوو نووسیبووم بەشکوو مسوەدەی دیوانی ڕەنگاڵە[1]م بۆ وەربگریتەوە دوای بینێری. لە هەموو حاڵەتێکدا ئیتر هەتا هەفتەیەک دە ڕۆژی تر لەم ناوەین. لەبەر ئەوە چ بۆ ناردنی بەرهەم و نامە و هاتنی خۆتان لەمەودوا بیر لەولا بکەنەوە. لە کۆتاییدا خۆشیت و چاوت ماچ ئەکەم. بە هیوای سەربەرزیتانم.

براتان

جوامیر[2]

"تکایە راسپیاردەکانی ناو ئەم نامەیەتان لەبیر نەچێت"

بۆ ڤیدۆیەکە نەسرین و ئەوان بەکاریان هێناوە، دیارە نەیان زاینوە رەش و سپی نیشانی داوە طبعا ئەبێ ملون بێت. بە پاڵ و سیگامیش هەروایە. بۆ ئاگاداریتان.

---

[1] شێرکۆ بێکەس، ڕەنگاڵە، ١٩٧٤.

[2] جوامێر مەبەست لە (شێرکۆ بێکەس)ە، لە بارەی ناوی جوامێرەوە دەڵێت: لە شاخ کاتێک شیعرم دەنارد بۆ دەرەوە بەناوی (جوامێر)ەوە شیعرەکانم بڵاودەکردەوە، چونکە لە رادیۆشدا دەخوێندرایەوە، بەلام لەدوای ساڵی ١٩٨٤ئاشکرابوو، کە جوامێر منم بەشی زۆری پێشمەرگەش بەناوی جوامێرەوە منیان دەناسی.

**دوا بەرهەمم دەربەندی پەپوولەیە،**

**کە ئێستە لە ژێرچاپ دایە!**

نامەی شێرکۆ بێکەس بۆ ڕەووف بێگەرد

ستۆکهۆڵم ٢٣ /١٩٩١/٨

برای ئازیز و خۆشەویستم

کاکە ڕێبوار [ڕەووف بێگەرد] گیان!

ماچ و تاسە و پەرۆشی دووری و سۆزی بێ ئەندازەم بۆ دیداری پاک و گیانی تینووتان... بۆ دار و بەرد و ئاشنا و ڕۆشنا و هەموو کوردێکی جوامێر و هەموو قەڵەم و وشەیەکی تەوێڵ بەرز و گەردن کەش.. لە "گوخلان"ی کۆچ و ئازارتانەوە..لە کاتی خۆیدا نەمەکەتان گەیشتە دەستم، بۆ دەرفەتی وەڵام دانەوە ئەگەڕام هەر نەبوو، بە تایبەت دوای ئەوەی کە دڵنیا نەبووم ئاخۆ ئەبێ ئەم بنەوبارگەی کۆچە بە کۆمەڵە لە کوێ ی تر بگیرسێتەوە! ئێوە لە ناو گەرداوی کارسات و نێرینەی بەسەرهاتەکاندا و ئێمەیش لەم دوورەوە لە تاراوگەی نامۆیی و دەربەدەری یەکدا کە لەوە ناچی کۆتایی هەبێ!... زمان .. شیعر.. چیرۆک.. لە ئاستی ئەم کاروانەی کۆست و نەهامەتی و پاشاگەردانییەدا دەستەوەسان و لاڵ و چاوئەبڵەق بووە. چی بنووسم؟! بە هیوای ئەوەی گوێم لە دەنگتان بێ هەر دوای ئەوەی نامەکەتان گەشت تەلەفۆنم بۆ ماڵی حەمە [محەمەدی حەمە باقی] کردا بەڵام بە داخەوە لەو ناوە نەبوون. نامە جوانەکەتان وەک فرمێسکی تیزانە چاوانم، لە هەمان کاتیش دا خۆشییەکی لە سنوور بەدەری پرژانە ڕۆحی تینومەوە، خۆزگە منیش لە ڕۆژانی ئازادی وڵاتدا لەگەڵتان ئەبووم، خۆزگە منیش بە چاوی خۆم کەلاکی ئەو مێردەزمانەم ئەبینی و ئیتر دوای ئەوە بشمردمایە چش! چی لەوە خۆشترە بۆ ساتێکیش بێ ئەو هەوای ئازادی و سەرفرازییەی هەڵمژیت.

سلاو و باوەشی گەرم و ماچی زۆرم بۆ خۆشەویستان: تاله و مچه و سەلیم سێ تەنگه و هەروەها قالەیش "ئەڵێن قاله خۆی کردۆتەوه به تونیلی سیاسەتدا و زرمەی دێ و خەریکه. من پێم وایه هەر له سەرەتاوه ئەم ئەوەی بکردایه و له هونەری گرانی چیرۆک به دوور بووایه باشتر بوو".

کاکه گیان: وا دیاره ئەم دەستی به دەستی و یاریکردنەوەی (صدام) ئەخایەنێ و ئەم سەردەمی نه ئاشتی و نه شەڕه درێژه ئەکێشێ. تینووم بۆ بینینەوەتان، حەزەکەم و زۆریش سەرێک بدەمەوه، رەنگه پێویستیش بێ، بەلام له هەمان کاتیشدا دوودڵم. چونکه ڕەنگه ئەو بارودۆخه به رۆژ بگۆردرێ. ئەمه جگه لەوەی من پەساپۆرتەکەم تا ئێستا پەساپۆرتی پەنابەرانەیه و پێویستم به ڤیزەی ئەو ولاتانەیه و ئەمەیش زۆر ئەخایەنێ، چونکه بەشی زۆری ئەو برادەرانەی ئەگەڕێنەوه پەساپۆرتی ئەو ولاتانەیان هەیه و بێ باکانه ئەتوانن سەفەر بکەن.

و لەگەڵ ئەوەیش دا – بینینەوەی ولات و ئێوه له کەللەی داوم و مەراقی شەو و ڕۆژمه- بابزانم چۆن ئەبێ. کاوەی ژن برایشم نامەی بۆ نووسیوم ئەڵێت: "پەله نەکەیت باشتره" ئیتر له بەینی ئەو ئاگردانەیا دوودڵم و نازانم چی بکەم؟! لەو کاتەوه به نامەیش لەیەکتر دابڕاوین من هەر له جموجۆڵ و گەشتی شیعری خۆمدام. له سۆڤیەت به یادی ئێوەوه تەواوی سەرجەمی بەرهەمەکانی چیخۆم کڕی و هەروەها کەڵه نووسەرەکانی تریشیان. له نامەکەتدا نووسیبووت "هەڵۆ"[1]م بۆ ناردویت بەلام حەزەکەم بزانیت هیچم به دەست نەگەیشتووه. من له ڕووی نووسین و بەرهەمەوه لێم ئەڕژێ هەست ناکەم نه تووشی باران بڕان بووم و نه ماندوویشم، دوا بەرهەمم "دەربەندی پەپوله"[2]یه که ئێسته له ژێرچاپ دایه. یەک قەسیدەی درێژی درامی یه که به نەفەسی رۆمان نووسیومه، نامۆی و نیشتمان مێژوو و یادگاره، به قەوارەی مام ناوەندی(١٨٢) لاپەڕەیه، تاقیکردنەوەیەک تازەمه، هەوڵدانێکه بۆ ئەوەی شیعر لەو قاوغه بەرمەدەرەوه که تا ئێستا گیریان تیا خواردووه.

---

[1] ڕەووف بێگەرد، هەڵۆ، بەغدا، ١٩٨٨.

[2] شێرکۆ بێکەس، دەربەندی پەپووله، ١٩٩١ سوێد.

پارانۆمایەکی هەزار رەنگە، رەنگە تا دوومانگی تر بکەوێتە بەردەست بەقەدەر یەک دنیا دڵم پێی خۆشە. نزیکەی ساڵێک پێوەی خەریک بووم. ئەمە جگە لەوەی لە هەمان کاتیشدا خەریکی کۆکردنەوە و ڕێکخستنی بەشی دووەمی دیوانەکەمم و کە ئەم جارەیان بریتی ئەبێ لەو پێنج دیوانەی(.......)[1]بەینمان باشە و یەکتر ئەبینین، بێگومان ئێستە ڕەفیق[رەفیق سابیر]. لە رووی بیرکردنەوەی سیاسیەوە مرۆڤێکی ترە و سەد دەر سەد نەتەوەییانە بیردەکاتەوە. بە داخەوە ئەنوەر [ئەنوەر قادر محەمەد] نابینم و لووتەلایە و بۆچی؟! نازانم.

ئەوی تریش کە خۆت ئەیناسی, تا ئێستا ئەو شتانەی کە بڵاوی کردتەوە، بە هەمان سەقفی جاران، لەسەر جنێودان بەردەوامە و وا ئێستاش ڕیزی جنێو رووی کردۆتە (پاسۆک) و لەوانەوە ئاڵاوە. من جار زۆر نائومێدی دام ئەگرێت، چونکە هەست ئەکەم و کێوێتی و دڕێتی و خۆخۆرییە وەک هەر لە ناو ئێمەدا هەبێ وایە. لێرەش کەس دانووی لەگەڵ کەس دا ناکولێ. عەینەن تاس و حەمامە. پێم وایە لە نامەیەکی تردا بۆم نووسیویت کە ئێستا بەشێک لە بەرهەمەی -خەریکە لەلایەن دەزگایەکی چاپەمەنی فەرەنسی یەوە بە زمانی فەرەنسی چاپ دەکریت. هەروەها خەریکی دووەم کتێبێن بە زمانی سویدی. لە سۆڤیەتیش وەختی خۆی دوو جار چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کردم– بۆ ڕۆژنامەی (ئەدەب)ی لینیگراد کە "١٠٠" هەزار نوسخەی لێ بڵاودەکریتەوە.

هەروەها گۆڤاری "کاتی نوێ" کە بە چوار زمان دەرەچێ و (٦٠) هەزار نوسخەی لێ بڵاودەکریتەوە تا ئێستا لە (٢٠) کۆڕدایشم بۆ شیعردۆستانی ئەم وڵاتانە شیعرم گوتوە لە: سوید، نەرویج، دانیمارک، فەرەنسا، ئیتاڵیا، ئەڵمانیا، و شیعرەکان بە کوردی و بەو زمانانە هۆنراونەتەوە، پێشوازیەکی زۆر باشیان لێکراو لەسەریان نووسراوە. من ئەمە بە هەموو رەخنەی لە جێی نەبووانی خۆمانەوە نادەم. ئەوەندەی بۆم کرابێ و گۆڤار و رۆژنامەکانی وڵاتم کەوتبیتە بەردەست، ویستومە لێ یان دانەبڕێم. لە نێو نەوەی نوێ دا ئەوەی پێوەندی بە شیعرەوە هەبێ بەرهەمەکانی: محمد عومەر عوسمان، مهاباد قەرەداغی، قوبادی

[1] ئەم دێڕە دیار نییە.

جلیزاده، هەروەها حەمە فاررووق [فاررووق ڕەفیق] کەلە کەنەدایە و ناوبەناو لەم ناوە شیعری بلاو ئەبێتەوە- دلم خۆش ئەبێ و هەست ئەکەم کە ئەم دەنگانە (ڕەنگە هی تریش هەبێ و من بەرهەمیان نەدیبێ) ڕەنگە مژدەی قۆناغێکی ترمان بدەنێ.

کە تەلەفۆنم بۆ ئێران کرد. قسەم لە گەڵ د. عیزەدین دا کرد، ئەوە ئەبێ لە چی دا بێت؟!بە قاچی شکاویشەوە هەر لە ڕاکردندایە! حەزەکەم ئەوە بزانیت: کە لە دڵدا و لە ناخەوە لە حەمە [محەممەدی حەمە باقی] زویرم، چونکە بەر لە ساڵێک هەر لە خۆیەوە نامەیەکی زۆر ساردوسڕ و پڕ لە قسەی نابەجێ ی بۆ نووسیبووم، باری خراپی دەروونی خۆی بەسەر مندا شکاندبووەوە. با یەک ڕستەی نامەکەیت بۆ بنووسم: "ئەو کاتە ئێمە لە شاخ بووین، پێویستە بزانیت کە من و تۆ تەنها بە مەوقیعی جوگرافیەوە لەیەکتریەوە نزیک بووین و هیچی تر" چاوت لەم قسە قۆڕ و بێ بنەما و هیچەیە! وە بە دەیان ڕستەی دیکەش کە بە داخەوە حەز ناکەم سەرتی پێوەبێشێنم! من ئەو تیرانەشی لە پشتم ئەچەقێنرێ بە داخەوە هەر لە هاوڕێ نزیکەکانی خۆمەوە بووە! بەلام من سەرم شاخ و گیانیشم هەمیشە گۆمێکی مەنگ بووە.

کاکە گیان: لەبەر نامەبەر ناتوانم نامەکە زۆر درووروودرێژ بکەمەوە، بۆ ئەوەی ئەرکم قورس تر نەبێ . زۆرم پێ ناخۆش بوو. کە لە نامەکەتدا وتبووت: "ئەبێ ببور من پارەم ناوێت".. ئاخر کاکە من ئەگەر لە خۆم زیاد نەبێ نایینێرم، بڕوابکە وایە. ئاخر من چی بکەم ناتوانم ئێستا ئەوەی لە خەیاڵمدایە بینێرم. ئەزانم وەزعتان لەم ڕووەوە شرە و گرانی لای ئێوە لە کێشدا نی یە. بۆیە تکام وایە ئەم دیاری یە بچووکە کە بۆ "هەوار" م ناردووە- کچە جوانەکەی پەسندی[پەسەند] خۆم- بیدەیتێ، ئەویش تەنها (١٥٠) دۆلارە و زۆر زۆر شەرمەزاریشم کە ئەو شتە کەمە ئەکەم بە دیاری. ئەگەر توانیت بە هەڵگری نامەدا "هەڵۆ" و نامەم بۆ بنێری دڵشاد ئەبم.

سڵاو  وڕێزمان بۆ شوکریە خان و چاوی منداڵان ماچ ئەکەین

هەواڵی هەموو برادەرە خۆشەویستەکان ئەپرسم.

هەربژین

برات

شێرکۆ بێکەس

بەتایبەتی دیوانەکەم بۆ ناردبوویت نازانم گەیشتۆتە دەستت یان نا؟

سڵاوی تایبەتم بۆ کاکە محیدین زەنگەنە و بۆ حسەین[عارف] و بیری ئەکەم.
بۆ جلیل قەیسی چاوی ماچ ئەکەم.

**..وێرای دەیان هەزار ئازادیخوازی دیکە کوژراوە؟**

نامەی عەبدولقادر دەباغی بۆ شوکریە ڕەسول

وێرای ڕیز و سڵاو

نامە رازاوەکەتان گەیشت و لە مزگێنی تەندرووستیان دڵشاد و لەوەی کە لوتفتان لەگەڵ ئەم ئاوارەیەدا نواندوە، بە شانازیەوە سپاس بێژتانم.

لە خزمەت مامۆستای بەڕێز عەرزی سڵاو و ئیحترامم هەیە و رەوەندی ئازیز ماچ دەکەم.

سەبارەت بە وەرگێرانە بەنرخەکەتان، بە ڕاستی لە ناخی دەروونەوە پیرۆزباییتان عەرزدەکەم و سەرکەوتنتان و زێدە خزمەتکردنتان بە ووشەی پیرۆزی کوردی پڕ بە دڵ بە ئاوات دەخوازم.

ئەوەندەی لە توانامدا بووە بە ئیجازەی خۆتان تێبینی و سەرنجم لێ نووسیوە، دیارە خۆم بە شیاوی ئەوە نازانم کە ستایشی ئەم هەنگاوە پیرۆز و بە فەڕەی ئێوە بکەم، بەڵکو دەبێ گشت کوردێکی بە ویژدان، بەو مامۆستا دڵسۆزەوە شانازی بکا کە ئەوەندە بە فۆلکلۆر و کەلەپووری کوردەوە دلمەندە و بۆ گەشە پیدانی هەوڵ دەدا.

سەبارەت بە فەرهەنگەکەی ئەگەر لێم زویر نەبی، زۆر ووشەم خەت کێشا، چوونکە دکتۆر مووکری ویستوویەتی ووشەی کوردی بۆ فارسی زمانان شی بکاتەوە، بەڵام لێرە دا ووشەی ساکاری کوردیە، کە لە نێو

کۆمەڵانی خەڵک دا، باو و بڵاون و تەنیا زاراوەکانی نەختێ جیاوازیان هەیە:

سەبارەت بە ژین نامەی دوکتۆر (محمد موکری) لە ساڵەکانی ۱۹۵۰ تا ۵۳ واتا زەمانی سەرەک وەزیرانی خوا لێخۆشبوو "دکتور مصدق" لە ریزی ئازادیخوازی جەبهەی میللی ِدا بوو، لە پاش کودیتای رەشی حەمە رەزا شا. ئەویش تووشی جەزرەبەو ناخۆشی بوو، بە هەزار کوێرەوەری خۆی گەیاندە فەرانسە و تا ساڵی ۱۹۷۹ لەوێ دەژیا، لەو ساڵە دا بە هۆی شۆڕشی گەلانی ئێران، ئەویش گەڕایەوە لەبەر ئەوە کە لەگەڵ، زۆربەی ئاخوندەکانی دەسەڵات دا، دۆستایەتی هەبوو خۆیشی شیعە بوو دژی فەلسەفەی مارکسیستی بوو، کرا بە باڵیۆزی گەورەی کۆماری نا ئیسلامی ئێران، لە یەکێتی سۆڤیەت و پاش ٥ یان ٦ ساڵ خزمەت هێنایانەوە تاران، و بە تاوانی کۆمەنیستی دوو ساڵ لە گرتووخانەی بەناوبانگی "ئەوین" زیندانییە و نازانم ماوە یان وێرای دەیان هەزار ئازادیخوازی دیکە کوژراوە؟

لە کۆتایی دا هیوام وایە لە گشت کارەکانتان، سەرکەوتو بۆ بەرەی تازە پێگەشتوو، هەمیشە مامۆستایەکی دڵسۆز و ڕێ نوێ بن.

بە ڕیز و ئیحترامەوە

عبدالقادر دباغی

۱۹۸۹/۲/۲۳

**زۆر زۆر بیری ڕاز و یار و،**

## پێکەنین و گریانی بادە دەکەم!

نامەی عەبدوڵلا پەشێو بۆ عیزەدین مستەفا

برای خۆشەویست کاک عیزەدین!

سڵاوێکی گەرم. دەمێکە دەمەوێ چەند وشەیەکت بۆ بنوسم، بۆ هیچ نەبێ هەر بۆ ئەوەی کە بزانیت ئەوەندە توورە نیم، ئەگەر تورەش بم (هەروەک وایە) ئەوا تەنیا لە تۆی ئەدیب و زانا توورەم. بە قەد تۆسقالێ لە تۆی مرۆڤ و هاوڕێ دلگیر نیم و حیساباتم لێ تێک ناچێ. تا ئیستا زۆرم قسە بۆ گەڕاوەتەوە، بروا بکە قەت وێنەی ئەو مرۆڤەی لەبەرچاو تەلخ نەکردووم کە ئێوارانی غەریبی و دوور وڵاتیم لەگەڵیا بەسەر بردووە. زۆرم پێ خۆش بو کە پارەکەیان دایتەوە. هەمیشە بیرم لەمە دەکردەوەو نامەیەکیشم بۆ مامم نوسی کە چارەیەکی پارەکە بکەن. زۆر سوپاسی دلفراوانی و چاوتێریت دەکەم.

بروا بکە لە برلین تەلەفۆنەکەم بزر کرد. جگە لەوەیش ٢-٣ ڕۆژ لەوێ بوم ئەویش بە ئیش. ئەگەر مەبەستم نەبایە تەلەفۆنت بۆ بکەم دیارە لە کاک جەمالم وەرنەدەگرت.

زۆر زۆر بیری ڕاز و یار و پێکەنین و گریانی بادە دەکەم  هیوادارم ئێستاش یار لیم توورە و داخدار نەبێ، خۆشەویستمە.

زۆر سلاوو ڕێزم بۆ دایکی ڕاز. بیرتان دەکەم. شوشە ڤۆدکەیەکم بە کاک حەممەدا بۆ ناردی، دیاری ی قوتابیەکی هەژارە و قەبوولی کە. ئەمشەو لەگەڵ (کاکە هع) و کاکە حەمە دانیشتین هەندێ یادمان کردیت. جیت دیار بو. بەشیریان زندوە، ئەگەر مانگیک (حەمەیات) تەنگی بە بەشیریات هەلچنی.

هەر ئیشێکت هەبێ برات لێرەیە.

**شەو نییە خەونتان...**

نامەی عەبدوڵلا پەشێو بۆ عیزەدین مستەفا

کاکە گیان

زۆرم پێخۆش بوو بزانم ئەنجامی (شەو نییە خەونتان...)[1] بەچی گەیشت. بە نامەیەک ئاگادارم کەوە.

وا شیعرێکم نارد بۆ گۆڤاری (نووسەری کورد)[2]. کاک ئەحمەد زۆر سلاوت لی دەکا..زوو زوو دەیبینم.

زۆر سلاو و ڕیزم هەیە بۆ دایکی ڕاز. ڕاز و یار و بادە ماچ دەکەم، بیریان دەکەم، زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕیی (خانی)یەکەت دەکەین، بۆ کتێبخانەی (لینین)یش لەبیر مەکە.

عەبدوڵلا پەشێو

دڵسۆزتانە

مۆسکو ١٩٧٩/١١/١٠

---

[1] عەبدوڵلا پەشێو، شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم، چاپخانەی ئەدیب، ١٩٨٠.

[2] نووسەری کورد، گۆڤارێکی ئەدەبی بوو یەکێتی نووسەرانی کورد، دەریدەکرد. دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسول سەرۆکی نووسینی بوو، سکرتێری نووسینیشی محەمەدی مەلا کەریم بوو. بەر لەم نامەیە هەر لەو ساڵەدا لە ژمارەیەکی نووسەری کورد، دا شیعری "دەنگێکی باشکێن" بلاوکرایەوە: ژمارە ٢، خولی دووەم، ئابی ١٩٧٩. شیعرەکە:

با دێ!
با دێ!
دیسان ئاستانەی خەلیفە
هەڵی کردوەو
بەناوگەڵی فتوای مەلای خەتێدا دێ!

**سەدەی بیستەم بە تەکماندا تێپەڕی وئاگامان لێی نەبوو!**

نامەی عەبدوڵلا پەشێو بۆ کەریمی حیسامی

برای گەورە و خۆشەویستم کاکە حیسامی

وا لە خوارەوە وەلامێکی نامەی ڕۆژی١٥/٢.١٩٩٤ ت دەدەمەوە،کە تێیدا گلەییت لە بێدەنگیم کردووە و شانازیی ئەوەت پێ بەخشیووم بیروڕای خۆم دەربارەی بیرەوەریەکانت[١] بنووسم!

چی بکەم بریا هێندە دوژمنی نامەنووسین نەبام! بەلام تۆ بڵێی مەسەلەکە هەر تەمبەڵی و تەوەزەلی بێ، یا ترسێکیشە لە وەلامدانەوەی ئەو هەموو پرسیار و وەردبوونەوە و بیر و بۆچوونە جۆراوجۆر و پڕ جەسارەتانەی تۆ، کە لە توێی چەند هەزار لاپەڕەیەکدا دەیانهارووژێنی؟

جارێ دەبێ ئەوە بڵێم، کە بە دەگمەن وارێککەوتووە ئاوا یەکنەفەس مەتریاڵێک، وەک بیرەوەییەکانی تۆ، بخوێنمەوە. من پێم وایە بە نووسینی ئەو بیرەوەرییانە، تۆ پاکانەت بۆ هاتنە دنیای خۆت کردووە. بەڵێ، بۆ ئەنجامدانی کارێکی وا ئەوە دەهێنێ پیاو لە دایک بێ. نووسەران و هونەرمەندان بە گشتی هەمیشە لەناوکارەکانیاندا شاکارێک هەیە، کە پێی دەگوترێ "کاری ژیان". ئەمە کاری ژیانی تۆیە، دەسهەقی ئەو هەموو کوێرەوەری و دەربەدەری و ماڵبەکۆڵییەیە،

---

[١] بیرەوەرییەکان، مەبەست لە کتێبێکی کەریمی حیسامییە بە ناوی (بیرەوەرییەکانم)، کە بە یانزە بەرگ بلاوکرایەوە سەربوردە و مێژوو و ژیاننامەی خۆی و ڕووداوەکانی کوردستانە. دیارە نووسەر داوای ڕای عەبدوڵلا پەشێو کردووە سەبارەت بەو کتێبە، ئەو دەمە چەند بەرگێکی دەرچووە، کاتێک عەبدولا پەشێو بەم نامەیە وەلامی دەداتەوە، ئەم نامەیەش لە بەرگی یازدەهەمی کتێبەکەدا دادەنرێت و دەبێت بەبەشێکی بیرەوەرییەکان و دە نووسێت: پێش حەوت ساڵ بیرەوەرییەکانم بۆ دۆستی خۆشەویست و شاعیری بوێر و ناسراو "پەشێو" نارد و داواشم لێکرد بوو بە زەحمەتی نەزانی پێم خۆشە بە چەند دێرێک تێشکێک بخاتە سەر بیرەوەرییەکانم. بەڵێ پاش حەوت ساڵ ٢٠٠١/٢/١٨ بە خۆشییەوە پەیدا بوو...بڕوانە:
کەریمی حیسامی، لە بیرەوەرییەکانم، بەرگی ١١، ستۆکهۆلمو ٢٠٠١، ل ٨٨.

که تا ئێستا چێشتووته، تاکە ئەنجامێکی کۆنکریت و بەرچاوی ڕەنج و خەباتێکی درێژخایەنە، بەڵام ئەمە کەمە؟

هەڵبەتە، چەند کەسێک پێش تۆ بیرەوەرییەکانی خۆیانیان لە چاپ دابوو، بەڵام کەسیان ئەو هەرایەیان نەنایەوە، دنیایان لە خۆ نەهارووژاند وەک تۆ. هەر لە بەر ئەوەش، نووسینی تۆ، جورئەتی تۆ (بەچاوپۆشی لەو ڕەخنانەی کەئاراستەت کران) بووە سەرمەشق بۆ نووسەر و سیاسەتمەدارانی تر، پەنا ببەنە بەر قەڵەم، هیچ نەبێ بۆ لەسەرخۆکردنەوە. ئێستا دەتوانین بڵێین، یاداشت، یا بیرەوەری، یەکێکە لە ژانرە دیارەکانی ئەدەبیاتی کوردی، کە ڕەنگە زۆرترین ژمارە خوێنەری هەبێ. ئەگەر ئێستاش کەسانێک هەبن لە بایەخی ئەو کارە مەزنە نەگەیشتبن، ئەوا دڵنیام لە دوارۆژدا تێدەگەن و هەقی خۆت دەدەنێ.

مخابن، زۆرجار لە خۆتم بیستووە، کە تۆ نووسەر نیت، بەڵام پێم وایە (بیرەوەریەکان)ت بریتین لە ئاوێتەیەکی نایاب لە هەموو توخم و ڕەگەزەکانی ڕۆمان، چیرۆک، ڕۆژنامەوانی، فۆلکلۆر، پەند و قسەی نەستەقی کوردەواری، نوکتە، بەڵگە و سەنەد، دیرۆک، سیاسەت، ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەوانی.... هتد. بەڵێ، ڕاستە، نووسینەکەت هیچ یەکێک لەمانە نییە. بەڵام هەمووشیانە! پیشانگای سەرجەم ژیانی کوردەوارییە، بە هەموو ڕەندی و دزێوییەکیەوە. تێیدا کۆمیدیا و تێراژیدیا پەنجەیان تێکهەڵکێشاوە و هاوێر ناکرێن. کاتێ باسی مام عەلی عەجەم، کە دوازدە ئیمامی بە جێهێشتووە و بووە بە کورد، دەخوێنیتەوە، نازانی نە بگرییێ نە پێبکەنی. ئەو چایچییەی لە پیرمەم، دوای دووجار تکالێکردن هەر چای خەست دێنێ، پاشان کە جاری سێیەم تکای لێ دەکرێ چایەکی سووک بێنێ، تووڕە دەبێ و هەر سێ تەڵاق دەخوا کە حەیای چاخانەکەی خۆی نابا! پیاو نازانێ ئەو چایچییەی خۆش بوێ یا ڕقی لێی هەڵسێ! حەیف نەبوو، ئەو وێنانە ون بن و کەس نەیانخاتە سەر کاغەز؟! جگە لەمەش، بەرهەمەکە سەرچاوەیەکی لەبننەهاتووە، بۆ ئەو مێژوونووس و فۆلکلۆرریست و ئێتنۆگراف و فەرهەنگسازانەی، کە سبەی دەیانەوێ مەتریاڵ و فاکتەکانیان لە یەکەم دەست وەرگرن. ئەگەر نەوێرم بڵێم سەدان، ئەوا بە

خاترجەمییەوە دەڵێم، دەیان دەکومێنتی گرنگت تۆمار کردوون، کە تەمی گومان لە سەر هەندێ مەسەلەی گرنگ دەڕەوێننەوە، نەخاسمە ئەوانەی پەیوەندییان بە (ژک) و حیزبی دیموکرات و ئەقڵییەتی سیاسی کوردانەوە هەیە، کە ڕەنگە تا ڕادەیەک وەڵامی ئەو پرسیارەشیان تێدا بێ، کە بۆ چی کورد نەبوو بە هیچ وسەدەی بیستەم بە تەکماندا تێپەڕی وئاگامان لێی نەبوو! بتەوێ یان نا، هۆیەکانی کەمبڕشتی و تا ڕادەیەک ڕەنجبەخەساریی سیاسەتمەدارانی سەدەی ڕابردووی کوردت هەڵخستووە.

بەش بە حاڵی خۆم، کە بیرەوەرییکانی کەسانی خەباتگێڕ و قوربانیدەری وەک بەڕێزت دەخوێنمەوە، بەدەست خۆم نییە، وەچەی ئێوە و تا ڕادیەکی زۆر خۆمانم بە ڕەنجبەخەسار دێتە بەرچاو. ئاش هەمیشە گرمەی هاتووە و باراشیش دیار نەبووە! کورد هەمیشە لەزەتی لە خودی پرۆسەی "خەباتی درێژ خایەن و خوێناوی" وەرگرتووە، بێ ئەوەی زۆر خۆی خەریک بکا بە هەڵسەنگاندنی ئەو ئەنجامانەی لەو خەباتە دەکەونەوە.

هیچ گومانێکم لەوە نییە، کە بەڕێزت یەکێکی لەو نووسەرانەی ڕۆژهەلاتی کوردستان (هەژار، هێمن، قزلجی، عەبدوڵلای حەسەن زادە، هێدی، زەبیحی و ئەوانی دی)، کە لە سەردەمی کۆماری مهابادەوە، بە تایبەتیش لە حەفتاکانەوە، شۆپێکی قووڵیان بەسەر زمانی ستاندارتەوە جێهێشتووە و پاراوی و دەوڵەمەندیی زمانی ئەدەبیی ئەمڕۆمان، زۆروکەم قەرزاریانە.

٢٠٠١/٢/١٨

**دووا دیوانت، هەم نامە بوو هەم جنێو!**

نامەی عەبدوڵڵا پەشێو بۆ لەتیف هەڵمەت

برای شاعیرم کاک هەڵمەت

دیوانەکانتم بەریزە(بە ڕێزەوە) پێگەیشتوون، دووا دیوانت هەم نامە بوو هەم جنێو! کوڕی باوکم، ئەوا خوا کونە شیعرێکی وای لە تۆ کردۆتەوە، کە ماڵی من و هەزارانی وەکو منی پێ ڕووناک دەکەیتەوە! ئەگەر جارجارە کونە شیعرێکی وەهاش لە من بکرایەتەوە، ئەوسا نەک بە نامە، بەڵکو بە دیوانە شیعریکی دیاری دەمتوانی کەمێک لە قەرزەکەت بدەمەوە. هەرچۆنێ بێ گیانە دووای نووسینی ئەم چەند دێڕە، چیتر خۆم بە قەرزارت نازانم، نەک لەبەر ئەوەی خوانەخواستە نامەیەکی من، دەچێتە ناو تای تەرازووێک، بەرامبەر بە دیاریە بەنرخەکانی تۆ، نە.. بەڵکو لەبەر ئەوەی بۆ تەمەڵێکی وەکو من ناردنی هەزار کتێب، ئاسانترە لە نووسینی نامەیەک!

بڕوابکە دەیان جار نامەم بۆ نووسیویت، بەڵام هەمو جاری ڕووخسەتم لە هاوڕێیەتیمان

وەرگرتووە، لەباتی تۆ هەر

خۆم نامەکانم خوێندۆتەوە!

لە ڕۆژگاری ئیمەدا زۆر جاران

تەنەکەی زبڵ، بە دەست

پاکتر دەزانم لە سندوقی

پۆستە، کیسەڵ بە خۆشبەخت

ترلە پۆستەچی!

لە دونیادا هەڵبژاردنی دوو شتم زۆر پێناخۆشە، دیاری بۆ ئافرەت، وشە بۆ نامە، بەرامبەر، بەوەی یەکەمیان بێ دەسەڵات و دەستە وسانم، لەوەی دووەمیش، تا بکرێ خۆم دەشارمەوە!

هاوڕێ گیان:

لەم ڕۆژگارەدا، کە شیعری ساختە و بە پارە گووتراو، لە نیشتمانی حاجی قادر دا چۆپییان گرتووە، دەنگی تۆ پڕە لە چیا، پڕە لە ڕیشەی داربەڕوو، من ڕەش بین نیم وەک هەندێ قەڵەمی نامەرد، دەیانەوێ ڕەشنبینیم بەسەردا بکەنە ماڵ! هەڵوێستی من بەرامبەر بە سەرجەمی شیعری ئەمڕۆی کوردی، هەڵوێستێکی مەسئوولە، هەڵوێستی خوێنەرێکی سادەی دور وڵاتی کوردە، نەک هەڵوێستی شاعیرێکی لە خۆبایی و خۆبە مامۆستازان، وەک هەندێ بێویژدان دەڵێن.

ئەو شتەی لە پاشکۆی(عێراق) بڵاوم کردەوە، زۆر هاوڕێی لێ توراندم، هەرکەسیکی دیاری بۆناردبووم بە خۆی تێگەیشت، کەچی مەسەلە، مەسەلەی (هاوڕێ)یەک نییە، مەسەلە، مەسەلەی (دیاردەیەکی هونەریی)یە.

هەڵبەتە ئەم دیاردەی وەک لە نامەکەشدا دیارە، موتلەق نییە، بەڵکو لە پاڵیدا چەند دەنگێکی ڕەسەنی زوڵاڵیش هەن. نازانم ڕای تۆ چی بوو بەرامبەر بە نووسینەکەم. زۆر چاوەڕێی وەڵامی ئەم پرسیارەی خۆم ناکەم، چونکە شیعرەکانی تۆ خۆیان لە خۆیاندا، ئیدانەی شیعری ساختە دەکەن.!

تۆ لە ڕیزی پێشەوەی ئەو شاعیرانەی کە بە ویژدانی خاکی و نەتەوە حسێب دەکرێن، بۆیە وەکو هاوڕێیەک و شیعر دۆستێک، تکات لیدەکەم کەمتر بنووسە، زۆرتر خەریکی فۆڕمی هونەریی بە، وریای زمان بە، زمان، زمان، زمان، زمان.. هەندێ جار کە شیعرەکانت دەخوێنمەوە و فێنکاییەکی وڵاتم بەسەر گیاندا دێ، وام دیتە بەرچاو کە تۆ هەرچی دەینووسیت، نایینووسیتەوە.. ئەگەر وایە لێت دەپاڕێمەوە، ئەوەی دەینووسیت سەد جار بەسەریدا بڕۆرەوە، سەد جار بینووسەوە، ئێمە هەر شیعر ناڵێین، بەڵکو زمانی ئەدەبیش دەچەسپێنین و دەیڕسکێنین.!

دەمیکە لەبەردام شیعری سێ چوار شاعیری کورد، وەرگێرمە سەر زمانی رووسی، بۆ ئەو مەبەستە قسەم لەگەڵ شاعیری بەناوبانگی سۆڤییەت، (کاسێین کولییڤ) کردووە، کە یارمەتیم بدات، یەکێک لەو شاعیرانە تۆیت، دە پازدە شیعرێک لە دیوانەکانت هەڵدەبژێرم. تۆ بەختیاریت چوونکە شیعرەکانت زوو وەردەگێڕێن و بێگانەش تێیاندەگات.

من دوور وڵاتم و ئاگاداری هەموو پرۆسێسێکی ئەدەبی نیم، تکایە بەچەند شاعیرێکی لاوم بناسێنە، کە شایەنی ئەوە بن، لە دەرەوە ببنە نوێنەری شیعری تازەی کوردی، رەنگە هەمان پرسیاریش ئاراستەی هاوڕێی شاعیر شێرکو بێکەس بکەم، ئەگەر تاقەتی نامەنووسینت هەیە ، ئەمە ناونیشانم:

پەشێو

برای دڵسۆزتە

١٩٨٠/٥/٢٣ پۆستدام

سڵاوم بۆ ئەو برادەرانە، بە تایبەت حەمید بەدری و عەباس بەدری، حوسنی بەدری، ئێستا من لە دەرەوەی یەکیتی سۆڤییەتم، بەڵام تا نامەی تۆ دەگات، من لە مۆسکۆ دەبم، ئیتر باوەشت پیا ئەکەم و ماچت ئەکەم و خۆشم دەوێی..

**باڵندەکانم تەواوکرد...**

نامەی عەبدوڵلای حەسەن زادە بۆ ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل

برای زۆر بەڕیز و خۆشەویستم مامۆستا ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل

پاش شیعر و ڕۆژباش

ساغی و سەلامەتی و سەرکەوتنت بە ئاوات بۆ دەخوازم، هیوادارم هەمیشە بە گوڕوتین لە خزمەتی زمان و ئەدەبی گەلەکەماندا بی. منیش ماوم و لەگەڵ ژیان لە مل بە ملدام.

یادداشتەکەت بەسەر "بەیان"[1] ەکەوە بوو بە مایەی خۆشحاڵیم، سوپاس کە شتەکەت بۆ دیومەوە، بەلام کاکە دیاری ئەم شاخ و داخە ناشوکری نەبێ هەر پریشکە تۆپ و قاوغە بۆمبا و سەری براو و دەست و لاقی پەڕیوە. ئەویش رووی مەجلیسی دۆستانیان نیە.

لەسەر ئەمری خۆت "باڵندەکان"[2]م تەواوکرد و هەرچەندە هەق بە خۆم نادەم جەنابت هەڵسەنگێنم، بەلام چونکە داوات لێ کردووم، ناچارم ڕای خۆمت عەرزبکەم. وەرگێرانەکەت پییەوە دیارە کە تورکی باش دەزانی و مەبەستی نووسەرت پێکاوە. نووسینەکەت ڕەوانە، کوردی یەکی باشی تێدایە و بەشی زۆری وەک نووسین دەچێ نەک وەرگێران، بەلام لەگەڵ پەسندکردنی رایەکی مامۆستا شوکور کە مۆرکی ناوچەی خۆتانی پیوەدیارە -ڕەنگە چارەش نەبێ- ئەوەش زیاد دەکەم کە جاروبار هەرچەنە زۆر کەمیش بێ -وشەی کەمیک نامۆی فارسی و رستەی ژیر تەئسیری عەرەبی تێدا دێنە بەرچاو. بە باوەڕی

---

[1] بەیان لە پێناسەکەی دا نووسرا بوو: گۆڤاریکی ڕۆشنبیری گشتییە، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی مانگی جاریک بلاوی دەکاتەوە.

[2] مەبەست لە ڕۆمانەکەی یەشار کەمالە کە ئەحمەد محەممەد وەریگێڕاوە بڕوانە: باڵندەکانیش کۆچیان کرد، یەشار کەمال، احمد محمد اسماعیل لە تورکی یەوە کردوویەتی بە کوردی، وەزرەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، بەغدا ١٩٨٨.

من پێویست بوو فەرهەنگۆکێکی کەمێک تێروتەسەلیش هەبێ، چونکە لێت ناشارمەوە هەر بۆخۆم تووشی چەند وشە و زاراوە بووم کە نەمزانیون، لەسەر یەک وەرگێرانی لە خانەی وەرگێراوە سەرکەوتووەکاندا دەیبینم.

ئەو نامەیەی بۆ برادەرەکەی خۆمم نووسیبوو -ئەوەکەی دەرەوە- تا ئێستا وەڵامی نەهاتۆتەوە. ئەم ڕۆژانە برادەرێک لێرەوە ڕاستەوخۆ دەچێتە وێ. دووبارە نامەی بۆ دەنێرم و هیوادارم کاریکی لە دەست بێت و دیارە دوای ئاگادارت دەکەمەوە.

کاکە گیان! چاوپێکەوتنەوەکەشتم خوێندەوە. بە داخەوە چونکە بە پەلە بوو و نەشکرا پێکەوە چاوی لێ بکەینەوە، زۆر شتی ناتەواو دەرچوون. شتی وای تێدایە کە حەزم نەدەکرد بڵاوبێتەوە، شتی واش هەیە کە نەزەری جەنابت بوو بەڵام لە زمان منەوە گۆڕاوە. زۆر شتیش کە حەزم دەکرد هەبێ، لەبیرچوون. ویستم روونکردنەوەیەک لەسەر چاوپێکەوتنەکەی خۆم بنووسم، بەڵام هەرچەنە ناوی جەنابتی لەسەر نەبوو، حەزم نەکرد شتی وا بنوسم. بۆیە شتێکی "عام" ترم نووسی و ئەوە بۆ خۆتم نارد، تکایە بیخوێنەوە، ئەگەر پێت خۆش بوو لە بەیان یان هاوکاری دا بە ناوی خۆم یان بە ناوی "دڵسۆزێک"ەوە بڵاوی بکەوە. ئەگەر پێشت باش نەبوو فڕی دە نێو "سلە مهملات" و هیچمان لە هیچ.

لە کۆتایی دا ڕێز و سڵاوم بۆ کاک ئازاد و هەموو دۆستان هەیە و هەر خۆش بن.

براتان عبدالله حسن زادە

١٩٨٩/٣/١٥

**له گەرووی سێ فریشتەی تازیەبارەوە دەهاتە دەرێ...**

نامەی عەبدوڵڵای حەسەن زاد بۆ شێرکۆ بێکەس

مامۆستای شاعیر و شاعیری مامۆستا کاک شێرکۆی خۆشەویست

پاش رێز و سڵاوی گەرمی برایانە

حەزدەکەم بەم هۆیەوە ئاگادارتان بکەم کە هەردوو دیاری یە بە نرخەکەتان "رەنگدان"[1] و "لە چلەی چلچرایەکدا"[2]م بە دەست گەیشتن و پڕی دنیایەک سوپاستان دەکەم و دەستخۆشی و ئافەرینتان بەسەردا دەبارێنم.

"رەنگدان" بۆنی خوێن و بارووت و بۆنی ساردی ئەشکەوت و بۆن و بەرامەی بەرووانی وێکڕا پێ هەڵ مژیم و "چلەی چلچرا" بردمیە سەر گردەکەی مامەیارە و بە بەرگوێگرتن لە ئاوازی حەزین و دڵنشینی "کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و کێو شینە..."وە کە لە گەرووی سێ فریشتەی تازیەبار دەهاتە دەرێ، جارێکی دیکە فرمێسکی خەمی پێ هەڵ رژتم.

سەد خۆزگە گوڕوتینی جوانی و کاتی دەستبەتاڵی و "ذاکرە"کەی سالانی زووم بووایە و هێندەم خوێندبانەوە تا کوپلە بە کوپلەم لەبەر کردبان و کۆڕی دۆست و یارانم پێ گەرم کردبان. بەڵام مخابن کە دەوەرانی رابردوو ناگەڕێتەوە و ئەو حەسرەتەم لە دڵ دا دەمێنێتەوە.

---

[1] شێرکۆ بیکەس، رەنگدان، ٢٠٠١.

[2] شێرکۆ بێکەس، لە چلەی چلچرایەکدا، دەقێکی ئاوێتە (پەخشان، شیعر، وتە)، ٢٠٠١.

هەر ئەوەندەم لە دەست دێ کە بڵێم شانازی دەکەم کە میللەتەکەم ئەو جۆرە بلیمەتانەی تیدا هەڵ دەکەون و ئەو جۆرە بەرهەمە فیکریانە دەخەنە سەر گەنجینەی فەرهەنگی گەلان. دووبارە سوپاس و ئەوپەڕی ڕیز و خۆشەویستی و سڵاویشم بۆ مامۆستایان رەئووف بێگەرد و حسین عارف و تێکرای نووسەرو قەڵەم بە دەستە پڕکار و پڕ بەرهەمەکانی لای خۆتان .

برای دڵسۆزتان

عبدالله حسن زادە

٢٠٠١/٨/٩

نامه‌ی عه‌بدوللای حه‌سه‌ن زاده بۆ محه‌ممه‌دی مه‌لا که‌ریم

برای گه‌وره‌م کاک محمدی ملا کریم

له پاش ڕێز و سلاوی برایانه

عه‌رزی احترامم بۆ مامۆستا مسعود و دکتۆر که‌ماڵ و کاک شوکور و کاک ئاوره‌حمان و هه‌موو دۆستان هه‌یه.

له‌سه‌ر داوای به‌ڕێزتان ئه‌وه ڕه‌زایه‌ت نامه‌یه‌کم به ناوی حیزبه‌وه بۆ ناردی که "پێکه‌نینی گه‌دا" چاپ بکه‌یه‌وه. ئه‌گه‌ر ئه‌و جۆره به که‌لک نه‌هات، مه‌تنه‌که بنووسه و بی نێره تا لێره بینووسینه‌وه و مۆری بکه‌ین.

زۆر تکاده‌که‌م به هاوکاری مامۆستا شوکور ئادرێسی مامۆستا یه‌شار که‌مالم بۆ بدۆزیه‌وه و بۆم بنێری، تا بتوانم نامه‌ی بۆ بنێرم و ڕه‌زایه‌تی چاپ کردنی کتێبه‌که‌ی "ئینجه مه‌مه‌د"ی لێ وه‌رگرم.

جارێ جگه له سوپاس و عه‌رزێکم نییه و هه‌ر بژین.

براتان عبدالله حسن زاده ٦٣/٨/٥

یسمح للسید محمد الملا عبدلکریم باعاده طبع کتاب "پێکه‌نینی گه‌دا" تالیف حسن قزلجی، من منشورات "بنکه‌ی پێشه‌وا" المایده الی حزب الدیمقراطی الکردستانی الایرانی. و لاجله زود بهذه الوثیقه.

سکرتارییه اللجنه المرکزییه

للحزب الدیمقراطی الکردستانی الایرانی

**پەناهەندەییم لەتەک نووسیندا بوو، وشە داڵدە و ڕوانگەم بوو.**

نامەی عەبدوڵڵا سەڕاج بۆ سەباح ڕەنجدەر

برایەکەم ڕەنجدەر: نامەی ماڵئاواییکردن لە نووسین.

چۆن باس لەخۆم بکەم، مەگەر پارێک نیم لە جەستەی وشە و نووسین و ئەفراندن. کەواتە ئەوانەی نووسیومن، من بوون. ئەمێستا پرۆژەنووسینێکی دواخراوم ئەگەر درەختی ڕۆحم وشکی نەکردبێت، هەستدەکەم لە چەقی دوورگەیەکدام تەنیا ساپە بەرد و لم و چەوە خولگەم، نە چڵێکی پاراوی سەوز، نە بایەکی فێنکی شەماڵ، نە چەهچەهەی مەلێکی عاشق، دەشێت هەستوەریی جارانم لێتۆرابێت، یان من لە ئاستیدا نەماوم، ئەگینا دەبوایە بەخۆمدا بچمەوە، ناخ و هزر و گیانم پەرگەما بکەمەوە، چاوەنۆڕ بم بەشکو پەڕ و باڵی باڵندەی هونەر جارێکی دیکە لە ئامێزی پڕ فەیز و سۆزی خۆییم بگرێتەوە، دەنا زۆر خامۆشم و هەنووکە هیچی دیکەم لەمێشکدا نییە. لەم دۆخە ناڵەبارەی گیانکوژییەدا، بێدەنگی کەپکی نییە و بێسوودیشە. زۆر نووسینی لەمەوبەریشم بە لەش و بە ڕۆحەوە شەکەت و بێشەنگی کردووم. چی

دیکەی نوێ بدەرێنم کە هێشتاکە نووسراوم هەیە دیلی هزری دۆگمای چاوسوورانە و ئەوانەی ڕووناکیان دیوە، تاکوتەرا شەنوکەو کراون. لەسەروبەندی ڕژێم و هەنووکەیش، هەمان چاوی ئەبڵەق و قەیچیی سانسۆر بەرەنگارم دەبنەوە، بەلامەوە ئەگەر قەڵەم سەرفراز و ڕەها نەبوو هەرگیز دیموکراسی و ئازادی وجودی نابێت. من تاکێکم لەو کۆمەلانەی کە بە دژواری و کولەمەرگی ڕۆژگارمان دەگوزەرێنین، دابڕانم لە هەژار و چەوساوان، تەکانە و دابڕانمە لە شەڕەفی وشە و ناموسی دەربڕین. هەرگیز بۆ قۆستنەوەی پایە و بەرژەوەندی لایەنەداری دەسەلات نەبوومە. ئاخر بەڕاستی بوومەتە تیترواسک، ئەو تیترواسکەی دوایین ڕۆمانم، تەنیا ئاسمانێکی گوشاد و سامالم گەرەکە تێیدا بفڕم و پاشان لە پەڵەهەورێکەوە بارانی پیرۆز ببارێنم و هیچی دیکە.

ئەوجا برای گیانی بەگیانم، دەپرسم ئایا تیتراوسک بۆی هەیە بنووسێت، یان هەر دەتیترواسکێنێت، پێشتر ڕزگاریم لە دەراندن و دەربڕینی ڕەوانە ناشادەکەم دەبینی، ئەمێستا بەو یادەوەرییانەدا دەچمەوەو فرمێسک و هەنیسک لەجیاتی باران لە چاوە کڵۆڵ و دەروونە تژیی ئازارەکەم بازرقە دەکەن، بۆیە زاتی نزیکبوونەوەم لە خامە نییە.

ئەمە چ مەینەتی و زەخمێکە، ناوبەناو بیر لە قرتاندنی دەمارێکم دەکەمەوە، نەک بۆ پاساودانی نووشستی و قەیرانی جوانکاریم، یان بۆ داپۆشینی وشکبوونم، نەخێر بەڵکو دۆخێکی ناهەمواری واقیعی و بایەلۆژییە، چونکی ئەگەر وشە بەهانامەوە نەیەت و قورتارم نەکات، ئەوا دەبمە جەستەیەکی بێگیان. چوون هەزارانی ناو کۆلان و سەر شەقامەکانی شار، ئەوساش بوون و نەبوونم وەک یەکە. خۆ دەزانیت، بەدەر لە وشە ئارایی و جوانییەکە هەبوومە؟ بەتایبەتی وا هەستدەکەم نە جوانیم لەلا ماوە و نە بوونێکی سەرمەدی.

تاوێرێکم لەو گورشدا، ئامبازی شەکرە و چەندین دەرد و مەینەتی تەمەنی پیری بوومەتەوە، لە تەمەنی بەرەو هەشتاکاندا چ ئازارگە و چ چێژگەیەکە، لەپاڵ دیواری ڕۆحدا مشتومڕ لەگەڵ قەڵەم بکەم.

له ڕۆژگاری تەڕنووسی و جوانخاسیمدا بەخۆمم دەگوت: ژیان بێکەڵک و پووچ و بەتاڵە، ئەگەر ئەمە پایەی نووسەرێکی نوێبەخش و ڕۆماننووسێکی سەلیقەداری جیاواز لەوانەی هەن. ئەوا ئێستاکە، لە ڕۆحی ئەو بەتاڵییە و لە بەرزەخی ئەو هیشکاییە نەبانەدام. لەباوەڕێکدا بووم کە هەر ئەزموونێک شێوە و ستایلی خۆی دەدۆزێتەوە، نەک بە سەپاندن و لاساییکردنەوە. ئاوها دەمڕوانییە شێوازی دەرەکیی داهێنان و گرێچنی ناوەکیی دەق. شێواز و ناوەرۆکم  بە جووتە باڵی هاوکێشەیەکی دینامیکی دەبینی، نەک ئەمەیان بە سەرەکی و ئەوی دیکە بە لاوەکی، یان بە پێچەوانەوە.

ڕەنجدەری برام: مەبەستم بوو مرۆڤایەتی بەرجەستە کراون. پەناهەندەییم لەتەک نووسیندا بوو، وشە داڵدە و ڕوانگەم بوو، وا ئێستا  ڕووت و ڕەجاڵ لە دەشتاییەکی کاکی بەکاکی و قاقڕدام، لەگەڵ دێوەزمەی تەمەندا چار چییە؟. خۆ خەریکە بمکاتە قەیتلکی کیسەڵ و سەدەفی ڕۆحی لمین، وای لەم دۆزەخەی تێیدام مەگەر تۆی هێژا بەهەستیاریی شاعیرانەت لە کرۆکی ئەم ئازارەم بگەیت، بەڵام نەکەیت لە ئاست ڕۆژگار و هەڵوێستەکاندا بە تەڵخبین و ڕووخاوم بزانیت، واقیعەکە وەکو خۆی دەخەمە بەر نەشتەرگەریی نیگاتەوە، سەرەڕای ئەوەش لەزەمەنێکی خۆمدا دەژیم کە ئاوێتە ئێستایی- ڕابردوو- داهاتووشە، ئەڵبەتە بەجیاوازی شوێنەکانەوە، لە چرکەیەکدا هەڵشێلاوی هەرسێکیانم.

ئەمەیشە قورسایی و گوشاری بوونەوەرییانەی (وجودی) بەسەر ڕۆحمەوە هەیە، زەمەنێکی خۆمە و دەشبێت بەسەری ببەم. ئەمەیە بارقورسیی تەمەنم، لەلایەکەوە زێدم لەناو پەڕەکانی دڵدا هەڵگرتووە و لەلایەکی دیکەوە خەڵک و چارەنووسیشیان لە قوژبن و پەناکانی دەروونم شوێنگیرن. ئەم دیاردەیەش لەلای زۆرینە دانسقە و دەگمەنە. لەتەک ئەوەشدا، بە چڕی بیر لە دوو شتی دواڕۆژیمان دەکەمەوە: ئایندەی  ڕۆشنبیری و سیاسیمان، کە هەردووکیان ڕەنگدانەوەی بارودۆخی ئابووریمانە، باشووری کوردستانەکەم بووەتە مۆڵگەی کۆمپانیا چاوچنۆکەکانی دراوسێ و ڕۆژئاوا و زلهێزان.

ئەوجا.. (چیمان پێدەدەن؟) پرسیاری سەرەکیمە، هەرچەندە (چی دەبەن) ئاشکرا و ڕوونە. ئەم نەوەی ئێستا، لەم تەنگژە نالەبارەدا، لە ڕێچکەی کام ئەدەب و کام هونەر دەگەڕێت؟ مێشکمی ئاڵۆزاندووە. ئایا پەرە بە خەونەکانی منگەل دەدەن، یان فۆبیای بە جیهانیکردن ڕایاندەماڵێتە خەرەندی نەمانەوە. ئەوەتا سەرەتای شێواندنی تاڵی زمانەکەمانَ کە ناسنامەمانە بە وشەی بیانی و نامۆ، بە بەرچاوی دەسەلات و ڕاگەیاندنەکانەوە دەشێوێندرێت.

جا.. نەوەی پاش خۆم بۆ تەواوکردنی هەنگاوە پەتییەکانم بانگهێشت دەکەم، با گوژمتر و بەرینتری بکەنەوە. خۆیان بن، چوون من خۆم بووم. واتێدەگەم کە نوێگەری لە واتا گشتییەکەیدا تێڕوانین و فەلسەفە و جیهانبینی نووسەرە بەرەو چاکتر و هونەریتر. لەوەش ڕوونتر دەڵێم: هەڵوێستە هزری ئەو ئافریدەکارییە بەرانبەر بە دامەزراوەی شتەکان، ئەویش بەگۆڕینی زمانی تەقریری بۆ زمانی ئەفراندنی هێما و ڕەمز و ئاماژەی شیعرییانە، ئاڵشتکردنی زمانی سەرسامبوون بە ڕووالەتەکان بەزمانی پەردە لەسەر لابردن و کەشفکردن. گواستنەوەی زمانی مەنتقی و باو بۆ زمانی تەقاندنەوەی دیدەری ئەفسانە ئامێز.

لەدیدی مندا ئەو سێ خاڵە هەرە گرنگ بوون. دڵسۆزی داهێنان، ڕەنجدەری برام.. ئەوانە و خاڵی دیکەیش لەوەرزی هەموو قەڵەمێک نییە، جیهانبینی دەربازبوون لەو داڕشتنە باو و سواوانە، زۆر بە ئاگاییەوە لە مەراسۆنی قەڵەمدا خودی مەبەستم بووە، هەر بۆیە هەندێک لە خوێنەری هێژا وا تێگەیشتبوون، کە گوایە پەنام بردووەتە بەر تەمومژ و ڕێگەی داخراو.

ئایا لە خۆشەبەختیی نووسەر، یان لە نیگەرانیەتی کە دەبینێت نووسەرانی پێش ئەو، ئەوانەی هاوقەڵەمی بوونە هیچی ئەوتۆیان بۆ نەهێشتووەتەوە، بۆیە تووشی فشاری دەروونی و بەخۆداچوونەوە هاتووە؟ ئەمە، جێی دڵەڕاوکێیە. ئەزموونی ڕۆحی لەلام، ئەڵبەتە بە واتا فراوان و وازەکەی، نەک بە پێناسە لاهووتی و ئایینییەکەی، کانگەی ئەدەبی و هونەرییە بە گشت شێوەکانی نیگایی و بیستەنی و وجودییانەوە کوکەرەوەی کرۆکی داهێنانەکەیە، لەتاکە چاووگی سرووشانەوە (وەحی و ئیلهام) هەڵدەقوڵێت و دەڕژێتە تاکە چوڕاوگەی

(جوانی)یەوە. تۆ بنۆڕە سێ پێکهێنەرەکەی مەردووم: لەش ـ عەقڵ ـ ڕەوان (ڕۆح)، ئەگەر جەستە نەبوو، ئاوەزوو و ڕەوان لە کێندەرێ نیشتەجێ دەبن؟ ئەی ئەگەر عەقڵ لە مێشکی مرۆڤدا نەما، تەن و ڕۆحی تۆش چ لێکترازانێک دەبن؟ هەروەها، ئەگەر هاتوو ڕۆح لە لەشەوە دەرچوو، هۆشیش دادەمرکێت، ئەدی چارە؟.

هەر دەبێت ئەو سێیە پێکەوە بگونجێن و لە ئاستەنگەکاندا باری لاسەنگیی یەکدی ڕاست بکەنەوە، بۆیە لە دەقەکانمدا تێکۆشاوم ئەو تێگەیشتنە قووڵ و ڕەگاژۆ بکەمەوە.

جا.. نازانم بۆم سازاوە، یان نا. ئێمە دەبێت وەکو (ئیبن و عەرەبی) باوەڕمان بە ئایین و خۆشەویستی هەبێت. تەنانەت ئەگەر ئەو خۆشەویستییە لە دێر و لە مزگەوت بوو، لە تەوراتخانە و ئاتەشکەدابوو، لە بتخانە و لالش و کەعبەدا بوو، گوێ بۆ پەیڤە ساکارە عاریفانەکەی، بۆ مۆسیقای شیعرەکەی شل بکە.

لقد صارَ قلبي قابلاً كل صورة فمرعى لغزلانٍ ودَيرٌ لرهبانِ

و بيت لأوثان و كعبة طائف والواحُ توارة و مصحف قرآن

أدينُ بدينِ الحب أنى تَوجَهْت ركائبُهُ فالحبُ ديني وإيماني

ئەزیش، یەقینی عاریفانەم دەراند بەرانبەر بە مرۆڤ و بوونەوەری و نیشتمان. ئەوانە کڕنووشگەی ڕامانم بوونە و هیچ لەباوەشی دایک و ژوانی دڵداران و چی و چییەکانی لبیدۆ و هەستەوەرییەکان کەمتر نەبوونە، هەرگیز ئەگەر باڵاتر و پاڵاوتر نەبووبن.

ئەڵبەتە ئەو جۆرە ئەزموونە سۆفییانەی بەخەستی ئاماژەم بۆ کردن لە پانۆڕامای گشت کولتوور و زمان و ئایین و دیرۆکی مرۆڤایەتی هاوشێوەن ئەگەر چوونیەک نەبن. لێرەدا پەنجە نۆمام بۆ ئایین و سۆفیگەری بەواتا

کۆنینەکەی نییە کە پەرستگەکان لە سەروبەندی تاریکیدا مرۆڤگەلیان جلەوگیر و مجرۆ کردووە، هەرچەندەش لە نەشونمای ئایینگەلی ئاسمانی و زەوینیدا، مزگێنی و بەشارەتی نەمانی زوڵم و بانگەشەی داد و ڕەواییان بەرگوێی خەڵکان دەدا، کەچی دیاردەی نایەکسانی و جەور و زۆرداری باڵبەست و سندم و چەقبەستی دەکردن. دەمەوێت مرۆڤ لە دۆزینەوەی یاساکانی ڕەوتی بوونەوەری ئازاد بێت، بەهاکانی جوگرافیا و مێژوو، ئایدیا و ڕۆشنبیری و...تاد، نەک مرۆڤ ببێتە کۆیلەی ئەندێشەی یۆتۆپیا و ڕامیارییە گشتگیرییەکان. لەکاتێکدا بەجیهانیکردن بە تۆبزی کرابێتە ئایینی نوێی جیهان و (بازاڕ ) و پەرتووکی پیرۆزی بێت کە، وشەکانی بەهەمان دگانە ترسناکەکانی سەردەمی (دراکیولا) نووسرابن.

برای شیرینم: شاعیری نوێبەخش، کاکە ڕەنجدەر

ڕۆشنبیر، لە ڕۆژێکدا سێ جار تووشی هەڵوێستنواندن و مەرگی گیانی و جەستەیی دەبێت و دەکەوێتە تاقیگەوە، جاری یەکەم لە پێناوی بژێویدا، جاری دووەم لە جەزرەبەدانی سانسۆر و جاری سێیەم لە تابۆکانی ئایین و سێکس و دەسەلات.

ئەوجا، ئەو ڕۆشنبیرە، لەناو سووتماک و خۆڵەکەوەی سەمەندەرانەی خۆیدا بۆ پاشماوەی سکڵ و ژیلەمۆی خۆی بگەڕێت.

لە کۆچیرۆک و پازدە ڕۆمانمدا، گوتەی خۆم بەڕاشکاوی دەراندووە. دەمامکم لە هەندێک ڕووی دزێو هەڵداوەتەوە، ئەوجا کارمەندبووبن، یان گیرفانمەند و دیاردەی چەوێل و پووکاو. ئەڵبەتە لە دوو توێی داڕشتەی هونەری و بەکالای ئیستێتیکەوە.

برام.. هاوسەرگیری کاسۆلیکی لەگەڵ سیاسەتدا، تەلاقدانی ئەدەب و هونەرە، تۆ دەڵێی چی؟ سێ مەرج هەیە بۆ ئەوەی ئەفراندن گەشە بکات، ئەوانیش:

*بوونی ئازادی، کە نێوانی ڕۆشنهزر و دەسەڵاتدار هاوسەنگ و داننان بێت بەمافی هەریەکەیان.

*ڕۆشنبیر خاوەنی شکۆ و ڕێز بێت و دەنگی بیستراو بێت.

*دەسەڵات ڕێز لە تاکمەندی و دەنگی بگرێت.

بۆ نموونە: پەیوەندی و (وەک یەکی) لەنێوان (سەعد زەغلول) و هەریەک لە (قاسم ئەمین) و (عەباس مەحموود ئەلعەقاد) هەبوو. ڕێز و تەبایی و هاوکاری لەنێوان (عەڕڕابی) و (عەبدوڵڵا نەدیم) و (سامی ئەلبارودی) هەبوو، هەروەها (مستەفا نەحاس پاشا) بەمەرجی (تاها حوسێن) قایل بوو، کە دەبێت خوێندن بکرێتە خۆڕایی بۆ ئەوەی ببێتە وەزیری مەعاریفی ئەو سەردەمە. ئایا ئەم دۆخە لای کورد هاتووەتە دی؟ لەپاڵ گرفتی ئازادیی دەربڕیندا، پرۆسەی نووسین وەکو کردارێکی ڕاستەوخۆ لکاو بەخودی داهێنەرەوە، خەمێکی دیکەمە.

کاکە ڕەنجدەر: ئەفراندنی ڕۆمان، نە کرداری وەڵامدانەوەی پرسیارەکانە، نە دۆزینەوەی چارەسەری دیاردەکانە، بەڵکو هەڵمەتبردنە ڕووە و چەمکی جوانی. دەستگیرکردنی مەعریفەت (هۆشەکی نەک غەیبی)، ئەوجا ورووژاندنی پرسیار لەهۆشی خوێنەردا، چونکە دۆزینەوەی چارەسەری ئاستەنگ و نالەبارییەکان، وەڵامدانەوەی پرسیارە ڕیشەییەکان کەوتووەتە گەردنی کۆمەڵناس، فەیلەسووف، ئابووریزان و دیرۆکنڤیسان، نەک ئەرکی بنەڕەتیی جوانکار بێت. هەرچەندەش خەمی (هیومانیزم)یان بەرانبەر بە هەژاری، دیموکراسی، ئازادی و نایەکسانی(چ لەنێوان ژن و پیاودا، چ چینایەتی، چ دەگەڵ بالادەستاندا) لە کەسانی ئاسایی هەستیارترە و پەنگاوی ناخیانە.

بەدیدی بەندەوە، ئەگەر ڕۆماننووس وزەیەکی گەشاوەی هاندەری خستە دەروونی خوێنەرەوە ئەوسا (سەردەمی ڕۆمان) و پاشی ڕۆمانیش دەستپێدەکات، بۆئەوەی :

بپشکنێت و توێژینەوەی بۆبکات و ڕابمێنێت و پاشان بپرسێت، نەک خەریکی کەڵەکەچنی ڕووداو و حیکایەتخوانی بێت.

خۆ دەبینیت، پشکنینم پێش توێژینەوە خستووە، هەروەها ڕامانم بەر لە تێگەیشتنی ئاماژە و سیمبوڵەکان دیاریکردووە، پاشان پرسیار هەڵخستنی ڕیشەیی دێت. وەکو دەرئەنجامی جووتکرداری: پێدان + وەرگرتنە هونەرییەکە. ئا لێرەوەش خاڵی بەرایی میتاڕۆمان بۆ ڕاگرتنی ڕیتم و هاوئاهەنگی و هاوسۆزی مرۆڤی کورد لەگەڵ سەردەمەکەیدا چەکەرە دەکات، ئایا لە ژیانی (وێنە)یی ئەمڕۆژیمان، بەڕاستی لە (سەردەمی ڕۆمان)دا دەژین. چ جای سەردەمی میتاڕۆمان؟ ئەو پرسیارە بایەخدارە هەڵوەستەی پێکردووم و هەمیشە بۆ هەنگاوی نوێتر ڕامدەچەنێت کە بە میتازمان و میتاحیکایەتی ناو دەبەم.

لەبارەی شیعری جەنابتەوە ئێژم: لە شیعری هاوچەرخدا کەم شاعیر هێندەی تۆ قووڵایی زمانی لە شیعردا خەملاندووە. لە بەکارهێنانی زماندا هەوڵت داوە بەشێکی زۆری هێزی زمانی کوردی بکەیتە هی خۆت، یان گریمان هیچت نەگوتووبێت، تەنیا جیاوازیی شێوازت لەگەڵ شاعیرانی دیکە، سەنگی ئەفراندنت لەلام بایەخدارتر دەکات لە کەسانێک زۆر بڵێن و کەچی خۆیان نین، چونکە هونەر ڕامان و شێواز و تاکمەندییە، جیابوونەوەیە لە فرینی پۆل. ئەو جیاوازییەت داهێنان و نوێبەخشییە، بەردەوام بە لە داهێنان، دواڕۆژ لەگەڵ داهێنەردایە، لەگەڵ تۆ و تۆی ئاسادایە. هەموو دەم ناداهێنەر دژایەتی داهێنەر دەکات، تەماشای مێژووی داهێنانی جیهان بکە و وێنەی خۆت زۆر دەبینیەوە، بە داهێنانت دەسپێرم.

عەبدوڵڵا سەڕاج

٢٠١١/١/١٠

تامپری ـ فنلاند

## پارسەنگی جوانکارییەکەت، لەنگ و تووکتاڵ و ڕیسوا دەکەن!

نامەی عەبدوڵلا سەڕاج بۆ حەمەسەعید حەسەن

ئەوەڵم یار و، ئاخیرم یار [1]

دۆستی هێژام، هاوسۆزی ئەفراندن و پێنووسم

کاکە حەمە سەعید حەسەنی بەڕێز

لە پاش سڵاوی گەرم، چاو ماچکردن و دەست گوشین

دەمێکە وتراوە، کەسیک بە تەنگتەوەیە، کە ڕۆندک

بقەتیسێنیتە دیدەکانت، نەک زۆڵ و

حەرامزادەگەلێک، ختوکەی کوڕژنی پێکەنینت بدا،

بیهەوێ بۆ پەیڕەوکردنی ئارەزووە گەندەکانی بتکاتە

(مەقاش) و بتخزێنێتە خەرەندەی لەبیرچوون و

گومڕایی و تەفاهەتەوە. ئەڵبەتە ڕاستەوخۆ ڕووی

زارم لە (تۆ) یەک نییە، کە هەمیشە و

لە شوێنانی جددی و کۆڕی مەشرەفخۆشاندا،

ئاماژەم بۆ زمانپاراویی و، بێ گرێوگۆڵی

شیوازی (stily) دەگمەنهەڵەیی و ڕێنووسە درووستەکەت

، چەند پات کردۆتەوە و، بەئەرکی خۆمم زانیوە.

---

[1] ئەم پەراوێزە لە نامەکەدا هاتووە: وەکو بیسمیلا ئەمە دەستپێکی نووسراوی پیرۆزی کاکەییەکانە

هەرگیز لە گوتەنی راستی و جوانی سڵم لە کەس نەکردۆتەوە، چونکە ((الساکت عن الحق شیطان اخرس)) وەلێ بە مامی خۆتم دانێ و سنگ گوشاد بە و، پشووت لەتەکمدا هەبێت.

برازام.. زۆر پەسەند و پیرۆز و هەم شایستەی، وەکو ئافەریدەکار و داهێنەر و شاعیرێک لەم ژیانەدا مایەی شانازی بیت و ڕیزت لی بگیرێت، نەجمەدین مەلا گوتەنی: مردوو پەرستی زیندووکوژ نەبین، دیسانەوە، وەلێ، لە خەلعەتە سوڵتانیە رامیارکراوەکاندا -کەوا لە راستی دا پێنووسەکەت شایستەی ڕیز لێنانە- زۆر قەڵەم ئەتک ئەکرێ و ئەحلام مەنسوورەکانت لە پاڵ دا دەوەستێنن و، پارسەنگی جوانکارییەکەت لەنگ و تووکتاڵ و ڕیسوا دەکەن! ئەوجا بۆ پێنوسە بوێر و بزێوەکەت، لە عاست ئەم دزێوانەدا، دەمی کڵۆم داوە؟! یان لە عاست (ڕستەکەی) هێژا فەلەکەدین کاکەیی دا کە (لەو شایانتر هەن بۆ ڕێزلێنان) ئایا لەبەر tv دا هەڵوێستی پیفرۆشتین یان ..؟! ئەدی بۆ (سارتەر)یانە چوون (نۆبل)ی ڕەفز نەکرد؟ ئەویش راستگۆیانە برەفتارایە! ئەدی بۆ لە بارەی خەڵاتە سیاسییەکانی (العنقاء)و (ئاراس) و (باوەگور گوڕ) و (موکریان) و (ئەردەڵانی) دا متەق ناکەی ئەگەر هەق ویستیت!!

ئەز لە مانگی شەشەمی ٢٠٠٥ دا، لە هەفتەنامەی "میدیا" -کاشکی بەرچاوت کەوتبێ- بە توندی پرۆتستۆی میری دەزگای"سەردەم"م [1] کرد و هاودەنگم نەبووی!!

هەروەها لەمەر شەهیدکردنی یەکەم پیشەنگام لە پایتەختی حوکمەتی هەرێمدا! کە تاکو ئێستەش وەڵامیان نەداومەتەوە، بۆیە بە تورەییەکی سۆفیگەرانەوە، کەڤالەکانم لە هۆڵی میدیا بە دڵشکاوی، وەرگرتەوەو.. سەرەڕای دیداری وەزیری ڕۆشنبیری و بریکارەکەی و چەندین هامشۆی ئەم دائیرە و ئەو دائیرە!! حەیف و مەخابن .."یقتلونک و یمشون فی جنازتک"!! لە کاتێکدا ئەم کارە

---

[1] ساڵی ٢٠٠٧ کتێبەکەی لە ناوی بەرەو گۆشەنیگاکان، لە دەزگای چاپ و بڵاوکلادنەوەی سلێمانی چاپ دەبێت.

قیزەونە لەگەڵ منی ئەندامی دەستەی بەڕیوەبەری گشتی یەکێتی نووسەرانی کورد دەکەن و ..خاوەندی ٧ میتاڕۆمان، ٥ کۆچیرۆک و ، ٤ پەرتوکی تیۆری لەسەر جوانکاری و ڕەخنەی ئەدەبی و شیوەکاری تەنانەت"٢-٣" یان پەرچڤەی فەرەنسی کراون!! دەبێ لەگەڵ خەڵکانی دیدا چۆن بن؟!

ئەوە بۆیە کەڤالەکانم لە هۆڵی شەهید مەهدی خۆشناودا، بەبێ ئیزن و سانسۆر، بە (ڕوتی) بە دەر لە (چوارچێوە) نمایش کرد و، دەیانکەس، چاوییان بەرایی نەدا، کە بێنە ئەوێ، چ جای دێڕیک لە دەفتەرەکەمدا بنووسن! هەرچەندەش ( الاطار نصف اللوحە) دەیان بینەری ڕۆشنهزری (نەوعي)بۆنە هەوێنی شادمانی و باوەشینکردنی ڕۆحە هەستمەند و گڕگرتووەکەم.. ئەمە و.. ڕێز لە ئەدەب و هۆنراوە گرتن.. ڕێزگرتنە لە خۆیان (الاناء ینضح بما فیە) پێچەوانەکەشی ڕاست و درووستە.

گیانەکەم: (بروانە فۆلدەری پێشەنگاکە چەندە کەساس و ناجۆرە!!)

ساڵی پار چوار فۆڵسکاپی (A٤) لەمەڕ گەندەڵی ناوەندی ڕۆشنبیریەوە بۆ جەنابی کاک مەسعود ڕەوانە کرد، بەو کەسەی کە دادگایی تۆی تۆمار کردبوو، گوایا ناویت زراندووە، پاش دوو حەوتە، وەڵامی کاغەزینی بۆ ناردم، کە ئەوەی ئەز، ژیر بەرەم خستبووە بان بەرە، جەنابی ئەویش دەمێکە درکی پێکردووە و هیشتویەتیەوە بۆ پاش یەککرتنی جووتە حوکمەتەکەی هەرێمی کوردستان و. گوایا بە دڵی(من)ان ئاسایی ئەکەوێتەوە، بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ خۆزگەمان بە پار و پێرار!! ئەز لەسەر کەسێک "کوردستانی نوێ"م بەجێهێشتو ئەمیستا لێرەش میرمحێیە!! ئیتر چۆنەکی پێشەنگا و ڕۆمانەکانم چاویان بپشکوێت!؟ پێم ناڵێی کێ سەبەبکارە؟ بۆ؟ ساڵی پار لە گیرفانی کونی خۆم، بە پارەی سۆسیال- نە جگەرەکێشم ونەمەیخۆر- سی نۆڤلیتم لە کتێبفرۆشی "سۆران" دا بە چاپ گەیاند هەر دانەیەکیان (٢٥٠) بوون و ..بەس! ئەمە کەی ڕەوای هەقە؟ چۆن بە دەنگی بەرز ناقایلی دەرنابڕم؟ بێینەوە سەر سلێمانی، د.فوئاد مەعسوم کە سەردانی (هیلسنکی) کرد، بەندە لەسەر شەرەفی ئەو پێشەنگایەکی کاتیم سازاند و پەرتوکێکی تیۆریمی لەگەڵ خۆیدا بردە دەزگای (سەردەم)، کەچی میری

شاعیران چوار ساڵی ڕەبەقە سانسۆری لەسەر داناوە و بە هەنجەتی جۆراوجۆر!! ڕاستییەکەش ئەوەیە، لە یەکێک لە "گۆشەنیگاکان"[1]م دا لە کاتی خۆی لە هەفتەنامەی (ڕێگای کوردستان) دا بە (بەلاش) بۆم دەنووسین، ڕەخنەم لێگرتبوو لەم شیواندن و شەمزاندنی لە شاری کەرکوکی (کەری) کوردستان دا، نەک (دڵ) و (قودس)ەکەی، شەڕی براکوژیمان پێکرا! کراینە ئاوارە و قەرەج و دۆم و (ئارابخا) لە بیست ساڵی پێشوو وێرانەخاک و کاولترە!! ناتەبایی ئەو دوو لایەنە، چەندین مودیرناحییە و کارمەندی تورکمان بردییانەوە! نامهەوێ هەزارویەک شەوەی کوردەواریت بۆ بگێڕمەوە، دڵنیام لە من چێتری دەزانی، کاتی خۆی بۆ وەرگرتنەوەی ئەو پەرتوکەم، هانام بۆ ئازاد جوندیانی برد، گوتی: ئیمە بە شێرکۆ ناوێرین!! ئامادەشم چیت بێ بۆت بکەم وەکو لە چاپدانەوەی چیرۆکەکانت بە نموونە. وەلامی من ئەوە بوو، کە ئەو پارەیە لە شاعیر (عەباس عەسکەر) خەرج بکەن نەبادا ئەویش چوون ئیسماعیل ڕۆژبەیاتی، لە شۆستەی کتێب فرۆشتن دا، نەخۆشی دڵ ساردی بکاتەوە. ئەمانە و هی تر هەڵوێستی بەندە بوونە. ئەدی چارە؟! وادیسانەوە هاتووم بۆ لە چاپدانی جووتێ بەرهەمم..خودی کاک شێرکۆ بێکەس پەیوەندی تەلیفونی لە کامپی پەنابەراندا لەگەڵ کردم لە بارەی ئەو (گۆشەنیگا)یەی کە خەوی زڕاندبوو! منیش کورتە وەڵامم ئەوە بوو: جا تۆش قەڵەمت هەیە و وەلامم بدەرەوە نەک کینە و تۆڵە ناختدا بپەنگێتەوە! ئەوسا فەرموی هیچم لە دڵدا نەماوە، بەڵام ڕاستی نەفەرموو، ئەوە نییە پاش دە ساڵ گورزی خۆی دەوەشێنێ!! (بەرەو ئاستانەی نوێ و ٦٠گۆشەنیگا)م عەوقی خوادووە.

کاک حەمە سەعید دەوردبەرەوە لەو حیلفە ناموقەددەسەی نێوان میری (ڕوانگە) و میری (ڕەهەند)ییەکان. یەکیان توپەکە بەرز ئەکاتەوە, ئەوی تریان (کەبسە) بەرزدەکاتەوە!! ئەمیان دەفەرمووی باش پێش مەرگم ڕۆمانی ... خویندەوە،

---

[1] مەبەست لە نووسینێکە لەگۆشەنیگاکان دا بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
عبدوڵلا سەڕاج، بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٧، ل ١٢١.

نووسەری ڕۆمانەکەش بەسەروباڵ و گوێی شیعرێکی ئەوا درووود و ستایش دەخوێنێ!! چ سەردەمێکی قەحپە و سۆزانیخانەیە کە تێی کەوتووین؟! (شیلینی و اشیلک) !! (کا شی صافی لبن) ئەرێ قاتی نووسەرە من ئاسایی بە تۆپەڵێ قوڕ دەمی ئەو (لشکری) داخات؟! ئەز، تەمەنی (٧٠) تێپەراند و دوو نەشتەرگەریم کردووە و چاوەڕوانی سێیەم و چوارەمم، سەرەڕای چاولکە و تاقمی دگان و سەمماعەی گوێ و ..نەخۆشی شەکرە و دڵ، کە بڕستی شەڕە دەنووک و وزەی یاخیبوونم کز بووە، ئەوانە گشت لەلایەک و.. نامهەوێ ڕاکێشرێمە نەبەردی نابەرابەری دۆنکیشۆتیانە و، تاکتیکی نوقم کردنە ناو گۆلاوی کێم و قەوزە و ژەنگ!!، بە ئاگاییەوە لەوە تێگەیشتووم کە (دانەخۆرە) بۆ موژدەدەر و خۆبەخشەکان دادەنێن، من وا بە کزۆڵی و رووتییەوە abstract کەڤاڵەکانم دەگەیەنمە کەرکووک و سلێمانی و.. تاد. ئەو بوارە ناهەموارانە ناخم گەرمارۆ دەدەن و پەپولەی ڕۆحم دەژاکێنن و.. خەو لە چاوە کزەکانم دەتارێنن. ئەز، سکالات بۆ هەڵناڕێژم: بەڵکو خوازیارم بچرپێنمە گوێیەکان، براله سەنگەری تۆ و من لە ئەفرانستانی (ئەوێ)یە، نەک خەرەند و وێنگەی (ئێرە).

زووکە، زوو، حاجیانە و نالییانە و مەولانانە، بامشێ گڵی زێدمان لە ناخدا هەڵبگرین و.. نەمانی تیشکپرژێنی لێوە بڕسکێنین. وای بۆ دەچم کە ڕەشماڵە شڕی بەر ڕەشەبا و زریانی سەرفرازی، هەموارتر و ئاسودەگیترە لە هەوارگە و شانەشێی ڕۆح مرێن و قەلەم خەسێن! دەشێ وشەکانم چێژی حەقیقەتی تفت و تاڵیان هەبێت و جەنابیشت بە جۆرێکی دی بیربکەیتەوە. بەهەرحاڵ جڵەوی بیری خۆت لە مستی خۆتە، لێ مامت بە کاڵفام و گەمژە نەزانی، کە ئەزمونی زیاتر لە پەنجا ساڵی نووسینم بەکۆڵ هەڵگرتووە و وا بە هاسانی و سانایی، هەرزان فرۆشی ناکەم.. نا.. نابمە داوەڵ، ماشێن و مەکینەی ماستاوی (دەرباره)کان و لەگەڵ (النفری)دا ئێژم: ((*کلما اتسعت الرؤیة، ضاقت العبارة*)) و ((الا هل بلغت)) دووبارە چاوەکانت ماچ دەکەم

ببورە، ئەم نامەم ڕاستەوخۆ نووسیوە. دڵسۆزی وشە وعاشقە ڕەنگ
عەبدوڵڵا سەڕاج

## تا زیاتر لەیەکتر بگەشتینایە!

نامەی عەبدوڵڵا عەباس محەممەد بۆ لەتیف هەڵمەت

عەبدوڵڵا عەباس محەمەد

ئیستەگەی بەغدا 　　　　　　　　　　　　　　　　　　　　　　　　۱۹٦۹/۱۱/۳

بەڕێز کاک لەتیف بەرزنجی... کفری

هیوای کامەرانیت ئەخوازم، وە داوای لێبوردنت لی ئەکەم، چوونکە ئەبوایە زووتر وەلامی نامەکەتم بدایەتەوە، بەلام دوای گەیشتنی نامەکەت، بە ڕۆژێ چووم بۆ سلێمانی بەهۆی کۆچی دوایی باوکمەوە.

سەبارەت بەو نامەیەی داوای شیعرەکانت تیا کردبووەوە، لەو سێ شیعرە تەنیا یەکەمیان بە من گەیشتووە، ئەویش ببورە ناتوانم بۆت بنێرەمەوە، چوونکە لەگەڵ پرۆگرامی ڕۆژی گەیشتنی دا هەڵگیراوە و نادریتەوە بە منیش، مایەوە سەر هەندێ بیروڕای بەڕیزتان، سەبارە بە ئەدەبەکەمان، دڵنیابە من (بەڕاستی) لەگەڵتام، وە زۆر زۆر شانازی ئەکەم بەوەوە توانایەکی (نوێی ڕۆشنبیرانەت) هەیە، وە خۆزگە بە بینینتان شاد ئەبووم، تا زیاتر لەیەکتر بگەشتینایە!

لە کۆتاییا هەمیشە هیوای سەرکەوتنی زیاترت بۆ ئەخوازم

براتان عەبدولا

**ئەویش وتی: باری پۆستە بۆ ئەوێ باش نییە.**

نامەی عەبدوڵڵا مەردۆخی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

زۆر خۆشەویستم کاکە حەمە گیان: ١٩٩٤/١/٦

سڵاوێکی دڵسۆزانەت پێشکەش دەکەم، ئومێدەوارم سەربەرز و بەختیار و بێ وەی بی. ئازیزم کارتی سەری ساڵت گەیشتە دەستم دنیانەک شادی و خۆشی بۆ هێنام منیش ساڵی تازە لە تۆ پیرۆزبایی دەکەم هیوادارم ساڵێکی پڕ ساغی و سەلامەتیت لەپێشدا بێ. لەوەی کە منت لەبیر نەچۆتەوە دیسان سوپاس گوزارم. کاکە حەمە گیان: نوسیبووت جەنابتم لەبیرکردوە چۆن شتی وا دەڵێی، ئەوە چەن ساڵە بە دواتدا عەودالم. ڕۆژ نەبووە نەچمە پۆستەو خەبەر ئەزانم بارودۆخی پۆستە بۆ عێراق چۆنە هەر جارە دەچووم بە ناهومێدی دەگەڕامەوە نەمدەزانی بە چ ڕێگایەک نامەیەکت بۆ بنوسم. لە دۆست و ئاشنا هەواڵم دەپرسی دیسان شتێکم دەستگیر نەدەبوو. پاش ئەو کارەساتەی بەسەر عێراقدا هات ئێمەش کەوتینە پەژارەو دەرد و ڕەنج، هیچ ئاگاداری ئەحواڵی دۆست وخزم نەبووین. ئەمڕۆ کە کارتەکەتم چاو پێکەوت باوەڕم نەدەکرد هی جەنابت بێت. بە هەرحاڵ گەلێک شادت کردم یاخوا هەر شاد و خۆش حاڵ بی.

لە دوا مانگی ساڵی ڕابردوو دا کونگرەیەک بوو لە پاریس لەسەر زمانی کوردی گەلێک دۆست وئاشنا هاتبوون. هەواڵم لە نوسەری کتێبی "سەرنجێک لە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی" پرسی و وتی زۆر باشە خەبەرم لێی هەیە، ئەویش وتی باری پۆستە بۆ ئەوێ باش نییە زۆر یادتمان کرد جێگات لەلامان زۆر دیار بوو. ساڵی ڕابردو توانیم بەهۆی دۆستێکەوە لە سوید کتێبی تازە بڵاوکراوەت بەناوی "بیری کۆمەڵایەتی و سیاسی پیرەمێرد..."م دەس کەوێ نازانم لەم چەند ساڵەداو لە یەکتر بێ خەبەر بووین چ شتێکی تازەت نووسیوە؟

منیش خوێندنەکەم لە مێژە تەواو کردووە ئێستا لە زانستگەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان مامۆستام.. چەند شتیکم بە زمانی فەرانسی بڵاوکردۆتەوە ئێستا خەریکم چەن دەستنوسێکی مێژووی ئەردەڵان کە هەمویان بە زمانی

فارسیین بڵاو بکەمەوە. هەر کە دەرچوو بۆت ڕەوانە دەکەم ئەگەر بەدەستت بگات!

کاکە گیان سەر لە نوێ ناوبەناو بۆ یەکتر نامە بنووسین پێویستت بە چیە بۆت ڕەوانە دەکەم تکایە ئاگاداری حاڵی خۆتم بکە. سڵاو لە ماڵ و منداڵت دەکەم هیوای بەختیاریم بۆیان هەیە. ماڵ و مندالانیش سڵاوت لێ دەکەن. زۆر سڵاوم هەیە بۆ مامۆستایان مەلا جەمیل، مەلا شوکور دوکتور کەمال و هەموو ئاشنایانی دیکە. بەخوات دەسپێرم. زوو نامەم بۆ بنووسە. نازانم گۆڤاری کوڕ دەردەچێ یا نە لە ژمارەی (بەرگی بیست ۱۹۸۹)ەوە من نیمە.

* لە خزمەتی بابتدا عەرزی سڵاوم هەیە و دەستە پیرۆزەکانی ماچ ئەکەم.

برای دڵسۆزت عەبدولڕەحمان

گۆڤارێکم درووست کردووه.

نامەی عەبدوڵلا مەردۆخی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

برای گەورەو زۆر خۆشەویستم کاکە حەمە گیان! ١٩٩٤/٤/١٨

سلاوی گەرم گوڕی برایانەت پێش کەش دەکەم، هیوادارم خۆش و سەرکەوتوو بی. کاکە گیان لە کارتەکەتدا نەتنوسی بوو چیت لێ بەسەر هاتووە، ئێستا کە دەزانم چی قەوماوە بێ ئەندازە سەخەڵەت و بەپەرۆش بووم بۆت. داوا لە یەزدان دەکەم زوو بەزوو چاک بیتەوە. دەبێ زۆر ئاگات لە خۆت بێ و ڕێگایەک بۆ چارەی ئەم گیرووگرفتەت بدۆزیتەوە لە ولات یا لە دەرەوەی ولات من وەک و برا لە خزمەتتدام.

ئازیزەکەم ئەو کتێبانە وا بۆت ناردوم بە دەستم نەگەیشتوون، چاوەڕێ بەرهەمەکانتم. کاکە حەمە گیان! گۆڤارێکم درووست کردووە بە یارمەتی هەندێ دۆست و برادەر بە ناوی "بڕوا" ئەم گۆڤارە ئێستا هەر وەرزێک ژمارەیەک دەردەچێت بە زمانی کوردی (کرمانجی خواروو) و فەرەنسی. ژمارەی یەکەمی ڕەنگە بۆ سەرەتای هاوێین پێ بگا. ئەم گۆڤارە تایبەتی لێکۆڵینەوە و گیرووگرفتەکانی کوردناسییە. ژمارەی یەکی تەواو بووە، بەلام بۆ ژمارەی دووەمی کە تەرخانی شەرەفنامەو شەرەف خانە داوا لە جەنابت و دوکتور کەمال مەزهەر و هەموو برادەرێک دەکەین یارمەتیمان بدەن. ئەم ژمارەیە بە بۆنەی چوار سەدمین سالی نووسینی شەرەفنامەوەیە کە گەلێک گرنگە. من لەم ژمارەیەدا شەرەفنامە کوردییەکەی هەژارم لەگەڵ دەقە فارسییەکەی خستۆتە بەر ڕەخنە. ووتاریکیشم لەسەر دۆستی کورد ڕەحمەتی مەحەمەد شەمس نووسیووە. بەداخەوە وەرگێڕاوەکەی مامۆستا شوکور مستەفام تەواو نییە بەشکوو بە هەر چەشنێک هەیە بۆم بنێری. ئەگەر برادەری وەرگێڕی ڕووسی زان لە لای ئێوە هەن بەشکوو داوایان لێ بکەی هەندێ ووتاری باشی کوردناسەکانی روسیمان بۆ بکەن بە کوردی. هەروەها داوا لە مامۆستا مەلا شوکور دەکەین لەم بارەیەوە یارمەتیمان بدات. ئەم گۆڤارە لە فەرەنسا بۆ

یەکەمجارە دەردەچێ کە تایبەتی کوردناسی بێ. بۆ ئەوەی گۆڤارەکەمان نەختێ دەوڵەمەند بێ دەستی یارمەتیان بۆ درێژ دەکەین.

ئەو شتانەی داوات کردبوو هەوڵ دەدەم بۆتی ئامادە بکەم لە کتێب و جل و بەرگ و... سلاو و رێزم بۆ هاوسەرت باجی شیرین و چاوی منالەکان بیارە، ژیوار و پیران ماچ دەکەم. مالی ئیمەش هەموو عەرزی سلاویان هەیە.

لە خزمەتی بابت دا عەرزی سلاوم هەیە دەستەکانیان ماچ دەکەم هەروەها خزمەتی مامۆستا جەمیل و مامۆستا شوکور و مامۆستا دوکتور کەمال مەزهەر.

هیوادارم حال و ئەحوالت دیسان باش بێتەوە و ئیمەش لە خەم و پەژارە دەرچیین.

* ئەوەم لە بیر چوو بنوسم مامۆستا مەلا جەمیل بلێ عیسای پەژمان چەن کتێبێکی لە پاریس بلاوکردۆتەوە زۆر بە خراپی باسی مامۆستا دەکا. کە چاویشم پێ کەوت هەر قسەی ناشیرینی دەوت. ئەوەش ئادرسی عوسمان ئەحمەدی:

O.A AHMADI

١١ squ. Normandie Niemen, ٩٢٤٤٠ Dugmy France.

**چوارده سەعات دوای شەڕ وەستان.**

نامەی عەتا محەممەد بۆ بەرزان هەستیار

عەتا محەممەد

برای بەڕێز کاک بەرزان هەستیار ..

پاش ڕێز و سڵاو چاوت ماچ دەکەم،

ئێمە باشین لە شەڕی ناوخۆ دا

ئەی تۆ...؟

برای بەڕێز کاک بەرزان هەستیار ..

پاشای ڕێز و سڵاو چاوت ماچ دەکەم ،

ئێمە ئێستا لە شەڕی ناوخۆ دا

لەدژی تۆ ،، ؟

هاوڕێت عطا محمد

٩٦/٧/٢٤

١٤ سەعات دوای

شەڕ وەستان

**پیاوێک له دارسێوت به دیاری بۆ ناردووم!**

نامەی عەتا نەهایی بۆ شێرکۆ بێکەس

مامۆستای بەڕێز، شاعیری گەورەی کورد

کاکە شێرکۆ بێکەس خۆشەویست.

لەگەڵ ریز و سلاومدا

بەر لە هەرشتێک بۆ ئەوەی بەسەرت کردمەوە و کتێبی (پیاویک له دارسێو)[1]ت بە دیاری بۆ ناردووم سوپاسی بێ پایانت دەکەم. وەکو هەموو بەرهەمیکی تری جەنابت هەر کە بە دەسم گەشت خوێندمەوە و چێژم لێوەرگرت و گریاندمی و زۆر شتی لێ فێربووم. ئەوە یەکێک لە ئاواتەکانی منە کە رۆژێک دەربارەی رەگەز و تەکنیکە مۆدێرنەکانی گێڕانەوە لە چیرۆک و ڕۆمانە شیعرەکانی جەنابتا، بە تایبەت لە بەرهەمەکانی دوای راپەرین وتاریک بنووسم. من بەش بە حاڵی خۆم جگە لە شیعریەتی باڵاو شکۆی زمان و دەیان رەهەند و لایەنی تری شیعری شێرکۆ بیکەس کە خوێندنەوە و دراسەکردنیان بێگومان لە وزەو توانای ئێمڕۆی ئەدەبی کوردیدا نییە، گەلێک ڕەگەزی مۆدێرینی چیرۆک و تەکنیکی نوێی گێرانەوە، بە تایبەت شکاندنی زەمەنی هێڵی و چۆنییەتی شۆڕبوونەوە بە ناخی زیهنییەتی کەسایەتی -یان کەسایەتییەکان- بە یارمەتی وەرگرتن لە تەسویری لە فەزا و لە شتی عەینی و بەرهەستەکان. خولقاندنی هیمای نوێ و داهینانی فەزای شیعری و فەنتازیای کوردی و... سەرنجیان ڕاکێشاوم و گەلەک شتان فێرکردووم. دڵنیام ئاشکراکردن و بەرجەستەکردنی ئەمانە و زۆر رەگەز و تەکنیکی تری گیرانەوە لەم ژانێرە ئەدەبییەدا، باشترین و متمانەپێکراوترین تەقەلایە بۆ تۆریزەکردنی پوتیقیای گێڕانەوەی هاوچەرخی کوردی و بۆ ئێمەی چیرۆکنووس و نەوەکانی دوای ئیمەش بە سوود دەبێ.

بۆ جارێکی تریش بە ئەمەکەوە سوپاسی خۆتان و هەموو

ئەو شتانە دەکەم کە لە شیعری ئێوەوە فێربووم.

برای بچوکت

١٥/٣/٧٩

[1]شێرکۆ بێکەس، پیاوێک لە دارسێو، ٢٠٠٢.

**تۆ چەند گەورەی شێرکۆ!**

نامەی عەدنان سائغ بۆ شێرکۆ بێکەس

برای خۆشەویستم شاعیری گەورە و داهێنەر بەڕێز شێرکۆ بێکەس ١٩٩٨/٤/١٤

تازە لە ئێوارە کۆڕەکەت گەڕاومەتەوە و پڕم لە مۆسیقای ڕۆحت، کە لە نێوان ماڵەکان و دارەکان و خەونەکاندا بەرزدەبوونەوە، و هەڵیان دەگرتم بەرەو یادەوەرییەکانی کوردستان و پردی کوفە و پەیکەری ئازادی و لوتکەی پیرەمەگروون و گوڵی نێرگز و پریشکە ئاوەکانی شەتولعەرەب و قاوەخانەی "حەسەن عەجەمی" و شۆستەکانی جادەی "رەشیدیە" و دانیشتنەکانی ئەبی نەواس و مەیخانەکان.؟

خودایە چەندە جوانە شیعر ئەو هەموو شتەمان لێ بکات.. من زمانی کوردیم نە دەزانی بەڵام باوەڕم پێ بکە خەریک بوو وەرگێڕانی شیعرەکانم لە بزوانی لێوەکانت و دەستەکانتەوە پێدەگەیشت کە دەتجولاند و وەکو چۆن دنیا بجوڵێنی و ئەستێرەکان و مانگ و شارەکانت بەرە و دەقەکانت دەبرد، کە زمانیان تێپەڕاندبوو، سنوورەکانیان تێپەڕاند تا بگەن بە رۆحی تینووم و پڕی بکەن.. چەندە گەورە و گرانبووی شێرکۆ بێکەس، بیرمە کە ساڵانی ٨٤-٨٥ لە سلێمانی بووم و ئەگەڕام بە مەکتەبەکاندا تا شیعری تۆم دەست بکەوێت و ڕۆژێک هاوڕێیەکی نووسەرم کە ناوی "تاریق" بوو بۆی دەخستم و هەندێکی بۆ وەرگێڕاوم، پاشان هەندێ شیعری ترم لە "دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسول"ەوە دەست دەکەوت، کاتێک لە ناو مەکتەبەیەکدا دانیشتبوو، کە هاوڕێکەم" تاریق" ی پێناساندم، پێی وت کە چەند حەزم لە شیعری تۆیە ئەویش کتێبێکی هەیە، وەکو بیرم بێت بە ناوی "الواقیعیە فی الادب الکردی"[1]ە.

شیعرەکانت لەگەڵمدا مانەوە، لە ڕۆحمدا هەڵم گرتوون بۆ هەرکوێیەک بچم!

---

[1] مەبەست لە "عیزەدین مستەفا ڕەسول"ە کە خاوەنی پەرتوکی (الواقیعیە فی الادب الکردی)یە.

ئەو کاتەوەی کە "لەتیف هەلمەت"ی شاعیرم ناسی، یەکەم پرسیارم لێی لە بارەی تۆوە بوو، ئەو کات "هەڵمەت" هەندێ شیعری منی کردبوو بە کوردی، پێی وتم کە بە دلت بوون.

لەیەکی دابڕین، عێراق، شەڕ، سالانی تاراوگە، هەتا باسی ئێوارە کۆڕەکەتم بیست بە دڵخۆشییەوە بۆی فڕی.. ئاه ئەی شێرکۆ تۆ لە ویژدانی هەمووماندای بە کوردی و عەرەبەوە، دەنگێکی شاز، هاوارکەر،لە سەروو ئەو هەموو بەند و چەکی بکوژانەوە.. تا هەیە وەکو ترپە و ڕۆحێکی تەقیو کە بە بکوژەکان ڕام ناکرێ و دەمێنێتەوە، هەتا هەیە لە یادەوەری کورد و عەرەب دا وەکو قەسیدەیەک دەبێ، کە هەڵگری بەرامی زەوی یە لە کوردستانەوە تا کەنداوی عەرەب. خۆشماندەوێی شێرکۆ بێکەس، ئاواتەخوازم بەردەوام پەیوەندییمان هەبێ و تاکۆتایی.

دلم زۆر خۆش بوو، بە وشە جوانەکانت دەربارەی دیوانەکەم "تحت سماء غريبه"[10] ئەو وشانەم هەرگیز لە یاد ناچێ و وام لێدەکەن لە دنیای شیعردا بەردەوام بم.

ڕۆحە جوانەکەتم زۆر پێ جوان بوو، چەندە گەورەیت ئەی "پرۆمیتیۆس" ئەی ئەوەی پیرۆزترین شاگرت لە شاخەکانی ئۆڵەمپ ڕفاند.. تۆ چەند گەورەی شێرکۆ، چەندە سادە دیوانەکەمت پشتگوێ نەخستووەو بەڵکو خوێندوتەتەوە و پێت بووە کاتێ بە شەمەندەفەر بۆ ستۆکهۆلم چوویت پاشان، زۆر شادمان بووم بە بۆچوونت لە بارەیەوە، تۆ چەند گەورەی شێرکۆ ئەمانە سیفاتی نەمرەکانن.

برای شیرینم شێرکۆ: دەمەوێ هەندێ لەو کتێبانەم کە نوسخەیان لێ نەماوە چاپیان بکەمەوە، و دەمەوێ دیوانەکەم چاپ بکەمەوە "تحت سماء غريبه" لە چاپخانەیەکی نوێ لە بەیرووت، کە چاپخانەیەکی گەلێک باشە، زۆرم پێ خۆش دەبێت ئەگەر رازی بیت بە نووسینی چەند دێڕێک، لەسەر ڕووبەرگی کۆتاییکەی

ئەگەر خۆت پێت باش بێت، ئەوا شەرەفێکی گەورەیە بۆ من و خۆشییەکی دانسقەیە کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە. چونکە دەمێ ساڵە خەون بەوەوە دەبینم. ئاخۆ بێتە دی، بەڵام ئەگەر نەتویست یان حەزت نەکرد، ئەم کارە بکەی، من تەنها ڕۆحی باش و دڵی جوانی باشی بەخشندەی تۆم بەسە و، ئەو دڵەی کە لە ئێوارەوە، لە کۆرەکەوە پڕی کردم لە خۆشەویستی و جوانی و هاندی دام بۆ داهێنان، نامە جوانەکەت و تەلەفۆنەکانت بۆ من بەسن، کە واتای گرنگیدان و بیرنەچوونەوەتم پێدەگەیەنن.

برای خۆشەویستم: ئەی مرۆڤ و شاعیر و کانیاوی هەڵقوڵاو زۆر سوپاسی ڕاستگۆییەکەت دەکەم، با هەمیشە بەم جۆرە ڕاستگۆ بین، ڕاستگۆیی گرنگترین سیفەتە کە شاعیری ڕاستگۆ و هاوڕێی پێ جیادەکرێتەوە، ئەمەم لە یەکەم نامەتەوە بۆ دەرکەوت.

شاعیری سەرسوڕێنەر شێرکۆ: لە کتێبخانەکەمدا یەک دیوانی تۆم هەیە بە ناوی "مرایا صغیر"[20] لە ستۆکهۆڵم لە کتێبخانەکەی "حمدی مرسی" کڕیومە، لە یەکەم سەردانمدا، هیوادارم کتێبە وەرگێڕاوەکانی دیکەتم دەست کەوێت لە ئایندەدا. ڕیزی "بەیاتی گەورە" بۆت و شاعیر "حسیب شیخ جعفر" منیش کە عیراقی بە شێوەیکی یەکجاری جیهێشتووە و دوای مردنی ژنەکەی کە ئێستا لە ئەردەنە و پاشان بۆ ئیمارات سەفەر دەکات و لەوێ لە ڕۆژنامەیەکدا کار دەکات.

ڕێزی هەموو شاعیرە عێراقییەکان لە ناوەوە و دەرەوەی عێراق بۆت، تۆ جێگەیەکی گەورەت هەیە لە دڵماندا، ئێمە هەمیشە یادت دەکەینەوە، ئەوان زۆر هەواڵی تۆم لێ دەپرسن، لە نامەکانیاندا بە تایبەت جیلی نوێ کە پێیان دەوترێت "نەوەی نەوەدەکان" تیایاندا چەند دەنگێکی شیعری باش هەن، کە بە پاکی و کپی دەنووسن دوور لە کابوسی حوکمەت.

---

[1] عدنان صائغ، تحت سماء غريبه، لندن ١٩٩٤.

[2] ئاوێنە بچووکەکان ساڵی ١٩٨٦ بڵاوبۆتەوە بڕوانە:

شێرکۆ بێکەس، دیوانی شێرکۆ بیکەس، بەرگی ٢، سوید ٢٠٠٩

بمێنن بۆمان تا ئەبەد هێمای بەرزی و بڵندی لە سەرتاپای داهێنانی کوردی و عەرەبی و جیهانیدا

خێزانم ڕیزی هەیە بۆتان و ڕیزم هەیە بۆ خێزانتان

لەگەڵ ڕیزی زۆرم

ببورە لە خەت ناخۆشیم، بە هۆی نەخۆشی چاوەوەیە!

عدنان الصائغ

١٩٩٨/٤/١٤

**کێ لە ژن مەزنترە؟**

نامەی عوسمان شەیدا بۆ ئەنوەری ڕەشی عەوڵا

خۆشەویستم ئەنوەر گیان.. چاوەکانت ماچ دەکەم

ڕێز و نەوازشم بۆ ڕیکا ی میهرەبان

چەند ڕۆژێک پێش ٢٣ ی ئایار، شێرزادی برامان ئاگاداری کردم هاوەڵێک بە نیازی گەڕانەوەیە.. ئەگەر نامەیەکم هەبێ ئامادەی بکەم..

هەواڵی مەرگی ڕەهبەر جەلال تاسەر ئێسک تەزاندمی.. لای من مردن حەسانەوەیەکی شیرین و دابڕانێکی ئۆخەی ئامێزە لە میحنەتەکانی ئەم ژیانە تڕحێوە.. وەلێ بۆ کەسێک کە بەخششی هەبێ یانی لە دەستدانی وزەیەکی ئیبداعی.. خەمەکە ئا لەوێدایە! گەش بوومەوە بەوەی ڕیکا ئاسودەییت پێ دەبەخشێ.

چونکە ئێوە لەوێندەر پێویستیتان بە سۆز هەیە.. ئەدی کێ لە ژن مەزنترە بۆ بەخشینی ئەو سۆزە.. لە دڵەوە سوپاسی ڕیکا گیان دەکەم. سەبارەت بە هاتنەوەی خۆشت کاکە عومەر ئامادەیی نیشان دا ئەگەر بە فرۆشتنەوەی نیوە کارگەکەشی بوە گەڕانەوەتان دابین بکا.. دیارە زۆر بیرتان دەکەین.

ویستم زێترت بۆ بنوسم بەڵام شێرە گیان ووتی: کاغەزێکی بچکۆلە منیش بە قسەیم کرد.

هەربژین، چاوتان ماچ دەکەم ٨/١٥

باپیرە شەیدا[1] سلێمانی

---

[1]شەیدا: عوسمان شەیدا، برا گەورەی ئەنوەری ڕەشی عەوڵا.

**سێبەری خۆت لێرەیە...**

نامەی عوسمان شەیدا بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

خۆشەویستم ئەنوەر گیان

دیدەکەم ڕیکای[1] میهرەبان

سلاوتان لێ بێت، چاوتان ماچ دەکەم، لە دڵەوە بە هیوای تەندروست باشی و هەمیشە بە جوانی مانەوەی دنیا پەپولەییەکەتانم. لێرە خێزان هەموو باشین؛ چ کێشەیەکمان نیە.

ئەنوەر گیان.. تا نوسینی ئەم نامەیە دوو قەسیدەت لە دوو رۆژنامەی ئێرە بلاو بونەتەوە و ژمارە ۳ ی ئایندەش کە ئێستا لە ژێر چاپدایە قەسیدەیەکی تری تیا دائەبەزێ.

سەبارەت بە دیوانەکەشت ئەوە بڕیارە هەموو چامەکانت بە کۆمپیوتەر بکرێت و بە ئامادەکراوی دیسکەکە ئەدەم بە شێرزاد.. پێم وایە تا مانگی دە ببێتە کتێب، بەهەرحاڵ سێبەری خۆت لێرەیە تکایە لەو بارەیەوە دڵ لەدوو مەبە.

سەبارەت بە دیوانەکەی خۆشم هێشتا هیچم دەست نەکەوتووە تا ۳۰۰ نوسخەیەکی لێ راکێشم.

[1] خاتوو ریکا هاوسەری ئەنوەری ڕەشی عەولا بووە.

به نیازیشم هەروەکی وەفایەک بەرگی ئەمجارەی دیوانەکەم ئەو کەڤاڵە بیّت کە رەهبەر جەلالی جوانەمەرگ بۆی کێشاوم؛ دیارە نوسخەت بۆ دەنێرم.

ئەنوەر گیان، ئیدی دەمەوێ بە راستی تەرخان بیت بۆ قەڵەم و هزری خۆت و بەرهەمی خۆتانم لێ نەبڕن تا لێرە بڵاویان بکەمەوە.. گیانەکەم ئەوەیان بۆ دەنگ و رەنگی خۆت چاترە لەو بێدەنگییەی پێشوتان.

چاک بو بیرم کەوتەوە قەسیدەیەکیشتان لە گۆڤاری گەلاوێژی نوێ دادەبەزێ هەروەها دوانی تریش لە هەردو گۆڤاری رامان و کاروان. سەبارەت بەو دیمانە ئەدەبییەی ئاوات حەسەن لەگەڵی کردویت، بەڵکو بۆم بنێریتەوە تا ئەویش بڵاوبکەینەوە.

هەر بەو بۆنەیەوە رێز و سڵاوی زۆری هەیە بۆت.

تکایە خۆشەویستی و سڵاوم بگەیەنە بە هیوا قادر و دلاوەر و خەبات.

تکایە رێم بدەن دوبارە چاوی هەموتان ماچ بکەم

براتان/ شەیدا

## ئەز ئاتاجم بە خۆشەویستییەک!

نامەی عوسمان شەیدا بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

گەورەم ئەنوەر، حەمدی فەرموویەتی:

ڕەببی مووی لێ بێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ

هەرکەسێ گوڵشەن بە دەردی کوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

بچووکم ئەنوەر.. پێش خوێندنەوەی نامەکەت، لە دێڕەکانی وردبوومەوە ئەوجا بۆ دوو وێنەکەتم ڕوانی نازانم بۆ شیعرەکەی حەمەئاغای وەرتێ م لەبەر خۆوە گووتەوە:

نامەیەکم پێ گەیی هەر وەک گوڵاوی پەرچەمت

وەس وەسەم کرد کەی بێ خوایە

دەم بنێمە نێو دەمت

خۆزگە ئەمزانی لە غوربەت کێ یە، بێ من، هاودەمت

چاوەکانم بەسیە غوربەت بێرەوە

چۆن بژیم من..

تۆ لەوێ و من لێرەوە.

لە سەرەتای پژانی زمانی شیعرمەوە ئەو چەند دێڕەی حەمەد ئاغام دەبەر بووە.

ئەنوەری بچووک و گەورە.. گەلەک شەوان سەبووری خۆم بە فرمێسک و مەی هێناوە "بۆ هەندێ لەو شەوانە خۆت شاهیدی".. هەر لێرەوە دەمەوێ ڕاستییەک ببێژم؛ ئەز ئاتاجم بە خۆشەویستی یەک، پێم وایە دەگەڵ شیردا خواردوومە

بۆیە وا دەڵێم: چونکە ئەو خۆشەویستانەم بیر ناچنەوە.. تۆش لەو "صەنەم" ە خۆشەویستانەی!

ئیدی نازانم کەی دەبم بە پێغەمبەر "کە تەمەنم چل و سێ یە" و.. "صەنەمەکان" دەشکێنم.

دیارە نە دەبمە پێغەمبەر.. نە بەو تەمەنە شکستەوە بتم پێ دەشکێ. پێم وا نیە خۆشەویستیش بە شەڕ بێ و بکوژرێ!

ساڵی حەفتا و نۆ لە پاریس دێڕیکم نوسی پاشان بوە ملوانکەی شیعری "خەزان"

ئاخ چەند شێتم

بالآی عیشقێ دەبڕمەوە، خۆم گەورەم کرد.

ئەنوەر گیان.. با بێینە سەر دنیای شیعر* لەسەر ئەرکی کاک ئەمین شەوکەت "گۆرانی بەرگری" م چاپ کردووە.

- گرانەتا.. چەند شیعرێکی کاریکاتێری یە ئەویشم فۆتۆ کردووە وا دەیبینی. هەر بۆ زانیاری حەز دەکەم دەربارەی کاریکاتێر ئەوە بڵێم لە پەنجاکاندا مامۆستا گۆرانی نەمر، ستوونێکی لە رۆژنامەی ژین دا هەبوو بە نێوی – کاریکاتێری بێ وێنە– رونتر دەمەوێ بڵێم کاریکاتێر بە ئەدەبیاتی ئێمە تازە نیە.. لەوەشدا قەرزاری گۆرانی زیندوین. خەریکی ئامادەکردنی بەشی دووەمی ئەو کاریکاتێرانەم..
- یانزە پارچە چەکی هەیە
- R.B.Gدوو
- یادگاری سەردەمانی خەفیفەیە
- پێنج کلاشینکۆفی یەک لاق...
- ئەوەیان دیاری مامەیە
- دوای راپەڕین بە چەند مانگێ

- تەرمۆمەتری باوەڕ کشا؛ بایدایەوە
- سێ برنەوە و چواردە خۆری
- هی دەست خۆشانەی کاکەیە
- سەر هەڵبڕن شەهیدانم
- ئەو موستەشارەبم بورن، موستەشار نا
- ئەو فەرماندی بەتالیۆنە
- پارێزەری ئەم خاکەیە

من لێرەوە لە بری جارێ سەدان جار بە قوربانی دڵت بم.

٢٦ /٩٣/١٠

شەیدا

**گۆڕ لە غەریبی دا و شیعر لە غەرەیبی دا ...**

نامەی فەرهاد پیرباڵ بۆ ئەحمەدی مەلا

ئەحمەد گیان بەراستمەو من ئێستا زیاترم لە چاو مانگیک پێش ئێستا خۆش ئەوێی، هەست بە پەیوەندییەکی قوڵتر دەکەم لەگەڵت، لەبەر هیچ نا: تەنیا لەبەر ئەوەی کوردیت، یان لەوانەشە لەبەر ئەوەی کە ئێستا هەست بە تەنیایەکی کوشندە دەکەم، لەم ڕۆژانەدا کورد بە تەواوی، لە ناو ڕۆح و شەخسییەتم دا و منیش لە ناو ڕۆح و شەخسییەتی ئەودا، وەک بڵێی پێکەوە دووایین هەناسەکانی ژیان بدەین: هیور هێور لە ناو تەنیایی و بێکەسی خۆماندا، ئەوان لەسەر سنوورەکاندا و منیش لەسەر لاپەڕە سپیەکاندا، دیسانەوە کورپەی هیوا و یادگارە شیرینەکانمان دەنێژین. گۆڕ لە غەریبی دا و شیعر لە غەرەیبی دا ..

ئەحە گیان بەقەد چارەنووسی میللەتە هەمیشە بەدبەختەکەم هەست بەبەدبەختی و کڵۆڵی دەکەم، بەقەد تەنیایی، تەنیایی، ئەو تەنیام. بەڵام تێناگەم، نازانم بۆچی لە هەمان کاتدا، ئەو هەرەس و ڕەشبینی و مەرگەساتانە، لەلای من، لە ناومدا، دەبنە گوڕێکی ئومێد و گەشبینانە سەرهەڵدەدەنەوە. خۆ ئەمڕۆ هیچ ئومیدێ لە ئاستە سیاسییە چ ناوخۆ و چ نێودەوڵەتیەکەش، بۆ کورد نییە؟! زۆرجاران کە بیر لەو نێوانە سامناکە، لەو دوورییە ترسناکەی نێوان تەنیایی میللەتەکەم و ئاسوودەبوونی دەکەمەوە، بەخۆم دەڵیم: نەخێر، چارەی ترنییە، تەنیا ڕۆح و بوونی خۆم نەبێ. من پێویستە لێوارەکانی ئەم دوو جەمسەرە ئەم دوو دونیا لەیەکتر دوورە (ئێستا و داهاتوو) تەنیا لە ناو خۆما بەیەکتر بگەیەنمەوە، خەیاڵی بوونی ئێمەومانانی هونەرمەند ئەحمەد گیان، لێرەدایە: خۆمان هەم وەک ڕابردوو، هەم وەک ئێستا و هەم وەک داهاتوش دەبینین هەم وەک قوربانی و هەم وەک قارەمان، هەم وەک پرد و هەم وەک مەنزڵگا.

تازە پێش نەخێتک موسا عەنتەرم لە تەلەفزیۆن بینی، لە کوردستان، لە نێوان ڕەشماڵەکاندا دەگریا، بە توڕەییەوە هاواری دەکرد و بە فەڕەنسی دەیگوت:

je vous en pris , il faut faire quelques chose , je vous en )
[1](pris

دەگریا و ئەم قسانەی دووبارە دەکردەوە، مووسا عەنتەر نووسەریکی کوردی کوردستانی تورکیایە، دەگریا، هاواری دەکرد، وەک شێت دەلالایەوە. ئێ دە ئەحە گیان هونەرمەندێکی کوردی عێراقیش، پێش یەک ڕۆژێک چوو بوە لای مانگرتووە کوردەکانی نۆرتدام پێیان گوتبوو: ((ها، شلۆنکم مەعە هەزائیمکوم؟)).

جاریکیان باسی سەربەخۆیی دەوڵەتی کوردییان دەکرد، لە پاریس، بە بیرت دێ؟ تۆ فشەت بە قسەکانم دەکرد. ئەوەیە ئیمە سرووشتی منالمان هەیە، متمانەمان بە خۆمان نییە و هەست بە تەنیایی دەکەین. ئەوەتا دوو ملیۆن زیاترمان لە "عێراق" دەرکراوین، کەچی لە سیاسییەکان هەر خۆمان بە عێراقە حیزەکە گرێ دەدەینەوە. ماندووم هێندەی بگریم، توانای نووسینم نەماوە، لە کاتێکی تردا هەندێ وشەی ترت بۆ دەنووسم. [2]

١٩٩١

فەرهاد پیربال

---

[1] بە واتای : تکاتان لێدەکەم پێویستە شتێک بکرێت، تکاتان لێدەکەم!

TONTON PROTECTEUR DES KURDES

ILS M'ONT MÊME NOMMÉ PESHMERGA D'HONNEUR... FAUT PAS EXAGÉRER...

Kerwouze

T. Canard en chaine, 4 avril 991

**یازدە سەعات پێکەوە، قسەمان کرد و خەونمان بینی...**

نامەی فەرهاد پیربال بۆ ڕەفیق سابیر

Farhad pirbal (١١٤)

٤١.R. TOURUE FORT . ٥e

پاریس ١٩٩٣/٥/١٤

برای شیرینم، رەفیق گیان

بەهیوای سەفرازی و لەشساغیتانم،

مانگی ٣ بوو وابزانم، لە ستۆکهۆلم، چوار پێنج قاوەخانەی خۆشمان پێکەوە کرد: زیاتر لە یازدە سەعات پێکەوە قسەمان کرد و خەونمان بینی.. گەشتینە گەلیک پێشبڕیار و ئەنجامی باش: لە بارەی (ڕابوون) و پڕۆژەکانی تر. هەقیقەتی ئیمە، بەڵکو دڵنیام کە لە داهاتوویەکی نێزیکدا ئەو پڕۆژانەی کە سێ ساڵی ڕەبەقە بیریان لیدەکەمەوە و وەکو هەنگ کاریان بۆ دەکەم، دەتوانم ئەنجامیان بدەم. ئاواتەخوازم پێکەوە بین. هەرچۆنێک بێ، من لە باری داراییەوە، لێرە، باشتر و زیاتر کەوتوومەتە خۆ. لە هەمان کاتیشدا لە کۆکردنەوەی ماتریریاڵی جۆراوجۆر و ناردنەوەیان بۆ هەولێر نەکەوتووم.

ڕەفیق گیان، من تا ئەو شوێنەی کە قسەمان لەسەرکرد رازیم و لەگەڵتام. بۆ مەسەلە، زیاتر پراکتیکیەکانی، دیکەش، ئاواتەخوازم لە کوردستان لە بەرچاوبگری کە باسمان لێوە کرد.

تۆ چۆنی؟ دەنگوباسی تازەت؟ کەی دەڕۆی؟ چۆن؟ چی لەگەڵ خۆت دەبەیتەوە؟ بۆ "چاپخانەکە" بڕیاری چیتان داوە؟ حەزدەکەم کە لە کوردستانیش دەبیت، تکایە، بە درێژی نامەم بۆ بنووسە و بارودۆخی کارو تەنگوچەڵەمەی

پڕۆژەکەم بۆ باس بکەی، بۆ ئەوەی کە من لە سەرەتای مانگی (١٠) دا دێمەوە بتوانم سوود لە تێبینیەکانت ببینم. سڵاوی تایبەتم بگەیەنە بە کاک هاشم کۆچانی و "کەماڵ". بە تەمام لە ١٠/٦/٩٩٣ بێمە ستۆکهۆڵم. لە شتی تازە و (ڕابوون) بێ بەشم مەکەن. چاوەڕێی نامەتم، تکایە.

ماچت دەکە. برای دڵسۆزت: فەرهاد پیربال

## کاتێ خەریکیش بوو هەولێر بەجێ بێڵم...

نامەی فەرهاد پیرباڵ بۆ شێرکۆ بێکەس

پاریس: ٦/٣/٩٩٣ Farhad pirbal

هەولێر ٤١, R, tomefort

وەزارەتی ڕۆشنبیری Paris ٥

بەڕێز "وەزیری ڕۆشنبیری"

کاک شێرکۆ بێکەس

"فیدای جوتیارتان بێ حاتەمی تەی

بە قوربانی سەپانتان ئالی بەرمەک "

ح.ق. کۆیی

بۆ برای بەڕیز و خۆشەویستم، کاک شێرکۆ بێکەس

بە هیوای بەختەوەری سەرفرازیتانم،

بە داخەوە کە گەڕامەوە هەولێر، بواری ئەوەمان بۆ ڕێک نەکەوت کە ماوەیەکی زۆر پێکەوە دانیشین و قسە بکەین. کاتێ خەریکیش بوو هەولێر بەجێ بێڵم، دوو سێ جارانم تەلەفۆن بۆ کردیت بۆ ئەوەی خواحافیزیت لێ بکەن و ڕاسپاردەکانت بگەیەنمە "ئەم ناوە" هەر لەوێ نەبوویت. لەم بارەیەوە دڵنیام دەمبەخشی.

پێش دوو هەفتە، بە ناوی سکرتێری ئەنستیتووەوە، کاک بەختیار، نامەیەکم بۆ کاک ئیسماعیل خەیات ناردبوو. لەو نامەیەدا هەموو خاڵیکی گرنگ و پێویستم لە بارەی ئەو پێشەنگایە ڕوون کردبۆوە کە ئەنستیتوی کورد دەیەوێ بۆ هونەرمەندانی کوردستان، لە پاریس سازی بکات، هەڵبەتە کە پیویستە کاک

ئیسماعیل ئەو نامەیەی پیشانی جەنابتان دابێت و لە چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم کارە و گەیاندنی تابلۆکان بۆ پاریس و.. هتد ئاگادار کرابێتنەوە.

لە بارەی خۆشم، مانگی ئۆکتۆبەر خوێندنەکەم تەواو دەکەم و نیازام وایە بەیەکجاری بگەڕێمەوە: ئەو چەند ساڵەی گوڕی گەنجێتی داهاتووم، با لە ناو "ئەم چڵپاوە ڕەشە ساردە" دا – وەک رامبۆ دەڵێ – بە هەدەر نەچێ.[1]

بە هیوای سەرفرازیی هەموو لایەک، چاوەڕێی دەنگوباستانم

برای دڵسۆزت فەرهاد پیربال

پەراوێز

لە غوربەت بە شاهی لەبیرناکرێ

زەمانی جوانی و یادی وڵات

ح.ق. کۆیی

ناگەن بە حیز و ڕێگری ئیمە لە مولکی ڕۆم

عەلـلامەی ویلایەت و شێخی ویلایەتی ح.ق. کۆیی

---

[1] پیربال مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٤ گەڕاوەتەوە کوردستان. هەفتەیەک دوای تەواوکردنی دوکتۆراکەی لە زانکۆی سۆربۆن، لە بواری مێژووی ئەدەبی نوێی کوردیدا لە ساڵی ١٩٩٤ لە زانکۆی سەلاحەدین دامەزراوە. پیربال کاتێک کە لە دانیمارک و ئەڵمانیا بووە وەکو سەرپەرشتیاری بەشی ئەدەبی و وەکو پەیامنێر و ئەندامی دەستەی نووسەران لە زۆر لە گۆڤارەکانی وەک خەرمانە و نۆدەم لە ستۆکۆڵم، یەککرتن و دەروازە لە دانیمارک، هیوا لە پاریس وە هەروەها گەلێک گۆڤاری دیکەش وەکو دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکان کاری کردووە، لە ١٩٩٤ کە هاتووەتەوە کوردستان لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بەرپرسی لاپەڕە بووە، لە گۆڤاری وەرگێڕان سەرنووسەر بووە کە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری دەردەچوو.

برام کاکە ئەنوەر . گەلێ سڵاو و ڕێزم هەیە
بۆتان ، زۆر سوپاستە دەکەم بۆ ناردنی
"زایەڵە" ، پیرۆزبایت لێ دەکەم بەو بۆنەوە ،
شیعری زۆر جوان و بە پێزن ، بە ڕێگەوەش
زۆر بە دڵە سوپاست دەکەم بۆ هەڵبژاردنی ،
هیوادارم هەردەم باش و سەرکەوتوو بیت .
بۆم بنووسە برام دەردی ئەم دووریە و
تاڵیایی بە گەلێ گرانە . . . .
تا نامەیەکی تر ، دیسانا سڵاوی گەرمم هەیە ...

برات
تەرەزی ١٢-١-١٩٨٩
[illegible]
[illegible]

**من سالی داهاتوو، دکتۆراکەم تەواو دەکەم.**

نامەی فەرهاد پیربال بۆ محەممەدی مەلا کەریم

farhad pirbal

پاریس: ١٩٩٢/١/٩

Cocordia ch.١١٤٤١ r.tornefort ٧٥٠٠٥ paris

برای بەڕێز و مامۆستای خۆشەویستم

کاک محەمەدی مەلا کەریم

به هیوای خۆی و سەرفرازیتانم،

له ستۆکهۆڵم به دیالێکتی کرمانجی / لاتینی، له پاریس به زمانی فەرەنسی، خەریکی ئامادەکردنی ئەنتۆلۆژیایەکن له بارەی ئەدەبیاتی هاوچەرخی کوردی. من تەنیا بەشێکی کەمیان بۆ ئامادە دەکەم، پێویستم به هەندی سەرچاوە، هەندیک یارمەتی جەنابتان هەیە.

١- کورتەیەک له ژیانی (حسێن عارف) و (ئەحلام مەنسوور) و (لەتیف هەڵمەت) و (محەمەد موکری)، هەریەکە و وێنەیەکیان. بەڵکو لێرە تەرجەمەی فەرەنسی و کرمانجییان/ لاتینییان دەکەم و لەگەڵ بەرهەمەکانیان (له ئەنتۆلۆژیاکەدا) بڵاویان دەکەینەوە.

٢- اضمامات قزحيه من الشعر الكردى المعاصر ترجمه آزاد عبدالواحيد

٣- عشرون قصة كردية (دراسەکەی د.عزالدين)له بارەی چیرۆکی کوردی.

٤- هەرکتێبێکی تازەی باش له بارەی چیرۆکی کوردی دەرچووبێ.

من سالی داهاتوو دکتۆراکەم تەواو دەکەم. لێرە لەهەمان کاتدا خەریکی نووسین و کاری ئەدەبی دیکەشم. هەرچی داخوازییەکتان هەیە، تکایە، تکایە وێڕای دەنگوباسی خۆتان – به درێژی بۆم بنووسن. چاوەڕێم

**به چ مافیک و به گوێرەی کامە یاسا؟**

نامەی فەرهاد شاکەلی بۆ برایم ئەحمەد

Sollentuna ۱۹۸۳/٦/۱۷

برای گەورە و هێژا و خۆشەویست مامۆستا برایم،

سلاوێکی گەرم و گوڕ و برایانەت پێشکەش دەکەم و هومێدم خۆشی و سەرکەوتنتانە.

زۆر سپاس بۆ نامەکەت و ژمارە عارەبی یەکەی کۆڤاری چریکە[1]. ئەوی راستی بێت ئەگەر تۆ ئەو دانەیەت نەناردایە من هەرگیز لێرە چاوم پێ نە دەکەوت.. پاشتر دیمەوە سەر ئەم باسە..!!

ئێمە بە گشتی باشین و لەسەر کار و فرمان و خەباتی خۆمان بەردەوامین. لەم ولاتە ماوەی ئەوە هەیە پیاو ناوی گەل و ولاتەکەی خۆی بە گوێ ی خەلکی ئاشنا بکات. خەلکیش کوردیان خۆش دەوێت. بەلام باوەڕم پێ بکە ئەوەی کە گوێ لە کاری باش دەگریت و دەبنە هۆی ناوزراندنی کوردەکە، هێندێ لە وانەن کە خۆیان بە سیاسی و نوێنەر و دەمڕاست و پێشڕەوی میللەت دەزانن.

لە دوای ئەو کۆرە ئەدەبی یەی لە نامەی پێشومدا بۆم نووسیووی، لە سێ کۆڤار و دوو ئەنتۆلۆژی ی سوێدیدا چەند هۆنراوە و باس و لێکۆلینەوەم بلاوکراوەتەوە. یەکێ لە ئەنتۆلۆژی نیزیکەی ۷۰۰-۸۰۰ کەسێ بەرهەمی خۆیانیان بۆ ناردبوو، لە نێوان هەموویاندا ۱۷ کەس هەلبژێردرا، شازدە سویدی

---

[1] چریکە، گۆڤاریکی ڕۆشنبیریی گشتیی سەربەخۆیە. هەموو ژمارەکانی چریکە لە دوو بەرگ دا کۆکراونەتەوە بڕوانە:
کۆبەندی ژمارەکانی گۆڤاری چریکەی کوردتان، گۆڤارێکی ڕۆشنبیری ی گشتی یە، بەرگی یەکەم و بەرگی دووە، لەسەر ئەرکی یەکێتی نوسەرانی کورد /لقی سلیمانی/ لە چاپ دراوەتەوە، ۲۰۱۱.

و یەک کورد کۆڤاری (mosaic ٨٠) سێ هۆنراوەیان بڵاوکردمەو و داوایان لێ کردم پێشەکی یەکیش بنووسم، منیش شتێکم بە ئینگلیزی بۆ نووسین، لەگەڵ ئەم نامەیەدا تێکستە ئیگلیزی یەکە و وەرگێڕانە سوێدی یەکەی و هۆنراوەکانت بۆ دەنێرم. هەروەها وام نیازە سەرەتای مانگی داهاتوو، لە زانستگەی ستۆکهۆلم سیمیناریک لەسەر زمانی کوردی رێک بخەم. داواتان کردبوو باسیکی ئەو کۆڕ و چالاکی یانە بنووسم، لەگەڵ ئەم نامەیەدا نموونەییکی ئەو بلاڤۆکەی بۆ راگەیاندنی کۆرەکە بلاوکرابووەوە، دەنێرم. بەلام ئەگەر دەزانی بەکەڵکی چریکە دێت، ئەوا دەتوانم هەر باسیکی درێژ و ریپۆرتاژ- ئاسایی لەسەر هەل و مەرجی کورد لە سوێد- بە تایبەتی باری فەرهەنگی- ئامادە بکەم و بۆتانی بنێرم. شتیکی لەو بابەتەم بۆ برادەرانی ئەمریکا ناردبو، کۆلێکیان پێ خۆش بوو.

کاکە گیان: ئەوەی راستی بێت ئەو یەک دووجارە یەکبینینەی هاوینم گەلیک پی خۆش بوو، چوونکو، بە داخەوە، لەم ئەورووپا کاول بووە، کەسیکت بەرچاوناکەوێ، بوێرێ خۆی لە قەرەی باسکردن و لێکۆڵینەوەی بیر بدات، ئەو باسە گرنگانەی کە پێوەندی یان بە ژیان و رابردوو و داهاتووی ولاتەوە هەیە، هەموو خۆمانی لێ دەدزینەوە، ناوێرین شان بدەینە بەری.

لە مێژووی نەتەوەییک و ولاتێکدا گەلی جاری وا هەیە کە بیروباوەری چەوت دەبێ بە باو. گەلێ جار خەڵکی دوای لێشاو دەکەون. من وادەزانم ئەرکی رووناکبیر (یان بیر رووناک)ی بە جەرگ و دڵسۆز ئەوەیە، لەو سەردەمانەدا بلێ: نەء..

بوێرێ و بلێ: براینە ئێوە چەوتن. ئەمە قسەیەکی ژان پۆل سارتەری فەیلەسووفم وەبیردینیتەوە کە وتبووی ئەو نووسەرەی ناوێرێ لە کاتی پێویست دا قسەی هەق بکات. زۆر چاکترە پێنووسەکەی خۆی بشکێنێ.

کاتی خۆی چینییەکان باوەڕیکیان هەبوو کە من زۆرم بە دڵ بوو. دەیانگوت جاری وا هەیە هەموو پارتی خەتێکی چەوت هەڵدەبژێرێ و ملی رێگەی ناراست

دەگرێ، بەلام تاکە کەس و ئەندامی دلسۆژ، ئەگەر وایان بیرنەکردەوە و خۆیان بە ڕاستزانی، دەبێ هەر لە سەر بیروباوەڕی خۆیان سوور بن، ئەگەر هەزار جاریش تووشی چەرمەسەری هاتوون. لەوەیە چینی یەکان ئەم قسانەیان بەهۆی وردە حیساباتی نێو خۆیانەوە کردبێ، بەڵام وەکو پرینسیپێک من زۆرم بە دڵە و بە چاکی دەزانم و بۆ خۆیشم لە ژیاندا ئاوام.

من لەو باوەڕەدام ئەمڕۆ لە ژیانی نەتەوەی کورددا گەلێ شتی سەیر و سەمەرە روو دەدات. گەلێ پەتا بڵاوبۆتەوە. خەڵکی دوای لێشاوی سەیر کەوتووون. لەم رۆژگارەدا ئەرکی ئیمە مانان، ئەرکی رووناکبیری کورد، ئەگەر بە راستی دڵسۆژی نەتەوە و قسەی راستی بکات، بلی نەء، ئەگەر شیری سوڵتان (یان سوڵتانەکان) سەریشی پەڕاندووە.

یەکێ لەو دەرد و پەتایانەی بڵاوبۆتەوە، نەبوونی دیموکراسی یە، گاڵتەکردنە و سووک تێڕوانینی بیروباوەڕی جیاوازە. لە کوردستانی ئێمە دا، ئێمە لە هەموو کەسێ پرتر پێویستمان بەوەیە لەم باسە بگەین، تەنانەت ئەگەر ئەو پێودانەش وەرگرین کە دەڵێ هەرکێ گرەوی بردەوە و سەرکەوت، ئەو لەسەر هەقە و راستی بەلای ئەوەوەیە، تەنانەت بەو پێ یەش بێ هیچ بیروباوەڕیک هەقی سەربەرزکردنەوەو لە خۆبایی بوونی نی یە؛ چونکوو هەتا تووشی بەدبەختی و چارەڕەشی ی کردووین هەر دووژمنانن. کامە بیروباوەڕو کامە ڕێباز پیشانی داوین کە لەوی دیکە دڵسۆژتر و چاکتر و راستترە؟ بە چ مافیک و بە گوێرەی کامە یاسا، بیروباوەڕێک خۆی دەکاتە کوێخا و دەمراست و خەتێکی راست و چەپ بەسەر هەموو ئەوانی دیکەدا دێنێ؟

ئەگەر نوسەریکی کورد، یا روناکبیرێکی کورد، کە خۆیان بە دڵسۆژی نەتەوە و وڵاتەکەی خۆیان دەزانن، ئەگەر ئەمڕۆ پێ بە جەرگی خۆیاندا نەنێن و رازی دڵی خۆیان نەڵێن، گوایە دەبێ لیرەی سپی یان بۆ کامە رۆژی لەمە رەشتر هەڵگرتبێ؟! ئەگەر نەتوانن وشەی راستی بنووسن، چما زۆر سەربەزی تر نی یە پێنوسەکانیان بشکێنن و ببنە یەکێ لەو هەزاران –بگرە ملیۆنان– کەسەی

تووتی ئاسایی، هەرچی رادیۆی دەوڵەت وتی و رۆژنامەی ئۆرگانی دەوڵەت -یا هێزی کاربەدەست- نووسی، هەر ئەوە دەڵێنەوە...؟!

کۆڤاریکی فەرهەنگی کوردی، بە باوەڕی من، ئەگەر بیەوێ بە راستی ببێتە سەکۆیەک بۆ خزمەتی نەتەوە و وڵات دەبی خۆی لەو سەدان ئۆرگانی پارتی یانە هەلاێرێ و جیا بکاتەوەو ببیتە سەکۆ بۆ پێنووسی کەسک و سۆر و زەرد و شین.

من وادەزانم هۆیەکی گەلێ نووسەری کورد (بە خۆیشمەوە) لە (چریکە) سڵ دەکەن، ئەوەیە کۆڤارەکە بەسەکۆی ڕێبازیک و بیروڕایەکی یەک لایەنە دەزانن و یەک مۆری پیوە دەبینن.

من لە ماوەی ئەو چەند دانیشتن و گفتگۆیانەماندا، چ لە ماڵی کاکە حەمە و چ لای وەهبی بەگ و چ لە باخچەکەی نیزیکی soas یش، وام بۆ دەرکەوت کە تۆ لە باخچەکەی پێت خۆش نی یە کەس لە تۆ و لە کۆڤارەکەش بکات. بەلام خۆ تۆ پیت ناکرێ لەگەڵ هەموو کەسێکدا چوار جار و پینج جار دابنیشی و بکەویتە گفت و گۆ، تا ئەو خەڵکە چەوت لە تۆ نەگەن. ئەوجا هیڤدارم هەر نەبێ لەسەر لاپەڕەکانی چریکە وابکەیت.

دەزانی سەیر ئەوەیە خەڵکی دیکە، نووسەرو رۆژنامەوانی گەلانی دیکە لە خۆمان چاکتر بیر لە دۆزی گەلەکەمان دەکەنەوە.. ئەوان مەسەلەکە بە هەموو بارێکدا لێک دەدەنەوە و دەدەن لە بنی هەمانەکە، کەچی ئیمە خۆمان دەدزینەوە. سیاسی خۆ بە پێشرەوزانەکانی کورد دەیانەوێ نووسەر و روناکبیری کورد ببنە مەیموون و خۆشیان مەیموونەوان بن. چۆنیان ویست رووناکبیران ئاوا هەڵپەڕێنن و پیشانی خەڵکیان بدەن. ئەوان بۆ ئەوەی ئەمەیان بۆ بچیتە سەر کوڵێ قسەی زریق و باقیش دەدۆزنەوە و نێوی تیۆری ی لی دەنێن. بەلام رووناکبیری کورد دەبێ بڵێ: نەء.. دەبێ بڵێ قوربان تۆ لە من دڵسۆزتر نیت بۆ گەل و وڵات، ئیدی بۆچی دەبێ تۆ ریگە بە من نیشان بدەیت؟! دەبێ، وەکوو

ئەحمەدی خانی ی نەمر بن، پەنجە بکەن بە چاوی میری جەزیرە دا و سەر بۆ هیچ هێزێک دانەنەوێنن.

رەنگە پیاو بتوانێ پوختە و کاکڵی ئەم قسانەی کردمن لە ژێر سەردێڕێکی ئاوادا کۆ بکاتەوە: رێگە و شتێکی لەو بابەتە. من خۆم پێم خۆشە لەسەر باسێکی ئاوا بە درێژا[درێژی] بنووسم. پێشتریش هێندێ شتم لەمەڕ ئازادی ی نووسیون و تا ئێستاش بڵاوم نەکردوونەوە. ئەگەر دەزانی لە چریکە دا جێگەی بیری ئاوا دەبیتەوە، پێم خۆشە، جارێ وەکوو سەرەتایەک، ئەم نامەیەم هەروەکوو خۆی، لاپەڕەی یەکەمی لێ دەرچێت، بڵاوبکەیتەوە و دەتوانم نووسراوی دیکەش ئامادە بکەم[1]. هەروەها حەزدەکەم ئەو پێشەکی یەی بە ئینگلیزی نووسیبووم" to be a kerd " –ئەگەر خۆتان بیکەنە کوردی– لەگەڵ "دەردەسەری"یەکەو هۆنراوەی (سەردەمی رۆژ بەڕێوەیە)دا کە لە لاپەڕە (٢٣)ی ئەو کۆڤاری "hnvandraren..."ەدا کە بۆم ناردوون بڵاوکراوەتەوە، هەموو پێکەوە بڵاوبکەیتەوە.

نووسیبووتان "رۆژ باش ئەبێ ئەگەر جارجارە، شیعر، نووسین، رەخنەیەکی خۆتم بۆ بنێریت..."، بەڵام باوەڕم پێ بکە، ئەم ژمارە عارەبی یەی لێ دەربچێت کە خۆت بۆت ناردبووم، دوا ژمارەی چریکە کە من چاوم پێ کەوتبێ ژمارەیەکی دیکەی عارەبی بوو کە وابزانم ساڵی پار بڵاوتان کردبووەوە.

ببورە کە رەنگە درێژدادڕیم کردبێ و سەرم ئێشاندبن، بەڵام ئەگەر ئێمە لەگەڵ یەکدی ئەم باسانە نەکەینەوە، دەبێ چاوەڕێ ی کێ بین گوێمان لێ بگرن؟!

زینەت سڵاوتان لێ دەکات و رێزی زۆری بۆتان هەیە.

---

[1] ئەم نامەیە لە و شوێنەوەی دەڵێت: " لە مێژووی نەتەوەیێک و وڵاتێکدا گەلێ جاری وا هەیە" لە ژمارە (٦)ی چریکە دا بە ناونیشانی(ئەرکی نووسەر و رووناکبیری کورد) لە کۆشەی چریکەی سەربەستی دا بلاو کراوەتەوە. لە ژمارە (٧) چریکە دا و لە هەمان گۆشەدا لە ژێر ناوی مارف دا سەرنجی خۆی ب شێوەیەکی رەخنەئامێز لە بارەی ئەم نووسینەوە دەخاتەڕوو. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

هەر بژین بە شادی، هیوام خۆشی و

سەربەرزیتانە.

براتان

فەرهاد شاکەلی

سەرنج: دوو نووسینم لای (کاک شەفیق)ن، لەسەر زمانی کوردی نووسیومن، حەزدەکەم ئێوەش چاوتان پێ یان بکەوێ و بیانخوێننەوە.

---

بەرگی دووەمی چریکەی کوردستان، ساڵی ٢٠١١ یەکێتی نووسەرانی کورد.

**هاوپەیڤینەکەی وانتم، دەگەڵ شاملوو خوێندەوە!**

نامەی فەرهاد شاکەلی بۆ بەرۆژ ئاکرەیی

برام کاک بەڕۆژ ١٩٩٣/١٠/٣

سەلاوی گەرمی برایانە

هەر کە دیوانەکەتت نارد، بۆی دانیشتم و خوێندمەوە. هەر زووش تەلەفۆنم هەڵگرت قسەت لەگەڵ بکەم، ئێستاو ئێستاش تۆم دەست نەکەوتی. ئەوە بۆ؟!

ئەگەر لە بیرت بێ کاتی خۆی، کە تازە هاتبووی، داوای دیوانە بە کوردی کراوەکەی شاملووت لێ کردبووم، منیش بە پۆستەدا بۆم ڕەوانەکردی، کەچی بۆم گەڕایەوە، چونکە دەبێ ناونشانەکەی دابووتمی، تەواو نەبووبێ. بە هەرحاڵ پاشان کە ئەوەم بۆت گێڕایەوە، وا پێ دەچوو باوەڕت پێم نەکردبێ. لەم ڕۆژانەدا هەر بەڕێکەوت پاکەتی ئەو نامەیەم دۆزییەوە کە لە ڕۆژی ١٩٩١/١/٢ دا گەیاندوویانەوە بۆ ئەدرێسەکەی خۆم. وامیش وەک دیارییەک و یادگارێک بۆتی ڕەوانە دەکەم.

هاوپەیڤینەکەی وان-تم دەگەڵ شاملوو خوێندەوە، وەک هەموو جارێ جوانت ئەنجام داوە، دەست و قەڵەمت نەڕزێ. سوپاس کە دیوانەکەت ناردبوو. شتەکانی دیکە بابمێنن تا خۆت لە پڕ پەیدا دەبێ.

هەر بژیت.

برات فەرهاد (شاکەلی)

**هەموومان قەرزاری تۆین.**

نامەی فەرهاد شاکەلی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

خۆشەویست و هێژا کاکە حەمە ١٩٩٩/١/١٤

سەلاو و ڕێزی زۆر و زەبەندی خۆم و زینەت بۆ خۆت و خانمەکەت، چاوی (چاوانی) بیارە و ژیوار و پیران ماچ دەکەین.

حەوتەیەک لەمەوبەر پاکەتیکی دەکیلۆیی کتێب و گۆڤارم بە ناونیشانی شازادە خوسرەودا ڕەوانەکرد و بەشێکی باشی بۆ تۆ بوو. هەر دووسێ ڕۆژێ دواتر کارتەکەت گەیشت. بەڕاستی پێم ناخۆشە کە ئەنجامی کارەکە ئاوابێ و بەو جۆرە بۆنی ناخۆشی و دڵئێشانی لێ بێت. بە داخەوە لە هەموو لایەک پێوەندی ڕوناکبیران (بەتایبەتی کورد) بەو شێوەیەیە؛ کەس کەسی دیکە ناخوێنێتەوە. خۆزگە هەر لە سەرەتاوە من داوای هیچم نەکردایە. چش لەوەی جیهانی عەرەب، لەم کەنارەوە بۆ ئەو کەنار، من بناسێ، یا نەناسێ!! بە هەرحاڵ من ئەو چاکەیەی تۆم هەر لە بەرچاوە و خوا یار بێ پاداشی دەدەمەوە. من پێم خۆش نییە بەرەوڕوو (ئەگەرچی بە نامەش بێ) مەدح و پەسنی کەس بکەم، بەڵام ئێمەی (ئەوروپانشین) هەموومان قەرزاری تۆین کە ئەوە ١٦- ١٧ ساڵە سەرومڕ گۆڤار کتێبمان بۆ ڕەوانە دەکەیت.

زۆرم پێ ناخۆشە کە تەندرووستیت ئاوایە. خۆ فەریاد دەیگوت هەموو شتم بۆی تەرتیب کردووە، ئیدی بۆ ناوی خوای لێ ناهێنێ، سەرێ بدەیت. بەڵام دکتۆرعەزیز دەیگوت کاکە حەمە خەتای خۆیەتی، نازانێ بخوا و نازانێ بخەوێ و ئەنجامەکەی ئەوەیە نەخۆش دەکەوێ. دیارە هێشتا بەخزمەتم نەگەشتووە، بەڵام بەتەلەفۆن بە سەعاتان قسە دەکات، بەینی خۆمان بێ زۆر ئەقڵم نایگرێ، یا بە قەولی ئەولا، ڕام لێ نییە!

هەموو جارێ کۆمەڵێ پرسیار سەبارەت تەریقەتی نەقشبەندی بە مێشکمدا ڕادەبوورن و دەڵێم بۆ کاکە حەمەی دەنووسم لە بابە گەورە پرسیار بکات،

کەچی کە دێمە سەر نامە نووسین هیچم لەبیر نییە. دەستی ماچ دەکەم. نازانم حەواسی ئەوەی هەیە پرسیاری لەو بابەتە وەرام بداتەوە؟!

هەندێ لە کتێبەکانی ناو پاکەتەکە ناوی (مامۆستا مەلا ئیسماعیل)م لەسەر نووسیون، دیارە مەبەستم مەلا سمایلی لەمەڕ خۆمانە (یەکەم مامۆستام)، هیوادارم خوسرەو بەگ بزانێ مەبەستم ئەوە.

پێش سەری ساڵ، بە خاو و خێزانەوە چووبووینە لەندەن. لەگەڵ کاک صەباحی غالیبدا یادی خێری تۆمان دەکرد. شەوێک لای مام هەردی بووین، زۆر نەخۆش بوو. هەروەها هاواریش نەخۆش بوو.

سڵاو لە هەموو دۆست و ئاشنایانی ئەو کەوشەنە.

هەر بژین بۆ براتان فەرهاد

**کوردی پاکستانیش، جموجولێکی کەمیان هەیە.**

نامەی فەرهاد شاکەلی بۆ محەممەدی مەلا کەریم

Sollentuma ١٩٩٢/٦/٢٦

برای هێژاو خۆشەویستم کاکە حەمە،

سڵاوی گەرم و گوڕی برایانەم، هیوام خۆشی و سەربەرز یتانە. سڵاو و ڕێزم بۆ شیرین خان و چاوی بیارە ماچ دەکەین. زینەت سڵاوتان لێ دەکات و منداڵەکانیش

(زەریا و زریان و یار) دەستتان ماچ دەکەن.

برا: ئەم نامەیەتان بە دەستی بۆ دەنێرم بۆیە (بەقەولی سوێدییان) ئازادی بە خۆم دەدەم، زیاتر و ڕونتر شت بڵێم. من ماوەی ٨-٩ مانگی ڕابردوو لە لەندەن دەژیام و دووجار بە سەردان، بۆ ماوەی کورت، هاتبومەوە. بەڵام ماڵ و منال هەر لێرە بوون.

من کە لێرە چووم بۆ لەندەن نامەیەکم بۆت نوسی

و قەولمان وا بوو زینەتیش لە سویدەوە جلەکانتان بۆ پۆست بکات، کەچی بەم دواییە نامەکەی تۆ هات و نوسیبووت هەر چاوەڕێی جلی. ئەوجا مەسەلەکەم بیر کەوتەوە. کە لەگەڵ زینەت باسم کرد وتی هەر کاتی خۆی دایەرەی پۆست قبوڵیان نەکردووە بینێرم، چونکە بۆ عێراق تەنیا دەکرێ نامە رەوانە بکرێ و بەس. بە هەر حاڵ وا ئێستا بەدەستی لەگەڵ کاک حەمە سەعیددا بۆتانی دەنێرم، بەو هیوایەی بەکەڵکتان بێت و مەسەلەی گەورەیی و بچوکی نەبێتە گرفت. پار هاوین هاتمە کوردستان و نێزیکەی دوو هەفتەیەکی لێ بووم. لە سنەوە نامەیەکم بۆت رەوانە کرد نازانم گەیشت یا نە؟! وا دیارە بەهۆی ئەم وەزعەی ئەمڕۆوە تۆش ناتوانی گۆڤارو کتێب و چاپەمەنی ڕەوانە بکەی بۆمان. خۆمان جارو بار لە ڕێگەی کوردستانەوە شتمان پێ دەگات.

گۆڤاری مامۆستای کورد هەر بەردەوامەو دوا ژمارەی، کە ژمارە چواردەیە، پێش مانگێک بڵاو بۆوە. ئەگەرچی ئەرکی زۆرەو زۆریشی پێوە ماندو دەبم، بەڵام پێم وایە گۆڤارەکە لەناو خوێنەران و ڕوناکبیرانی کورددا جێگەی خۆی کردۆتەوە. دڵێکیشم بەوە خۆشە کە دەگاتەوە کوردستان و هەندێ کەس (ئەگەرچی زۆریش نین) چاویان پێ دەکەوێ. ئەگەر ڕێک بکەوێ لە هەلێکا ژمارە تازەکانی کە نیتن دەنێرم بۆت.

ئەوە ماوەی پێنج-شەش ساڵە لە زانستگەی ئوپسالا، ئەنیستوتی زمانانی ئاسیا ئەفریقا کاردەکەم و دەرزی کوردی دەڵێمەوە بەشە کوردییەکەی زۆر لە پێشکەوتندایە و قوتابیمان هەن، زۆربەیان سویدین و هەر ساڵی یەکەم کوردییەکی باش فێردەبن لە هەمان کاتدا، هەر باوەڕیش ناکەم، لێرە بەدواوە جیدیتر بم بەهۆی کارەکەی زانستگەوە بەشداری زۆر کۆنفرانسی زانستی لە ئەوروپا -تورکیا- ئەمریکا و کەنەدا دەکەم و بەرهەمی ئەو بەشدارییەش باش بووە. ئەنتۆلۆژییەکی شیعری کوردیم لەگەڵ هەندێ دۆستی سویدیدا، ئامادە کردبوو و پار بڵاوکرایەوە (شیعرێکی تۆیشی تێدایە). ئێستاش ئەنتۆلۆژییەکی شیعری کوردیمان ئامادە کردووە (١٧ چیرۆکنوس) و ڕەنگە هێشتا لێشی زیاد بکەین و بە هیواین ئەمساڵ یان سەرەتای ساڵی داهاتوو بڵاو ببێتەوە.

وەزعی کوردستان حەتمەن ئێوە چاکتر ئاگاتان لێیە. هێندەی پەیوەندی بە ئێمەو وەزعی دەرەوە هەیە، دەتوانم بڵێم ئەوە یەکەمجارە مەسەلەی کورد هێندە بایەخی پێ دەدرێ لە ئەوروپا و تا ڕاددەیەکیش لە ئەمریکا. لە وڵاتێکی وەک ئینگلستاندا نەک هەر لە ڕادەی ڕەسمی دەوڵەتدا بەڵکە لە ناو خەڵک و لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا کورد ناوبانگێکی یەکجار باشی هەیە، بە تایبەتیش دوای ئەم هەڵبژاردنە. ئەوەی ئێمەمانان نیگەران دەکات وەزعی هێزە سیاسیەکانی کورد خۆیەتی کەوا پێدەچێت زۆر لە خەڵکەکە وەپاش کەوتون.

لە بواری نوسین و لێکۆڵینەوەدا ئەم دوساڵەی دوایی کتێبێکی زۆر بە ئینگلیزی (و زمانی دیکەش) بڵاوبۆتەوە. سەدان لێکۆڵینەوە و وتار لەولاو لەولا دەنوسرێنەوەو بڵاودەکرێنەوە. کۆنە دۆستەکانی تۆش (ڕووسەکان) هەر وەک بە شیووعییتی دەمیان چوبووە کلیلە، ئێستاش دوای ڕزگاربونیان بە خێر و بەشەڕ باسمان ناکەن و خۆیانمان تێناگەیەنن. لەدەرەوە مەڵبەند و ئەنستیتوو و دام و دەزگای کوردی زۆرن. تەقریبەن لە هەموو وڵاتێکی ئەوروپا دوو سێ شتێک هەر هەیە. بەڵام پلەی کار و چالاکی هەمویان وەک یەک نین.

پەیوەندیم لەگەڵ ڕوناکبیران و خوێندەوارانی هەموو بەشەکانی کوردستان یەکجار بەهێزە. بە ڕێک و پێکی نامە و هات و چۆم لەگەڵ کوردستانی ئێراندا هەیە و چاپەمەنی ئەوێم بە تەواوی پێدەگات کتێبێکی زۆر لەوێش چاپ دەبن. کوردەکانی شورەوی جارانیش وەزعیان ئەمڕۆ خراپترە. ڕۆژنامەکەیان ڕاوەستاوە. ئەرمەنەکان گێچەڵیان پێ دەکەن و یەزیدی دەکەن بە گژ کورددا!!!

کوردستانی تورکیا (خەزوورانم) ئێستا وەزعیان باشە. دوو ڕۆژنامەی هەفتانە و سێ چوار گۆڤارێکیان بە کوردی هەیە. ئێستا باسی دامەزراندنی تەلەفزیۆنی سەربەخۆی کوردی دەکرێ. کتێبی کوردی زۆر چاپ دەبن و دەیان ئەنستیتوت و ناوەندی فەرهەنگییان دامەزراندووە. کوردی وریا ناڕاستەوخۆ ڕێگەیان دەدەن کتێب و گۆڤار بڵاوبکەنەوە. بە ڕەسمی ئاهەنگی نەورۆز دەکەن و مۆسیقا و گۆرانی کوردی ئازادە. یەک دوو ئەندامیان لە پارلەماندا هەیە بەڵام

باری کاری سیاسیان ئەو باشە نییە. کوردی پاکستانیش جموجوڵێکی کەمیان هەیە بەلام لە چوارچیوەی بەلوجستان و بزوتنەوەی بەلوجیدا زیاتر.

کتێبێکی زۆر چاک بە (ئینگلیزی و فەرەنسی) لەسەر نەقشبەندی دەرچووەو بەشێکی هەر تایبەیە بە نەقشبەندی لە کوردستاندا لە بەشێکیاندا بە درێژی باسی ئەوە دەکات کە خەلیفەکانی مەولانا خالید لە ئەندەنوسیا و مالایزیا و جاوا چەند کاریگەر بوون و ئێستاش کاریگەرن.

بە هەرحاڵ بە قەولی ژنە کوردەکە، جنگم لە هەویرە و هەر هێندەم لە بیرە. حەز دەکەم لە وەرگرتنی ئەو جلانە ئاگادارم بفەرموون دەتوانی هەر بە پۆستی عێراقدا نامەم بۆ بنوسی، کە دەگات. منیش کە دەرفەتم هەبێ (ڕێی نەوتەکە باجگری زۆرە، ڕێی خاسە بەشەو خاڵییە، دەنێرم بە بلاغا) بەقەولی شیخی سەرووەرمان، مامە شێخ ڕەزا.

حەز دەکەم لە هەواڵی دورو درێژی خۆتان ئاگادارم بکەیت. دەستی بابە گەورە ماچ دەکەم و خودا دەست بە تەمەنییەوە بگرێ. سەلاو و ڕێزم بۆ مامۆستا مەسعود محمد، مامۆستا شەکور مستەفا، دوکتۆر کەمال مەزهەر و کاک فوئادی حەمە خورشی

هەر بژین و سەربەرز بن.

براتان فەرهاد شاکەلی

**دانانی هەستیاری بەرزی کورد...**

نامەی ئەنوەر شاکەلی بۆ لەتیف هەڵمەت

بسم الله الرحمن الرحيم

براي بەنرخ كاكە شيخ لەتيف بەرزنجي بەڕێز

پێش هەمووشتێک گەرمترین سڵاوي برايانەت پێشکەش ئەکەم، سڵاوێک هەڵقولاوبێت لە دڵێکي پڕ خۆشەويستي و برايەتييەوە، هيوادارم هەموو چرکەيەک لە ژينت، بەخۆشي و بەختياري تێپەڕيت بەسەرتا.

برا گيان: هەرچەندە ڕۆژان بەسەر ئەچي و ناگەڕێتەوە، بەڵام چاکتر وايە کە هەموو کەسێک لە ئيمە، بەشێک هەڵبگريت، لەو ڕۆژانە تاکو، لە يادي نەچي ئەگەر پرپيش بێت لە ناسۆر.

جا بە پيي ئەم وتەي من زۆر بەختيارم، کە دەولەمەنێکي باشم، لەلايەن يادگارەوە، ڕەنگە بتوانم بڵێم زياتر لە نيوەي ئەو يادگارانە، ناو وە يا شێوە تۆي تيايە، وە ئێستاش لەگەڵ:

دەنگي خرمەيي داسا، کە گوڵي جواني گەنم ئەبڕێتەوە، دەرچووني هەتاو لەسەر لوتکەي کەژي (بەمۆ) وە يان ئاوا بونيا وەيا ون بوني لە ناو ڕيزە لوتکەکاني (شاکەل)، هەر تۆم لەيادە، وە هۆنراوەکانت بوونە بە سروودي خۆشي سەر زمانم!

براي بەڕێزم وابزانم ئێستا بەختياري ليتەوە نزيک بۆتەوە، وەيا بە تەواوي باوەشي پياکردووي، وە ئەيەوێ تۆش بيلاوێنيتەوە، ئەويش بەبونەوەي دوورکەوتنەوەي تارمايي، ڕەش و ترسينەري (تاقيکردنەوە)وە زۆر هيوادارم کە ئەم بەختيارييە ببێتە، بەختياري هەميشەيي بەسەرکەوتنت لەو تاقيکردنەوەيەدا، وە يان گەشتن بەو ئامانجانەي، کە هەميشە لە يادتن.

براي هەميشەييم: مرۆڤ كە تێ ئەپەڕێ بەسەر شەقامي ژينا، تووشي چەندين كەس ئەبێ، كە برايەتي و هاورييەتي وايان لێ ئەكات، كە پەيوەندييەكي بەتين و خاوێن بێت لە نيوانيياندا. منيش نازانم چۆن بوو كە دەستي كردەگار، بەبێ ئەوەي پرس بە من بكات، يەكێكي هەڵبژارد بۆ ئەوەي ببێ بە برادەرم.. برام، كە ئەويش تۆ بووي.

كاكي هەستيار، ڕۆژنامەيەكي كورديم ئەخوێندەوە، كە ئەم دير وە ئەو دێر، وە ئەم لاپەڕەو ئەو لاپەڕەم، ئەكرد كاتێ كە.. شتيك هاتە پێش چاوم، چەند دێڕيك بوو، كە واي لێكردم بە هەنگاوي گەورە گەورە، بچمە دواوە بۆ ئەوەي سەريك بكێشمە ناو باخچەي يادگارەكانمەوە، چەند دێڕێك بوو كە تيا نووسرابوو:

((بەم زوانە دەكەوێتە بازارەوە..كۆمەڵە هۆنراوەيەكي ڕەنگين، داناني هەستياري بەرزي كورد ..لەتيف شيخ مەحوود بەرزنجي))..ئاخۆ ئەم هەستيارە كێ بێ، ئەي خەلكي كوييە؟؟ ئاي ئاي ئەم هەستيارە كاك لەتيفە، بەڵێ كاك لەتيفە..خۆ من چاكي ئەناسم..برادەرمە، خێرا هەستام وە چووم بۆ پۆستەخانە، وە بە زووترين كات، برووسكەيەكي پيرۆزباييم نارد بۆ ئەم هەستيارە بەرزە، ئەو برادەرم،

بەڵێ هەموو ئەمانە ئامانجن، هيوان كە هەميشە بيريان لێ ئەكەمەوە، جانازانم، كەي.. وە چۆن ئەبێ..!

كاكە شێخ:

قوتابخانە كۆتايي هات، بەڵام نابێ برايەتي ئيمەش بە تەواوبوون كۆتايي بێت، بەڵكە پێويستە هەميشە بيپارێزين، بە جوانتريت شتي بزانين.. بە پيرۆزترين شت..

وا لێرە دا چەند ديرە هەڵبەستێكت بۆ دەنووسم، كە بەم زوە دانراوە:

ئەوەی کە پێی بەختیارم
دور لە دەردو ئازارم
تەمی پەستیو ناخۆشی
زۆر جار کە ڕوم ئەپۆشێ
ئەگۆڕێ بە پێکەنین
بە بزەی جوانو ڕەنگین
چەپکە گوڵێ ئاواتم
بۆ ئەکاتە خەڵاتم

ئامانجی خۆشیو شادی
ژینێك پڕ لە ئازادی
ڕێك دینێتە پێش چاوم
وابێت هەتاکو ماوم
هەست بکەم شادومانم
لە خۆشیم بێ گومانم
هەستی دڵو دەرونم
هیوای خاوێنو ڕونم

لەگەل شنەی شەماڵا
گوڵاڵەی جوانو ئاڵا
دەنگی شمشاڵی شوانا
ئاوازی عودەکەمانا
بۆ ئەکاتە هۆنراوە
کە جوانی لە پێش چاوە

تەنها خۆشەویستیمە
خوای جوانی پەرستیمە

براگیان: زەردەخەنە و قسە خۆشەکاني، کاکە شیخ قادر بە ڕاستي وایان لێکردم، کە زۆر بەختیار بم ، بە ناسیني ئەو لاوە.. تکایە سڵاوي برایانەمي پێ بگەیەنە..

دەستي باوکت ماچ ئەکەم، سڵاوم، بۆ "بورهان" و "ڕزگار"..

ئیتر بە یەزدانت ئەسپێرم بمێنە بۆ

برات

ئەنوەر موحەممەد شاکەلي

**مەموزینەکەی خانی کە...**

نامەی فەرهاد شاکەلی بۆ هەژار موکریانی

نامەکانی شاکەلی

Sollentuna ۱۹۹۲/٦/۲٦

بەڕێز و خۆشەویستم مام هەژار

سەلاوی گەرم و گوڕ و هومێدم خۆشی و

سەربەرزیتانە. سەلاوی زۆر و ڕێزم بۆ

پوورم و خانی و مستەفا.

بە داخەوە ئەوە ساڵی زیاترە ئاگامان

لەیەک نەماوە. من هەر یەک دوو مانگێ

دوای گەڕانەوەم لە پاریس کۆمەڵێ

کتێب و گۆڤار و شتم ناردە خزمەتتان،

بەلام بە دووری نازانم هەر نەگەشتبێ.

ئێمە بە گشتی باشین و خەریکی کار

و خوێندن و خۆخەریک کردنین.

ئەم پاییزە سەرێکی یەکێتی سۆڤیەتم

دا و چوومە ناوچەی کوردستانەکەی

ئەویش و هەموو دۆستان و خزمانم بەسەر

کردنەوە.

مەموزینەکەی خانی کە بە دەستووس لای ئەنستیتووت بەجێ هێشتبوو ئێستا لە ئامادەبووندایە. ئەوە دوو سێ مانگ لە سوێدە و تایپکردنەکەی تەواو بووە. ئەرکی ڕاستکردنەوە و (بە قەولی خۆت) هەڵگرتنەوەی هەڵە و پەڵەیان بە من سپاردووە. منیش، لەسەر وەسیەتی خۆت، بە موو لە دەستنووسەکە لام نەداوە. بەڵام ئێستا کە ئەرکەکەم بەجێ هێناوە دەمێنێتەوە سەر ئەوەی کە باری سەرنجی خۆمتان عەرز بکەم. پێشم خۆشە پێشەکی دڵنیابن لەوەی ئەوەی دەیڵێم هەمووی لە ڕووی دڵسۆزی و ڕێز و خۆشەویستییەوە دەیڵێم مەبەستم، مەبەستی بەرو دوام زمان و فەرهەنگی کوردە و هیچی تر.

- ئەوەی سەرنج داوە لە دانانی (  ) ی سەر تیپە کوردییەکاندا زۆر جار هەڵە کراوە، واتە لە جێی خۆی دانەنراوە و ئەمەش بۆتە هۆی شێواندنی ماناکان. پێم وایە دوای تایپکردن خۆت سەر لەنوێ بەسەریا نەچوویتەوە، دەنا ئەو هەموو ٧(حەوتە) بەسەزمانانە وایان بەسەر نە دەهات.
- لە نووسینەوەی تێکستە کرمانجیەکەدا ڕێنووسێکی یەکگرتوو نییە، هەر بۆ نموونە هەندێ شتی کەم باس دەکەم: تەشبیە، بەڵام تەنبیهـ کە بێگومان دووهەمیان ڕاستە، هەروەها ئاگاە و شاە، بەڵام نەهـ و گوهـ کە دیسان دووهەمەکان ڕاستن.
- لە نووسینەوەی وشە عارەبیەکاندا سیستمێکی یەکگرتوو بەرچاو ناکەون، بۆ نموونە ئەو وشانەی لەسەر وەزنی (فاعل)ن، هێندێ کە کراون بە کوردی بە دووجار نووسراون: ظاهر، باذل، کەچی فاریس و سالیف.
- لە بەکارهێنانی ڕ (ڕێی قەڵەو دا) دوو شێوە هەیە: هێندێ جار بە دوو (رر) و هێندێ جار بەیەک و هێندێ جاریش بە ڕ (ڕێی حەوت لە ژێر)؛ بۆ نموونە: زەررین،طوررە،کەچی هەرە دەر!!

- له بەکارهێنانی نێر و مێ کرمانچییەکاندا هێندێ جار وا بەکارهێنراوە کە لەگەڵ بنەماکانی ڕێزمانی کرمانجیدا نا گونجێ: بۆ نموونە وێ مەزاری (لاپەڕەی ٣٧١ی دەستنووسەکە).
- فۆنیمی واوی درێژ (وو=u) هیچ بەکارنەهێنراوە، ئەمەش بۆتە هۆی سەرلێشێواندن، چونکە نەبوونی وو ناتەواوییەکی ئاشکرایە لە زمانی کوردیدا، جگە لەوە ئەگەر وو نەنووسرێ جیاوازی لە نێوان و: U و وو: U دا نامێنێ.
- هەر بە گشتی لە گەلێ شوێن دا وشەی لێکدراو کاری لێکدراو وشەی دیکەش بە جۆری جیاواز نووسراون، بۆ نموونە کارتێک دەر (ل٢١٠) قی بامت، سەیادت و گەلێ شتی دیکە.

کەمن پێم وایە بڵاوبوونەوەی مەم و زین بەم شێوەیەی ئێستا چەندە دڵی دەروێشانی خانی و ڕێبازەکەی و دۆستانی هەژار خۆش دەکات، دوو هێندەش دڵی ناحەزانی بیری خانی و ناخۆشەویستانی هەژار خۆش دەکات، چونکە بە دیتنی کیماسی و هەڵەوپەڵە و ناتەواوی ڕێگەیان بۆ واز دەبێ و گرێی زمانیان دەکرێتەوە.

هیوادارم بە زووترین کات وەرامم بۆ بنووسنەوە و ڕێنوێنی خۆتان لەو ڕووەوە بنووسن.

جاریکی دیکەش ڕیز و دڵسۆزیم و هەر بژین و

خودا دەست بە تەمەنتانەوە بگرێ.

دڵسۆزتان

فەرهاد شاکەلی

**پێویستمان بە کاکڵ هەیە، نەک توێکڵ!**

نامەی کاکەی فەلاح بۆ عیزەدین مستەفا

برای خۆشەویست کاک عیزەدین

ڕۆژباش

بەگەرمی هەواڵت ئەپرسم و هیوام خۆشیتە، کاغەز و پارەکەم پێگەیشت، زۆر سووپاس بۆ هەستی برایانەت.

وا بەکاک ئەمین دا چوار وێنەی پیرمێردم بۆ ناردی وەک نۆبەرەیەک، خوا یار بێ لەمەولا هەرچی وێنە و دەستنووسێکی شاعیران و یادگارییەکانیانم دەست بکەوێ بۆت ئەنێرم، بۆ بەرنامە ڕەنگینەکەت. هیوام زۆر تەواو سەرکەوتو بیت.

بە دکتۆر نەسرین[فەخری] دا نامەیەم و لیستەیەکمان بە ناوی هەرسیکمانەوە هەردی و کامەران و من نارد بۆ کاک جەمال بابان وەک پێشنیاریک دەربارەی ئەو کەسانەی لە سلیمانی دا شایانی ئەوەن، کە ببنە ئەندام لە یەکێتی نووسەرانی کورد بۆ ئەوەی لە هەرچوار لاوە دەرگا نەخریتە سەرپشت بۆ وەرگرتنی ئەندام لەسەر حسابی ئەندازە و ڕادەی هیچ نەبێ مام ناوەندی ئەدەبی کورد. بەتایبەتی لە شارێکی وەک سلێمانی دا، کە خۆتان ئەزانن لقیکی گەورە و گرنگی یەکییەتیەکەیە و ئەبێ ئەتوانێ دەورێکی تەواو دیاریکراو بگێڕی، یەکجار لەم ڕۆژەدا کە زۆر پێویستمان بە کاکڵ هەیە نەک توێکڵ.

سەلامی گەرم و هەواڵ پرسینمان بۆ کاک ئیحسان و کاک مەعروف و هەموو خوشک و برایانی یەکێتی.

بەراستی لەبەر ئەوەی تەسوییەی پارەکەمان نەکردووە لە خەزێنە، چاوەڕوانی هیمەتی ئێوەین.

برات کاکەی فەلاح

**ئادریسەکەت هات...**

نامەی کەریمی حیسامی بۆ عەبدوڵڵا پەشێو

شاعیری بەراستی و پەشیوی خۆشەویست

رۆژ باش

سلاوی گەرم و برایانەم بۆ هەمووتان.

ئیستا بۆت دەرکەوت کە هەر تونی وادە و وەلامەکان بە سال بخەیە پشت گوێ و کەس بە پیاو نەزانی.

بەلی، ئادریسەکەت هات و رابوون کە رۆژ نامەکە نیرم. کاکە ئەم مالەم پشکنی رۆژ نامە نەماوە.

من دوای خویندنەوە هیندیکییان فرێدەدەم. ئەویش وەبەر ئەم (تصفی) کەوتبوو.

چبکەم و چۆن پەیدای کەمەوە و چون لە ژیر ئەم بارە قورسە پشت راست کەمەوە.

خوای تەعالا ئەوە نیزیکەی چەند مانگە برادەریکی بۆ دیتوومەوە بە زەحمەت دەتوانی ناوی پەشیو بە راستی بینی. بەلام حەزی لە خویندنەوەیە و راست نیوە رۆیان لە کاتی خەودا تەلەفۆن دەکات و قازانجیشی هەر ئەوەندەی کە خەوەکەم دەڕوات.

تەلەفۆنم لیکرد و گوتم کاکە ئەم ژمارەیەم گەرکە کە لەسەر شیعری پەشیوی نووسیوە.

دوینی چومە پوست و دیتم پاکەتیکی تیدایە کە کردمەوە رۆژنامە و چەند دیری برادەر شادین کردم منیش وا ئەم رۆ هاویشتمە پۆست و هیوادارم بگات و بحەسیمەوە. ئیتر خۆشیت و هەمیشە سەلامەت و لە خوشی دا بی.

برات کەریم
١٩/٤/٢٠٠١

**بەغدا بوو بە شاری نامۆیی و غەم.**

نامەی کەمال میراودەلی بۆ ڕەفیق سابیر

ڕەفیق گیان.

ئەوی دەبوو ببێ بوو.. بە جێمان دێڵی.. کەلێنێکی گەورەمان تێ بوو.. ساڵێک و کێ دەزانێ؟! بەغدا بوو بە شاری نامۆیی و غەم.. هەست دەکەم بەشێک لە ژیان و بونم جیادەبێتەوە..لەگەڵ ئەوەشا شادم بەوەی کە تۆ شاد دەبی.. کە تۆ زیاتر وەکو ڕەفیق درووست دەبی. هیوام بە ڕەوشت و ڕەفتار و باوەڕت زۆرە.. ئەوەندەت لەبیر بێ کە تۆ (....) یێکت بە هەموو مانای وشە بەجێ هێشتووە. چاوەڕێت دەبین.

ڕەفیق. پێویست ناکا بڵێم چۆن بیرت لێ دەکەمەوە. تەنها ئەوەندە دەڵێم هەر وەختێک لەگەڵ تۆ بووبم وام هەست کردوە کە هەر لەگەڵ خۆمم و لە خۆم جیانەبوومەوە، واتە بچووکترین هەستێکم بە نامۆیی نەکردووە.. بۆیە ئێستا هەقمە کە بە قوڕڵی ئەم هەستە لە ناخما بهاروژێ..

بە داخەوە کۆنگرەش بێ دیداری تۆ – بۆشاییەکی گەورەی تێکەوت بە تایبەت بە نیسبەت خۆمانەوە.. بەهەرحاڵ هیوام زۆرە کە تاقیکردنەوەیەکی گەورەت لەبەردەمە. تۆش هەمیشە ئەو تواناو لیهاتوویی یەت هەیە کە ئەوپەڕی کەڵک لە تاقیکردنەوەکان وەربگری. بە تایبەتی بە نیسبەت شیعرەوە... هەر بە گەیشتنت بە ناونیشانی –سانەوی ئەزمرِ ئاگادارم بکە. هەر بەرهەمێکی نوێ ی هەت بوو دەبی دەسبەجێ بۆمی بنێری.. هەرکاتێ چاپکردنی شیعرەکانت بە چاک زانی – پێش هاتنەوەی خۆت- ئەوا وەڵامم بۆ بنێرە تا ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆی خۆم، بۆ مەسەلەکانی تریش پێویست ناکا بڵێم! دڵنیابە لە خۆت زیاتر بە تەنگ بە جێگەیاندنی هەر ئیشێکتەوە دەبم کە نامەت بۆ (.....) نووسی ئەوا یەکسەر بەهۆی منەوە بینووسە. ئەمڕۆ کاک فؤاد-م بینی- میدالیەکەم دایە. زۆر سوپاسی دەکردی..

کاکە، بە ڕاستی باوەڕم نەدەکرد کە هەروا زوو بڕۆی و مەسەلەکە هەموو ببیتە ڕاستی. بەڵام ئێستا تەواو هەست دەکەم ببورە کە نەهاتم تا ئەو لە حزاتە قورسانەی جیابوونەوە بینم، مادام هەر دەڕۆی چار نیە، هیوادارم ئەم چەند وشەی ڕووی بەڕێکردنی تۆیان هەبێ.

ئەوا کاغەزێکیشم بۆ نووسیت بۆ فرانسیس[1]، تکایە عینوانێکی ئەوم لای کاک (جزا) بۆ بەجێ بهێڵە.

کاکە؛ هەر کە گەیشتیتە (صوفیا) ناونیشانی یەکەم رستورانت یان گازینۆ-مان بۆ بنووسە کە یەکەم جار بۆی دەچی، ئیدی کە هاتین دەتبینینەوە، چونکە ئەو کوردە هەر ئەوەتا بە شوێنیکی فێر بوو.

بە هیوای سەرکەوتن و دیدار

کەمال

سەعات ١٠/٤٥ شەوی ٩٧٨/٩/٧

---

١ فرانسیس: کچە ڕۆژنامەنووسێکی بریتانییە، دۆستی کوردە و هاوڕێی ڕەفیق سابیر بوو. ئێستا لە لەندەن دەژی.

**ئای لەو غەدرە!**

نامەی کەمال میراودەلی بۆ ڕەفیق سابیر

ڕەفیق گیان:

تۆ -بەتەنها- نەڕۆیشتی..تۆ خۆشی بەغدای ئێمەشت لەگەڵ خوتدا برد، .. ئێستا کە بە شەقامەکانیدا دەڕۆم هەمیشە سێبەرێکم لە تەنیشتە، وەک سێبەری دڵم؛ بە داخەوە لەگەڵ تیشکی گڵۆبەکاندا بۆ دوور پێ هەڵدەگرێ، لێم جیا دەبێتەوە و هەناسەی ساردم بۆ بەجێ دێڵێ. بەڵام نا. گوێم لە ترپەی پێ ی هەنگاونانێتی بەسەر سەقامی ئایندەدا بۆ وڵاتێکی جوانتر دەگەڕێتەوە، وڵاتێک هەموو خەونەو، خەمی تێدا ونەو، هەمووی نیشتمانە و نیشتمان.

دوو نامەت هات، نامەیەکمان بەڕێ کرد، ئای لەو غەدرە! نازانم چی بڵێم، دەبێ مێشکمان لە کام کۆڵانی تەنگەبەردا خۆی ون کردبێ، تا تۆشی لە یاد نەمابێ؛ نازانم. بەڵام نامەکانی تۆیش دوای ٢٥ ڕۆژێک دەگەن. هەڵبەتا هەواڵی خۆشیت شادییەکی گەورەی پێوەیە.. خۆشحاڵم کە زیاتر لێرەی لەوەی لەوێ بێ. ئێستا یادی سۆفیا دەکەمەوە دیمەنەکان دێنمەوە پێش چاوم – بە بوونی تۆ لەوێ چەند جوانتر و بە دڵ ئاشناترن.

کە ئەم نامە دەنووسم بە باڵای تەزییوی پایزدا دڵۆپە بارانی سڕ، وەک پەلەی خۆکوشتنیان هەبێ، خۆیان بە شۆستەکاندا دەدەن. باخەکان زەردن و خەزانی ئەمساڵ لە چاوە بریقەدارەکاندا وێنەی خۆی نەنەخشاند. لە ژوورە دوو نەفەرییەکەودا شەو و ڕۆژ بەیەکدا دەچن و چاوەڕوانی زانی١ کازیوەیەکی تازەم ماوەیەک بوو نازانم نە دەستم قەڵەمی نەدەگرت، نە قەڵەم لە دەستما ئۆقرەی نە دەگرت. دەنووسرام و هیچم نە دەنووسی، دەسووتام و کڵپە و دوکەڵم نەبوو- چرە دووکەڵێکم لە دوور بەدی دەکرد، نەم دەزانی منم، یان خەونەکەمە.. ئێستا ماوەیەکی کەمە، کاغەزە سپیەکان لە ژێر زەبری بارانی پەنجەمدا ڕەش دەبنەوە، قوڵایی بیرم لە جەرگی کارەساتەکان گیر دەکەم و ناونیشانی خۆمیان لێ دەنووسم دەیانکەمە ڕاسپاردەی پەیامەکەم.

---

[1] "زان"ی کازیوەیەکی: واتا لەدایکبوونی کازیۆوەیەکی... لە ناوچەی قەڵادزێ و مەرگە وشەی زان فلانە ژن زا، زۆر بەکار دێت.

هەواڵی ئەدەب نەخشەیەکی تاریکە، ئاژاوەیەک لە گۆڕێیە ئەوسەری دیار نەبێ.

{ من. منم من منۆکێ – دووچاوم پێوەیە بز بزۆکی- شەل و کوێرم، کەس نابوێرم} ئەمە یاسای ڕەخنەکارییە. وشە هەموو شتێکی هەیە پەیام نەبێ- دڵشاد[ مەریوانی][1] – بێ گومان – شێرکۆ[بێکەس] – خۆشی بێ خەتا نیە. هێشتا ناتوانێ دەرەوە و ناوەوەی یەکخا. کازیوەکەی[2] دەرچووە و دانەیەکت بۆ دەنێرین. شتێکم لە بارەوە نووسیوە - گەر بڵاوی کەمەوە. (جزا)ی خۆمان شەیدا و شێتی ئەو کچۆڵانەبووە کە زمانی پییان ناگات تا بیانکرۆسێتەوە[3]. بە پێوە خەون دەبینێ. ئەندامە و لە لیژنەی (......) سلێمانی دایە. ئێمەش بە تەماین بەم زووانە گۆڤارەکەمان دەرکەینەوە. تازە ڕازی بوون. هەموو هەفتەیەک لە بەغدا، هەولێرە، سلێمانی کوڕێک هەیە.. زۆر جار ئاڵوگۆڕیان پێ دەکرێ. ئەم حەفتەیە لە سلێمانی (روشن بیری و لاوان)[4] کۆرێک بۆ گۆران دەگێرێ، ئێمەش ١٢/١٥ نیمچە میهرەجانێک سازدەکەین – لە سلیمانی- من لێکۆڵینەوەیەکی دووروودرێژم نووسیوە بە ناوی – ئافرەت و جوانی لە شیعری گۆران دا ـ لەوێدا دەیخوێنمەوە.

ئەنوەر[قادر] -یش قەلفری کرد، بەغدا چۆل بوو، لەتیف[هەڵمەت] باش و پاک و شێتۆکەیە. (حوسێن سابیر) جنێو بە هەموو لایەکا دابەش دەکا. (...) جار جار دەبینم، جوانتر و جوانتر دەبێ، هەق نیە بێ نامەی کەی. ئەزانی چەند دڵی پێ خۆش دەبێ.

ئێمە لە وشکانیدا دەژین هەر چوار دەوریشمان دەریایە! کچ زۆرە بەڵام... دەربارەی ژن هێنان زۆر دوودڵم. ئەگەر تۆ ڕایەکی تازەت هەیە بۆم بنووسە..

---

[1] ڕەنگە مەبەستی لە دڵشاد مەریوانی بێت، کە دوای گۆنگرەی نووسەرانی کورد لە هەولێر، نیوەی یەکەمی مانگی سپتەمبەری ١٩٧٨ هەندێک گرفت کەوتە نێوان نووسەرانی سلێمانی.

[2] شێرکۆ بێکەس، کازیوە/شیعری پۆستەر، چاپخانەی اسعد،١٩٨٤.

[3] کرۆستنەوە، وشەکە مانایەکی پۆزەتیڤی نییە، چونکە ئەوترێ وەک سەگ ئێسقان دەکرۆسێتەوە. بەڵام لە نێوان دۆستاندا و بۆ خوشی ئەم جۆرە وشانە بەکار دەهێندرێن.

[4] بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری سلێمانی لەو دەمەدا.

دەرگاکان هەموو دادەخرێن، کۆڕ بەتۆڕەوە بوو- نەما..

پێویستە دەنگت لێرە هەبێ.. ئەمە گرنگە سەبارەت بە لاوەکانەوە- خۆت لە شیعر دامەبڕە هێشتا لەسەر ئەو باوەڕەم نابێ چاوەڕێ ی ئیلهام کەی. هەموو ئێوارەیەک شتێ بنووسە، با بەدڵیشت نەبێ، دوایی گەورە دەبێ، پێ دەگا، گرنگ لە دایک بوونی شتەکانە- بەڵام ئەمە میتافیزیقا نایکا.

ماڵەوەتان لە تەواوی باش و خۆشی گوزەرانی دان. هەموومان چاوەڕێتین، خۆت پێ بگەیەنە... رەنگە ئێستا لە کچانی سۆفیاوە فێری درۆی زل زل بووبی!! ئەمەش هەر شیعرە. سلامم بۆ قزلجی و زۆر سلاو ریزم بۆ کاک ئەکرەم – ماڵەوەیان زۆر باشن. هاوین بێ دێین.

کەمال ١٩٧٨/١٢/٣

سلێمانی

**مەمەندئاغای فانی...**

نامەی کەمال میراودەلی بۆ عیزەدین مستەفا

گەورە و بەریز و خۆشەویستمان مامۆستا عیزەدین پێشکەشە

پێشەکی سڵاو و ڕیزم ڕادەگەیەنم، هیوادارم هەمیشە بەختەوەر و سەرکەوتوو بیت.

مامۆستا گیان: کۆمەڵیک هۆنراوەی باوکم خوالیخۆش بوو (مەمەندئاغای فانی) ئامادە کردوون بۆ چاپ، کە لەم دوو دەفتەرەدان، (کەبەهۆی کاک رەفیقەوە پێت دەگەیەنم)، بەلام هەرچەند دەکەم، وا بەستراومەتەوە کە ناتوانم، هیچیان لەگەڵدا بکەم، واتە (اجازە وەزارەتی اعلام) یان بۆ وەربگرم، وە هەوڵبدەم و بۆ یارمەتییەک بۆ لەچاپدانی.. بە ناچاری وە وەکو مامۆستایەکی من و دۆستیکی فانی -ئەو ئەرکە گەورەیەم خستە بەرتۆ.. بەتایبەتی وەرگرتنی اجازە»، وە ئەگەر ماوەشت هەبوو، حەزدەکەم سەرەتایەکی کورتی بۆ بنووسی، بەشکو بە زووترین کات بگەیەنریتە چاپ.. (وە ئەو کۆمەلە شیعرەی کە لەدەفتەرە سوورەکەدان، ایجازەیمان بۆ وەرگیراوە، بەلام پیویستی بە تازە کردنەوە هەیە... وە پێشەکییەکی کورتی مامۆستا(.......)[1]شی تیا نووسراوە، بەهۆی زیادکردنی ئەو شیعرە سیاسی... پیویستی بە پێشەکی ترە..) حەزم دەکرد، کە خۆشم بە خزمەتتان بگەم، بەلام بە داخەوە ماوەم نییە وە ماڵیشتان نازانم ئەگینا ئەهاتم بۆ ماڵتان.

دڵسۆزتان

کەمال میراودەلی

٩٧٣/٢/٢٣

**من کچی ئەو شاعیر و نوسەرە دیمەشقییەم!**

نامەی لەمیاء ئەلنابلسی بۆ شێرکۆ بێکەس

گەورەی بەرێز (شێرکۆ)

سلاوێکی گەورەیی و جوانی ..لەم چەند دێرە دا بۆت

دەخوێنمەوە.

زۆر شیعر و پەخشانم خوێندۆتەوە،

نەمدیوە هیچ شیعرێک راستگۆتر

و بەرزتر لە شیعری شاعیرانی غەریب

لە نیشتمان بن، ئەوانەی کە بە دڵتەنگی

و زۆرداری لە نیشتمانیان

دوور خراونەتەوە. زۆر بە

ڕاستگۆیی گەورەم.. فرمێسکی غەم

لە چاوانما تکا و موچوڕک بە گیانما هات

کاتێ کە قەسیدەکەتم خوێندەوە..

ئاواتەخوازبووم کە شنەبایەک بم

و هەڵتگرم و بتبەمە بۆ خاک و خۆڵت.

خەونم بینی کە مەلێک بم و بتخەمە

---

[1] ئەم بەشەی نامە دڕاوە و دیار نییە.

سەربالەکانم و بتفڕێنم بە ناو ئاسمانی

گوێژەتدا، ئاه ئەگەر هەڵچوون و داچوونی دەریایەک دەبووم و خراپەکانم ئەفڕاند و بە رەو قولایی قوڵایی زەویم دەبردن، تاکو بەلەمەکەی نوح بە کوڕە باشەکانییەوە بگەڕایەتەوە بە ئاشتی و ئازادی.

خاوەنشکۆم: من کچی ئەو شاعیر و نوسەرە دیمەشقییەم، کە چیرۆکەکانی ئازار دەگێڕنەوە و شیعریشی خۆشەویستی و شەیدایی باس دەکەن، بەلام هیچ هەستێکی گەرمم بۆ شیعر و پەخشان و قەسیدەکانی رایان نەکێشاوم وەکو ئەو هەستەی کەرایکێشام بۆ قەسیدەکەت و ئازاری دام... برینەکانتان برینمانە.. ئازارەکانتان ئیمەش دەبڕێت وەک چۆن ئیمە منداڵی یەک پارچەی گەوەری زەوین کە ئازار و خەمچەشتن کومان دەکاتەوە، دینی خوا کە هەڵمان گرتووە سەبر و هیوامانە بۆ ڕزگاربوون و گەڕانەوە.

گەورەم: وشەکانی راستگۆکان، ئەو شمشێرەن کە دەکەوێتە سەر سەری داگیرکەرەکان. خوێنی ئەوانەی لە سەیوان و لەلوبنان و لە دیمەشق و شەهیدەکانی تری نیشتمانەکانیشمان، ئەو ژیانەیە کە لە ڕێگەیەوە زەویەکانمان گوڵی ئازادی و هیوا و گەڕانەوەی ژیانێکی سەربەرزانەی پی دەردەکات و گەشە دەکات.

دەستەکان پیرۆزبن گەورەم، قەڵەمەت سەلامەت بێت کە ڕاستگۆی و هەستی ناخ دەنووسی. گوڵی هیوا هەمیشە گەشاوەیە، تا ژنان نەوەی وەک تو

لە لای منەوە

گەورەیی و ڕێز لەمیاء ئەلنابلسی

## فەنتازیایەکی سەیروسەمەرەیە!

نامەی لەمیاء کەمال ئالوسی بۆ ئەحمەد محەممەد[1]

بەڕێز مامۆستا ئەحمەد                    ڕێز و سڵاو

ببورە ماوەیەکی زۆر کتێبەکانتم دواخست، سەرقاڵی هەندێ کاروبار بووم، شت گەلێک نازانم چۆن بە جارێ کتوپڕ هاتنە ناو ژیانمەوە، وەک قەدەرێک کە دەبێت روو بدات..

دەترسام لە ڕوودانی کارێکی وا، چونکوو ئەوەی ناسیومن پێیان وتم ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکەیت، جا ئەو کاتە لە ئەدەب بکشێیتەوە زۆر نزیکە..

هەرواش دەرچوو ئەوە دوو مانگە هیچم نەنووسیوە، ئەوەشم نووسیوە ساردوسڕن و خۆشم ناوێن.

دوێنێ هەر لە ژوورەکەمدا لە دایەرە، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن دەستم بە نووسین کرد، لە خۆشیا خەریک بوو بفڕم. وا ئیتر لەوەی روودەدا ناترسم، ئەوەی نووسیومە خۆشم دەوێ و ڕیزی لێ دەگرم.

حەزم دەکرد بۆتی بخوێنمەوە، بەڵام جارێ پاکنووسیم نەکردوە، دەزانم لە کاتی پاکنووسی دا بیرۆکەی نوێی دەخەمە سەر.. فەنتازیایەکی سەیروسەمەرەیە، بۆیە دەبی پەیوەندی بە واقیعەوە هەبێ، دوای ئەوەی دەینووسم و دەینێرم بیخوێنەوە ئومێدەوارم بە دڵت بێ زۆر سوپاس دنیای "جەنگیز ئیتماتوف" ت پێ ناساندم، شتێکی نایاب بوو، بە تایبەتی سەگبەڵەکی ڕاکردووی..[2]سڵاو و ڕێزم ئومێدی بەرهەمی جوان

لمياء كمال الآلوسي                    ٨٦/١٠/٣٠

---

[1] ئەم نامەیە بە زمانی عەرەبی نووسراوە.

[2] ناونیشانی کتێبەکەی تەواو نەکردووە کە دەکاتە: سەگبەڵەکی ڕاکردووی سەر کەناری دەریا.

**بەلام وشە هی ئێمەیە.**

نامەی لەتیف هەڵمەت بۆ حەمەسەعید حەسەن

لەتیف هەڵمەت

سلێمانی ١٩٩٨/٦/١٨

برای بەڕێز و خۆشەویستم کاک حەمە سەعید حەسەن

ڕێز و سلاوی برایانەت پێشکەش دەکەم و هیوای شادیت بۆ دەخوازم

بەرهەمە چاپکراوە نوێیەکەت (شیعر و تەور)[1] گەیشتە دەستم ئومێدەوارم دەیان کتێبی دی وا بە پێز و کاریگەر بە چاپ بگەیەنی...

ئیمە هەر وشەمان بۆ ماوەتەوە و ئەو یۆتۆپیایەیکە ناومان نابوو –نیشتمان– و دوژمنان بە هەموو هێزێکیانەوە نەیانتوانی لیمان زەوت بکەن، حیزبەکان هاتن و داگیریان کرد و کردیان بە نیشتمانی خۆیان.. هەمومان لێرە و لەوێ لە تاراوگەدا دەژین، نیشتمان، نیشتمانی حیزبەکان و دەستەوتاقمی حیزبەکان.. بەلام وشە هی ئیمەیە.. وشە و ولات و نیشتمانی راستەقینەی قەلەم بە دەستانە.

جاریکی دی سوپاس بۆ کتێبەکەت کە بەدیاری بۆت ناردبووم و نامەوێ لەوە زیاتر بنووسم، نەوەک ببێ بە ئەرک لەسەر ئەو برادەرەی بە دەستی دەگەیەنێ.

---

[1] شیعر و تەور، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، سوید ١٩٩٨.

**ئەوە لۆ دەنگی نییە...لۆ..؟**

نامەی لەتیف هەڵمەت بۆ فەرید زامدار

برای زۆر ئەزیز و هاوڕێی دڵسۆزم کاک فەرید زامدار

سڵاو ڕیزی زۆر زۆرت پێشکەش دەکەم و حەزدەکەم هەمیشە شاد و کامەران بیت..

بیرت دەکەم و حەزدەکەم دیدەنییەکتان بکەم! نامە جوانەکانت دەگەن و چرای شادی لە ژووری بێژمارەی ولاتەکانی، دڵە بێ ولاتەکەمدا، هەڵدەکەن! چی ئەوەندەی وشەیەکی هاوڕێیەکی دڵسۆز و برایەکی هاوبیر گەشە، بە دەروونی غەریب و پەرەوازەبووان دەدات!

برای بەڕێزم، زۆر زۆر سەلام لە کاکی بەڕیز موحسین ئاوارە دەکەم و هەواڵی کاک مەولوود مەلول و پەرۆش و برادەرانی دی، دەپرسم.. بە سەعدولا بڵێ ئەوە لۆ دەنگی نییە...لۆ..؟ ڕەنگە ئێستە پارەی زۆر بووبێ بە کاک جەوهەریش بڵێ: لەتیف دەڵێت: تا کەنگێ پارە کۆدەکاتەوە با بێ بۆ بەغدا، زستانە لە لانگستەری بەغدا قاتیکی تازە بکڕێ.. ئاخر بار زستانی لای ئەنگۆ ساردە و من حەزناکەم شاعیرێکی کورد لە سەرماندا ڕەق بیتەوە.. خەیاڵ نەکەن قاتی هەزار بابێ بکڕن (چ جەوهەر و چ سەعدوڵلا) من هەر دەڵێم لەنگەیە..

ئێتر بژی هەموو مرۆڤیکی دڵسۆز و بتۆپێ هەموو مرۆڤێکی ساختەچی و تەڵەکەباز درۆزن.

برات لەتیف هەڵمەت

کاکە فەرید گیان ئەم پسووڵەیە بە نامە مەزانە

هەر یادکردنەوەیەکە و بەس پشت بەخوا نامەی جوانتان بۆ دەنێرم..

### هەر سێک تەلاقم کەوتبێ، بەخێربێی!

نامەی مارف ئاغایی بۆ بەرۆژ ئاکرەیی

بەرۆژی خۆشەویستم سڵاو

دەڵێن کابرایەک میوانیکی زۆر خۆشەویستی بۆ دێ، خانەخوێ میوانەکە زۆر بە خێرهاتن دەکا و ئەوەندە بە درێژی لەسەری دەڕوات، کە هیچ قسەیەکی پی نامێنێ و دەڵێ کاکەی ئەوەی پێ ناوێ، هەر سێک تەلاقم کەوتبێ بەخێربێی!

ئەمنیش ئەوەندەم نامەکەت بەخێرهاتن کردووە کە نازانم چی پێ بڵێم. بەراستی هەست دەکەم ڕۆحمان لیک نزیکە. بە هەموو گیانمەوە هەست بە نزیکایەتی قووڵ دەکەم کە دۆستایەتی ئێمەی داڕشتووە. کاتێک باسی نامۆیی دەکەی ئەمیش لێرە لەگەڵت هاودەنگ دەبم، ئەمن لێرە دۆستی خۆشەویستم یەکجار زۆرە، بەلام هەر گوڵەی بۆنی خۆی هەیە و هیچیان بۆشایی گیانی گەورەی تۆ پڕناکەنەوە. تەنیا هومێمان بەو نامە و نووسراوانەیە. با ئەوە لە بیرنەچێ کە نامەکەی تۆش زۆر لە نوشتوو و گەورەتر نەبوو، وات کوتبوو هەتا هەڵمخەڵەتێنی. چاوەڕوان دەمینمەوە هەتا تۆماری دواییم بە دەست دەگا. ئای چەندەم کەیف بەم وێنانەوە کرد کە ناردبووت. بەراستی دیارییەکی بەنرخ و قیمەتن. بڕیارەکەت لەبیرنەچێ ئەوانی دیکەشم بۆ بشۆیەوە. هەرچەند دەزانم پارەشی تێدەچێ و پارە باخەڵی تۆش جارێ (جن و بیسم الله)ن.

ئەمڕۆ کە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم بۆ من ڕۆژێکی خۆش بوو. مامۆستا مەسعود محەمەد تەشریفیان هێنابوو بۆ ئینتیشارات و دیدارێکی باش و وت و وێژێکی دوور و درێژمان لە خزمەتیدا بوو. من پاش هاتنی برایانی کوردستانی عێراق و ئاوارەبوونی نووسەران و هونەرمەندان بە تەواوی شارەکانی کوردستانی ئێراندا گەڕام و لەسەردەشت مامۆستا حەسیب قەرەداغی و کەمال ڕەئوف و لە بانە مامۆستا ئەحمەد سالار و لە سەقز دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسول و هەروەها چەندین کەسی وەک کاک سەراجی ڕۆماننوس و چەند هونەرمەندی دەنگخۆش و پەیکەرتاش و زۆر کەسی دیکەم بینی و دەگەڵ

هەرکامەیان، نزیک بە سەعات و نیویک هەتا دووسەعاتم وت و ویژکردووە، وینە و فیلمی ویدیۆیشمان لێ هەڵگرتوون. ئێستا زۆربەیان گەراونەتەوە، بەڵام دیارییەکەیان لەلای ئیمە ماوەتەوە و جارێ نازانم چۆن دەبێ، بەڵام یا بە کتێب یا لە (سروە)[1]دا بڵاویان دەکەینەوە و لە هەردوو حاڵەتدا تۆ دەیانبینی.

بابینەوە سەر باسی نامەکەت گۆیا لە وێ ژیان، دەفتەرێکی بەر ڕەشەبایە، پێم سەیرە. ئەو هەموو خەون و خەیاڵە هەمووی تراویلکەیە! لێرەوە لەبەر سوئێد کەس بە بەهەشت ڕازی نییە کەچی وەک تۆ نوسیوتە ئەوانی جەهەنەم بۆ تاوانەکەیان چکۆڵەیە دە سوئێدیان داوێن! دەزانی بە ڕۆژ گیان مەسەلەی گرینگ لە ژیان دا چی؟ ئەو مانایەیە کە مرۆڤ لە درێژایی ژیانیدا لە هەستان و دانیشتن و کۆمەڵ و سروشتی وڵاتی خۆی کرتووە. ژیان، خۆشی، دۆستایەتی و گەرم و گوری هەموو نیسبی یە. ئەتۆ کوردێکی پاک و سادقی و بە خووخدەی کوردانە گەورە بوویە و ئێستا لەیەکەم دیداردا هەر مەسەلە نیسبی یەکە ئازارت دەدا، هەموو شتێک لە وێ مانای گۆڕاوە. ئەوەی بۆ ئیمە دۆستایەتی دادەنرێ ڕەنگە لای ئەوان ئەو مانایە نەدا، بەڵام ئەو شتانە تەنیا بۆ ماوەیەک ئاڵۆزت دەکەن پاشان عادەت دەگری.

عادەت بەوەی کە زۆر بە ئاسانی دەگەڵ هەر کەسەی وەک خۆی ڕەفتار بکەی. ئەو عاتیفەیەی کە ئێستا دەتهەژێنێ بۆ ئەو شێوە هەستان و دانیشتنە دەگۆڕێ و شێوەیەکی تازە بە خۆیەوە دەگرێ و من هیوادارم ئەم دەورانەی ئێستات زوو تێپەڕ بێ و عادەت بگری. بەلای منەوە گرینگ ئەوەیە کە لە کوێ داهاتوویکی ڕووناک چاوەڕوانتە؟ وەڵامی ئەو پرسیارەش جیانییە لەو کارەی کە خۆت کردووتە، من هەر ئێستا ئەو نامەیە دەنووسم ئاسەواری پێشکەوتنیکی قووڵ لە کارە ئەدەبییەکانتدا دەبینم. دەڵێی ڕەشەبا نەیتوانیوە دەفتەرەکەت شڕودڕ بکا، بە پێچەوانەوە تۆ بەسەریدا زاڵ بوویە. من لەو شیعرانەدا کە لە

---

[1] سروە بەم تایبەتمەندییەوە بڵاودەبوویەوە:
سروە گۆڤاری فەرهەنگی ئەدەبی، ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەییوبی، اورومیە.

ئێران دەتنووسی شلپەشلپی ماسیە شیعریکی ئەوها کەمتر وەبەرچاو دەکەوت. باسی ئەو کوڵەکە بەهێزەش ناکەم، و کە قورسایی مێشک و بیری تۆی کەمتر وەبەرچاو دەکەوت. باسی ئەو کوڵەکە بەهێزەش ناکەم کە قورسایی مێشک و بیری تۆی ڕاگرتووە. شاملوو لە دەست (عەدالەت) دەبیتە ئەو کەڵە پیاوە، ئەتۆش با لە دەست غوربەت و ئاوارەیی ئەوەندە بناڵێنی، کە هەر ئاشنایی دەگەڵ ئەو ناڵە و هاوارانە بە تاڵایی تەنیایت بۆ پڕبکەنەوە، ئەمن هەر جاریک، کە شێعرێکی تازە دەنووسم بۆ چەند ڕۆژیک لەتەنیایی دوور دەکەومەوە. کێ چوزانێ؟ بەڵکوو هەل واهەڵکەوت گەڕایەوە کوردستانی ئێراق و لەوێ میوانت بووین. ئێستا کە ڕەوەتەکە بە قازانجی کوردە باچاوەڕوان بین هەتا بزانین چی لێ دێ.

نووسیبووت هەموو کەلێن و قوژبنی نامەت پشکنیوە و ناو و سڵاوێکت لە کاک ئەحمەد و جەلال تێدا نەبووە. وەڵاهی کاک ئەحمەد خەتا لە منەوە بوو، چونکە بەڕاستی سڵاوی زۆری هەبوو و هەیە و هەموو دەم حاڵت دەپرسێ و ئێستاش ڕایسپاردووم، کە لێت بپرسم، بەڵام مەسەلەی جەلال شتێکی دیکەیە. ڕەنگە زانیبیت کە جەلال ساڵیانێکی دوور و درێژ لە داوی ئیعتیاد دا بوو. کاتێک کە ئێمە چاومان پێکەوت بڕیارمان دا ئەوەی لە دەستمان دێ بیکەین هەتا ئیعتیاد بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە دنیای ئەدەبیات هەرلەو پێناوەشدابوو کە هێنامانە ئینتشارات و وەک پەڕی گوڵێ لەسەر دەستانمان ڕاگرت. ئەویش وەک پیاوان ئیعتیادی فڕێ دا وتەنانەت بەهۆی ئێمەوە دەگەڵ خێزانیشی زەماوەندی کردەوە و پاش سێ ساڵ پێک گەشتنەوە. لەو ناوەدا بە تایبەت من وەک دۆست و هاوالی نزیکی جەلال زۆری بەدەوەریدا دەهاتم و خۆشحاڵیش بووم لەوەیکە سەرکەوتووین. سەرت نەیەشینم هەتا پێنج شەش مانک بەر لە نووسینی ئەم نامەیە ببوو بەکادریکی باش بەڵام سەفەرێکی سنەی هەڵکەوت و لە گەڕانەوەی جەلال بوو بە جەلالیکی دیکە. وردە وردە ئاسەواری موعتادی لە کردەوەکانی دا دیار بوو، چەندین جار بانگمان کرد، قسەمان دەگەڵ کرد، لێی پاڕاینەوە. هەر کوتی وانیە، هەتا کار لە کار ترازا و ئیتر خۆی لەسەر لاق پێ ڕانەدەگیرا و بێ پوولی هێرشی بۆ هینا و ڕووی لە دەرگای نامەردان کرد و ئینتشارات دەری

کرد و دوومانگ بەر لە ئێستا گۆیا لە خەیابان گیراوە و ئێستا لە بەندی ٣ی زیندانی ورمێ دایە.

دەزانم تۆش پێت ناخۆش دەبێ، بەڵام چارە نییە و ئەوە چارەنووسێکە کە بۆخۆی هەڵیدەبژێرێ؟ دۆستانی دیکەش بە تایبەتی کاک پەرویز سڵاوت دەگەیەنن. ئەرێ ئەگەر سەلاحت زانی تۆش لەسەر کەسایەتی ئەو ئەدیب و شاعیرانەی کە لێیان نزیکی بۆم بنووسە، هەمیشە بۆ ناسینی شاعیر و هونەرمەندان کونجکاوم و ئەڵبەتە چاوەروان نیم هیچ کەس بێ عەیب بێ هەروەک خۆشم بێ عەیب نیم.

نووسیبووت کە بیرورام سەبارەت بە شیعرەکانت بۆ بنووسم. هەموویانم بۆخۆم تەرجەمە کردۆتەوە و داومە بە مودیریەت کە ئەگەر ئەوانیش پەسەنایان بکەن لە هەر ژمارەیی یەک دوویەکیان دەگونجێنم و پیم وایە لە شێعری (هەڵکەوت) و (دیمەن) و وێنەی هەوەڵی شیعری (دان پیانان)دا ئەوەندە بەرز فڕیوی کە تەنیا خەیاڵ دەتگاتێ. زۆر جوانن، شیعری (تەحقیق) ئەو گەورەییەی تیدا نیە. گازندەیە، بەڵام زمان و شیوە دەربرینەکەی بە بڕوای من سوست و کەم هێزە. لە وێنەی نوێ بێ بەرییە و وەک هەستەکەت لە کۆڵ خۆت کردبیتەوە وایە. لەبیرم چوو کە بڵێم (نامە)شم زۆر پێخۆشە. ئەڵبەت بەڕۆژ گیان، ئەتۆ تەنیا کەسیکی کە ئاوا خۆمانە دەگەڵی دەدویم، دەنا ئە ئێزنە بە خۆم نادەم بە شێعر بڵێم پێم خۆشەیان نا؟ شاعیر بۆ کەیفی من شێعر نالێ. لە کۆبوونەوەی بانە مامۆستا هەردی یان بە زۆر تووشی کۆمیسۆنی شێعر کرد. لە پشت تریبوونەکە کوتی بە خوا لە کۆڵم نابنەوە دەنا ئەو شەڕە شەقە بە من ناکرێ.

ئەمنیش تۆ لیم ناگەڕێی دەنا من لە کوێ و داوێنی شیعرەکانی تۆ لە کوێ. کۆکردنەوەی وشەی هەستم لە شێعرێ؟ چی جوان نییە. هەستەکان زۆر هەست دەگریتەوە کە نابێ بیانگریتەوە، لە شێعری (کۆبوونەوە) پێوەندی نیوان ناوی شێعرەکە و ناوەرۆکەکەی بە من نەدۆزرایەوە. تەنیا لەگەڵ کەسیک قسان دەکەی کە دایکتە، بەڵام لە سەرەتادا باس لە کۆبوونەوە دەکەی. کام کۆبوونەوە؟ جگەلەوەش لە وێنەی دووهەمی ئەو شێعرەشدا من پیم وایە ئاوا

بویایه جوانتر دەبوو: دڵت دەڵێ ئەگەر ئەو بێ تەنیاییت بە (با) دەسپێرێ و ئیتر تەنیا نامێنی، بەڵام با دەڵێ ئەگەر ئەو نەبیت یادەکانی ئەم نامۆیە (کە دەبوایە بنووسی ئەم نامۆییە) لوول دەدا و لە نێو گەرد دا نوقمی دەکا. ئەمن لەسەر ئەو نوقتەیە قسەم هەیە. دەبوایە با هەڕەشە بکات کە گەردەلوولی یادی نامۆییت دەسەردەکا. چونکە ئەتۆ کە ئەو گەردەلوولەت لێ دووربێتەوە ئاسوودە و بێ یاد دەمێنیەوە لە حاڵێکدا مەبەست (لەپێوەندی دەگەڵ وینەی یەکەمەوە وا دەردەکەوێ) ئەوەیە کە گەردەلوولی یادەکانت وەسەر دەگەڕێ.

قسەی خۆمان بیت بۆخۆشم لە خۆم حاڵی نەبووم جا مەخوازە تۆ!! خۆ ناشوێرم لە سەرا بیخوێنمەوە، دەترسێم لەڕەخنەکە پەشیمان بمەوە و جا ئەوحەل (خر بیار و معرکە را بار کن) ئەو هەمووە نامەیە کوا بە من دەنووسرێتەوە. کاکە گیان ئەوەی ناکەین، هەر ئاوا بۆت دەنێرم ئەگەر دیتت بە کار نایە ئەوە بیدرێنە و بە گەردەلوولەکەی بسپێرە، ئەگەر بەکاریش هات.... دیسانیش هەر بیدڕێنە.

شۆخیم کرد بەڕۆژ گیان نەڵێی لەوەتی ئاگام لەو کورەی نەماوە شێت بووە. ئەڵبەتە شێت کە هەم ئەمما ئەوەندەش نا، شتێکم وەبیرهاتەوە. ژنێک بەمێردەکەی دەڵێ ئەگەر ئەمن مردم چ دەکەی؟ دەڵێ شێت دەبم. ژنەکە دەڵێ ناوەڵڵا ژنیکی دیکە دێنی. پیاوەکە: ئەوەندەش شێت نابم.

ئەرێ بەراست باسی نازلی و براژنمت نەکردبوو، لەلای خۆتن یان لە ئێرانن. خۆم و خیزانم سڵاوتان دەگەیەنین. شەونەم چکۆڵەش ئێستا ساڵ و نیوێک تێپەڕیوە و کەم کەم بۆ مێردی دەبێ. بۆ جوانیش کە هیچی تیدا نەهێشتۆتەوە. کەس بە دۆی خۆی ناڵێ ترشە.

ئەوجار بابێینە سەر کاروباری خۆم. جاروبار شیعری تازە بە قەولی ئێوە ئەمنووسێ. زۆرتر بە موتالاکردنەوە خەریکم و دەمەوێ لە سەبکێکی شێعری دا خۆم بە تاقی کەمەوە (زۆر تر دەگەڕێتەوە سەر شیعری دەربڕین).

له سرووەی[1]ژماره ٥٥ دا ڕەخنەییەکان لەسەر شێعری شاری کاک سواره (ئیلخانی زاده) بڵاوکردبووه، من به درێژی وەڵامیکم بۆ نووسیوەتەوه که رەنگه له سرووەی ٥٩ یا ٦٠ دا چاپ بکرێ که تازەترین کاری منه. نموونەی چەند شێعریکی ئەم دوواییانەشت بۆ دەنێرم و چاوەڕوان دەبم هەتا بیروڕات بزانم .

بەڕۆژ گیان: هاوکات دەگەڵ ئەم نامەیه دوو نامەی دیکەشم یەکیان بۆ مامۆستا رەفیق[سابیر] و یەکیان بۆ مامۆستا بیکەس ناردوه و داوای هاوکاریم بۆ سرووه لێکردوون. ئەگەر بەرهەمەکانی ئەوانمان پێ بگات لاپەڕەی شیعر زۆر دەوڵەمەند دەبێ. به تایبەت ئەگەر ئەوشێعرانه بن که ئێمه توانای چاپ کردنیمان هەبێ. له نێو ئەو وینانەی که بۆت ناردبووم وینەکەی شێرکۆ بیکەس زۆر کاری لەسەر کردم. و ئەمنی بەڕاستی خسته حاڵ و هەوایەکی دیکەوه و کاتیک چاوم لەسەر هەڵبڕی که تەماشام کرد شیعریکم لەسەر نووسیوه. جا نازانم بۆ شێعر دەبێ یان نا؟

چوار شێعری تۆ (سەرگەردانی)، (هەڵکەوت)، (دیمەن) و (کۆبوونەوه) ئێستا له وەختی تایپه و گەرانەوه لای من و رەنگه له ژماره ٦٠ دا چاوت پیان بکەوێ. شیعری (دان پیانان)م له وتارەکەی خۆمدا که وەڵامی ڕەخنەی باوکی تارام داوەتەوه وەک نموونەیەک بۆ هەستی ئاوارەیی هیناوەتەوه. ئەگەر هەتا تەواو بوونی وتارەکه هیچی بەسەرنەیه ئەوه له داهاتوودا دەیبینی. له سرووەش دڵنیابه هەر ژمارەیەک دەرچێ بۆ تۆش دەنیرێن. لەوه زیاتر سەرت نایەشینم. چاوەڕوانی وەڵامی نامەکەتم. زۆریش بەپەلەم بەڕۆژ گیان دیسان چاوت ماچ دەکەم.

شاد و سەرکەوتووبی

بچووکت　　　　　　　　　　مارف ئاغایی

---

[1] مارف ئاغایی له ساڵی ١٩٨٧ دا له گۆڤاری سرووەدا دەست بەکاردەبیت و بەشیکی زۆر کارەکانی ئەو گۆڤاره ڕادەپەڕێنێت.

**ئەمانە، دارەدارەی شیعرین و هێشتا پێیان هەڵنەگرتووە.**

نامەی مارف ئاغایی بۆ ڕەفیق سابیر

بەڕێز مامۆستا رەفیق سابیر

سلاوێکی گەرم و برایانەت پێشکەش بێ.

رەنگە بلێی ئەم برایە کێ یە کە سلاوی برایانەم بۆ دەنووسێ بەلام خۆم نایناسم!

من پیم وایە هەر کەس "سروودی حەلەبجە"ی "رەفیق"ی خوێندبێتەوە بێ شک بۆتە رەفیقی، بەلام من پاش چاپ کردنی ریژنە و پاشان وەرزی سەهۆلبەندان دۆستایەتی یەکی یەک لایەنەم لە دلدابووە و خۆشحالم کە ئەمرۆ شانازی نامە نووسینیشم هەیە.

بەرۆژی(ئاکرێی) خۆشەویست "کە جێگای هەر لە دلماندایە" نامەیەکی بۆ نووسیبووم و بە پیی داخوازی من دوو وێنەی ئێوەشی ناردبوو، کە هەروەها ناو و نیشانەکەتان لە نامەکەدا هاتبوو هەتا ببێتە سەرەتای نامە نووسی، ئەگەر ئێوە کات و تاقەتتان هەبێ من بە تامەزۆرێ یەکی زۆرەوە لەمەودوا نامەتان بۆ دەنووسم و دیارە ئەگەر شتێکیش پێویست بوو کە لە لای ئێمەوە دەست بکەوێ لە کتێب و گۆوار و.. دەنێرمە خزمەتتان، تا ئێستا لە گۆواری سروە دا نەمانتوانیوە بە باشی ئێوە بە خوێنەران بناسێنین، بەلام هیوادارم لەمەودوا ئەم پێوەندی یە قوولتربێ و بەرهەمە تازەکانتان لاپەڕەی شێعر برازێنێتەوە. دیارە کە شێعر و ئەدەبیات لە کوردستانی ئێراندا تەمەنی بە ئازادی نووسینی زۆر کەمە و پێویستە ئەزموونەکانی ئێوە ببێتە چرای٬ئەو ریگ اتووش و سەختە. ئێوە کە بێ شک یەکێک لە دەنگە بەهێزەکانی شێعری کوردین لە پێناوەدا دەبێ خۆتان زیاتر ماندوو بکەن. گەورەیی لە خۆبوردوویی پێدەوێ. من خۆم کە لە بەشی شێعری سروەدا کاردەکەم، دەزانم کە ئەو بەشە شێعری لاواز و کەم

هێزی زۆر تێدا بڵاودەبێتەوە ، بەڵام ئەوە قۆناخێکە کە دەبێ پێیدا بڕۆین و "کەس لە پڕێ نەبووە بە کوڕێ".

جا ئەگەر ئێوە و مامۆستا شێرکۆ بێکەس (کە نامەیەکیشم هاوکات دەگەڵ ئەم نامەیە بۆ ئەو ناردووە)؛ لەمەودوا بە شێعر و لێکدانەوە و نووسراوەکانتان هەوڵ بدەن بۆ بەهێزکردنی لاپەرەی شێعر لەم گۆوارەدا لە راستیدا هەوڵتان داوە بۆ پێشکەوتنی دەیان هەزار خوێنەری تامەزرۆی سروە. ئەم شێواز و سەبکەی کە ئێوە شێعری لەسە[لەسەر] دەنووسن لەلای ئێمە هێشتا بە جوانی خۆی نەگرتووە و خەلک دوورن لە سەهۆڵبەندان لە بابەت مانا و زمانەوە بەڵام رووناکبیرەکان کەیفی پێوە دەکەن. ئێمە پێمان خۆشە کە ئەم توانایی و غیرەتە لە لاوە خۆش هەستەکانی ئەم بەشەی کوردستانیش دا پەیدا بێ بۆ لەو قالب و چوارچێوەی کە ئێستا بەسەر شێعری کوردستانی ئێراندا زاڵ بووە تەکانێک بدەنە خۆیان (مەبەستم شێعری نوێ یە). رەنگە بۆ یەکەمین نامە ئەوەندە قسەکردن بەس بێ. ئەگەر پێتان خۆش بێ لە داهاتوودا زیاتری باس لەسەر دەکەین لەم نامەیەدا زۆرتر دەمویست پێتان رابگەیەنم کە دەرگای لاپەرەی شێعر و وتار لە گۆواری سروەدا لە رووی بەرهەمەکانتان ئاوەڵایە و ئێمە (دەستەی نووسەران) ئەوەندەی لە دەستمان بێ هەوڵ دەدەین بۆ ئەوەی پێوەندی یەکی قوولتر دەگەڵ ئێوە ساز بکەین. لە کۆتاییدا چەند – بە ئیستلاح- شێعریکی خۆمتان دەنێرمە خزمەتی. دیارە کە ئەوانە دارە دارەی شیعرین و هێشتا پێیان هەڵنەگرتووە، بۆیە دەبێ پێت سەیر نەبێ ئەگەر خوار و خێچ رۆشتوون، یا کەوتوون و هەستاونەوە. ئەگەر قسەیەکت لەسەریان بوو پێم خۆشە لە ولامی نامەکەمدا چاوم پێی شاد بێ و دەنا بیانخە پشت گوێ. هەروەها بۆ ئەوەی نامەکان زووتر بکەونە گەڕ و بۆ خۆم بیکەمەوە تکایە ولامەکەی بەم ناوونیشانە بنووسەوە:

ایران – آذربایجانغربی ارومیه – صندوق پستی ۷۱۷ معروف آقایی (مارف ئاغایی)

ئەم نامەیە، نامەیەکی رەسمی دەستەی نووسەرانیشی دەگەڵە

ئەم شێعرانەی کە بۆ ئێوەم ناردووە بۆ کاک شێرکۆشم ناردووە.

سەرنج : شیعرەکانی شاعیری جوانەمەرگ مارف ئاغایی یازدە کورتە شیعر بوون و هەموویانم لە ژمارە سێی گۆڤاری رابووندا (ساڵی۱۹۹۲) بڵاوکردنەوە.
رەفیق سابیر

**له مێژه ئاشناتین..**

نامەی مارف ئاغایی بۆ شوکرییە ڕەسول

نووسەری بە توانا و لیهاتوو، بەڕێز دکتۆرە شوکریە ڕەسوول

سڵاوتان لێ بێ، هیوادارم هەمیشە شاد و سەرکەوتووبن، نامە پڕ لوتفەکەی جەنابتمان پێگەیشت، ئیمەش هەر لە ڕێگای نووسینەکانی جنابتەوە، لە مێژە ئاشناتین. تەنانەت لە بەشی فۆلکلۆری سرووەش دا بەشێکی زۆر لە پەندەکانی جەنابتمان بڵاوکردەوە. ساڵ و نیوێک بەر لە ئێستا سەفەرێکی ڕەسمیمان بۆ ئەو دیوی کرد، هەواڵی جەنابیشتمان پرسی، بەڵام بەداخەوە نەکرا بەخزمەت بگەین.

ئیمە زۆرمان پێ خۆشە کە هەر یارمەتییەکی لە دەستمان بێ، دریغی لێ نەکەین. بەشێکی زۆر لە نووسەرانی کوردستانی ئێران خەریکن لەسەر فۆلکلۆر کار دەکەن، هەر ئێستا کە ئەم نامەیە بۆ جەنابت دەنووسم، بریار وایە دوای دوو ڕۆژ لە کۆڕیکی تایبەتی فۆلکلۆر لە شاری سەقز بەشداری بکەین، بە داخەوە ئیمە ناتوانین بە شێوەیەکی ڕەسمی جەنابت بانگێشت بکەین. بەڵام ئەگەر تەشریفتان بێتە ئێرە، دەتوانین پیکەوە سەردانی مهاباد و بۆکان و سەقز بکەین. پیوەندی یەک ساز بکەین. ئیمەش لەمەو دوا -ئەگەر ناونیشانێکی تایبەتتان هەبێ- پێوەندیتان لەگەڵ دەگرین. دەی بە داخەوە ئیمڕۆ کە نامەکەی جەنابت گەیشت، کاک ئەحمەدی قازی تەشریفی نەبوو، تا وەلامی نامەکەت بنووسێتەوە. لەوە زیاتر وەختتان ناگرین. بەرهەمی تازەمان بەشێوەی کتێب بڵاو نەبۆتەوە .

دڵسۆزتان: مارف ئاغایی

٧٦/٥/١٧

ورمێ

**کارەساتی ئێمە پێنج بە شەش لاییە.**

نامەی مارف خەزنەدار بۆ عەبدوڵڵا پەشێو

بۆ برای خۆشەویستم کاکە عەبدوڵڵا

ڕۆژتان باش

چاوەکانت ماچ دەکەم، دەمێکە ئاگاداری هەواڵت نیم، بە تایبەتی ئێستا کەس زاتی ئەوە ناکا چاپەمەنی لەگەڵ خۆی دابنێ، بەڵکو نامەش نایەنن، مەبەستم ئەوانەیە بە خۆیان و دولارەوە، بە قرقینەوە دێنەوە لێرە خانوو دەکڕن و بە جێ ی دێڵن، کچێکیش دەخوازن و لەگەڵیان خۆیان دا دەیبەنەوە.

کوردایەتی یەکەیان ئەمەیە، خوا بە زیادی

نەکا هەمووشیان پەنابەری سیاسین!

خزمێکم لە فینلەندە گەڕایەوە هەواڵی ئەوەی دامێ

کە تۆ لەوێ ی، منیش ووتم: دەزانم لەوێیە.

ئیتر بێزم نەهات لەوە زیاتر گفتوگۆی

لەگەڵ دا بکەم.برای خۆشەویست

کوردۆ عەلی لەووڵات بوو، ئەمەم

بە هەل زانی ئەم نامەیت بۆ بنووسم

و لە هەواڵت بپرسن. کارەساتی ئیمە پێنج

بە شەش لایی یە، تەنیا ئابلۆقەی ئابووری

نی یه، ئابلۆقەی خوێندەواری کوشندەترە بۆ ئێمەی ڕۆشنبیر زۆر سەیرە گەشتێک بۆ ئەرزە رۆم"ەکەی پووشکین کە من لە سوید بڵاوم کردۆتەوە نەکاتە کوردستان، لە لای ئەو دیوی سنوور بسوتێنرێ چونکە بە زمانی کوردی یە کەچی لە سویدەوە بخریتە پۆستە و بڕوا بۆ ئودرون بە فڕۆکە لەوێوە بە ئۆتۆمۆبیل بگاتە بەغدا و دەستا و دەست بکا لە ناو خوێندەواری بەغداو ئەمە سەیر نی یە! یا سەیر ئەوەیە شێرکۆ بیکەس شانازی بەوە بکا ڕۆژێ لە ڕۆژان وەزیر بووە!! یا حوسین عارف کەش و فش بێتەوە وەک عەلەشیش چونکە ئەندامی پەرلەمانە!!

کاکی برا، بە ڕاستی بیرت دەکەم، بە ڕاستیش مانەوەی من لێرە زیادە، بەڵام لەبەر بنیادی کوڕم ناتوانم هیچ بکەم، تازە لە بەشی بیناسازی کۆلێجی ئەندازیاری لە پۆلی سێ یەم دەرچووە بۆ پۆلی چوارەم، هێشتا دووساڵی خوێندنی تەواو بکا، ئیتر ئەو کاتە من سەربەست دەبم و دەتوانم بۆ یەک دوو ساڵێک سەر لە مۆسکۆ و جێگەی تری ئەوروپا بدەم. بە کوڵ ئارەزوو دەکەم هەواڵتان بزانم، بۆم بنووسن. سڵاووم بۆ هەموو دۆست و برادەران بە خۆشی و شادی بژی.

برات مارف خەزنەدار

هەولێر ١٩٩٦/٧/١٩

**بزانین چارەنووست دەگاتە چی!**

نامەی مارف خەزنەدار بۆ فەرهاد پیربال

Annaba- algerie

بۆ برای خۆشەویستم کاک فەرهاد ١٩٨٧/٤/٢٤

ڕۆژ باش

چاوەکانت ماچ دەکەم، هیوادارم لە خۆشی و بەختیاری دابی.

نامەکانی رۆژی ١٩٨٧/٣/٣١ و ١٩٨٧/٤/١١ م بە دەست گەیشت لەگەڵ هەردوو ژمارەی "یەکگرتن" و ژمارەکەی "لە دایک بوون" سوپاسی هەستی بەرزت دەکەم بۆ ئەم دیاری یە بە نرخانە.

کاکی خۆم، بە ڕاستی من لە تۆ و ئیوەومانان زیاتر بیر لە چارەنووسی لاوانی کورد دەکەمەوە، بەتایبەتی بەردەوام بوون لە خویندنی بەرزیان کە بووە بە تەنگ چەڵەمە و گەلێ تەگەرە کەوتۆتە ناوەوە. بەلای منەوە بۆ مەسەلەی خوێندنت، وەکو خۆشت نووسی بووت یا دەبێ لە یەکێتی سۆڤییەت بێ یان لە پاریس. لە بابەت یەکیتی سۆڤیەتەوە لاموایە جیگەمان هەیە، ئەمەش تەنیا بە ڕێگەی کۆمۆنیستەکانی عیراقەوە دەبێ. ئەگەر بۆت بکرێ دەمت بگاتە یەکێکیان ڕەنگە کاریکت بۆ بکەن، دیارە هەوڵدانی شەخسی هیچ سودی نییە، چونکە ئەوان جیگەی خوێندن ئەدەن بە ڕیکخراوان. ئێستاش وەکو بزانم سۆڤیەتەکان پیوەندییێکی ئەوتۆیان لەگەڵ ڕێکخراوانی کورد نی یە و دیارە ئێستاش کورد مەبەستیان نی یە. بۆیە ئەگەر پیوەندی لەگەڵ کۆمۆنیستانی عیراق ببەستی بە تایبەتی هەولێری یەکان ئەمە ڕەنگە شتێکت بۆ بکەن.

بۆ مەسەلەی خوێندنیش لە پاریس و ئەوەی من بزانم ئامۆژگا کوردی یەکە ئێستا وەکو جاران ڕێک و پێک نی یە، بەلام ئەوەندە دەزانم هەموو ساڵێ چەند قوتابی یێکی کورد لەسەر حسێبی خۆیان پێ یان دەخوێنن، جا ئەگەر ئێستا بۆ

ساڵی خوێندنی داهاتوو قوتابی کورد وەرگرن من دەتووانم نامەی تایبەتی یان بۆ بنووسم، ئەگەر تۆ هەوڵێ بدەی و لەم بابەتەوە بپرسی و ئەگەر دەرگای خوێندن کراوە بێ، ئەوا بۆم بنووسە من دەتووانم نامەیان بۆ بنووسم. بەڵام وەکو بزانم ئێستە ئەوەندە گوێ نادەنە ئەم لایەنە، بە تایبەتی ئەگەر سوودی کوردی عێراقی تێدا بێ.

ئیتر کاکی خۆم وەزعە بەم جۆرەیە، وەکو دەبینی بۆم ناکرێ بە هیچ جۆرێ راستەوخۆ لەم لایەنەوە یارمەتیت بدەم.

تۆ قسەکەت جوانە و دەتەوێ هەڵەکۆکیک بە دیاری ببەیەوە نیشتمان، بەڵام چار چی یە ئەگەر لە هەموو لاییکەوە دەرگا داخرابێ !! پێم وایە کارێکی نابەجی نی یە ئەگەر خوێندنی بەرزی کوردیت دەست نەکەوێ، هەر لە کۆپنهاگن خەریکی خوێندنی تر بی، بە مەرجێ کەڵکی کوردی تێدابێ.

هەرچۆنێ بێ دیارە تۆ لەم لایەنەوە لە من شارەزا تری.

کاکی خۆم، من سەرێشە نامگرێ لە باسی گیروگرفتەکانی خۆت هەرچەندە لە سەری بڕۆی، چونکە ئەمە گیروگرفتی هەموو نەتەوەکەیە.

ئەو شتانەی لە بابەت خۆت و بنەماڵە و هەولێرەوە بۆمت نووسی بوو، ڕوونکردنەوەییکی باش بوو و هەموو شتێکم هاتەوە یاد و باوکیشت دەناسم. ئیتر هیوادارم لە هەڵسوکەوتی خۆت ئاگادارم بکەی و بزانین چارەنووست دەگاتە چی!

دووبارە سووپاست دەکەمەوە و هیوام وایە گوشاد و بەختیاربی و بەخۆشی و شادی بژی.

دڵسۆزت

**رامان لێ هاتووە، نازانین چۆن بیر بکەینەوە.**

نامەی مارف خەزنەدار بۆ فەرهاد شاکەلی

بۆ برای بەڕێز و خۆشەویستم کاک فەرهاد

ڕۆژتان باش

سڵاوێکی گەرمتان لێ دەکەم، هیوام وایە لە خۆشی دا بن، نامەی دوایی ڕۆژی ١٩٩٧/٤/١٨ تتان بە دەستم گەیشت، دڵخۆش و گوشادی کردم، لەگەڵ نامەکەدا هەر دوو شیعرکە و ڕوونکردنەوەکەشم بە دەست گەیشتن، هەرچی شیعرەکان بوون پێشکێش بە سەر نووسەری ڕامان کراون، گۆڤارەکە ئەو ڕۆژە ژمارەیێکی دەرچوو بوو، لە ژمارەی دا هاتوودا بڵاودەکرێتەوە، هەرچی ڕوونکردنەوەکەش بوو وادەردەکەوێ یەکێتی بڵاوی ناکەنەوە، پارتیش حیزب بڕیاری نەداوە بڵاوی بکاتەوە، بەڵام دووجار لە ڕادیۆی "گولان" بڵاویان کردەوە، لایەنە سیاسی یەکان هەڵوێستیان هەرچۆنێ بێ، تا پلەیێکی بەرز ڕوونکردنەوەکە بەڕێگەی فۆتۆکۆپی بڵاوکرایەوە و دەکرێتەوە.

کۆمۆنیستە گەوجەکانی ئێرە بەزمێکیان بۆ سەرۆ قادر نایەوە، ئەمەیان چیرۆکێکی بڵاوکردەوە بە ناوی "تێشکان" لە بابەت هەڵاتنی دامودەزگای کۆمۆنیستەکان لە عێراقەوە بۆ ئێران پاش ڕاگرتنی جەنگی ١٩٨٨. بە تورەیی یێکی چاوەڕوان نەکراو لە ڕۆژنامەیان دا بە بار هێرش و جنێویان بۆ سەرۆ قادر نارد، ئینجا مەکتەبی سیاسی یان چاویان بە سەرکردایەتی پارتی کەوت، بەجۆریک سەرکردایەتی پارتیان پڕ کرد لەسەر قسەی کۆمۆنیستەکان دەبوو سەرۆ قادر لە ناو ببرێ. ئێمەش ڕوونکردنەوەییکمان لەم بابەتەوە بۆ سەرکردایەتی پارتی نارد، دیار بوو ئەمە تۆزێک مەسەلەکەی هێور کردەوە، ئێمەی بێ لایەن و سەربەخۆ و ئەوپەڕی دیموکراتیخواز پێشنیازی ئەوەمان کردووە بۆ ئەم مەسەلەیە و هەموو کێشەییکی تری لەم بابەتە پێویستە لە دادگا شکات بکرێ، بە کۆمۆنیستەکانمان ووتوە شکات بکەن، لەدادگا ڕووبەڕووی یەکتری دەوەستن، لەوێ خەڵکی گەمژە و نەفام لە کەسی ڕاست و

نیشتمانپەروەر و داهێنەر جیا دەکرێتەوە، ئێمە حەزدەکەین جۆرە شکاتی وا لای ئێمەش هەبێ، بەڵکو دادگاییکی وەکو دانیێل و سنیاڤسکی ساڵی ١٩٦٦ی مۆسکۆی لێ درووست بکەین، ئەگەر سەرۆ قادر دەنگی بۆ لای ئێوە نەبێ لەبەر ئەوە بووە.

کاکی برا لە بابەت هاتنەوەکەت بۆ ئەستەموول و کۆنفرانسە زانستی یەکە لام وایە ئەگەرێیکی ئەوتۆ نایەتەڕێ. هەرچەندە هاتوچۆ لە نێوان سلێمانی و هەولێر هەندێ قورسە و پیاو پەست دەکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا بۆ تۆ هیچ نابێ، چونکە ئەوانەی ئێرە لە ناوەوە ئەوەندە بەهێزنین بتوانن خراپە لەگەڵ خوێندەوارێکی دانیشتووی دەرەوەی نیشتمان بکەن ئەگەر بەسەردان بێتەوە، هەرچۆنێ بێ ئێمە پێمان خۆشە و گەلێکیش شاد دەبین جارێکی تر چاومان پێت بکەوێتەوە.

پێم خۆش بوو ئەو نامەیەی لەگەڵ خۆشەویستمان کوردۆ عەلی ناردبووم، گەیشتۆتە ئەورووپا وەک خۆت نووسی بووت بە تەلەفۆن پی ی ووت بووی، هەرچۆنێ بێ وەرامی ئەم نامەیەم بۆ جێ بەجێ بکە، بە تایبەتی لە بارەی ئەو ژمارانەی "مامۆستای کورد"ەوە کە تا ئێستا چاووم پێ یان نەکەوتووە.

من ئێستاش مانگی دووجار گەشتی سلێمانی دەکەم بۆ موحازەرە ووتنەوە، هەرچۆنێ بێ ئەگەرچی سەرێشەشی تێدایە بەڵام ناچارم، چونکە کەس نی یە ئەو موحازەرانە بۆ زانستگای ئەوێ بدا.

ئیتر کاکی برا، دووا ووتەم ئەوەیە "وامان لێ هاتووە نازانین چۆن بیر بکەینەوە، کورد لە ڕابردوودا ڕۆژگاری وای نەدیوە، لە دوواڕۆژیش دا تووشی نایە".

ریز و سڵاوم بۆ هەموو دۆست و برادەران، بە تایبەتی ئەوانەی وەکو ئێمە بیردەکەنەوە. چاوەکانت ماچ دەکەم و بە خۆشی و شادی بژی.

هەولێر ١٩٩٧/٥/٩

برای دڵسۆزت    مارف خەزنەدار

## من خۆم نیشتمانێکی وێران...

نامەی مارف عومەر گوڵ بۆ بەڕۆژ ئاکرەیی

برای بەڕێز ئاکر بەڕۆژ

سڵاوی گەرم و خۆشەویستی :

باسی بارانت کردبوو،
من بارانم لێ نابارێ
باسی گریانت کردبوو،
هەمیشە گریاوم
تا شەرمێکم کۆتایی هات !
تەنیا باسی پێکەنینت نەکردبوو
من ترسیم،
دەمێکە لێک بێ هاوڕێم

برا: هەواڵی خۆم و دەروونی خۆم چۆن بنووسم؟! چی بنووسم؟ ئەو چەند دێرەی سەرەوەم هەر ئێستا بەسەر زماندا هات، پێم وایە گوزارشتێکە لە دەروونی خۆم، بڕوا بکە، من ئەوەندە گریاوم چکم کردووە، سەیر ئەوەیە پێکەنینیش دەڵێ ی کردە و پەساپۆرتی نیە و ناگاتە لای من! من خۆم نیشتمانێکی وێران.. من خۆم جەستەیەکی ئازار لێ نەبڕواو.. دڵ و جەرگێکی، شادی لێ قەدەغەکراو. پاروی ژیان ناچاری کردووم بۆ ماوەی ساڵێک خوێندنەکەم رابگرم و بە پەساپۆرتێکی ساختەوە رووبکەمە ولاتێکی ئەوروپا هەوڵم دەدا بچمە ولاتێک بتوانم دوو سێ عانە کۆبکەمەوە قەرزەکانمی پێ بدەمەوە، تەنیا توانیم بگەمە بەلجیکا! ئێرەش بۆ پەناهەندە خراپە و دەردی سەری زۆرە. بەڵام ناچارم و وا چاوەڕێم چەند مانگێکی تر پەساپۆرت وەربگرم. ئیتر ژیانی تایبەتیم ئەوەندەی ژیانی گەلی کورد ناخۆشی گەمارۆی داوە. نە شیعر ، نە چیرۆک، نە ڕۆمان، نە گۆرانی، نەحیزبی هەڵاو هاوار، ئەو گۆڕانەیان بۆ دروست ناکرێ کە لە سەردەمی هەرزەکاریماندا. لە کتێبە

ئەستورەکاندا دەمانخوێندەوە. جاران دنیا لە واشنگتۆن و کرملین-ەوە نەخشە دەکێشرا، بەڵام ئێستا هەموو لە واشنگتۆنەوەو منیش تا ئێستا سەرم لە کەمپیوتەری ئاسایی دەرناچێت، جا نەخوازەڵڵا، کەمپیوتەرە نهێنی یەکانی (کۆشکی سپی) وئەوانی تری رۆکێتە ئاسمانی یەکان!

کاکی برا: هەر چۆنێ بێت، ئەگەر ژمارە سێ ی رابوونت پێ پەیدا ناکرێ، ئەوا ناونیشانەکەی کاک رەفیقکم بۆ بنێرە با راستەوخۆ نامەی بۆ بنێرم. چونکە ناونیشانە کۆنەکەیم لەلایە و ئەویش گۆڕاوە. لەبەر ئەوەی زۆر زەرووری ئەو شیعرەم، چونکە لەلای خۆم نیە، نیازی کۆکردنەوەی شیعرەکانی خۆمم هەیە، ئەگەر بکرێ چاپییان بکەم.

نەمزانی لە ژمارەی دووی (وان)[1]دا ئەو چەند شیعرەم بڵاوکراوەتەوە یان نا؟ ئەگەر دەزانی (وان) ئیتر دەرناچێ و هەوڵ بدە ئەو چەند شیعرە دەست بخە و لەبەربانگ دا بڵاوی بکەرەوە.

وا لەگەڵ ئەم نامەیەشدا شعرێکم بۆ ناردی، کەی بڵاو بۆوە ئاگادارم بکەرەوە با ڕەوانەی هیچ لایەکی دیکەی نەکەم.

نامەم لێ مەبڕە! بێزار بوومە لەوانەی هەر ئیشیان ئەوەیە شەو و ڕۆژ جنێو بەم و بە دەدەن، بەراستی مرۆڤی پاک و رەوان زۆر کەمە! من چ تاوانێکم هەیە کابرایەک لەسەر شتێکی بچووک جنێو بە هەزاران دەدات، کەچی شەو و ڕۆژ سەری خەڵکی پێوە دێشێنی! ئەی من چ تاوانێکم هەیە دەبێ گوێ لەو هەموو قۆڕیات و قسەپووچانە رابگرم. ژیان بۆ ئێمە سەر ئێشەیەکی زۆرە، هەر لە منداڵیەوە بەهەڵە پەروەردەکراوین، بۆیە دەماغمان دەڵێ لە (فریزەر)دا هەڵگراوە.

شیعریش لای من هەناسەیە لە دڵێکی بۆ کڕوزاویەوە، رەنگە ئەوانەی من دەیان نووسیم شیعر نەبن، بەڵام بۆخۆم هاواری هەقە لە دژی هەموو نارەواییەک،

---

[1]وان: گۆڤاری وان، گۆڤارێکی ئەدەبیی وەرزی بوو، لە سەرەتای ساڵانی لە نەوەتەکانی سەدەی رابردوودا لە سوێد دەردەچوو. خەبات عارف سەرنووسەری بوو.

هونەرێکە، هێندەی ئاوازی بولبول لام خۆشە، بەڵام خۆزگە ئەوەندەی بولبولێک هونەرمەند بوومایە! ئێمە کوڵ و کوڵەوارین لە ئاستی زۆر شتی ژیاندا، کەوتوینەتە شەڕی ژیانەوە، وەک تر (تووشی داوی ژیان بووینە) ئەوەی باشە، ئەوەندە سەر ڕەقین، ئەوەندە سەرسەختین بەرگەی ئەو هەموو مەینەتی یە دەگرین:

لە دونیادا نەبوو وەک من لە عەشقی ئەو گرفتاریٚ
ویسال، یا قەتڵ، یان تەسکین، لە هەرسیٚ بۆم بکەن چاریٚ

ئێوە خۆشتان، هیوادارم سەرم نەیەشاندبن
لە خۆشەویستییەوە چەند وتەیەکتان گرت، نازانم بۆ یادگاری و تیانەم
دەست دەکەوێ.

مارف عومەر گوڵ

١٩٩٤/٧/٢٤

**له هەر بستێکی خاکی کوردستان بێ!**

نامەی مارف عومەر گوڵ بۆ فەرهاد پیربال

٢٧ /٩٨٩/٤ کیڤ

برای خۆشەویستم کاک فەرهاد

سلاو و ڕێز هیوادارم هەمیشە سەرفراز و سەرکەوتووبی.

براگیان: دەمێکە نامەکەتم پێگەیشتوە، داوای لێبوردن دەکەم لە دواکەوتنی وەلام.

برا: من هەر کە گەیشتمە ئێرە نامەیەکم بۆ ئینستیتو نارد داوای چاپکراوەکانم کرد، بەلام لەسەر زەرفەکە ناوی د. سیامەندم نووسیوە، ئیتر نامەکە چی بەسەر هاتووە نازانم ؟ بە حیسابی خۆم د. سیامەند هەروەکو جاران بەرپرسیاری گۆڤاری هیوایە[1].

برا: وا لەگەڵ ئەم نامەیەدا تاقە دانەیەک (خۆری زیندان)[2]ت بۆ دەنێرم، جا ئیتر تۆش لای خۆت هەڵیدەگری، یان دەیدەی بە کتێبخانەی ئەنستیتو ئەوە کەیفی خۆتە، ئەو دانەیەشم لە خەڵک و خوا قەرز کردوە. لەوە زیاترم چنگ نەکەوت.

برام: "گینو سید" واتە سیاسەتی قەلاچۆکردن، قڕکردن، بە کۆمەڵ کوشتن، جا کوردیش گەلێ جار بە کۆمەڵ لێی کوژراوە، لەسەردەمی ئەتاتورکی سەگباب و لەسەر دەمی جەنابی نووری پاشای ئێستای عێراق و هی تریش.. جا ئەگەر هەر دۆکیۆمێنت و بەڵگەنامەیەکی نێو دەوڵەتان لای تۆ دەست بکەوێ ئەگەر نوسخەم بۆ فۆتۆکۆپی بکەی ئەوە سوودی زۆرە بۆ من. یا دەست نیشانی هەندێ سەرچاوەی گرنگیشم لەبارەوە بۆ بکەی هەر چاکە، بە تایبەتی وەکو

---

[1] گۆڤاری هیوا [نوێ] ئینستوتی کوردی ساڵی دوو جار دەریدەکرد, بە جیاواز لە گۆڤاری هیوای سالانی پەنجاکانی سەدەی پێشوو.

[2] خۆری زیندان، مارف عومەر گوڵ، ١٩٨٩

خۆت دەڵێی بە دوای ئەو سەرچاوانەدا دەگەڕێ ی لە کتێبخانەکانی پاریس کەلەسەر کورد نووسراون، دڵنیام شتی باشت چنگ کەوتووە.

لە کۆن و نوێ، لە هەر بستێکی خاکی کوردستان بێ چاکە بۆ من.

برام: لە نامەیەکی لای خامۆش دا نووسیوتە کە یەکێتی پارێزەرانی کورد لە پاریس دامەزراوە، سوپاسی هەستی دڵسۆزانەت دەکەم، کارێکی باشت کرد کە منت ئاگادار کردەوە، تکایە ئەگەر هەندێ لەو ناوانەم بۆ بنووسی کە ئەو یەکێتی یەیان دامەزراندوە و کێن و چین؟ ئەگەر ناونیشانەکەشیانم بۆ بنێری لەگەڵ زیاتر مەعلومات لەو بارەیەوە تا منیش لەلای خۆمەوە پێوەندییان پێوەبکەم. بەڵام زۆر پێویستە پێشتر ناوەکانیان بزانم، تا بزانم کێن؟ (...) دەنگوباسی ئەدەیب و ڕۆشنبیری لای ئیوە چیە؟ وێڵی ووشەیەکم.

لە داهاتوشدا هەندێ شیعری خۆمت بۆ دەنێرم، ڕەنگە شیعرەکەم کە داوە بە "هیوا" جارێ دیار نەبێ؟

دیارە تۆ کە ساڵی دووەمتە لەوێ ئێستا زمانەکەت باشە، من هێشتاکە کۆرپەم، لە هەفتەیەکدا سێ ڕۆژ دەوامامان هەیە و ئەم دەرسانە دەخوێنین.

زمانی ڕوسی
فەلسەفە
اختصاص- (بە نیسبەت منەوە قانونی دولی)

لەگەڵ دەرسێکی تردا کە زیاتر مصطلحاتی سیاسی و اعلامیە.

لێرەخوێندکارانی کودی هەر ناوبەناو لە پرێکدا بە کۆمەڵێ وێنەی کوردستان و کارەساتی کیمیاویەوە لە بەیەکەوە بارگەیان دەخەن و بازاری کارەساتی گەلی کورد پیشانی خەڵک دەدەن. خەڵکی زۆریان پێ سەیرە ئەمە لە عێراق ڕوو دەدات، ئەوەندەیان درۆ بۆ کردوون خەڵکەکە سەریان سوڕ دەمێنێ، زمانی واقع و زمانی سیایەت جیاوان. ئێمەش هەر پیمان دەکری بڵێن ئەمە ژیانی کورد، ئەمە کارەساتی کورد، ئەمەیە دەردو ئاخی ئیمە! خەڵکەکە زۆر عاطفی و

جگەرسۆزن. ئیتر بە قسە و بەسەیرکردن و بە گوڵەوە دەچنە بەردەم وێنەی هەڵەبجە و کارەساتەکانی کوردستان. ئەمەش یەکەم جارە لە سۆڤیەت شتی وا بکرێ.

برام: نامەیەکم لە زمانی ئاسکێکەوە بۆ برچیت باردۆ وەکو (تعلیق) نووسی، نازانم تۆ دەکری بیکەیتە فەرەنسی و لە یەکێ بە ڕۆژنامەکانی پاریس بڵاوی بکەیتەوە. ئەگەر دەکرێ ئاگادارم بکەرەوە بۆت دەنێرم.

تا نامەی داهاتوو.. دووبارە ڕیزم هەیە

هەر بژیت. سەرفراز بیت

ئەگەر تەلەفۆنت هەیە ڕەقەمەکەم بۆبنوسە

ئەگەر دەزانی دەکرێ، چەند شیعرێکی ناو خۆری زیندان

هەڵبژێر و لەوێ دووبارە بڵاوی بکەیتەوە چاکە، چونکە ئەم دیوانە

کەمی لێ چاپ کراوە، یان ناکرێ

دووبارە چاپی بکەنەوە.

ئەگەر دەتوانی

ئاگادارم بکەرەوە

برات مارف

## پڕە لە نامەی دۆست و برایانی وەک تۆ!

نامەی مارف عومەر گوڵ بۆ فەرهاد پیرباڵ

ئۆکرانیا 1989/1/18

برای خۆشەویستم کاک فەرهاد

خۆشیت ئاواتمە. نامەکەتم بەدەست گەشت گەلێ دڵشاد و خۆشحاڵ بووم. خوا ماڵی خامۆش ئاوەدان کات وا تۆی بۆ من دۆزیەوەو منیش بۆ تۆ.

زۆرم پێخۆش بوو کە بەهۆی خامۆشەوە هەوالتم زانی و لە سۆربۆن دەخوێنی. هیوادارم لە هەموو روویەکەوە وەزعت باش بێ. دیارە تو ساڵی یەکەمی زمانت تەواو کردووە و ئێستا فێری فەرەنسی بوویتە، جا نازانم زمانەکەت چۆنە؟ من وا دوو مانگ و چەند ڕۆژێکە لێرەم هێشتا شتێکی ئەوتۆ لە ڕوسی فێرنەبوومە، وا ڕۆژانە خەریکم، وا کەوتومەتە گروگاڵ(...).

برا گیان: ئەو ئیوارە خۆش و غەمگینەی (بەگەرلوو) هینایەوە بیری منیش، بڕوا بکە خەڵکی وەکو ئیمە کە نیشتمانەکەی بەجێ دێڵێ ئەوسا ئاوات دەخوازێ هەر لەوێ بمردایە! خۆ من ڕەش بین نیم لە ژیاندا. بەڵام ئازار و دەردی ئێمە ئەوەندە سەخت و هەمە لایەنەیە هەر باس ناکرێ. لە ژمارە (6)ی (یەکگرتن) دا شتێکم خویندەوە زۆرم پێ چاک بوو. دیارە لە نوسین و چیرۆک بەردەوامی، کاریکی زۆر چاک دەکەی.

منیش لە دوای ئەوەی ساڵی(987) دیوانی (خۆرَی زیندان)م چاپ کرد، گەلێ شیعری ترم هەیە، بەڵام چی بکەم؟ لێرەش چەند شیعرێکم نووسیوە. ساڵی پار شیعرێکم نارد بۆ (د. سیامەند) بۆ گۆڤاری (هیوا) نازانم چی بەسەرهات؟ ئەگەر لێ ی بپرسی خراپ نیە.

شیعرەکە ناوی (ئەو دی چیا پاوان نیە) یە. هەر لێرەشەوە نامەیەکم بۆ د. سیامەند نارد تا ئیستا وەڵامی نیە، پێم خۆشە لەویش بپرسی.

بیرم کەوتەوە (خۆری زیندان)م کای خۆی ناردووە بۆ (ئەنستیتو) رەنگە لەوێ دەستت کەوێ.

برام من لێرە (قانونی دولی) دەخوێنم، نیازم وایە لەسەر گینو سید بنوسم، بە راستی ئەم ڕووداوانەی دوایی کوردستان ئەوەندەی تر پەرێشان و جەرگ بڕاویان کردووم هەر جارێک هەراسان بوومە.

چونکە خۆم لە نزیکەوە کارەساتەکانم دەبینی. هەتا مانگی هەشت و نۆی ۹۸۸ هەر لە کوردستان بووم، لە کاتی بۆمبارانی هەڵەبجە و ناوچەکانی تردا لە دەوروبەری سلیمانی بووم. بەڕاستی ئەو ڕووداوانە و تێکڕای وێرانکردنی کوردستان دەردێکی ئەوەندە سەختە مرۆڤ دەهاڕێ. ئەگەر سەرچاوە و شتی لەو جۆرە بابەتانەت لە لادەست کەوت یارمەتیم بدەی چاکە. دەربارەی بە کۆمەڵ کوشتنی خەڵکی کوردستان لە کۆنەوە تا ئیمڕۆ. دیارە بەڵگەنامە و دۆکیۆمێنت زۆر چاکن، نازانم دەکرێ "هیوا" و چاپکراوەکانی ترمان پێ بگات؟

کاکی برا:

خوێندن لێرە ناخۆش نیە، بەڵام جێگای خەوتن و ئیسراحەت ناخۆشە، چونکە بە زەحمەت بە تەنها ژوورێکت دەست دەکەوێ و ئەوە جگە لە ماڵ وێرانی گیرفان! پێم خۆشە بە دوور دودرێژی وەزعت بزانم. لە نامەکەی خامۆش دا باسی دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی کوردستانت کردبوو لە سوید. نازانم ئەو نووسراوانە جیاوازە لەگەڵ نووسەرانەکەی شاخ و حەمە موکری؟ یا بەشی یەکترن، ئەوانەی سوید کێن؟ لێرە من تەنها لەلای خامۆشەوە دەتوانم دەردە دڵی خۆم هەڵڕێژم؟ ژوورەکەی ئەو دەڵێی هەولێرە، پڕە لە شیرینی کوردی و پڕ لەکورد، پڕە لە ژان، پڕە لە تایەر تۆفیق و سێوە، پڕە لە گریان، پڕە لە کتێبی کوردی، پڕە لە نامەی دۆست و برایانی وەک تۆ. کاک فەرهاد گیان ئەگەر بیرت مابێ ئەو ئیوارەی بەرگەڵو هەندێ ڕەسمان گرت من هیچیانم دەست نەکەوت،

نازانم تۆ؟ خالقییش (مەزهەری خالقی) لەوێ بوو! ئەگەر وەڵامی ئەم نامەیەم زو بۆ هاتەوە، نازانم پیت چۆنە شیعریت بۆ بنیرم بۆ هیوا؟ خۆم پیم چاکە و گۆڤاریکی باشە.

حەمە موکری و حەمە کەریم گۆڤاریکی ئەستوور دەردەکەن بە ناوی (کەلتور) زۆر قەبەیە و گەلێ بابەتی هەمە جۆری تیدایە، تا هاوینی رابردوو دوو ژمارەی لێ دەرچوو بوو، بە داخەوە وەزعی نالەباری کوردستان ریگە نادا زۆری لێ چاپ بکرێ.

بمبورە نامەکەم پچڕ پچڕە، ئەوەیش هۆی نامورتاحیمە، لە دوای وەزعی شڕی کوردستان پێویستم بە حەسانەوەیەک هەبوو، بەڵام یەکسەر ئاڵامە خوێندن و ئێرەوە، ژوورەکەم ناخۆشە، بە تەنیا نیم، دوو کەسی ترم لەگەڵە. سیسارکی زۆرە، هەتا تەنها نەبم لە ژوورێکدا ناحەسێمەوە.

براله: ئیتر تۆ زۆرترم بو بنووسە. با نامەکەی تۆ وەک ئەمە ئاڵۆز نەبێ.

بمبورە. بە قوربانت هەر بژیت بۆ برایەتیت دووبارە رێزم بۆتان هەیە.

برات مارف عمر گول

پەراوێز
کاک فەرهاد وا شیعریکم بۆ ناردی
بۆ هیوا کەیفی خۆتە
ئەوە شیعرەشم کاتی خۆی
لە کوردستان نووسیوە.

**نازانم بۆ بیرت ئەکەم..!**

نامەی محەممەد حەمە باقی بۆ ڕەووف بێگەرد

برای جگەرسۆز و سەروەرم

کاکە بێگەردگیان

بە پەرۆش و تاسەوە ماچت ئەکەم و ئەتنوسیێنم بە سنگ ودڵمەوە.. بۆنت ئەکەم، چەند فرمیسکێکمت بەسەرا ئەبارینم، پرکێشی ئەوە ناکەم، خۆم لەگەڵ نالی دا ڕابگرم کە بە سالم ئەڵێت: سەنگ دڵ بۆیە نازانم کامان دڵمان بۆتە بەرد، وا ئەوەندە ئازابین ماوەیەکی دووروودرێژ یەکتر بێ نامەبکەین!؟ من دان بەوەدا دەنیم کە لە دەمێکەوە گۆشتی دڵم بووە بە چەرم، بۆتە ئاسن، یان بە واتایەکی تر کردیانە بەردو خەڵوز و، نازانم خوێن و گوشتەکەی چییان لێهاتبێ!! ڕەنگە گۆشتەکەی کە هەر پڕ چنگێک بووە، لە کوڵانێکی تەنگی (سەرکارێز)دا، سەرەتای لاوێتیمدا لەبەر پێیی کچۆڵەیەکدا، کردبێتمە دیاری و ئیتر ئاوڕم لێ نەدابێتەوە.. خوێنەکەشی لە زیندانە تاریک و شاراوەکانی سەدام دا، لێم چۆڕابێ و نەمدیبێ..!

ئەگینا ئەگەر سەنگ دڵ نەبم، کەی ئەبوو ئەوەندە شار. ئەوەندە کێو، ئەوەندە پرد،.. ئەوەندە زام.. ئەوەندە شەهید.. ئەوەندە ژەهر.. ئەوەندە دەردی دووریی.. ئەوەندە براکوژی.. ئەوەندە تاڵان.. ئەوەندە دزێتی.. ئەوەندە برسێتی.. لە نێوانماندابێت..؟! ئای بێگەرد گیان چەند بیرت ئەکەم! نازانم بۆ بیرت ئەکەم..! نازانم بۆ حەزەکەم هەر لای تۆ بگریم..؟! ئەبێ هی ئەوە نەبێ، تۆ هەر هاوڕێم نەبوویت، بەڵکو بەشێکی گەورەیەتی.. بەشێکی باوکایەتی.. بەشێکی دایکایەتیمت لە خۆتا حەشاردابێ و بەخۆمان نەزانین.. ئەگەر وا نەزانینت، ئەوا تۆ وەک (کازانتاکیس) ئەڵێت: هەر تەنیا گەورەیەکی (موتڵەق) یت... نەک (عادلێکی موتڵەق)! بەڵام بیرت نەچیت کازانتزاکیس ئەو قسانەی لەگەڵ (خوا)یە!.. کە ئەگەر لە دۆستایەتیدا خوایەک هەبێ بۆ من، ئەوا قسەکەی کازانتزاکیس هەر بۆ تۆیە. .ئەگینا ئەم ماوە دوورە نامەیەکت بۆ دەنووسیم..!

دۆستانی ئێرە، لە نزیکەوە تۆیان دیبێ. هەموو هەواڵت ئەپرسن، و بیرت ئەکەن. هەمیشە کە ئەچمە (سنە)، سەردانی کاکە جەمیلی حاجی ئیقباڵ ئەکەم و ماوەیەک پێکەوە دائەنیشین و دەردە دڵ و دەردە دووریت باس ئەکەین.. کاک جەمیل کوڕی باشە، ماوەیەک لەمەوبەر، نامەکەت پێگەشتبوو، هەمیشەش کە هەواڵ ی کارەکەتی لێ ئەپرسم، ئەفەرموێ: ئەبێت خۆی بێت بۆ ئێرە..ب ۆیە هەمیشە نامەکە، سەبارەت بە جەنابت، بۆ نەژادی برام ئەنووسم، هەر تەنیا ئەڵێم: نابێت بێت بۆ ئێرە.. چونکە بۆ هەر جێکەیەکیی دەوڵەتی بچین بۆ کاری جەنابت و پیمان ئەڵێن ئەبێت خۆی بێت.. ئەوەتەی_کۆلان_[1]مان گەیوەتێ، کۆلان بە کۆلان و ماڵان بە ماڵانی، شارانی سەقز و بۆکان و سنە، ئەگەڕێ و ئەینێن بە دڵییانەوە، هاوڕێکەلیکی زۆر خوێندوویانەوە، زۆریان پێخۆش بووە.. دیارە دوای کۆلان-یش بەرهەمی ترتان هەبووە و هەیە، ئەزانم تەنگوچەڵەمەی چاپەمەنی و گرانی چاپ.. بواری لە چاپدانی نەهێشتووە.. گرانی چاپەمەنی، گەیشتۆتە ئێرەش. من و کاک عەتای نەهایی و گەلێ دۆستان، بەرهەمی زۆر و تازەمان هەن و، چاوەڕێی چاپ ئەکەن، کاری زۆر زۆرم کردووە، و هەمیشەش هەر کارئەکەم... ئێستا ئیجازەی چاپی چوار کتێبم هەیە.. لەوانە: ڕاوە گزنگ (کۆمەڵە وتارێکی ڕەخنەییە)، شینی خوداوەند (شیعرێکی درێژە و دەمێک پێوەی ماندووم، بەڵام بەردەوام کاری لەسەر ناکەم، جارە جارە کە چاوبرێکێ..یان ختوکەی ڕۆحم ئەدات..ئەچم بەلایەوە..هەندێکم لی تایپ کردووە و ئیجزەی چاپم وەرگرتوووە)، مێژووی مۆسیقای کوردی. دڵم بەمەیان زۆر خۆشە، چونکە زۆری پێوە ماندووبووم و بۆ یەکم جار ئەبێ کتێبخانەی کوردی، بەرهەمی لەم جۆرە کتێبانە بەخۆیەوە ببینێ، هەوڵم داوە ئەگەر بۆ زمانێکی تریش تەرجەمە بکرێت، لە ڕووم بێت بڵێم هی منە! پڕی لە بەڵگەی مێژووییە، کە زۆر بە جنگەکرێ، چنگم کەوتوون[2]، ژووان[3] (دووبارەی چاپی ئەکەمەوە).

---

[1] ڕەووف بێگەرد، کۆلان، چاپی یەکەم، سوید، ١٩٩٤.

[2] بڕوانە: محەمەد حەمەباقی، مێژووی موزیکی کوردی، زنجیرە کتێبی دەزگای موزیک و کەلەپووری کورد، چاپی سێیەم، هەولێر ٢٠٠٩.

[3] محەمەد حەمە باقی، ژووان، چاپخانەی زانکۆ-سلیمانی، ١٩٨٠.

حەزەکەم لە کورتترین دەرفەتا، بە تایبەتی لە پشووی نیوەی ساڵدا، تەشریف بهێنی بۆ لامان، ئەگەر پەلە بکەیت، ئەتوانین لەگەڵ هەڵگری نامەدا بێیت، کوڕی باشە و جێی متمانەی منە..کارەکەی سنەشتان جێبەجێ ئەکەین.

ئەی هەواڵی ماڵ و منداڵ! خوشکە شوکریە خانم چۆن بێت؟ زۆر ڕیزم هەیە بۆی.. کاکە ئاری گیان! لەم هەرا وبگرە و بەردەیەدا، چون بوبوبێ؟! توخوا ئاگات لێی بێت حەیفە ئەو جووانووە پاکە، خزمەتی بێهودە بکات، ئەی کچەکان چۆنن؟ ماچیان ئەکەم.. نەجیبە زۆرتان بیر ئەکات، منداڵەکان دەستان ماچ ئەکەن، ئەی هەواڵ ی دۆس و هاوڕیان! کاروباری ڕۆژنامە گۆڤار..هتد..هەموویم بۆ بنووسە، زۆر زۆر پەرۆشتانم، ئاخۆ گۆڤاری وا لە ژیاندا ماوە، تا ئێستا دەربچێ؟!

ببورە لەگەل نامەی جەنابتان هەشت نۆ نامەی تریش ئەنووسم، و هەڵگری نامەش زۆر پەلەیەتی، تا دیدارو نامەیکی تر ماچت ئەکەمەو.

دووبارە ڕێز و سلاوم

ئەگەر هەڵگری[1] بتوانێ: هکدا تکلم زرادشت و

اربعة قرون من تاريخ العراق- تان بۆ ئەنیرمەوە

هەر بژی

براتان

محەمەد حەمە باقی

١٩٩٥/٢/٢٥ سەقز

---

١ (نەنووسراوە نامە)

ئەدەبێکی بەرەنگاری و...

نامەی محەممەد حەمە باقی بۆ لەتیف هەڵمەت

برا و هاوڕێی شاعیر و خۆشەویستم

کاکە هەڵمەت

ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستی و سڵاوی گەرمم! بە پەرۆش و تاسەوە ماچت ئەکەم و ئەتنوسێنم بە سنگمەوە.. بیرت ئەکەم و ئەبوایە، بێ رەحمی هەردووکمان وا نەبووایە، بەڵام تۆ زۆرتر بێرەحم تر بوویت لە من و لە دوورەوە گوێت لە ناحەزانی هەردووکمان گرت.. من لای خۆمەوە، وێنەت لام چۆن بووە، هەروا ماوەتەوە و هەر خۆم بە نزیک و برات زانیوە، هەرچەندە ئەم پێشەکییەشی نە ئەویست، چوونکە ئەبێ لەم وردە شتانە گەورەتر بین، بۆیە لەگەڵ کاک نەوشیرواندا، ماوەیەک لەمەوبەر بەرنامەیەکی ئەدەبیمان ڕەنگ ڕشت، بە پشتیوانی ئیوەومانان بڕیارم دابوو لەگەڵ نامەکەی کاک نەوشیرواندا، خۆشم دیدەنیت بکەم، داخەکەم هێشتا بۆم نەرەخساوە، زۆر حەزەکەم لە نزیکەوە بتبینم، بەڵام ناشوکری نەبێ وەکو جوانەمەرگ بوونی زۆر هیوا و ئاواتمان، وتم نەک نەتوانم بەم زوانە، بیبینم، با پێشەکی ئەم چەند دێرە هەڵەشەیەی بۆ بنووسم، بە ئومێدی ئەوەی لە داهاتویەکی نزیکدا دیدەنیتان بکەم، دیارە هەڵگری نامە سەبارەت بە بەرنامە ئەدەبییەکەمان، لە نزیکەوە قسەت بۆ دەکات.. هیوادارم بەرنامەکەت بە دل بێت و بەهەمورمان بتوانین، ئەدەبیکی بەرەنگاری و رەسەنی نەتەوەکەمان، لە ناو گێژاوی هەندێ نووسینی شێواو، و بێ هودە و، بەرەڵا جیا بکەینەوە، و جیاکردنەوەکەش، هەلبژاردەی ئەو نمونە پاکانە بن، کە لە هەناوی ئاوات و ئازاری گەلەکەماندا، سەریان هەلداوە، و بە هەموو مانای وشەوە، -سەر بە بەرەی ڕاستەقینەی گەلە- دیارە بی رووپامایش ئیوە لەو شاعیرە رەسەنانەن، کە جیی شانازی چەوساوەکانی کوردستانن، و بە شانازییەوە پێمان خۆشە، جیگا دەست و بەرهەمتان لەو

بەرنامەی ئەدەبییەماندا دیاربێت و هەر پێشنیار و رەخنە و سەرنجێکتان لەم
رووە  هەبیت، بفەرموون ئاگادارمان بکەنەوە.

جاریکی تریش ماچت ئەکەمە و ڕیز و سڵاوی هاوسەر و هاوریی شاعیرمت پێ
ئەگەیەنم، ڕیزی زۆرمان بۆ هاوسەر و برادەرانتان..

دووبارە ڕیز و سڵاوم

هەر بژین

**گەر بۆتان کرا، سەلامی منی پی بگەێنن...**

نامەی محەممەد موکری بۆ ڕەووف بێگەرد

برای گەلێ خۆشەویستم کاکە ڕێبوار [ڕەووف بێگەرد]

ڕیز و سلاوی گەرمم هەیە، داوای سەرفرازیتان بۆ دەکەم، گەلێ بیرتان دەکەم، بە هیوام هەمیشە کەیف خۆش و سەلامەت بن.

براگیان لە ١٤-٢-٩٨٧ نامەیەکتان نووسیبوو لە ٢٠-٢-٩٨٧ گەیشتە دەستم هەر دەست بەجێ چوومە لای برای بەڕیزو خۆشەویستمان.. ئەویش بەپێی ڕەوشتی بەرزی خۆی و دیدی مرۆڤدۆستانەی: پێی وتم بچۆ بۆ بەرگەلو بزانە چی ئەوێ بۆی جی بەجێ بکە "بۆ ئەوکەسەی کە داواتان کردبوو -کابرای تیزلاوی"[١] هەروەها ١٠٠دیناریشی دامێ سەرف کەم. جگە لە چەندین جەریدە و موجەلە. دیارە ئەم کارەی مامیش[مام جەلال] ئەوە دەسەلمێنێتەوە کە چەند دڵسۆز و خەمخواری ئەدیبانە، بۆیە جێ ڕێز و سوپاسە. خوشکی "کابرای تیزلاوی" کاغەزیکی ناجۆری بۆ براکەی نووسیوو

بە کورتی نوسیبووی "ئیمە دەتوانین کاری بکەی بەربیت.. ئەگەر

---

[١] مەبەست لە "ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل"ە، لەگەڵ دکتۆرێکدا لە دوزەوە هاتبوو، بۆ بەردانی برایەکی ئەو دکتۆرە کە زابتی تەنوییەی تورکمان بوو، بێ تاوان گیرابوو.

بەربووی لێیان پرسیت چۆن بەردرای، بڵێ کەسیک دەمامەکی کردبوو چەکدار بوو چبووە[چووبووە]ماڵی پارەیەکی زۆری لێوەرگرتبوون، هەروەها تەهدیدیشی کردبوون کە دەنگ نەکەن"!!

بەهەرحاڵ لەم ڕووەوە بێ خەم بە ئەوەی بە ئێمە بکرێ بۆ ئێوەی دەکەین، بە کورتیەکەی کابرا –ئێستا وەزعی زۆر زۆر باشە.

براگیان: گلەیی ئەوەتان کردبوو کە بۆ نامە نانووسین، ئێستاش بە دوو دڵی یەوە ئەم نامە دەنووسم، نەک لەبەر خوانەخواستە هیچ شتێک. تەنها لەبەر خاتری ئێوەیە و بەس. لە نامەکەتان هەواڵی جوامێرتان [شێرکۆ بێکەس] پرسی بوو- منیش هەر ئەوەندە دەڵێم و بەس. تەنانەت خواحافیزیشی لێ نەکردین، دیارە لە لای خۆیەوە سەبەبێکی بۆ ئەم کارەی هەیە! لە ڕووی عارەقەوە باشین و باشیش نین، گەر نەبێ بۆ ئێمە بۆ صیحەت بۆ زاکیرە و شتی تریش باشترە!

ئەو برادەرانەی کە لە نامەکەی ئێوەدا سلاویان لێ دەکردین و هەواڵپرسمان بوون، ئێمەش هەواڵپرسیانین.

ئەو برادەرانەی کە خۆتان سلاوتان بۆ ناردبوون، حەمە کەریم و باوکی ستران _بە گەرمی یەوە سلاویان بۆ خۆت هەیە و بە دڵسۆزیەوە هەواڵی ساغ و سەلامەتیت دەپرسن.

براگیان: رەنگە هەست بەوە بکەن کە زیاد لە پێوستی هەست بە غەریبی بکەین، بۆیە وا نامەکەمان وا بێ تام و چێژە. ئەگەر ئەم هەستەتان لا درووست بوو، ئەوا تکام وایە "هەندۆکەییک" هەقمان بدەنێو هیچی تر.

ئەگەرچی ئەم داوایەمان زیاد پێویست عاطفیانەیە، چی بکەین ئینسانین و ئینسانیش لە عاطفە دابڕ بکرێ ئیدی شعور بە ئینسانیەتی خۆی ناکات... ئێمە چمان لەو هاوڕیانە ناوێ "جگە لە نامەییک، هەواڵپرسینێ، سەلامێ" دیاریشە لەم سەردەمەدا -کە وەک بێ ئاگاییک لە ئەتەکێتەکانی سەدەی بیست- داوای عەشایەریانە دەکەین پەکو لەو غوربەی تووشی بووین..

کاکە ڕیبوار: قەت حەزم لە گلەیی نەبووە. بەڵام بۆ ئەم وەزع و حاڵە، دەبێ گلەیی بکرێ و ئەڵبەتە کە گلەیی لە دۆستان و خۆشەویستان دەکرێ..

وەزعی ئێمە "ئێ"!

وەزعی دەروونیمان "هەر ئێ" و هەموو شتانەکانی دیش هەر"ئێ ی" دەوێ! هەواڵی هەرەستان[1] پرسی بوو، چاپی بەشی دووەمی لە تەواو بووندایە.. شارم خوێندەوە و بەو شتانەشی لەسەری نووسراون -ئەوەی بەردەستم کەوتبێ- خوێندمەوە. شار [1] -شتە، شایەنی ئافەرین و دەستخۆشی یە. بریا ئەو "صیراعەی نێوان گەلاوێژ و مریەم بەرجەستە تر دەکان.. ڕەسمی مریەم زۆر جوانە.

تێکڕای ڕۆمانەکە چاکە، تاکە عەیبێکی ئەوەیە کە بۆتە دەستکەلا بۆ خەڵکانی 'کە ڕۆژانی خەبات و قارەمانێتی و خێرخوایی خۆیانی پێ دەرخەن و بڵێن: چاکی وەبیرهێنایینەوە ئێمەیش لەو سەردەمەدا -بە کێلی قەبری باوکی ڕەحمەتیانەوە بنازن!" نوسەری[گۆڤاری نوسەری کورد] ١٣ دەرچوو.

ڕێز و سلاوی گەرمم: بۆ تالەی (تاهیر سالح سەعید) خۆشەویست و مچە (مستەفا سالح کەریم) و باقی برادەران.

سەرکەوتووبن

موکری ٨٧/٣/١٤

لە نامەکەتا هیچ هەواڵێکی ئەحەی [ئەحلام مەنسوور]تیانەبوو

بەسەراجدا نامەیەکم بۆ ناردبووو نازانم

گەیشتتە دەستی یان نەء.. بەهەر حاڵ من وام چیبکەم

---

[1] محەمەد موکری، هەرەس، چاپی یەکەم، ١٩٨٧.

خۆزیا دەمتوانی زوو بڕیار بدەم و زوویش شتە سەرەکییەکانی

تەمەنی خۆم حەسم بکەم.

دیارە ئەم قسەیەشم یان لە بێ دەسەڵاتی یە یا

هەر خەون دەبینم.

برا خەونیش خراپ نییە.. گەر بۆتان کرا-

سەلامی منی پێ بگەیێنن..

ڕێز و سلاوم

بۆ دایکیی میدیا و هەموو منالان هەیە

سلاوم بۆ کەمال هەیە.

---

[1] حسێن عارف، شار، بەرگی یەکەم, مطابع شركة الاديب البغدادية, الطبعة الأولى, ١٩٨٦.

**تەنانەت؛ پەنجەکانی پێمان پەناهەندەی پێڵاوە!**

نامەی محەممەد موکری بۆ ڕەووف بێگەرد

برای بەڕێز و هەرەخۆشەویستم کاک ڕێبوار [ڕەووف بێگەرد]

هەمووکاتێکت شاد..

براگیان.. ئێمە لێرەدا دەزانین ئێوە لە چ دۆزەخ و لە چ دڵەراوکەیەکی سەیردا دەژین، هەر بۆیە نامانەوێ بۆنی نامەکانمان گەنیوی شتە تۆپیوەکانی، ئەم سەردەمەی -کەبە هەڵە تێیدا لەدایک بووین- یان لێتانی دەشارینەوە!- شتەکانتان وەکو خۆی بو بنووسین ئەویش لەبەر:

١. خۆتان بێ خەم نین تا ئێمەش بە باسکردن و گێڕانەوەی (شتە نەکردەنییەکان) وابکەین بێز لە خۆتان بکەنەوە و تفیش بەرەوژووری خۆتان هەڵدەن.. هەرهیچ نەبێ ئێوە تفەکانتان ڕووەو خوارە و ئەوپەڕی داوێنتان پیس ئەکات، باوەڕتان هەبێ (نێوچاوانی ئێمە) بە تفی خۆمان هەند سواق دراوە، پێم وایە ڕوی ئەوەمان نییە، تەنانەت لە ئاوینەکەدا سەیری خۆمان بکەین. پێم خۆشە هەر کە ئەم چەند کەلیمەیەت خوێندەوە تفیکی خەستمان بۆ ڕەوانە بکە... چونکە گەلێ موستەحەقین! هەر خۆمانین حەزمان بە ڕسواکردنی خۆمانە -پاش ئەوەی سەرگەڵومان بەجێهێشت- باوەڕت هەبێ ئەوەندە زەلیل بووین- هی ئەوە نییە لەم نامەیەدا باسی بکەم کە چ کەسانێ، بە چ سوکییەکەوە سەیری چ کەسانیکی ئێمەیان دەکرد. هەر لەو ڕۆژانەدا، لە گرتنەوەی فاو بە سەقزدا ئیجازەیان بۆ پ.م. ەکان نەدەکرد، بە ئەوپەڕی ڕاشکاوییەوە دەیانگوت: ((ئیجازە نییە.. ئێمە چ کاریکمان بە ئێوە نەماوە!)). زەلیلی و بێ سەروبەری، جگە لەهەندێ شتی دی کاریکی کردووە مەگەر هەر ئەو خوایە بزانێ دەروونی (هەندێ) لە خەڵکان چ دۆزەخێکە (خوا ڕەحمی بەوە کردوە لە شارەکانا، مەیخانە و قەحپەخانە نییە، دەنا تاقە نەفەرێک ئامادەی گەڕانەوە نەبوو) ئێوە کەیفی خۆتانە ئەگەر بەبێ ورەم بزانن، بەڵام من بۆ خۆم و بۆ کەوی کردنی ناخی خۆم (ورەم پەروەدە

دەکەم) ڕەنگە کار بگاتە رادەییک، بە تاقە نەفرەی، بە سەرە لیشیواوی دیوانەئاسا لە شاخەکاندا بمینمەوە.. تۆ سەری خۆت -چرتێ بۆ ئەم ورە بەرزییەم بکێشە دڵنیابە لێرەوە گوێم لێ ئەبێت.

٢. چی بێ لە ئیوە نهێنی، سەرتای ڕۆشنایی مانگ هەر لە ئیوارە دیار نییە؟ بۆ ئیوە نەتاندەزانی؟ نەتاندەبیست -ناشوکری نەبێت کەس بەکڵاوی ئێمە گو ناپێوێ. نەماندەوێرا قسان بکەین، شتێ بنووسین، پیشەکی دەکەوینە بەرتانە و توانجی ئیوە!

بۆیە لە نامەی پێشووماندا، وەک ئیوە دەڵێن گوایە لە نیاگار و شانزالزیدا نووسرابێ ئاوهابوون! چ شتێکمان باس نەکردوو.. ئێستاش کە ئەم چەند دێرە بێ سەرووبەرەتان بۆ دەنووسم قەناعەت بکە: هەر ئەم چەند ساتەیە تا نامەکە تەواو دەبێ خۆم بە ئینسان دەزانم. دەنا پاش لێبوونەوە، دەچمەوە دۆخی خۆم!

کەسێکی گەوج لە بازاڕی جامبازاندا سەودای پێوەدەکری، بووەتە قوربانی ناعەدالەتی، کەچی من و هەمووکەسانی وەک من ئاسایش پێبزانین یان نەء بەشدارین لە تاوانی ئەم ناعەدالەتییە، چوونکە بە غەشیمیی و نەزانییەوە بەشداری گەمەی چاوشارکێی (سەدەی بیستین)کە هەرگیز لە رەسم و دەستووری ئەم گەمەیە حاڵ ی نیین.. ئەمە پاکانە نییە تەنها ئیعترافە بە گەوجایەتی خۆ کردن شفاعەت لە ساتە (لە ساتە ئینسانییەکانی خۆ بخوازین) کەسانی وێڵگەردی ئێمە ئاسا خۆزیا بەوە دەخوازین، شەوێک، تاقە شەوێک بێ ترس، بێ دڵەڕاوکێ، بێ لەرز، دوور لە تۆپ و کیمیاوی، دوور لە نازانم چی.. تەنانەت دوور لە نانێ گەرم.. سەر بنێینەوە.

دوێنێ هەر ئەوەندەم تاقەت هەبوو، لاپەرەکەی پێشووی ئەم نامەیم نووسی، سەرتاسەری ئەمرۆ بیرم لەوە ئەکردەوە، ئاخۆ زەروورە ئەم شتانە بنووسم یان نەء؟ سەرەنجام هاتمە سەر ئەو قەناعەتەی: دەبێ کەسانی ئیوەئاسای خۆشەویست بەئاگابن لە هەندێ ڕووداوی پشت شکێن، کە بەهەزار فرت و فێڵ و پاکانەی بێ سەروبەر ئەنجام دەدرێ... دیارە ئێمە دەبێ هەر شاهیدی هەرەس و داتەپین بین، دەنا بێزاری هیچ و پووچی و احمقی بێ سەرووبەری

ئێرانی دۆزەخ و خوێنمژانی کورد، کەی هی ئەوەیە مارکسییەکانی ئێمە کرنوش بۆ عەمامەکانیان ببەین! توخوا مارکسییەت و ئەم کارەیان کەی وتوە؟ ئێستە پێم وایە تەنانەت، پەنجەکانی پێمان پەناهەندەی پێڵاوە، پێڵاوەکانی پێمان پەناهەندەی رێیە، رێش هەر بەرەو بارەگای خۆخۆری و مەزاتخانە گەورەیەکە. ناخۆشترین حاڵەتی ئینسان لەوەدا بەرجەستە ئەبێ، ئینسانەکە چەکی پێبێ و لە ناخدا هەرەسی هێنابێ.. ساڵی ۱۹۷۵ ئاشبەتاڵ کرا، گوتمان خەتای... کەچی هەر هەمان خەتا دەکەین و ریش بەردەدەینەوە، بۆ ئەوەی قەحپە و گەوادەکانی دنیا بەریشمان پێبکەنین، کاکە ریبوار پێت وانییە کوردبوون تاوانە؟ چیبکەین: چ سەنگەرێک بکەینە پەناگا؟ ئەوەی ئەمڕۆ سپییە، سبەینێ تەنها سپی بوو ئەوەی ئەمڕۆ بە ئاگایە سبەینێ ئەوەی لەبیرنەماوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بۆ ساتەوەختێ وریابووە. پیم وایە گەوجایەتی بە میراتی بۆ ئێمە ماوەتەوە و دەبێت بە گەوجی لەدایک ببین بەگەوجی تەمەن بگوزەرینین و رەفتاری گەوجانە سێبەرئاسا بەدوامانەوە بێت. کاکە ڕێبوار بمبورە کە دەڵێم کوردبوون تاوانە! تاوانەکە خەست ترە بۆ ئەو کوردە خۆت گوتەنی لوتی وەکو لوتی مشک بێت، هەست بکات و بزانێ چی لیدەکەن، قەناعەت هەبێت پیناکەین ئەگەر ختوکەمان نەدەن، ناگرین ئەگەر فرمێسک لە چاوانمان نەدۆشن، نازانین بیربکەینەوە ئەگەر بیرمان بۆنەکەنەوە، تەنانەت خەونیشمان بۆ دەبینن..

براگیان: دڵنیام لەوەی کە چ شتێکی نوێم نەگوتوە کە ئێوە نەتانزانی بێت، یان هەستتان پێنەکردبێ.. برا، دەردەدڵە دەردەدڵ! جا ئەگەر لای ئێوە دەردەدڵ نەکەین ئیدی دەبێ بتەقین.. دەشێ ڕۆژگار بەخت، ڕێکەوت.. هیچی دی نا.. بمانکاتە (شتێ) دەنا هەر سەگ و سەگبابەکەی جارانین، ئەحمەق و مەلعونین. هەر یەکە و تەختێکی شەترنجمان پێیە، ڕەش دەکەینە دووژمنی سپی بۆ ئەم کارەیش بە دووی پیادە و فیل و قەڵا و ئەسپ و کەر دا وێڵین.. جا لە وڵاتی ئێمە دا چ شتێ هێندەی کەر زۆرە!! خۆ خوا نەیبڕی ئەگەر قیمەت بکات، بەشی هەموو وڵاتانی دنیا دەکەین!

ئەرێ نەتەوە یەکگرتووەکانی چی؟ پێت وانییە ئەندامانی ئەو کۆمیسیۆنە وەک ئەدیبانی دەرێن و چ کەسێ گو بە کلاویان ناپیوێ.!؟

برا ئەوە ئێستا پێکی دووەمی عارەقەکەی ئێوە هەندێ لەو هەستە ناسک و دەگمەمانەی پێ بەخشیوم، دڵم بە خۆم و هەموو ئەو گەوجانە بسووتێ کە من ئاسا ئەحمەقن لەم سەدەیەدا داوای ئاسودەیی و شادی دەکەن و دەیانەوێ بەهەڵەداوان وەدەستی بێنن، تۆ بڵێی پلەی کەرایەتی لەمە بالاتر هەڵبچێت: کورد بیت و کوردستانی و رەفیقە هەر خۆشەویستەکەت لەلای (ئاشەگاوی) لە دایک بووبێ و هەموو خەم خواردن بێت و دوژمنێکی سەرسەختی خودی خۆی بێت و مامەخەمەی سەردەم بێت.. داوای خۆشی و شادی بۆ ئینسان بکات؟!! ئەری کام ئینسان.. چ ڕۆژێ گورگ و ورچ وشێر پەلاماری نەداوم؟ هەر.. هەی قوڕبەسەر.. نازانم چی..

هەندەم داخ لە دڵدایە، هەند پەست و بێ تاقەتم، ڕۆژبەڕۆژ لە کەرایەتی بەرەو هێستری دەچم، بار قورستر و ڕێگای سەخت تر، ئاشنای پشتی ئیمە و...... دەبێ هەر قاچاخچی زیرەک و وریا بزانێ چۆنمان ئالف دەدات چۆنیش قاچاخچێتیمان پێدەکات..

گەلێ بیری تاله [تاهیر سالح سەعید]دەکەم...

چاوانی ماچ ئەکەم، خۆشم ئەوێ هەروەها مچەو حەمە تاڵیش ئیدی ئەگەر جەلیلیشی بچێتە بانیان (من زەرەر ناکەم) دەنا ئەوانی تر دەناسم، دەناسم و بەس دەتوانم بڵێم، ڕەفیقن..

براگیان: ئەو برادەرەی ناوت نووسیبوو ((ملازم....)) جارێ ئێمە دوورین سبەی دەگەڕێینەوە،، سێ ڕۆژ ڕێمان لەبەرە، بەهەر جۆرێ بێ ئەگەر لەلای ئێمەدا بێ دەیدۆزمەوە. ((ئەگەر مابێ.. ئەوا، بەری دەدەین)) بەهەرحاڵ خوابکا مابێ و بەناحەق نەکوژرابێ، ئەوا دڵنیابە تا بەربوونی ئامادەم سەربەستی خۆم دابنێم..))

حەمە کەریم، قەساب (فازڵ قەساب)، ڕێزو سڵاویان بۆ خۆتان و ئەو چەند برایەی کەلەنامەکەدا ناوم هیناون هەن!!

براگیان : ئەمەیشت تەنها بۆ سەر ئێشتاندن بۆ دەنووسم، ڕەنگە هەنە[هێندە] (گرنگ نەبێ) و بەلای ئێوەشەوە هیچ نەبێ مەبەست نەبێ ئەویش گۆڤاری کەلتوورە؟

ژمارەیەکی بە ٤٢٠ لاپەڕەی فلسکاپ دەرچوو لەبەر وەزع و حاڵ هەمووی بڵاونەبووەوە. چەند ژمارەیەکی نێردرا بۆ ئەوروپا و یەک دووژمارەیشی ئەمسەر و ئەوسەری کرد.((هیچی تر)).

ئێستا دانەیەک لە دەفتەری سیاسی برادەران هەیە بەهۆی مامە قالەوە (تالە) دەتوانی داوای بکەی، هەر بۆ سەیرکردن و ڕێنمایی کردنی ئێمە، ئەوە ژمارە دووی خەریکە..

هێزم نەما چیتر بنووسم

شادبیت

١٩٨٨/٥/٢٥

زەوی خوابەرینە موکری

**ئەری خەونی ناخۆش بە ئەحەوە دەبینم!**

نامەی محەممەد موکری بۆ ڕەووف بێگەرد

برای بەڕیز و خۆشەویستم کاکە ڕیبوار

هەموو کاتێکتان شاد..

سەربەرزیتان بۆ دەخوازم، گەلێ بیرتان دەکەم، زۆریش بێ تاقەتین.."تەنها" صحەتمان هەندێ باشە؛ "ئێستا بەهارە، فەسلی... ئێمەیش بۆ خۆ، (مەبەستم تەنها خۆمە) تێپەڕبووین"، ئەلەوەڕین و ئەزەڕین، جارجارەش تانە و توانج لە خەڵکیش دەگرین. بۆ؟ نازانم.. تا مانگ و نیوێک لەمەوبەریش گەلێ بە زەلیلی کەوتینە بەرچاوی خۆ.. جار جارە هەندێ دڵی خۆ بەوە دەدەینەوە کە گوایە: "هێشتا" کەر و ئەحمەق و بێ تەجرەبەین، چ جارێکیش نەخەڵەتاوین، یەکەمجار و هەر ئەوەندەی لێ دەزانین!! چ بکەین ڕۆژگاریش پشتی تێکردووین، خوا دۆست و دووژمن بگرێ –نەکەون- ئێمەیش چش! برا ئەوەی نەدەشیا، بوو.. ئەوەی عەقڵ نەیدەبڕی کرا! ساتەوەختەکانی دوو مانگ لەمەوبەر هی ئەوە نین بەهیچ جۆرێ لە یادکرێن بەفر و برسێتی شەو و ڕێگا، کارێکی ئەوتۆی پێکردین، نەکردەنی یە! بە چاوی خۆ دەیان دایکمان بینی کوڕ لە نێو بەفردا جی ی هێشتبوو، باوک منالی جێدەهێشت ژن بە خۆ و منالەکانیەوە وەک مریشکە کڕ بالی بەسەر منالی ڕەقەوەبوو دا گرتبوو..

جگە لە هەندێ شتی سەیر تر و..

بیستمان گوایە (تەعزیەیان) بۆ ژوانە دانابوو، لەم ماوەیە دا ڕەوەند و ژوانە و هەردوو منالّەکەیم بینی گەلێ باشن و سلاو ڕیزیان هەیە.[1] چەند ڕۆژێ لەمەوبەر خاوەنی "نغرۆ"م بینی هەوالّی ئیوەی پیگەیاندم.. ئەوەیشم بیست "خاوەنی ئەسپ" مەبەستم بارگیرە نەک ئەسپی ڕەسەن! بۆ ماوەی مانگی بە ئارەزوو چ بوە خەلّوەتەوە عیبادەتی بۆ زۆ لیکراوان[2] کردووە.. کوڕەکەی لە دیمەشقەوە نامیێکی بۆ ناردووم پیدەچێ وەزعی زۆر باش نەبێ. ئیستا بە میوانی لەلای برایانم ماوەێک لەمەوبەر کوڕەکەی "بەخوا دەچم" هاتبووە لای ئەمان و (ح.د) سەردانی کردبوون!!

براگیان.. جارێ دوانە.. بەر لە یەک دوو مانگ سەردانی خیزانەکەی جوامیرم [شیرکۆ بیکەس] کرد، وەزعیان باش بوو، وا دیارە جارێ نەکەوتونەتە ڕێ..کاکی برا: ماوەییکی زۆرە چ ئاگام لە مالّ و منالّ نیە، چەند ڕۆژێ لەمەوبەر "٥٠٠" پینج سەد دینار (ساندە[3] و دوو سەعات و هەندێ ورد شتم ناردەوە..ب ەلام گەلیکیش چاوەڕیم کرد چ وەلامیکم پینەگەیشت، شتەکانیشم بۆ دەستی خیزانەکەی کاک حەمە کەریم ناردبووەوە) ئەگەر بەزەحمەتی نەزانی لە مالّی خۆمان ئەو هەوالّەم بۆ بپرسە و بزانە چی یان بە دەست گەیشتوو.. پیم وایە وەزعی مالّی ئیمە لەوە ناچی باش بن، ئەوا بە هەرجۆرێ بووە "٥٠٠" دیناری دیم پەیدا کردووە بە هەلّگری نامەدا بۆتانی دەنیرم، ئیوەش بیدەنە دەستی دایکم و شیرین ئەگەر بەم شیوەیە تەوزیعی بکەی گەلێ سووپاست دەکەم ٢٠٠ دایک ٢٠٠ شیرین ٥٠ ئاری ٥٠ ئاریان. جا ئەگەر بەهەلّگری نامەدا "نامەی خۆتان و نامەی مالّێ ئیمەم" بۆ بنیری ئەوا گەلێ خەم و پەژارم لە کۆلّ دەکەیتەوە..

---

[1] ژوانە و ڕەوەند مەبەست، لە نەجیبە ئەحمەد و محەممەدی حەمە باقییە، بە هەلّە وا بلاوبوو، کە سالّی ١٩٨٨ لە ریگای چوون بۆ کوردستانی ڕۆژهەلا کچیکیان کۆچی دوایی کردووە، کە دواتر هەوالّەکە هەلّە بوو و دوور بوو لە ڕاستییەوە.

[2] هەلّەی تایپ نییە و وەها نووسراوە نازانین زولّم لیکراوانە یان زۆر لیکراوان.

[3] ئەم وشەیە بەم شیوەیە نووسراوە و نەتوانرا ماناکەی لیکبدریتەوە.

تکام وایە سەیری وەزعیان بکە ئەگەر ئەزانی پیویستی دی یان هەیە، ئاگادارم کەوە تەنها دەتوانم هەندێ شتی تایبەتی خۆمان بۆ بفرۆشم و پارەکەیان بۆ بنیرمەوە. دیاریشە خۆتان دەزانن چەند پەرۆشی خوێندنی منالەکانم، ئەلبەت هاندان و ڕینمایی کردنی ئیوە کاری خۆی دەبینێ.

هەلگری نامە دەتوانێ یەک دوو ڕۆژ بمینێتەوە تا وەلام لە ئێوەوە وەردەگرێ، ئیمە لێرەدا هەر ئەوەندەمان دەرفەت هەیە تا سێ چوار ڕۆژیکی دیکە بمینینەوە، دەگەڕێینەوە بۆ لای "خۆمان!" ئەلبەتە هەر هەموو شتیکمان سووتا.. لەم حالەتەدا دەبێ بلێین چش!!"

براگیان لەگەل ئەم نامەدا "نامەییک بۆ کەریم کابان.. ئەگەر وەلامی نامەکە بە هەلگری نامەدا بنیرن ئەوا دلی ئەو برایەمان خۆش دەبێ..

گۆڤاریکمان بە نیوی کلتورەوە دەرکردووە بە دوو زمان عەرەبی و کوردی عەرەبی یەکەی تەنها بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردی یە. گۆڤارەکە قەوارەی گەورەیە ژمارەی لاپەرەکانیشی ٤٢٠ لاپەڕەیە مەبەستم "فولسکابە" چاپی مادەکانی ژمارە دوو خەریکە تەواو دەبێ ئەم رەنگە ئەم ژمارەیە لە ٦٠٠ لاپەرە زیاتر بیت هیچ مادەیەک نیە لە پەنجا فلسکاب کەمتر بێ.

شتیکی نوێم نووسیوە، لەم ڕۆژانەدا خەریکی پیاداچوونەوە و پاکنوس کردنەوەیم هەر دەرفەتم دەسکەوێ چاپی دەکە و دەیخەمە روو "چ دەبێ با بێ" ئەگەر دەکرێ هەندێ رۆژنامە و گۆڤار و دانەییک دووان، الشرقیەمان بۆ بنیرن تا بەیادی ئێوەوە شەوێک "هەلمانمژیت "!

ئەرێ خەونی ناخۆش بە "ئەحە" (١)وە دەبینم، ئەرێ چ هەوالیکی دەزانی؟ تکایە بۆم بنووسە.

ڕیزوسلاوم بۆ مالەوەتان، گەورەو بچووک هەیە، برایان حەمە کەریم و قەساب ریز و سلاویان هەیە.

ڕیز و سڵاوم بۆ برایان تاله (تاهیر ساڵح)، کەمال هەردوو "سێ کافەکە" ئەرێ یەکێتیکان بەرازیلی هەیە؟ سڵاوم بۆ مچە (مستەفا ساڵح کەریم) و حەمە تاڵ- ئامانجی کوری حەمەتاڵم یەک دوو جار بینیوە سحەتی باشە، هەر لەم نزیکانەدا بینیومە.

ئیدی نازان چیتان بۆ بنووسم، چاوەڕێی ئێوەم.

شادیتان..سەربەرزیتان

ئاواتمە

گەلێ پەرۆشی هەواڵم

وەڵامی ماڵی خۆمان و نامەی

خۆتانم ..دووروودرێژی

بۆ بنووسە

برات

موکری

١٩٨٨/٥/١٥

---

[١] ئەحە، مەبەست لە "ئەحلام مەنسوور"ی چیرۆکنووسە.

**له بارەی گۆڤاری شەفەقەوە...**

نامەی محەممەدنوری تۆفیق بۆ ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل

پایزە براکەی گەرمیانم ئەحە گیان ۲۰۰۰ /٥/۲۷

(................)، برا له بارەی گۆڤاری "شەفەق"[1]، ئەوەی من زانیاریم هەبێ گۆڤاریکی کوردی و عەرەبی بوو له سەرەتای ساڵی ۱۹٥۷ دا له کەرکوک دەردەچوو.. خاوەنی ئیمتیازەکەی عقیدی متقاعد شێخ عبدالقادر بەرزنجی بوو، له چاپخانەی "الشمال" چاپ دەکراو کۆمەڵی روناکبیری کوردی ئەو ڕۆژگارەی کەرکوک تیایاندا ئەنووسی. معروف خەزنەدار، ئیبراهیم ئەحمەد، عمر عارف.. عبدالصمد خانقا، معروف بەرزنجی که ئەمانە وەک دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە بوون.. دیارە نوسەرانی ئەو سەردەمانەش تیایاندا ئەنووسی.

ئەوەی من ئاگام لێ یەو خۆم تیادابووم ئەوەیە، که له دوای کارەساتی کەرکوک ساڵی ۹٥۹ گۆڤاری شەفەق که هەر بە دووسێ مانگ جاریک دەرئەچوو.. تەنگی پێ هەڵچنرا و شێخ عبدالقادر بەرزنجی کەرکوکی بەجێهێشت و چووە سلێمانی و گۆڤارەکەی دا بە عبدالله گۆران- ی شاعیر.. که ئەو سەردەمە ئەو سەرۆکی ئاشتیخوازانی سلێمانی بوو..

---

[1] گۆڤاری شەفەق له پێناسەکەیدا نووسرا بوو: شەفەق، گۆڤاریکی نیومانگی ئەدەبی و زانستی و کۆمەلایەتی کوردیە- جاری مانگی جاریک له سلیمانی دەرئەچێ. بۆ نموونە ئەم ژمار ەیە. (ژمارە ۳، ساڵی ٤، ۱۰ ئاب ۱۹٦۱) له کۆتا پەڕەی گۆڤارەکەش نووسرا بوو: خاوەن و لێ پرسراوی: عبدالقادر بەرزنجی، سەرنووسەر: محرم محمد امین، کارگێڕ: غفور رەشید..هەر لەو ژمارەدا بابەتیکی محەمەد نوری تۆفیق-ی تێدایە بە ناوی گیروگرفتی گۆڤار و ڕۆژنامەکان.

ئەویش گۆڤارەکەی ناوگۆڕی سوک و باریک لە "شەفەق"ەوە کردی بە "بەیان"[١] و بەرگەکەیان بە کۆتر رازاندەوە و دو سێ ژمارەی لە چاپخانەی کامەرانی لە سلیمانی لێ بڵاوکردەوە کە هەموو وتاری سیاسی و سەربەحیزبی شویعی بوو، نووسەرەکانیشی شویعێکان بوو.. لەبەر ئەوە پارتیکان مقاطعەیان کرد و نە ئەیانکڕی و نە تیایاندا ئەنووسی.. بۆیە خوالێخۆش بوو شێخ عبدالقادر کە لە دانیشتنێکی لە سلیمانی لەگەڵ "حمید عوسمان" رێکەوتبوون کە گۆڤارەکەی بداتێ و ناوەکەی بکەنەوە بە شەفەق و بگەڕێتەوە کەرکوک؟؟ بەڵام لەبەر ئەوەی بارودۆخی کەرکوک بەرامبەر بە کورد خراپە، با جارێ بە شێوەیەکی کاتی لە چەمچەماڵ دەربچێت، کەبارودۆخەکەی باشە و "حمید عوسمان" خۆیشی کارمەند بوو لە کۆمپانیای کات "C.A.T" کە ئەو ڕۆژگارە جادەی نێوان کەرکوک- سلیمانی دروست ئەکرد.. حەمید عوسمان هاتە لای من کە ئەو سەردەمانە لێپرسراوی لێژنەی ناوچەی "پ.د.ک" بووم لە چەمچەماڵ و مەسەلەکەی لەگەڵدا باس کردم، منیش زۆرم پێخۆش بوو کە بۆ یەکەمجارە چەمچەماڵ شەرەفی ئەوەی بدرێتێ کە گۆڤارێکی تیا دەربکرێت و خۆشم دەستەی نووسەرانی بم بۆیە بڕیارماندا کە ڕۆژانە دوای نیوەڕوان کاک حمید عوسمان بێتە بارەگای "خەبات" لەوێ مادەکان کۆبکاتەوە و رێکی بخات.. بۆ ئەو مەبەستەش ئیمەی گەنجەکانی چەمچەماڵ چەندین وتارمان ئامادەکرد و هەرخۆم سێ نووسینیشم ئامادەکرد کاک حەمید بەرەو کەرکوک کەوتە ڕێ و موادەکانی برد و زۆری پێ نەچوو شەفەق لە هەمان حەجم و کلێشەی پێشووەوە و دەرچوو.

---

[١] کاتێک شەفەق بوو بە بەیان، قەبارەکەی بوو بە نیو ئەیفۆر و وەک چۆن محەمەد نوری تۆفیق دەڵێت، هەروا بەرگەکەی وێنەی زنجیرە چیایەک بوو کە تیشکی بە پرتاوی خۆری لێوە هاتبووەدەر و لە ناوەرستیش دا کوترێک کە لە چڵە زەیتونێکی لە دەنوک گرتووە، دەبینرا، لە ژمارەیەکی نیسانی ١٩٥٩ دا لە پێشەکی ژمارەکەدا وەک سەروتار، باس لە ناوگۆڕین دەکات کە لە ناوی شەفەقی عەرەبییەوە کراوە بە یان و ئامانجی ئاشتیخوازانەش دەخاتەپێش چاو.

حەمید عوسمان سەرنووسەری بوو ئێمەش چەند کەسک دەستەی نووسەران و ، بەلام لە هەموو ئەو نووسینانەی ئێمە تەنیا کورتە وتاریکی منی تیابوو، ئیتر خوالێخۆش بوو حمید عوسمان هەموو نووسینەکانی خۆی بە ناوی جۆراوجۆرە بلاوکردبۆوە.. سەرەتا ئەوەمان بە لاوە ناخۆش بوو، بەلام کاک حمید وەعدی دا کە لە ژمارەکانی داهاتوو دا ئەو نووسینانەش بلاوئەکاتەوە، ئیمەش لەبەر ئەوەی کە نووسرا بوو "کە شەفەق گۆڤاریکی ڕووناکبیری گشتی یە لە کەرکوک، مانگی جاریک دەرئەچێ، بە شێوەیەکی کاتی لە شاری چەمچەماڵ بلاوئەکریتەوە" لەبەرئەوە گوێمان نەدایە و کارەکەمان بەلاوە هەر خۆش بوو.. ئیتر دەستمان کردەوە بە هاوکاری و کۆکردنەوەی نووسین بۆ ژمارەی ١٩٦١.. واتە ژمارەکەی پێشوو لە کۆتایی ١٩٦٠ دەرچوو.. ئیتر وەزعی کوردستانمان ڕۆژبەڕۆژ بەرەو خراپی ئەچوو.. ئەوە بوو بارەگای خەبات داخرا، خەڵکەکە پەرتەوازە بوو.. شۆڕشی کورد دەستی پێکرد.. ئێمەش ئەندامانی لیژنەی ناوچە هەمومان زیندانی کراین، دیارە موادەکانی شەفەقیش سەری تیاچوو.. ئیتر ئەو ژمارەیە یەکەم ژمارە و دووا ژمارە بوو لە چەمچەماڵ دەربچێت. بۆ ئاگاداریتان ئەم ساڵ لە یادی ڕۆژنامەگەری کوردی دا لە کوردستانی نوێ دا کاک سۆران مەحوی شتێکی لە بارەی ئەو گۆڤارەوە نووسی بوو و منیش لە ژمارەیەکی دواتر دا ئەم ڕوونکردنەوەیەی کە بۆ تۆم نووسیوە بلاو کردەوە ئەمە لە لایەک لە لایەکی تریشەوە برامان دکتۆر مارف خەزنەدار و کاک هیمدادی حسینی کە یەکەمیان خۆی ئاگاداری دەرچوونی شەفەقە و دووەمیان لە بوواری ڕۆژنامەگەریدا شهادە و دراسەی هەیە، لە بارەی شەفەقەوە شتیان لا هەیە حەزەکەم بۆ کەڵک وەرگرتن سەردانیان بکەیت و سلاوی بەندەشیان پێ بگەیەنە.. هەرکاتێ شتەکەشت بلاوکردەوە، گەرمیانیانە ئەحەیانە لەگەڵمدا ڕەفتار نەکەیت و نوسخەیەکم بۆ بنێرە !!

ئەزانی بۆچی وا ئەڵێم؟ ئەمە لە ئەنجای ئەو قسەیەی خۆتدایە، کاتێ کە رووف و من تۆمان نارد بو دەرەوە بۆ "شاخ".... هەتا بە دیدار شادبوونتان

خواحافیز براتان محمد نوری توفیق

**لەیل و نەهار بە مەحزوونی...**

نامەی محەممەد نوری کاکی بۆ محەممەد دلێر میسری

شکوای حال

بو جنابی عال المقام، عمدی کولیەی خاص و عام

لە پاش عەرضی سەلام و ئیحترام

ئەمە بۆ دەفعەی سێهەمە، بەندە نیازمەندبووم عەرصی مەغدوورییەت و گللەیی و گازندەم، ئەم جارەیان بە تەحریری نەک بە نوطق، وەک شەکوا و ئیستدعایەک بخەمە پێش نەظری جەنابتان.

سابقا دەمویست شەکوای حالم..... لای برای ئازیزو تەنیا بالم.

ڕەفیق و صەدیقی عەمەل و زەمان و متبیعی دیراسات و ئەلعولیام بکەم، ئەما هەر کە لە دیوەخانی شکۆمەندتاندا بە حضورتان شادوشوکر دەبووم، لوطفی طبع و سەخاوەت و بەساطەتی مەعالیتانم بە فیکر دەکەوتەوە، لە تەقدیمی عەرضی سکاڵام پەشمان و پاشگەز و نادیم دەبووم، بە عیللەتی ئەوەی چەند جارێ بە غەیری موباشیر، مامەعناهو بە جەوابێک سامع دەبوم "بۆ شوکری باری تەعالا ناکەی..ئەو روخصەتی سەفەرەی بە ئێوەیە..موقابیلی تەخت و تاراجی هەموو عالەمە..!"

قوربان ڕاست ئەفەرموون، فەقەد وەلەقەد، کێ بە حاڵی کێ دەزانێ؟ مەعلومی جەنابتانە مودەتی ٢٤ ساڵە ژنێکم تەزویج و تەنکیح کردوە و صاحێبی سێ طیفڵ و کوڵفەتم، ئەمما ئەو جاهیلانە بە حەیات و عەیش و گوزەرانی وەطن ڕاضی نین.

منی بێ ماڵ و حاڵ.. پیرو مەهتوک و ڕەجاڵ، لێرە لێیکەوتووم، لەیل و نەهار بە مەحزوونی خەریکی دڵ نەوایی و موراعاتی خوشک و خوشکەزایەکی رەشپۆش و تەعزێبار و کۆسکەوتووم. بەهەرحاڵ با بێنەوە سەر وەظیفە و عەلاقە و

ئموری ئیداریمان، دوای ساڵیک کە رووم کردەوە دایکی وەطەن و هاتمەوە ژیر رکیف و مەرحەمەتی ئیوە و برادەران و لەو عانەدا وەظیفەی نائیبی جەناب عالیتان شاغیر بوو، ئای لەو خەیاڵەی بەندەی کاڵفام و عەقڵ نوقصان دڵی خۆمدا ئیش و ئوموری ئیوەم ڕادەپەڕان و مەعاوەنەتم تەقدیم دەکردن، ئای نەیخۆی ئەوە بۆ پیاوی خۆی..! مەعلومی جەنابتانە و ئەیهینمەوە فیکر و زاکیرەیی جەنابتان، لە ئەواخری قەڕنی ماضی لە سالانی ئیبتیدای جامیعە، عەلاوەتەن عەلا مودەریسەکەم، هەم موقەڕیر و هەم موسەجیل بووم، خیرلی بوو کە مودیری تەسجیل شاغیر بووم ضەنم وابوو عەمیدی برام، من بە موستەحەق و قابیلی ئەو مورتەبەیە دەزانێ و حەتمەن دیتەوە فکری

(مابعدو)

لە ئیجتماعی حیزبی و تەشکیلاتی قۆمیتە پشتگیرم ئەبێ و تەزکییەم ئەکا و بۆ موستەجیلی عام تحریکم ئەکا. هەر نەبێ بۆ مودیر ول مەدرەسەی مەسائییە تەعین و تەرقیەم پێ عەطا ئەفەرمێ. ئەمەشیان نەخیر سەهوە تەخەیولت. جەنابی عەمید عەفووم بفەرموون، ئەمانە هەر هەمووی لە بابی سوحبەت و کەیف و تەلەطوف و تەشویق بوون . ئەمما:

سەبەبی ڕەئیسی ئەم عەرز و حاڵە      تەنها ئەم دووانەی و هەمووی بــەتاڵە

یــەک دوو حەفتە لەمـــەوبەر      درۆناکەم لە حزورت  بە حضرتی پیغەمبەر

لــەبۆ ئەو بیست و حەوت هەزارە      چوومە ژووری حسابات و یۆقڵەمەی پارە

لە مەغدورییەتم سوئالم کرد، ڕەدەن چەند قسەیەکی ساردم تەوجیهـ کرا، بە لائیقی طەبع و عیزەتی نەفس و نەزاهەتی خلوقیەتی خۆمم نەزانی، بینائەن عەلەیهی قەراری صەمیمیم دا قەطعەن سەرنەکەم بەو شوعبەی حیسابات و صکوک و نقودەدا.

لوطفەن ئەگەر یەقینت نییە، تەدقیق بفەرموون، لە ئیقرارێکم خیلافک هەبوو حازری هەموو جەزا و سزایەکم، ئەوەندەش ئەرجوو ئەکەم، ئەو چوار عانەیەم بە پۆصتەچی یەکدا بۆ حەواڵە بکەن.

خوا راوەستاوتان کات، ئێمەش پاڵکەوتوو

بەڕۆژ لە زانکۆ و بە شەو حەرەسی خەوتوو

الحمد و الشکر لەگەڵ مودەعی عەلەیهی تەصالوحمان کرد و فەقەت بە قوبلە یەکترمان تەعانوف کرد. ئەمە نوقطەی ئەوەڵ تەواو. ئەمما ثانیەن، مەحالە حەلی عوقدەم لە کنتان بێت، بەلام لە فەیزی رەحمەت و کەرەم و شەفەقەتی جەنابتان موطمەئینم، لەم طەڵەبەم مەئیوس نابم، هەرچەندە حەقیقەتەن من پردی تەحەمولم زۆری مابوو، خۆم نەمدەویست، لە حزورتانا ئەم طەڵەبە بکەم . ئەمما دوو ظاهیرە بوونە سەبەبی تەدەفوقی ئحساساتم. ئەوەلەن وەک بیستوومەطەڵەبەی سەنەواتی سابقە، لە مەسئولیکی رەفیعول مستەوایان داواکردبوو، کە سەدی حاجاتی شەهوانی و تەقاضای ڕەغبەتی جنسییان بکەن. منیش، حاشاکی قارئین و السامعین، مەدی هەیەجانی داخلیم، و زغوطاتی کەفوکوڵی مەخزون لەئەعماقی خەصیتەینەما، کە لە طەڕەف ئەو ڕەفیق و صەدیقە ناموافیقەی مابەینی ساقەینما، وەقتێ کەیەرەق ئەبێ، بەسەرما غالیب ئەبێ و توشی ئەم غەلەتەی کردم، لیزا تا بۆتان مومکین دەبێ، بۆ دەفعی حاجەتی بەندەی تابیع و مەنسوبتان موسریعەن سەعی و جەهدێکی موشفیقانە ئەنجام بدەن، و بە مەزهەبی تەشەیوعیش بێت حەلی مەسئەلەم بفەرموون، ئەجر و صەوابتان لای خوداوەند بەزایع ناچێ ئینشاالله.

ئیمضای موستەدعی، کاکە حەمەنوور دوور لە ژن و ماڵ، لە وەطن مەغدوور

**بۆ شەرحی ئەم حاڵەم...**

نامەی محەممەد دلێر میسری بۆ محەممەد نوری کاکی

لە عەموودی پائمی عەمیدی ذوالشأنەوە

بۆ طالبی عیلم و موستەعیدی زەرقی ئیبەر

بعد سەلام، عەرزی إخلاص و تەمەننای

بەقاء فی ظل دنیای بێ بەقا خلاصەی

احترام و رجا و نەقدو انتقادتان بە سەمع و بەصەری

ذاکرەمان واردبوو، بعد التەفەکر، بە واجبی مەقاممان زانی کە رەددی إعتبار بکەین و خۆمان بۆ تنظیف، لە تۆمەتی سؤالظن بە ئاوی بەرائە

وەصل ئەدا بکەین.

بعد هذا بە حکومی تەذەکور و طولی صەداقەتی بێ ریا و حەسادەت کە بەندەی بە حەبلی غەلیظ و مەتین بە مەعالیتانەوە شەدد کردووە، مافي کیفایە، ئەتانتوانی بێ تەشریفات و مەظاهیری خیدعەباری دنیای فانی و لە هەموو لەحظە و ئەوقاتێکدا بە لطافەت و زەرافەت موراجەعەت بکەن وە قەهری مەغدوریەت بدەن بە سەمع و حس و شەمیم و احساسماندا. مطمئن بن هیچ جۆرە إلتفاتێکی ناقابیل و سؤالظن لە ئیمەوە اجرا نەدەبوو. مەعالیتان ئەی طالبو العلم و پەروانەی شەمعی شەبسۆزی مەعریفەت، واجبی طالبە دائما لە حضور مەطلوبدا بێت سوئال و إستفسار لە بەر بابی ئەصحابی حاجەت بکات، نەک بە چەند کەلامێکی مەعسولی تێکەڵ بە قعودێکی چەند لەحظاتێکی بێتە سەبەبی مەنعی موبتەغا و تەحصیلی ئامالتان.

نەفسی من هیچ لە ئەدای نوطقێ کە دەفەرموون: "بۆ شوکری باری تەعالا ناکەیت ئەو روخصەتی سەفەرەی بە ئیوەیە، موقابیلی تەخت و تاراجی هەموو.." بە غەرەز و لە بابی حەسادەت و قەولی مەجروحەوە بە لیسان و بە ذکر و ذەکەرمدا صادر نەبووە، ئەو قەولە لەصنفی شۆخی و صەداقەت جەرەیان بووە، هیچ ڕەبطی بە نەقد و انتقاد و شەکوای حال و ئەوزاعی ماضی و ئەاعان و موستەقبەلتانەوە نی یە. عەجەب ئەو ضرب و المثەلەتان بە عمق لە قەلب و زاکرەتاندا تەسبیت کردووە، وا ضەن ئەکەم بە إستعمالی ئەنواعی مەمحات مەحوو نەکرێ، کە ئەمە بەرامبەر بەندە غەدر و ظلم و ئیفتەرایە. کل مافي الأمر وەک تەذەکورم کرد، شۆخی لەطافتە، ئەگر بە غەیری ئەوە شەرح و تأویل بکرین، ئەوا سەد کەڕەت مەعزەرەت و هەزار جار مەغفیرەت، قلبم مطمئنة وەک تەجروبەی ضمان و عەمەل و تەحصیلی دیراسەتدا، قلبمان مرئاتی سەبری اغواری ناخمان بووە، بەندە لە غەیری سەفا و نەقا و خلوصی، لە خەزنەی ماضی و حاضرمدا مەتاعێکی تری وارد نەکردووە، بۆ شەرحی ئەم حاڵەم، خودای خالقی عەرش و قورش، عادل و حاکمی کلی بەشەر ئەکەمە حەقە وەسێنی ناحەقی و مەغدوریمان.

ئەڵبەتە لکل حادث حدیثە مەعالیتان طاحونەیە و بە غوباری دنیاو موشکیلاتەوە ئەبیەضە، دوبرتان ما شو هەن طالبی ماشن چونکە ئاشن، لکل قطعیا ئەو تەفکیرەم نەبووە.

لە ریسالە پڕ عطف و حنان و نەقد و عیتابەکەتاندا، سەطری ئەدای وظیفة جەلبی انتباهی کردم، بە واجبم زانی لەو مەوقیفەدا تەوەقوف بکەم و شەرحی حاڵی خۆم موختەصەر بیان بکەم:

اولا: طالبو العلم بە ئەمری فەوقی، لازمە مەشغوڵی مەتالابێت و بە قەراری قطعی بەلای وظائفێ کە جەلبی مەتاعب و مەصاعب بێت گوزەرنەکات، واقعا حاڵیم کە حالیا إستفسار ئەکەن سەبەب چی یە مدیر التسجیل لحد الآن طالبەو مەقعەدی قعودی ثابتە و تەزەحزوح ناکات؟

رەئسا جوابم حاضرە کە ئەو ذاتە مەتاعی ئەو قسمەتەی تنقیح و تەبیض کردووە و زیارت لە ٣ ساڵە شوائب لەو سجلاتانە دا إجراج ئەکات و بە ئەدای عەمەلی مومەیەزی بە شاهیدی عمومی محەل رەئیسی رەئیسی محەللەی مەرفوع کردووە.

ثانیا: مەسائیلی تری مەناصب و حەقائب کە جەلبی نەزەرن، فقط رەددی بەندە کافی نی یە، بۆ دەفعی مەرامتان بۆ مەقامی عالیتر، لازمە جەمعێ لەو ئەشخاصانەی کە مەعالیتان شارەزایان هەن، سەری رضاو پەنجەی مەوافەقەت بخەنە سەر طلب و موداوەلەی ئەو طلبە بکەن لە کلی ئەبعادیەکیەوە.

خلاصەی قەول، عطف و روحم و عەلاقەی حەمیمەی هەردوو طرف نابێتە تەزکیەی ئەصحابولطرف مطمئنم کە جەناب عالیتان لە عەرزم حاڵی یە!!!

ئەوەند غافڵ نیت نەزانی چ لە حەول و ئەترافت ئیجرا ئەکرێ زۆر عالم تری لەوەی خۆت لەو مەقامە پڕ إسترحامەدا عەرز بکەیت، إدراک و حسست لە وەتەن مایجری فیها، ئافاقی فکرتی فەریح کردووە، تەعلیم و خروجتان بۆ غوربەت، ئەوەی پێ عطا کردووی کە فەهمی ئەوە بکەیت، تحصیلی وەزائیف بلئەخەص "نائبوالعمیدو رئیسوالقسم و ئەمسالی ئەو مەراتیبە فەوقانیانە تصدیقی جیهانی موختەصەی لازیمە" ئەگەرچی شەوکەتی مەعالیتان تەجروبەی عەمیقتان و صافی نیەت و إخلاصیتان بۆ وطن و مەملەکەت لە ماضی و حاضردا گەواهی ئەوە ئەدەن کەزۆر زیاتر لەو مەقامانەتان پێ عطابکریت و وانشاللە فی أیام الآتیە بە تەصەوری من بعد تخلصتان لە قەیدی طالبوالعلم، فەرەح و گوشایشی قەلب و فکرتان بەلەقەبی دکتۆرا "اشاللە عن قریب" زیاتر بۆ منصب و حەقائبی سەفیر و سوفەرا، مەبعوث و بعثا، عەمیدی و عومەدا نەخێر رەئیس و رؤساء و هلم جرا، مافی الواقع ئەو زاتانەی لەم عەصرەدا اشغالی ئەو مەناصیبانەیان کردووە لەگەڵ بەندەی صاحب مەقالدا، کامیان لە مەعالیتان رەفیع تر و عالم تر و پڕ ئەداتر و ناطق ترو قەڵەم مەنثور ترن؟

با له هەر عابر السبیلێ سوئال بکەین، محقەق جەوابی بە کەففەی میزانی مەعالیتانە.

ثالثا: ئەمجارە بۆ مەسئەلەی رئاسەتی و تدبیر و ئوموری حیزبی، مەعلومە پێنج ساڵە من لەو مەسئولەیەتە مبتعد بووم، عن قریب و بعید تەداخولی ئوموری سیاسیم نەکردووە ئەلاهومە گەر دەبیری کلی مجدد "آقای سورخی" لطفی کردبێ و بە إستفساری بەندەی لە حلقەی نسیان انقاض کردبێت، ئەوا بە غەیری قصەی حەق، حەلالی متاعب، تەصغیری حەجمی مەشاکل، مطلق ملتزم بەو فەرمودەیەی حەزرەت "لکلمة الطیبة، صدقة" هەروەها نطق و ئەدام کردووە ئەمما تەفکیری ئەصڵی ذوالشأن تا چ میقدارێ بە مەسالکی ئەلفاظ و مەوعیظەی بەندەدا طریقیان طی کردووە؟ ئەوە جوابی لای خۆیانە و بەندە هیچ شەکوای نی یە.

رابعا: صەد دەفعە بە نطق و حەرەکەت لە ناو جەمعی استاذ و صاحب الفکر و منقذی کورد و طالبانی علمی کللیەدا ئەو تەوضیحەم عرض کردووە کە لە مەحاسن و مەکارمی ئەخلاقی استاذدا هەیە و واجبە ئەدای بکەن کە زیارەتی شعبەی متخصص بە شؤون مالیە و ذاتیە و تسجیل نەکەن، بەندە فی الاخرە مسؤلم لە ئەدا جمعي کوللیان و فقط مەعالیتان ئەوەندە لطف بکەن بەقەڵەمی طلب صەفحەی بیاض مسوەدە بکەن و ئیتر دعو الأمر لذوی الأمر، مع التأسف کە بە لیسانی خەشن، احساسی مورهەفی مەعالیتانیان لە شعبەی نەقدونقودا مجروح کردووە، دەعنی لەوەکالەتی ئەو شەخصەی کەسوء استعمالی ئەافاچی کردووە، سەد جار مەعزەرەت بخەمە بەر قاپی پڕ رەحم و عطفی مەعالیتان.

زۆر سەعیدومەسعودم بەو طلبەی جەنابتان کە ئەفەرموون "من الآن وصاعدا تحویلی نقود و حتی نفوذ با لە طریقەتی ساعی و البریدەوە بێت" سەد بارەکەڵلا لە عومقی تەفکیرتان، خاطرجەم بن ئەو طەلەبە في اللحضة موافەقەی حاصل کراوە فی کل الأحوال سەمع و بەصرمان بۆ نوطق و طەلەبێ کە سەعادەتی عمومی رەعیەتی تێدا بێت، ئەوە بە مەمنونیەت و نیکرانی زاتەوە مصادەقەی ئەکەین.

خامسا: وەک لە تقریضی رسالەکەتاندا هاتووە و بەندەش بە فەخر و اعتزازەوە ئەو تەصالوحەمان قبوڵە، کەڵبمانە لە هەموو لیقایەکدا طرفین بە تەقبیلەوە استقبال و تەجدیدی بەیعەت بکەین، لاکن مع الحظر لە شەهوەت و نەزوەتی لەندەهوری بێ ئەمان، مەعالیتان لەبەینی مەددی طلب و جەزری گوشایش عوقدەی مەغدوریەتدا طلبی: خەپلی خەپان و نەبعی دافئی ناوموان، لەبەندە ئەکەن، کە ئەمە فی الواقع ضەرورەتی مولیحە بۆ خۆمان لەولا، وە بعده الی من هو صدیق الحمیم کە جەنابتانن ثانیا. هەروەک بە مەسەل لە قەدیمەوە بە مەرڕی ئەجیال هاتووە "تا ماڵ وەستابێ مزگەوت حەرامە".

وە بۆ تەذەکور ئەو مەسئولی رەفیعول المستەوایە، ئەلحەقی بە کەرەمەوە ئەو حاجەتەی طەلەبەی سەنەواتی سابیقەی قبول فەموو بوو فی الحال خۆی چەند دەفعە پەرییبوو و دواتر وەقفی طەڵەباتی فەرموو، عالی جەناب: کوللی مەغدورێ کە وەقتێ لە ئەدای فەرزی ئیشباعی اشتهایی مەطرقەکەی مەحروم بێت، بالتأکید هەیەجان و تەدەفوقی نا مەسؤلانەی ئەحلامی فاحیشەی بە نصیب ئەبێ، رجائەن بەو رەفیقە ناموافیقەی مەستورە، کە لە ناو وادی مەحمومەدایە، بڵێ "صبر کن در بەرسیلە حلوا کن" ئەگەریش جسری صبری بە فەیەضانی مەنییە نغرۆ بووە، ئەوا عادەت و السریە، عیلاج و راحەتی نەفس و بەدەنە، لای خۆمانەوە لە سەعی و تەفەکور بۆ ئەو مەسئەلەیە قصورمان نابێت، لاکین بۆ عیلمی جەنابتان ئەو هەیەجانە رەبطی موباشیری بە قورب و بوعدی حورمەوە نی یە. فی کل الاحوال ئەگەر جەسارەت بکەنە لیبسی حاضر و موستەقبەلتان، شەرعەن زەواجی ثانی و ثالث و رابع موهەبیایە و جنس البشر مانعی نی یە، واضەن ئەکەم لەم عەصری عەولەمەیەدا، إزدواجیش پڕ سورعەتە و تەعجیلی پێ دراوە، لە مابەینی مەغریب و عیشا دا ئەتوانن سەردەق بشکێنن، لاکن خۆتان لە ضەوضا و غەوغای تەلەگرافی داکی طفلەکانت ئەسئوولن و وا تەصەور بکەن کەئەننەهو صەوتی مشوافەکەیە و تەشویش ئەدا ئەکات، رەجائەن هەروەقتێ سێ حوققە غیرەت و جەسارەت و مقاوەمەتتان حاصل کرد تا قاپی قیامەت مەمنوین کەلە و خیرەمونزەویمان مەکەن.

بەندە وەک لە فەقەراتی صەلاحیەتماندا واردبووە ئەلعان تەوصیە دەدەم بە باش کاتبی محەللە کە ئیفادتان بۆ مەنبەعی تەشویع ئیجرا بکات، مەصاریفی حەرەکات و سەکەناتان و واصیلە، شەرتی ئەوحەدمان ئەوەیە، لوطف بکەن بەچەند سەطرێ نەشاطی خۆتان و ساقی بێ "حذاء"تان بەیان بکەن تا تەبریک و تەهانیمان بە سەمع و بەصری عمومی مەملەکەتدا نەثر بکەین.

فی الختام موطمئن بنو بەندە عەموودی حاضر و صدیقی سابق و لاحیقتان قصوری نابێت و ئیستیجابەی فەوری هەیە بۆ تەنفیزی موباشیری هر طەلەبێ کە ممکن بیت و لەطاقەت و تەحەممولماندا بێت.

والسلام و بە تەمەننای رەحەت و راحەتتان

م.د

ملاحضە:

رەجائەن : طیا لەگەڵ ئەم جەوابەدا، لطف بکەن و نەصی رسالەی مەقام و العالی استاذ کاکە حمە نوری ئیستیلام بکەن

مع خالص الشکور

سالی شەش حەوت کتێبێکیش دەرئەچێ بە کوردی.

نامەی محەممەدی مەلا کەریم بۆ عەبدوڵڵا پەشێو

برای خۆشەویست و ئازیز کاکە وڵای پەشێوو

ڕۆژتان باش!

خوا جەزای خێری عارفی ئەحمەدی بداتەوە بە زۆری زۆداری خستمیەوە یادت و کاریکی لێ کردی ئەگەر بە زڕەی تەلەفۆنیک و نووسینی دوو سێ دێڕ یادێکم نەکەیتەوە دەروونت کەمێکت ئازاربدا. بە هەرحاڵ، ئەی دۆستی کۆنینە سوپاسگوزاری هەردوو یادکردنەوەکەت ئەکەم و خوا لە برایەتیت کەم نەکا.

باشە، هۆ برای ئازیز، تۆ کە خۆت نامە نانووسی، چۆن بە هیوای ئەوەی خەڵکی نامەت بۆ بنێرن و، بە چ هەقێ هەموو ڕۆژان سەر لە سنووقی پۆستت ئەدەی بزانی نامەت بۆ نەهاتووە؟ ئەمەم زۆر پێ سەیرە ! دیارە شوعرایش وەک شێخ و مەلا وان هەر بە تەمان بۆیان بێت و بڵێن بارەکەڵا و خۆیان هیچ نەدەن.. وتیان: بێنە مەلا، وتی: ئەستەغفیرەڵا. وتیان: فەرموو مەلا: وتی: بارەکەڵڵا! ئەمەی ئێمەی مەلا لە ئێوەی شاعیر قەوماوە لەم عەسرەدا!

لە برا و براژنت دەپرسی: بە جووتە هاواری قاچ و قول و دەردی (سەوەفان)مان کە بە کوردی واتە: ئەژنۆکانمان سواون. من زیاد لەوەیش ئازاری کلۆت و نەخۆشی شەکریشمە.. ئەویش سەرەڕای دەوری ئەژنۆ ئەرکی ماڵ و مناڵ و میوان و منی دەردەدار!

مناڵەکانمان: بیارە (چووە بۆ پێنج)، ژیوار (چووە بۆ سێ)، پیران (ئەمساڵ ئەچێتە یەک)، دەستی خۆت و براژنم و برازا ئازیزەکانیان ماچ ئەکەن. شیرین عەرزی حورمەتی بۆ هەموان هەیە.

هەواڵی کولتوورت پرسیبوو؟ حەساری ستەمکاران وەک تەوقی عەزرایل بینەقاقای خۆیان و سەقافەت و نان و ژیانی گرتووین. لەگەڵ ئەوەیش بە

کوردی ئەمانە لە بەغدا دەرئەچن:

ڕەنگین: مانگانە. بەیان، ڕۆشنبیری نوێ: چوار مانگ جارێ. هاوکاری: هەفتەی چوار جار. پاشکۆی کوردی عێراق: هەفتەی جارێ. سالّی شەش -حەوت کتێبێکیش دەرئەچێ بە کوردی.

هەوالّی ژیانمانت پرسی بوو لە زۆر کەسان چاکتر ئەژین. دیارە لە چاو هەندێکیشا ئەبێ خەلّک بەزەیی پیامانا بێتەوە. بەلاّم هەرچۆنێ بێ ئەگوزەرێنی. سوپاست ئەکەین. خەفەتی ئێمە مەخۆ.

ئیتر تا پێک ئەگەینەوە خواحافیز و بە هومێدی دیدار. سلاّوی گەرممان بۆ براژنم و چاوی ئەولادی ئەعیززا ماچ ئەکەین.

براتان : حەمە

**له شه‌ره ده‌نووكی ئه‌وێ سه‌رودڵم گیراوه!**

نامه‌ی محه‌ممه‌دی مه‌لا كه‌ریم بۆ عیزه‌دین مسته‌فا

مۆسكۆ ٩٧٤/١/٤

برای شیرین و به‌ڕاستی برای عه‌زیزی گیان

ده‌سته‌كانت ئه‌گووشم..ده‌م و چاوت ماچ ئه‌كه‌م.. زۆرت تاسه ئه‌كه‌م.. هیواداری كامه‌رانی و به‌خته‌وه‌ریتم..

عزی گیان! یه‌كه‌م: له برایه‌تی دا خه‌به‌ری كۆچی دوایی مامتم خوێنده‌وه‌و به‌ڕاستی دڵی گرتم، زۆرم پێ گران بوو، خۆتان خۆش بن، تكایه سه‌رخۆشیم بۆ نووری و فاضڵ و ئه‌وان بنێری، خۆشم نامه بۆ نووری ئه‌نووسم بۆ سه‌رچنار له‌وێ یه وابزانم.

عزی گیان.. من لێره‌وه له شه‌ره ده‌نووكی ئه‌وێ سه‌رودڵم گیراوه.. ئه‌ی تۆ له‌وێ چۆنی.. من لام وایه زۆر باش له‌مه‌سه‌له‌كه ئه‌گه‌م، به‌ڵام كێ هه‌یه گو به كلاوی من بپێوێ؟ لاشم وایه به‌هۆی نووسینه‌كانی تأخی و جاروبار ڕیگاشه‌وه هه‌ندێ كه‌س ده‌می لێكردبم به مقه‌ست و ته‌نانه‌ت پێشم بڵێن كه‌ری ناو جۆگه.. به‌ڵام تۆ خۆت من باش ئه‌ناسی و من دڵنیاشم له‌وه كه ئێستا -هیچ نه‌بێ ئێستا- كه‌سێك هه‌یه له‌و دیوی په‌رده‌وه ته‌نافی ئه‌م شه‌ڕه جرته رائه‌كێشێ.. صه‌د داخ و صه‌د مه‌خابن..

عزی گیان.. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا كه دووریش بۆ كاتی وا ناخۆش نییه، به‌ڵام باوه‌رم پێ بكه به‌دڵ له‌وێم.... عزی گیان بیستم له دژت نووسرابوو له هاوكاری دا و تۆش له برایه‌تیدا وه‌ڵامت دابووه‌وه. حه‌زم ئه‌كرد بمزانیایه چی نووسراوه وه‌ڵامێكی شته‌كه‌ی ڕۆشنبیری نوێم نووسی یه‌وه و پۆسته ناردم بۆ حه‌مه كه‌ریم، تۆش پێی بڵێ بڵاوی كاته‌وه و با لێم زیز نه‌بن... سڵاوی گه‌رمم بۆ مامۆستا علا و اساتذه‌ی محترمین سڵاو و ڕێزم بۆ ڕووناك خان و حاجی و

خوشکان و چاوی مناڵەکان ماچ ئەکەم.. جلال الماشطه سەلامی لی ئەکردی.
سڵاوم بۆ احمد سجر افندی.. نامەم لێ مەبڕە..

بۆ نوکتە

---

تاخی وابزانم غلطی مطبعی گەیوەتە ڕادەی ناونەزانینی

خەڵقیش "روشن خان، ئەبێ بە "روشن بدرخان" و

"نوری مەلا محمود" ئەبێ بە "محمدی مەلا نوری" وهم جرا..

برای دڵسۆزت

محمد

**ناوی شیخی سەنعانم بیستبوو!**

نامەی مەحموود کزەڵ بۆ عیزەدین مستەفا

بسم الله الرحمن الرحیم

[illegible] بەڕێز کاک عیزەدین [illegible]

بە ناردی گۆڤاری کۆلیژی ئەدەبیات[1] ژمارە(١٥) زۆر گەشامەوە، سپاسی هەستی بەرزتان دەکەم، لە کانگای دلەوە، خودا سەرکەوتوو و پایەدارتان بکا، یادگاریتان هەر بمینی و دیاریتان نبڕی..

وتارەکەم خویندەوە، بەراستی جوان و پر سوودە، بە گیانیکی پاکی زانیاری شیرین نووسراوە، بە هیوام خویندەواران و گەلی چەوساوەمان، لەبەروبوومی وتارنووسینەکانان بێ بەش نەبن، و هەمیشە سوود لە کانی پرتەوی پر نەرخی رەوشەنبیرانی وەک ئیوە وەربگرێت..

برای خۆشەویست بەم بۆنەیەوە، ئەمویست -ئەگەر ڕیبدەن- ئەم یەک دوو تیبینییەی خوارەوەتان بەرچاوکەم:

ئەو داستانی (شێخی سەنعان)ی فەقێ تەیرانم چۆن دەستکەوت؟

١) لە ساڵی ٥١ -٥٢ کە مامۆستابوم لە دێی (پەلکانە) لەناوچەی (کەنیناوە) نزیک پردێ.. ئەو ڕۆژە هەندێ بارزانی دوورکراوەیی لێبوو، لەوانە کوری بوو ناوی (محەمەد شانەدەری) شەوان ئەهاتە لام بۆ خوێندن..دووای لام

[1] کۆلێژی ئەدەبیات، گۆڤارێکی ڕۆشنبیری بوو، زانستگای بەغدا، کۆلێجی ئەدەبیات لە سالانی حەفتاکاندا، دەریدەکرد.

دەمایەوە و سەرگوزەشتەی خۆیانی بۆ دەگێڕامەوە، منیش هەندێ هەڵبەستم بۆ دەخوێندەوە لە شێوازی بادینی، وەک:

ژچریا یا شەهپیدا مەلا باتەێ کانێ
سەفەرکێشا بە یەک سێڤاَ ژ سەر قەولی زڤستانێ
زڤستانێ ئەڤی قەولی بۆری ئەڤی چۆل
مژی هاڤیتەدا هۆڵێ کروڤی گرت نەسرینا

ئەویش ناوە ناوە هەندێ لەم داستانی شیخی سەنعانی بۆ گوتم، نەمبیستبوو، بەڵێ ناوی شیخی سەنعانم بیستبوو، چونکە بڵاوە، مەتەڵەیەک بەیەکێ دەڵێت: (چما شێخی سەنعانی) منیش دەستم کرد بە نووسینەوەی، بەلام پاش کەمێ بۆم دەرکەوت، ئەو برادەرە چاکی لەبەر نییە، پێم گوت کەس ناناسی لێرە لەبەری بێت؟، گوتی: بەڵێ یەک هەیە ناوی(فەقێ محەمەد)ە، لەسەر بیرەکانی نەوت پاسەوانە.

فەقێ حەمەد هات، پیاوێکی کامر بوو، دیتم زۆربەی زۆری لەبەرە، بەلام پێی گوتم، پێت دەڵێم بەمەرجێ دانەیێ لەم داستانەم دەست نوسی خۆت بدەیێ، منیش یەکەمجار وەک دیوتانە بی باک نوسیومەوە، دووای زۆر بە پوختی لە سیپارەیەکی کە نووسیمەوە وا تێدەگەم، زۆر لە ڕاستی نزیک بێ، ئەو دانەیەشم دا ئەو فەقێ حەمەدە، جا زانم ماوە یان نا؟ هەر کەسێ بیەوێ دەتوانێ بەهۆی ئەو(موحەمەد شاندەریە)گەرمابێ بیدۆزێتەوە.

هەرچەندە خۆشم بە نیازەوەبووم، دانەیەکی پوختەی کەی، بۆخۆم لێ بنووسمەوە، بەلام داخم ناچێ! سەبارەت بە پڕ ئیشیم و هاتوچۆی کەرکوکم و جەوەری ئەو ڕۆژە- هیچ دەرفەتم دەست نەکەوت بینووسمەوە.

وە ئەوەی لەبەر دەستانە و دیوتانە، زۆر شرە و کەموکورتی زۆرە، پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی چاک دەکا، وە لەبەرەوە کە دەیبینم، لە ناوچەی بادینان بەتایبەت برابارزانییەکان، زۆریان لەبەریانە، واچاوەنواڕ دەکەم، ئێوە و

هاوڕیانی ڕەوشەنبیری کاروانی پێشکەوتن ئەم جۆرە گەنجینەیە بێننە دەرەوە و بیدەنە بەر تیشکی پرتەوی ڕۆژ و بەرچاوی جیهانی بدەن، کە ئەو نەتەوەی خاوەن ئەم گەنجینانەیە، نامرێت..

٢) وەک من بۆم دەرکەوتووە، ئەم جۆرە داستانانە، وەک مەموزین و شیخی سەنعان و... ئەمانە زۆر لە کۆنەوە لە فۆلکلۆری کوردی پنچی هەیە و ڕیشەی داکوتاوە، دەتوانم بڵێم زۆربەی داستانەکانی شکسپیر و چەندانی دی قەرداری ئەو داستانەن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەت لە ناو کوردستان بڵاوبۆتەوە لە ئەنجامی ئەو هێرشانەی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هێناویانەتە سەر ئەم ناوچەیە، کە گەڕانەوە ئەم داستانانەیان بردۆتەوە و بڵاویان کردۆتەوە... هەروەکو لە هێرشی یۆنانییەکان یەک لە مێژوونووسەکانیان چیرۆکێ دەگێڕیتەوە زۆر بە چیرۆکەکەی (مەم و زین)دەچێت، بەلام بە ناوی کە، هەروەکو لە پەڕاوی (مەمی ئالان) پیشانی داوە، وەک دەڵیی کە ئیسلام هاتووە، ناوەکانی گۆڕیوە تایەکێ وەک ئەحمەدی خانی هاتووە، داستانی مەموزینی بەشیوازێکی ئەدەبی، زۆر شیرین داڕشتووە لە قسەی پڕوپوچ و دێو و درنج ڕزگاری کردووە..هەروەها داستانی شێخی سەنعانیش بەلای منەوە شتێکی ئاوهایە، دوور نیە کۆنەهەواری دێرینمان چاک بپشکنێتەوە، سەروچاوەی ئەم گەنجینانە وەک دەڵیم زۆر جوان ئاشکرا و ڕەوشەن بکا...

ئیتر ئومێدەوارم، هەردەم سەرکەوتووبن، تێبینییەکانیشم جێگیر بێ و سوودبەخش بێ

بە خوا ئاماندەسپێرم

بەغدا / ١١/٩ / ١٩٧٢

[illegible]

## چ دەبوو ئینسان بە پیری لە دایک بوایە؟

نامەی مەریوان وریا قانع بۆ ئارام کاکەی فەلاح

ئارامی ئازیز

دنیایەک سڵاو بۆ تۆ و بۆ ئەو خانمەش کە پێکەوە منالێک بۆتە قەدەرتان.

گومانم لەوەدانییە کە تۆ باوکێکی ئازیز و ناسک، باوکێکی جیاواز لە باوکەکانی دیکەی، باوکێک کە هیوادارم کاری سەرەکی بریتی بێ لە تێکشکاندنی وێنەی(باوک) خۆی.

ئارام گیان لەگەڵ لە دایکبوونی هەر منالێکدا، دەبێ بە هەموو دنیادا بچێتەوە، دەبێ موحاکەمەیەک ساز دەین قورستر لە موحاکەمە خوداوەندییەکان. ئەبێ ریازیبوونەکانمان لە رووکارە باوەکان و سەپاوەکانی ژیان، ئەبەدی تر و رەها تر بێت، لەگەڵ لەدایکبوونی هەر منداڵێکدا، ئەبێ جارێکی تر ئاسمان بشۆینەوە.

چارەنووسی ژیان چ بەدکارییەکە کاتێ ژیان دەبێتە سەفەرێکی بەردەوام بۆ دوورکەوتنەوە لە منالی بۆ ونکردنی لە ناو تەفاسیلە بێزارکەر و تێکرارە بێ رۆئیاکاندا، بۆ گۆڕینەوەی گڕوگاڵەکان بە شووتی کەشتی و قیرەی شەمەندەفەر و گرمەی بۆمباکان، چارەنووسێکی بەدە کە ئینسانی ئەم چەرخە هەر ساتە و بەشێ، هەر رۆژە و پارچەیەک، هەر ساڵە و رەهەندێ لە رەهەندە درەوشاوەکانی منداڵی ئەدۆڕێنێ، چ دنیایەکی پیر و، سەردەمێکی بەساڵاچوو، لۆژیکێکی ریش سپی گەمارۆ داوین.

تاقە کائینێک لە منال بچێت، تاقە وزەیەک زەوی بەرەو منالی خۆی ئینسان بەرەو قۆناغی جیانەکراوەی زمان لە گڕوگاڵ و، خەیاڵ لە لۆژیک و، هەقیقەت لە هیولای گومان جیا بگەڕێنێتەوە (جیابکرێتەوە)، شیعرە. شیعر و منالی دوو کائینن کە بە داخەوە زوو ماڵئاوایی لەم ئەستێرەیە ئەکەن، منداڵی بە گەورە بوون و دۆڕاندنی رۆژانە، قەسیدەش بە کوژرانی بەردەوامی، چ دەبوو ئینسان بە پیری لە دایک بوایە ژیان بریتی بوایە لە سەفەرێک بەرەوە منالی، ئارامی برا..

ماچی من، ماچی لێوە تەنیاکانی من، وە لە باتی من بە تەوێڵی (کاریتە) دا بنەخشێنە، لە منەوە بۆ ئەو خەیاڵی لە قەبارەی پەلکەزێڕینەدا..

هیوادارم شاعیریکی نوێ بێ. منداڵی خۆی بە دنیایەکدا بکێشێت، کە تەنها لۆژیکی مناڵ لە کێشەکانی ڕزگاری دەکات.

خۆشەویستیم بۆ هەمووتان

ئەمەش چەند کۆپلەیەک لە قەسیدەیەکی زۆر درێژی نوێم.

بە میتۆدی باران وەرزەکان ئەخوێنمەوە

پاییز ناو ئەنێم ئافرەت و بەهار ناو ئەنێم مناڵی

بە حیکمەتی ئاگر، حەرف حەرف کتێبی سووتان لە سینەما ئەنووسم

خۆڵەمێشە ئەم جەستەیە و.. سوتانە عەشق..

دەست لە نەیزەکێ ڕائەگرم ناسنامەکەم نیشانی خۆرەتاو ئەدەم

شیعر ئەنووسم و فڕین لە هەوا قەرزەکەم [1]

بە گومانێ، ئاگر لە بەهەشت بەرئەدەم

مناڵێ لە حەرف خانویەک لە وەهم

ئایندەیەک لە گوڵ و ژەهر درووست ئەکەم

---

[1] بە شێکی ئەم هۆنراوانە بە دەستکارییەکی وردەوە لە کتێبێکی شیعری دا بە ناوی (کتێبی دڵشکان)ەوە بڵاو کراونەتەوە. بۆ نموونە ئەم شیعرە بە ناوی "میتۆد"ەوە بڵاوکراوەتەوە و ئەم دێرەی تێدانییە، جگە لە چەندین وردەکاری تر و زیاتر کورداننی هۆنراوەکە. بڕوانە:
مەریوان وریا قانع، کتێبی دڵشکان، نێوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥

ئینجا ئەمرم

...............

من دونیا وا بەش ئەکەم

شارێ شیعرێ

شارێ دۆزەخ

من خۆشم دوونیوەم لە ڕۆح

نیوەم کۆیلە

نیوەم خودا

تەنیایی دوو لەتی هەیە

لەتی ئاهەنگ

لەتێ سەحرا

..........

چلە ڕێواسێ بە تەنیا

مانگ بە بێ چراکانی

دایکم لە دووری عەقیدە و نوێژەکانی

من بەبێ تۆ،

تۆ بە بێ وەهمە درەوشاوەکانی عەشق

عەشق بەبێ جەنگ

ع سەحرایەکە بێ مانا..

..........

ئافرەتێ ئەناسم

نیوەی ئاوە

نیوەی گیا..

ڕۆحیشیی گوڵیکە لە ناوەراستی دەریادا

ئافرەتێ ئەناسم پیرم ئەکات

بە منالّی خۆم و، منالّی دنیا و، منالّی خەیاڵەوە، گریێم ئەیات..

....

(با)یەک ئەناسم، هەمیشە ناوی ئافرەتێ

لە دەفتەریی سەفەرەکانیا ئەنووسێ

ئافرەتێ ئەناسم، با لە پەنجەرەکەیدا ئەشوات و

لە گوڵدانێکا هەڵی دەگرێت

من تێناگەم جیاوازی نیوان (با) و ئافەرت چییە؟

بەڵام ئەزانم سبەینێم بایە و

دوو سبەیم ئافرەت

سێ سبەینێشم منالّیکە

لەتێکی باو لەتێکی ئینسان

من برای مۆمێ

برای پردێ

برای درەختێکم

خودا من و ئاو و

خودا من و گیا،

من و بومەلەرزەی بەیەکەوە درووستکرد.!

..

هەندێ جار لە گوڵە گەنمیکا خودا[1]

هەندی جار دایکم

هەندی دار حەشیشیەخۆرێک

هەندێ جار خائینیک

هەندێ جار وڵاتیکی نەخۆش

هەندی جار قەسیدەیەک ئەبینم!

.......

من و تۆ یەک ئاوێنەین لە دوو جەستەدا

تۆ لە منا، منالی زەوی و

پەنجەرەکراوەکانی خودا و

[1] ئەم هۆنراوەیەش بە هەمان شیوە دەستکاری زۆری کراوە بە ناوی(بینین)ەوە بلاو کراوەتەوە.

سەفەرە ئاگراوییەکانی خەیاڵ ببینە

من لە تودا، سبەینێ و

دوو سبەی و

سێ سبەی ئەبینم..!

درەختێک هەیە، باخچەیەک خەیاڵ ئەگرێ

ئینجا خونچەیەک درووست ئەکات

هەزار سوێند ئەخوات

بۆ گیایەک گومانی لێ بکات

درەختێ هەیە

نە ئەدرەسی هەیە

نە باوک

نە ڕۆژی لەدایکبوون

درەختێ هەیە سبەینێیە!

....

(کات) قوفڵیکە هەندێ جار ئەیکەیتەوە

هەندێ جار دایئەخەیت

بەڵام هەمیشە بە دەرگاکانەوەیە!

**تاقە فرسەتی مانەوەیان ، ئیمزاکردنی بەڵگەنامەی مردنی خۆیانە!**

نامەی مەریوان وریا قانع بۆ ئارام کاکەی فەلاح

ئارامی ئەزیز گشت کاتێکت شاد و بەختەوەر

هیوادارم نامەی پێشووت پێگەشتبێت

بیرت ئەکەم

نازانم بە چییەوە خەریکیی، بەڵام دوێنێ چووم بۆ سینەما، لەوێ وام بەبیردا هات، کە لەو ساتەدا خەریکی تەماشاکردنی تەلەفزیۆن بیت، بڕوابکە لەوێ لە نێو قەرەباڵغی و دوکەڵی نێو هۆڵەکەدا، لە نێو ئەو هەموو ئافرەتە شۆخ و کوڕە عەگیدانەدا، بیرم کردیت.

نازانم چ یادەوەرییەکی ناوەختی تۆ بوو زاکیرەمی داگیرکرد... ڕەنگە بابەتی فیلمەکە و وێنە هەڵواسراوەکان بێت کە ڕاستەوخۆ فەزای سلێمانی و تیرۆری فاشیزمی عێراقی خستەوە بیرم.. فیلمەکە باسی کودەتا خوێنینەکەی (شیللی) دەکرد. خەلاتی نۆبڵ و چڵە زەیتوونی ئاڵتونی وەرگرتبوو، کە هاتمەدەر لە سینەماکە، چەند ئافرەتێکم دی لە ژێر کاریگەری ڕووداوەکانی فیلمەکەدا دەگریان، لە دڵی خۆمدا وتم: ئەوەی دیتان شەو و ڕۆژێکی عومری من و هاورێکانم و ئەو نیشتمانەیە کە تاقە فرسەتی مانەوەیان، ئیمزاکردنی بەڵگەنامەی مردنی خۆیانە!

ئا.. ئارامی ئازیز، ئا لەوێدا لە نێوان کۆی بەیەکاچوونی زاکیرە و واقیع غەریبی و تەنیایی دا، کەوتیتەوە یادم...

چاوەڕیی نامە و هەواڵتم

**تارژەنیک دێت کتێبێک ئەکوژێنیتەوە...**

نامەی مەریوان وریا قانع بۆ ئارام کاکەی فەلاح

ئارامی ئازیز ..گشت کاتێکت شاد

دەبێ ببوری لەوەی ماوەیەکی درێژە نەمتوانیوە نامەت بۆ بنێرم، لە ڕاستی دا جگەلە بێتاقەتی هیچ هۆیەکی نەناردنی نامە، نەک بۆ تۆ، بەڵکو بۆ سەرجەم هاوڕێیانی دیکەش، شک نابەم، ژیانی من لەم بەستەڵکە، بێ مانا و بێ پرۆژە و بێ بەرنامەیەکی ڕۆژانەی دیاریکراو گوزەر ئەکات، جاران کتێب ئەیتوانی فەریادڕەسێکی بەوەفا بێت، بەڵام بۆ باری سایکۆلۆژی و قەناعەتەکانی ئێستام، ئەویش چیدی ناتوانێ هەڵگری ئەو مانایە بێت، زۆرجار بەسەرم دا دێت و دەڵێم، تەواو هەموو کتێبەکان و حەرفەکان و کاغەزە سپییەکان بۆ جەهەنەم، بمرن ئەو ئیمپراتۆرییە وەهمیانەی لە حەرف درووستدەکرێن، کتێب تەواو، حەرف، تەواو، ئیتر کاتی نوقوم بوونە، لە ناو کۆی ڕووداوەکانی ژیان خۆیدا، ئێستا تێگەیشتووم، ژیان لە ناو کتێبەکاندا نییە، حەرف بەختیاری درووست ناکات، ژیان لەوێ نییە، وەک رامبۆی مەزن دەڵێت: ژیان لە شوێنێکی دیکەیە! (کتێب لە کوێ بێ فیردەوس لەوێ نییە_کافکا) نا ئارام ترسناکی کتێب لەوەدا نییە، فیردەوس وێران ئەکات، ئاین و یۆتۆپیاکان ئەسڕێتەوە، ترسناکی کتێب لەوەدایە، کە ژیان قەلاچۆ ئەکات! یەکەم جارمە لە ژیانمدا هەست دەکەم کتێب گەورەترین دوژمنە. تاوانی ئینسان لەوەدایە کائینێکە ئەنووسی و ئەخوێنێتەوە، ئەتوانێ بە قەبارەی باخچەکان حەرف ڕیز بکات، لە جیانی گوڵ و سەوزەگیا، لە جیاتی تەماشاکردنی ئەستێرەو باو بومەلەرزرە، لە جیاتی بۆنکردنی خوێن و جەنگەڵ و تەرزە.. خەریکی ڕیزکردنی حەرفە، یان ڕاست تر بڵێم خەریکی ڕیزکردنی ژیانە لە ناو حەرفەکاندا، ترسناکی ڕۆژئاوا لەوەدایە، هەموو ژیانی کردۆتە کتێب!

هەموو شتێ بۆتە خەریتە، نانخواردن و گەڕان و سەفەر و یاریکردن و سێکس، هەموو ئەو ڕەگەزانەی لە چەرخەکانی پێشوو دا ئینسانیان سەربەست دەکرد،

ئێستا لەم چەرخەدا بەهۆی کتێبەکانەوە، هەموو وزەیەکی ڕەهاکردنیان لە دەست داوە، بۆ ئەوەی دونیا ئامادە بێ، دەبێ کتێبەکان بزر بن! وە تەنها لەسەر تەرمی حەرفەکانەوەیە، ژیان ئەتوانێ بانگەشەی خۆی بکات! بەڵام دوواجار کێ دەڵێ بەختیاری ئامانج و غایەی ژیانە. کێ ئەڵێ مرۆڤ بۆیە لەسەر ئەم ئەستێرەیە بۆ ئەوەی ئاسوودەبێت؟ کێ ئەتوانێ بەم هەموو وەهمە ژیان داگیر بکات: ((ژیان بریتییە لە ئاسودەگی..)) پێکەنین و گریان لەیەک بینابییەوە دێن، گۆرانی و قریشکە، یەک دەم دەیانڵێت، یەک پەنجە بە نێو قژی خۆشەویستییان و پەلەپیتکەکەی تفەنگەکاندا دێت.. ڕەشی چییە، جگە لە تۆنێک لە تۆنەکانی سپی؟ تاریکی جگە لە تەفسیرێک لە تەفسیرەکانی ڕووناکی، شتێکی دیکە نییە، هەر ڕەنگە ئەمەش وای کردبێت، ئیسنان لەیەک کاتا هەم بیەوێ بژی و هەم بیەوێ بشنووسێ، و دەستێکی لە ناو ژیان بێ و دەستەکەی تری لە ناو حەرفەکان، ڕەنگە هەر ئەمەش بێ تەفسری ئەوەی من تا ئێستا پەیوەندی خۆم لەگەڵ کتێبەکاندا نەپچڕاندووە و، بەردەوام، بەڵام زۆر بەکەمی، هەردەنووسم!

ئارام گیان، شتەکانم بە دەست گەیشت، چاوپێکەوتنەکەی (شاملو)م خوێندەوە[1]، سەرم سوڕما، ئەو شاعیرە گەورەیە بۆ وا نەخوێندەوارە، نازانم بۆ دەبێ فەرهەنگی شاعیرەکانی ڕۆژهەڵات دەبێت فەرهەنگێکی بەرتەسک بێت، بۆ نمونە ڕۆشنبیر و توانای فیکری(ئەدۆنیس) و (شاملوو) بەروارد کە، لە ڕاستی (شاملوو) لە بەردەمی ڕۆشنبیری (ئەدۆنیس) دا، دۆش دائەمێنی، هەر ئەمەش وادەکات، شاملوو بە ئەندازی ئەدۆنیس قوڵ نەبێت!

براکەم مەسەلەی (فەرەنسا) و (ئینستیوت)یش هیچ دەرچوو، بڕیاریشم وایە لە هەر شوێن و جێگایەک و هەرشتێ بە دەستی کورد بێت، ڕووی تێنەکەم، کورد وایە، لە نێو مەزنترین دەزگاکانی ڕۆژئاوادا، بە ڕۆحی قەبیلەو خێڵەوە کار ئەکات. بۆیە دوواجار کۆمەڵی خزم و برادەر هەریەکەیان لە ناو ئەو دەزگایانەدا دەبنە نوسخەیەکی فۆتۆکۆپی کراوی ئەوی دیان. بەهەرحاڵ ئەزمونی پەیوەندی

[1] بڕوانە پێشەکی ئەم کتێبە.

کردنی من لەگەڵ ئینستیوت لە دوو ساڵی ڕابردوودا، دەرسێکی باش بوو بۆ ئایندە.

حەمە گیان پرۆژەی کۆمەڵێ نووسینم هەیە، بەڵام هیچیانم تەواو نەکردووە. ناشزانم تەواویان ئەکەم یان نا، بەدەر لە مانە شیعریشم نووسیوە، با ئەم چەند دێرەت بۆ بنووسم:[1]

من بە چرایەکەوە ئەم شەوگارانە ئەدوێنم، کە چرا نییە و شەویش نییە.

بە قەڵەمێ ئەم بەفرانە ئەنووسمەوە، کە قەڵەم نییە و بەفریش نییە.

بە نوریکەوە ئایەتی ئەم ئاگرانە ئەگێرمەوە، کە ئایەت نییە و نووریش نییە.

قەرە.. قەترە.. عەزابێ لە پەنجەکانییەوە ئەتکێ، کە خۆشەویستی نییە.

کلوو .. کلوو بەفرێک لە پاڵتۆکەیوە ئەبارێ، کە هەرگیز زستان نییە.

ئەوەی لە لێوی ئەکەوێ ماچ نییە

ئەوەی لە ڕۆحەوە هەڵئەفڕی کۆتر و باو ئایەت نییە.

ئەمە کلیلی بەهەشتێکە، کە بەهەشت نییە و

ئەمەش کێلونی ئازادییەکە، کە ئازادی نییە.

من پێشبینییەک ئاشکرا دەکەم :

تارژەنیک دێت کتێبێک ئەکوژێنێتەوە.. گیایەک ئەنووسێتەوە.. عاشقی دۆلفینێک ئەبێ..

---

[1] هەندیک لەم هۆنراوانە بە دەستکاریەوە لە کتێبی دڵشکان دا هەن, بۆ نموونە ئەم پارەچەیە بە ناوی خەون و جیابوونەوەی با وە لە ١٧٨لا دا بلاوبۆتەوە.

ئاو بۆ ئاو.. غەرق و غەرق.. سەفەرا و سەفەر دوای ئەکەوێ .

تارژەنێ دێ

لە فەنەری تەنیادا، بە دیار خەونی گەرانەوەی دۆلفینێکەوە

بێ براکانی.. جەنگەڵی.. بێ هاورێکانی خیانەتی.. بێ گوڵەکانی باخی گشتی

لە شەممەیەکدا ون ئەبێ، و

لە ژێر چەند حەرفێکا ئەمرێ..

...

لە وێرانەی جەستەکان

لە وێرانەی حەرف

لە وێرانەی سەفەر

چی درووست کەمەوە؟

مەنفایەک لە ئاگر

مەنفایەک لە زوقم

مەنفایەک لە شیعر

تا نامەیەکی دیکە خوات لەگەڵ

خۆشەویستیم قبوڵ بکە

ئەو پەڕی سەلامم بۆ ئاشتی و هونەر و سرووە.

## ئەوان کوشتەی غیاب بوون، ئێمە کوشتەی حوزور!

نامەی مەریوان وریا قانع بۆ ئارام کاکەی فەلاح

ئارامی ئەزیز

دنیایەک سلاو

هیوادارم بەختەوەرو شادمان بیت

لە مێژە دەنگت نییە، رەنگە دنیا لای ئێوەش،
هەمان ئەو دنیایە بێت کە هەموومان لە
بێدەنگییەکی سەرتاپاگیر دا نقووم ئەکا، لە
کپییەکدا کە لێ ناگەڕێ ئەوشووتی خەتەرانە
ببیستین کە بۆ یەکدی و لە پاڵ یەکدا لێی ئەدەین.
دەشێ سنوورەکان، شارەکان، ئینسانەکان،
ئەو پەرژینانەبن کە دەنگەکان خەفە ئەکەن. ئەشی یەکێ لە
خاسییەتەکانی ئەم سەدەیە بەندکردنی دەنگ بێ.. کزکردنی
هاوارەکان، لە هەموو شوێنێکەوە، لە هەموو ئاسۆکانەوە،
تەنانەت لە یۆتۆپیاکانی ئایندەشەوە دێت، بۆیە رەنگە تاقە چارەسەر
"نووسین" بێت، نووسین بەمانای هاوارێک، رەنگە بەهێزترین
هاوار، نەخێر قریشکەیەکە، بەلام بێ دەنگ و بێ سەدا.

هەڵبەتە بۆ دەرچوون لەم سەحرایە، دواجار پێویستمان بە مینبەرێک
هەیە، بۆ ئەوەی بدوێین، مینبەرێک کە بتوانێ شایەتی زیندەگی
ئێمە بێ، زەوییەک کەتێیدا بقریشکێنین و بڵێین: ئێمە هێشتا ماوین
هەناسە ئەدەین، و پەلمان بە دیوارەکانی ئەم سەردەمەدا ئەکێشین.

هەفتەی رابردوو لە (فرانکفۆرت) بووم، چوار رۆژی رەبەق لە
ژوورێکی چکۆلانەدا من و بەختیار عەلی و هەڵکەوت (عەبدوڵا) و ئاراس

(فەتاح) و ئەوانی دی، کۆبووینەوە و پلانمان دانا و خەونمان هێناو خەونمان برد. دواجار لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە هەم گۆڤاری (ئازادی)[1]دابخەین، هەم گۆڤاری (یەکگرتن)، بە حوکمی ئەوەی ئەو دوو گۆڤارە هەر یەکەیان لە ڕۆژگاریکی تایبەت بۆ مەبەستێکی تایبەت دامەزرا، کە ئێستا بە هیچ حوکمێ لە ئارادا نەماون. بۆیە بە هەردوولا بڕیارماندا گۆڤاریکی نوێ دەربکەین، گۆڤارێ نوێ، لە هەموو شتێکا و لە ناونیشانەکەیەوە بۆ ناوەڕۆک و شێوەی کارکردن و فرۆشتن و یارمەتی و هتد..ئەوەی تائێستا لە بارەیەوە پێتی بڵێم ئەوەیە کە: گۆڤارەکە بە ناوی (ڕەهەند)ەوە دەردەکرێت، دیارە لەبەر ئەوەی ئیمکاناتی ئەوەمان نییە، مانگانە دەری کەین، بۆیە وابڕیارە وەرزی بێت و ساڵانە لانی کەم چوار ژمارەی لێدەربچێت. پلانیش وایە لە کۆتایی مانگی دوودا، ژمارەی یەکەمی بکەوێتە بەردەستی خوێنەران. دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە بریتیین لەوانەی ئازادی و لەوانەی یەکگرتن، تا ئێستاش هەموویان بە شیوەیەکی کۆنکریتی دیاری نەکراون. گۆڤارەکە بێ سەرنووسەرە و جگە لە باس و لێکۆڵینەوەی تیۆری و نووسینی ڕیپۆرتاژی تایبەت بە چالاکی فیکریی و هونەری و ناساندنی کتێب و نوسراوی نوێ و وەرگێرانی دەقی تیۆری دیاریکراو، شوێنی شتی دیکەی کەمتر تیادەبیتەوە، بەڵام نیازمان وایە و لە پلاندایە، کە هەوڵ دەدەین، پاشکۆی تایبەت، بۆ ئەدەب و هونەر، چ دەقی کوردی و چ وەرگێردراو، دەربکەین.

ئەم گۆڤارە بڕیاری داوە، دەستەیەکی تایبەت بە ناوی (هاریکاران)ی گۆڤارەکەوە درووست کات، کە کاری ئەمانە، نووسین و وەرگێڕان و نووسینی ڕیپۆرتاژ و ناساندنی کتێبی گرنگ و بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکە، دەگریتە خۆی. ناوی هاریکارەکان لەسەر گۆڤارەکە بڵاودەکرێتەوە، بڕیاریشمان وابوو، کە تۆ لە ناو ئەو دەستەیەدا بیت، وە هیوامان وایە چالاکانە پێکەوە بتوانین کاربکەین و ئەم تەوقی بێدەنگییە بشکێنین.

---

[1] گۆڤاری ئازادی، گۆڤارێکی ڕۆشنبیری ڕەخنەیی سەربەخۆ بوو، لە سەرەتای ساڵانی ڕاپەڕین دا دەرچوو، بە سەرنووسەری بەختیار عەلی.

دیاره دەشێت خەونی گەورە، و گەورەتر ببینین، بەڵام لە ئێستادا واقیعی قەیراناوی رۆشنبیری کوردی کە ناهێڵێ تەنانەت سنووری خەونبینینەکانیشمان ئازاد بێت. بۆیە خەونە گەورەکان هەڵدەگرین بۆ سبەی.

ئەم ژمارەیە تایبەت ئەبێت بە نووسین لەسەر (شەڕی ناوخۆ) ناساندن و لێکدانەوەی بنەما و هۆکارەکانی (دیارە ئەبێت، نووسینەکان جنێونامە نەبن و لانی کەمی نرخ و بەهای زانستانەیان گرتبێتەخۆ) جگە لەمەش مەلەفێکی تایبەتی تیائەبێ، لەسەر (ماکس فیبەر) چ وەک تەرجەمە و چ وەک نووسین، هەروەها چاوپێکەوتن لەگەڵ کوردناسیکی ئەڵمانیدا. لەگەڵ هەندێ ڕیپۆرتاژ و ناساندنی کۆمەڵێک کتێبی نوێ کە بەزمانە ئەوروپییەکان لە یەک دووساڵی رابدوو دا دەرچووبن و بابەتی گرنگییان گرتبێتە خۆ.

چاوپێکەوتن لەگەڵ نووسەران و فەیلەسوفانی رۆژئاوادا، بە شیکی گرنگی سیاسەتی گۆڤارەکەیە، بۆیە لەم رووەوە هەمومان داواکارین، کە هەریەکەمان هەوڵبدات، پەیوەندی بەو کەسانەوە بکات، کە دەشی کەڵکی چاوپێکەوتنیان هەبێت، من خۆم ئێستا بیر لە چاوپێکەوتن لەگەڵ (محەمەد ئەراگۆن) دا دەکەمەوە. دەبێ هەموو نووسینەکان تا ١٩٩٦\١\٢٠ گەیشتبن، دەنا بڵاونابنەوە.

ئارامی ئازیز

هیودارام لەگەڵمانا قۆڵی هاوکاری لێ هەڵکەیت و پێکەوە بتواین لەم بێدەنگییە ڕزگارمان بیت، لە بیرم چوو، لە هەموو ژمارەیەکدا کورتەیەکی باسە گرنگەکان بە هەر دوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی لەگەڵ گۆڤارەکەدا بڵاودەکەینەوە.

بەڵام گومانت لەوە نەبێ کە ئەم خەونە بەبێ کەسی دڵسۆز و هاورێی وەک تۆ، زەحمەتە پیادە و جێبەجێ بکرێ، بۆیە هیوادارم لەمڕووەوە هەستی بەرپرسیاری لە ناو خۆتدا پتەو بکەیت و بە نامەیەک وەڵامم بدەیتەوە، تابزانم ئامادەی لە دەستەی هاریکارانی گۆڤارەکەدا بشەداربیت، یان نەء.. لە هەموو حاڵەتیکدا تۆ هاورییەکی نزیکی منیت خودی گۆڤارەکەشی، مام ئارام..

بەودیوا بارودۆخی ژیانت چۆنە؟ لەگەڵ باوکایەتیدا لە چیدای؟ کاریتە لە چییایە؟ تۆ بڵێی نەوەی دوای ئێمە لە ئێمە بەختەوەرتربێت؟ لە ڕاستی دا مێژووی کورد مێژوویەکی عەجیبە، بەدبەختی نەوەکانی بەر لە ئێمە، لەوەدا بووکە دەسەڵاتی سیاسی کوردی، غائیب بوو، کەچی بەدبەختی ئێمە لە حزوری ئەو دەستەڵاتەدایە، ئەوان کوشتەی غیاب بوون، ئێمە کوشتەی حوزور، لەوە دەترسێم نەوەی دوای ئێمە ببێتە کوشتەی (نەهلیسیزم)ببن بە عەدەمییەک کە نەمانباتەوە ناو مێژوو و نەشمانگەیەنێت بە میتافیزیک. ون بوون لە فەزای نێوان عەدەم و مێژوو دا، مەساحەیەک کە ناتوانم جگە لە مەساحەی ون بوون، هیچ ناوێکی دیکەی لێ بنێم.

من سێ مانگی یەکەمی خوێندنم بە دوو ئیمتحانی سەرکەوتوو کۆتایی پێ هێنا، سێ مانگی داهاتوش تایبەت ئەبێت بە (ئیسلام) پرۆژەی نووسینم زۆرە و لە جاران چالاکترم، لە ڕووی عەشقیشەوە ئاسوودەتر و دڵنیاترم. وەزعی ماڵەوەمان خراپە و زۆر بێ پارە و دەرامەتن. منیش وەک قوتابی نەک ناتوانم یارمەتی ئەوان بدەم، بەڵکو هی خۆشم پێنادرێت.

سەلام و ڕێزم بۆ دایکی کاریتە و خۆشەویستیم بۆ هونەر و سرووە و منداڵەکانیان، سەلامم بۆ هەندرێن، بەڕاستی ناونیشانەکەیم بزرکردووە، دەنا نامەم بۆ دەنووسی.

سەری ساڵی تازەتان پیرۆز، هیوادارم ساڵێک لە وەدی هێنانی ئاواتەکانتان نزیکتر بووبنەوە.

**حەزم ئەکرد هیچ نەبێ ، ساز یان کەمانێکم لەگەڵ بێ!**

نامەی مەزهەری خالقی بۆ شێرکۆ بێکەس

برای بەڕێز و خۆشەویستمان

کاک شێرکۆ

ئەم کاتەت شاد، نامە و دیاری هەرە بە نرخ و پڕ لە هەستت پیم گەیشت، هەروەها بە بینینی دایکت ئەو بڕوایەم پەیداکرد کە لە دایکێکی وا بەهەست و ناسک ئەبێ شێرکۆیەکی وەک تۆمان هەبێت..

شیعرەکانت هەر کە گەیشتە دەستم چەندجار خوێندمەوە تا بە جوانی بچنە ناخی هەست و هۆی مەبەستەکانەوە و بتوانم نەختێ مێشکی ماندو و دڵی تەزاوم لە بەسەرهاتە شوومەکەمان بسینمەوە، ئەوجا لە کانی دلمەوە سپاس و ئافەرینم کردی کەوا هاواری خنکاوی گەلەکەمانت بە هەموو لایک دا هەل داوە.. زۆر حەزم ئەکرد کە شتی کیان لەسەر دەربینم و بیخەمە سەر شریت و بۆتانی بنێرم، بە داخەوە گێرە و کێشەی ژیانی ئەم وڵاتە مەجالی نەدامێ ئەگەرچی هەموو شتی کم ئامادە کردبوو، بەڵام حەزم ئەکرد هیچ نەبێ ساز یان کەمانێکم لەگەڵ بێ.. بۆیە نەمتوانی یان ڕی نەکەوت.. بەڵام هیوادارم لە دوو سێ هەفتەی داهاتوودا بە خصوصی بۆ ئێوە تەسجیلی بکەم و بینێرم بۆتان..

سەبارەت بە ئاگاداربوون لە یەکتر بە نووسینی نامە و هەواڵ زۆر پێ خۆش حاڵ ئەبم کە بەهۆی نامەوە ئەو نێوانە ببڕین و زێدەتر لە یەکدی نزیک ببینەوە، بە تایبەت زیاتر داوات لێ بکەم کە هەر وەها با نووسراوەکانت بە تەوژم و پڕ خرۆش بن و نەک، نەک آزادی و نەبوونی ترسی (ئێستامان) دەردو ژانی گەلە قەلاچۆ کراوەکەمان لە بیربەرێتەوە..

ئێستە کە ئەم نامەیەت بۆ ئەنووسم سێ ڕۆژ بەسەر مردنی خمینی دا تێ ئەپەڕێ بێ گومان مەرگی هەر دیکتاتۆرێ شادی دینێ و نوخشە بێت لە زەحاکی بغدا..

ئەگەرچی خمینی ش لەو بەسەرهاتەی ئەمجارەمان بێ بەش نەبوو.. و بە داخەوە وادیارە کە داهاتووی نزیکمان لە ڕۆژانی تاریک حەیاتی سیاسیمانە..

کاکە گیان هیوادارم لە یەکی مانگی داهاتودا سەفەرێکی سوئید بکەین.. هەر لە ئێستەوە بە خۆم وەعدم داوە کە دڵم بە هۆنراوە بەرزەکانت و چاوم بە ڕووی ئیوە ڕوون ئەبێتەوە، (ریان) چاوی ماڵ و منالّت ماچ دەکات و ئەحوالّتان ئەپرسێت، ئیتر داوای سەربەرزی و خۆشیتان ئەکەم..

بو عزیز و خوشەویستی خوم جنابی رحیم قاضی زور محترم

لە پاش سلام و أحوال پرسین چاوتان ماچ دەکەم هەمو حەوالەکان بە عمومی
ایوە سوآلی حالی ایمە کربو أمیش هەمو سلامتن . کاغذی ایوەم وەرگرت أوی بەم تاریخە
رەوانە کراوە ٣/٧/٥٧ وهەرچی ایوە نوسیبتانە زور باش لیم معلوم بو . أوەی
کە گوتوتە (ئەمن دەزانم کە، ایستاش جنابتان دلتان نسبت بە من خاوین نیە) أوە من دەلیم وا نیە
چونکو من دل لەگەل هەمو کەسی پاکو خاوینە زور خاوینە أما تو شخصا تماشای خوتو أعمالی خوت
بکە ومن دەلیم أعمالی تو بە أو نوعە خیالاتە بەسەر تاندا دینی ومن لیرەدا قصوریم نیە
أگەر منیش بە مقصر دەزانی أوە کەیفی خوتە .
وبو مسئلەی خیربونە کونفرنسی یا إجتماعەکی أوە بە دەستی حکومەتی سوفیاتە
وبە فکری ملت کوردە أگەر حکومەتی سوفیات وملتی کورد أمرەکی بە من بیکەن من حاضربم
بوجی بەجی کردنی أو أمرە وەلەو مردن پی قبولی دەکەم زور بەکەیفو دل خوشی فخری
پیوە أکەم أگەر ملت کورد وحکومەتی شورەوی بە مصلحەتیان زانی ألبتە روژو وەختی
دەزانی وفرصەتی لە دەست نادەن منیش خوم شخصا منتظری أو دو أساسەم
هەرچی بە مصلحەتیان زانی أوە دەبی .
(وەتو گوتوتە) (ئەمن دەزانم کە، بعضە کەسیکی غیری کورد بە آمانجی لیکی هەلبرینی ایمە
بەتەواوی هیزی خویانەوە تیدەکوشن . بەلام فەید ناکات) أوەش من دەزانم کە هەمو
کەسی ئ کە هیشتووەکە کورد خوبوخوبەسە لەبەر أوە إحتیاجی بە کەسی ناکەت کە لەخاریجەوە
بینو خویان بە مەوە أذیەت بدەن . (وتو گوتوتە عمن جیالە حرمت وباوەری بە ایوە هیچ
ماتیک فکریکی دیکەم نە بووە) ومن خوم شخصا هیچ وەختەکی نەم گوتووە کەسی باوەریم
لی بکە وەیان حرمەتم بگرن . أوەش هەر کەسی حرمتم بگری وە باریم پی بکەت
ماری خویەتی من لەودا حقیم نیە هیچ بلیم . وتو گوتوتە ( لابردنی دو دلی
ونانەبایی نیو خومان تیبکوشن) أوەش من بە دودلی نیو خومان ونانەبایی
نازانم أوی من دەزانم ومن کە هیشتوم بە قەدر إمکانی خوم وام زانیوە
کە أوە بی عقلی وبی علمی وبی إنصافی بی خومانە أوەشی دەلالەتی دەکەتە
سەر أوە نەبونی لیاقەتی کە کەلکی هیچ تیبیا نیە . أوەشی من نالیم کە راستە
بەلام خوم واتی کەیشتوم ایتر نازانم چون دەبی . بەلام أگەر ایوە أوەی
بە دودلی دەزانن واحسابتان کردوە کە نانەبایە فرموون تی بکوشین بو لابردن
أگەر وای وەلا بچیت زور باشە وا بزانم کەس نالی خرابە هەمو دەلین چاکە
دوبارە سلام لیتان دەکەم

بارزانی مصطفی

١٩٥٧/٧/١٧

**من لیرەدا قصوریم نییە!**

**نامەی مەلا مستەفای بارزانی بۆ ڕەحیمی قازی**

**بو غزیز و خوشەویستی خوم جنابی رحیم قاضی زور محترم**

له پاش سلام و احوالپرسین چاوتان ماچ دەکەم و هەمو هەوالەکان به عمومی ایوه سوآلی حالی ایمه کربو أمیش هەمو سلامتن. کاغذی ایوەم وەرگت أوی بەم تأریخه رەوانه کراوه ٥٧/٧/٣ و هەرچی ایوه نویسیتانه زۆر باش لیم معلوم بو. أوەی که گوتوته (ئەمن دەزانم که، ایستاش جنابتان دلتان نسبت به من خاوین نیه) أوه من دەلیم وانیه چونک من دل لەگەل هەمو کەس پاکو خاوین زۆر خاوین أما تو شخصا تماشای خوتو أعمالی خوت بکه و من دەلیم أعمالی تویه ئەو نەوعه خیالانه بەسەرتاندا دینی و من لیرەدا قصوریم نیه اگەر منیش به مقصر دەزانی أەوه کەیفی خوته.

و بو مسئلەی خیربونه کونفرینس یا اجتماعەک أوه به دەستی حکومەتی سوفیاته و به فکری ملت کوردە اگەر حکومەتی سوفیات و ملتی کورد أمرەک به من بیکەن من حاضرم بۆ جی به جی کرین أو أمره وەلەو مردن بی قبولی دەکەم زۆر به کەیفو دل خوشی فخری پیوه أکەم أگەر ملت کورد و حکومەتی شورەوی به مصلحەتیان زانی ألبته روژ و وەختی دەزانی و فرصەت له دەست نادەن منیش خوم شخصا منتضری أو دو أساسەم هەرچی به مصلحەتیان زانی أوه دەبي.

(وه تو وتوته) (ئەمن دەزانم که، بعضه کەسیکی غیری کورد به أمانجی لیک هەلبرینی ایمه به تەواوی هیزی خویانەوه تیدەکوشن. بەلام قەید ناکات) أوەش من دەزانم که هەمو کەس تی کەهیشتووه که کورد خوبوخوی بەسه لەبەر أوه أحتیاجی به کەس ناکات که له خاریجەوه بین و خۆیان بەمه أذیت بدەن .(و تو گوتوته ئه من جیا له حرمەت و باوەری به ایوه هیچ کاتیک فکریکی دیکەم نەبووه) و من خوم شخصا هیچ وەختیک نەم کوتوه کەس باوەریم لی بکه وەیان حرمت بکرین. أوەش هەر کەس حرمتم بکری وەباریم پی بکەت کاری

خویەتی و من لەودا حەقیم نیە هیچ بلیم. وتو گوتوتە (لابردینی دو دلی و ناتەبایی نیو خومان تیبکوشن) أوەش من بە دو دلی نیو خومان و ناتەبایی نازانم أوی من دەزانم وەتی گەیهشتوم بە قەدر امکانی خوم وام زانیوە کە أوە بی عقلی و بی علمی و بی انصافی یی خومانە أوەش دەلالەتی دەکەتە سەر أوە نەبونی لیاقەت کە کەلکی هیچ تییا نیە. أوەش من نالیم کە راستە بەلام من خۆم وا تی گەیهشتوم ایتر نازانم چون دەبی. بەلام اگەر ایوە أوەی بە دو دلی دەزانن و احسابتان کردوە کە ناتەبایە فرمون تی بکوشین بۆ لابردنی اگەر وابی وەلا بچیت زور باشە وابزانم کەس نالی خراپە هەمو دەلین چاکە دوبارە سلام لیتان دەکەم .

١٩٥٧/٧/١٧

بارزانی مصطفی

МОСКВА

40 копеек

Куда Баку улица 12 В'езжная 54,
блок 2 кв. 19

Кому Газиев Р Г

Адрес отправителя: Москва А-55 Новослободская
улица дом 50/52 кв. 125
А. А. Мамедов.

**دەبێت تۆ هەروا، ئاوازخوێنی برینەکانی مرۆڤی ڕەنجدیدە بیت.**

نامەی مەنسور یاقوتی بۆ شێرکۆ بێکەس

شاعیری گرنگ و ئاوەزمەند شیرکۆ بێکەسی ئازیز

درود بۆ ئیوە و بە ئومیدی دیدارتان کە هاوتای شاعیرانی مەزنی هاوچەخی ئێران، لە وڵاتی ئێران و لە نێوان تیگەیشتووان و شاعیران و ئەهلی ئەدەب دا ناسراویت.

منش لە گەڵ هۆنراوە زۆر جوان، بزوینەر و لێوریژ لە ژیرییەکەتان دا ژیاوم. هۆنراوەی ئیوە بۆ ئێمە پەیامی ئومێد، ژیان، هۆگری وپەیامداری لەگەڵ بووە. هۆنراوەی شێرکۆ بیکەس هۆنراوەیەکە بەڵێندارە بە ژیان و مرۆڤ، هەر ئەمەیە کە سنوورەکان دەبڕێت و مرۆڤەکان بۆ پێشەوە ئاراستە دەکات:

- دەتوانرێ سەر هەم بێتە بێشەی شیعر و هەم شعور....
- برسیێتیمان تاقیکردەوە/ تا وەک یەک بخۆین/ روویتمان تاقیکردەوە تا وەک یەک بپۆشین...
- ئازادی تەنها بەیەک زمان ئاشنا نییە...

دەبێت تۆ هەروا ئاوازخوێنی برینەکانی مرۆڤی رەنجدیدە بیت، مرۆڤ، لە هەرکوێی ئەم هەسارە شینەدا، مرۆڤی بێ بەش.... وە ئیستا کە پێنووسی تۆ ئازاد بووە، پەناگەیەکە بۆ خاوەن پێنووسان، ئەوانەی کە پێنووسیان لە ئەسرین و رەنج و خوێن دا دەگێڕن...

دۆستانە دەستتان دەگوشم، مەنسور یاقوتی

لەگەڵ ئەم نامەیەدا دەقی تەواوی "برزو نامە" –شانامەی کوردی–

لە ٩٤ لاپەڕەدا دەنێریت، هیوادارم وەرگێرێکی ئاشنا بە زمانی کوردی کەلهور – کولیایی بتوانێت ئەم دەقە وەربگێرێت بۆ کوردی سۆرانی.

شاعر گرانقدر و فرزانه

شیرکو بی‌کس نازنین

با درود و آرزوی دیدار شما که همسنگ شاعران بزرگ معاصر ایران، در کشور ایران و در بین فرهیختگان و شاعران و اهل ادب آشنائید.

من هم با اشعار بسیار زیبا، شورانگیز و سرشار از خرد شما زندگی کرده‌ام. شعر شما برای ما پیام امید، زندگی، همبستگی و پایداری همراه داشته است. شعر شیرکو بی‌کس شعری است متعهد نسبت به زندگی و انسان، همین است که مرزها را در می‌نوردد و انسان‌ها را به پیش می‌راند:

□ می‌توان سر را هم بیشه‌ی شعر و شعور آتش کرد....

□ اگر تشنگی راست کردیم تا بیابان هم بجوشیم | اگر گرسنگی راست کردیم تا بیابان‌ها هم بپوشیم ا....

□ رهایی تنها به یک زبان آشنائیست ...

باشد که شما همچنان آوازخوان زخم‌های انسان رنجدیده باشید، انسان، در هر کجای این ستاره آبی، انسان محروم..... و حالا که قلم شما آزاد شده است، تسلیت‌هایی برای اهل قلم، آنان که قلم در آتش و رنج و خون می‌گردانند...

دلت شاد، همیشه شادمانی، شاد زی: منصور یاقوتی

کرمانشاه ۵ اردیبهشت ۸۵

همراه این نامه متن کامل «برزونامه»، شاهنامه کردی – در ۹۴ صفحه ارسال می‌گردد. امیدوارم مترجمی آشنا به زبان کردی [illegible] بتواند این متن را به کردی سورانی برگرداند.

**دوای ئەوەی پرۆژەکە بۆ خۆ مرد...**

نامەی موحسین ئەحمەد بۆ ئەحمەدی مەلا

برام کوی، سەروسیحەتت لەگەڵ ئیسپانیای وڵاتی ڕم و ڕمبازی کوییە؟ برای بەڕیزم هیوای شادمانی بۆ تۆ و ساری خیسوسی خیزانت دەخوازم.

اما بعد، برای بەڕیزم دەست لە مامۆستا موحەمەد موکری بشۆ، هامشۆو گفتوگۆ لەگەڵ ئەم پیاوە زەحمەتە، سەرەڕای زیرەکی خۆی، هەمیشە لە لوتکەی ئیگۆیزم هەژیێ، بۆیە داواکردنی شت لێی بێ سوودە، سەرەرای ئەوەش زۆر بێتاقەتە، بێجگە لەوەش، بەردەوام لە ناو ترسێکی گەورەدا دەژیێ، ئیتر بێسوودە، ئەمە لەلایەک لە لایەکی تر، مەسەلەی تێزەکەت[1] چی بەسەرهات؟ کەی سوتنانس دەکەی؟

برام سەرەنجام ئەو پرۆژەیەی بۆم باسکردن، دەربارەی وەرگێرانی شیعری کوردی، دەعوەتکردنی هەندێ کەس لە کوردستان و ئەورووپا، سەرەنجام قبوڵ کرا، بێگومان (عەبدوڵلا ئۆجەلان) خۆش بێت، دوای ئەوەی پرۆژەکە بۆ خۆ مرد، بەڵام پاشان دوای ئەم ڕووداوەی (ئۆجەلان) (ماڵی شیعر) خۆیان پەیوەندییان پێوەکردم و وتیان چیت دەوێت بۆت دەکەین، سەرنجام پرۆژەکەم پێشکەشکردنەوە. ئێستا ئامادەن شەش کەس دەعوەت بکەن. هەمان ئەو کەسانەی، کە پێشتر قسەمان لەسەر کرد (ئازاد عەبدولواحید، زامدار، کەژاڵ ئەحمەد، لەتیف هەڵمەت، شێرکۆ بێکەس، ڕەفیق سابیر)، ماوەتەوە جارێکی تر قسەیان لەگەڵ بکەمەوە، بۆ ئەوەی تۆ و نەزەندیش (نەزەند بەگیخانی) دەعوەت بکەن، چونکە بێگومان هەر ئەم سێیەمان لەگەڵ ئیسماعیلیش خەریکی وەرگێرانی شیعرەکان دەبین، جا ڕەنگە پرۆژەکە بکەوێتە مانگی شەش، لەهەمان کات دۆسیەیەکیش دەربارەی شیعری کوردی لەگۆڤارەکەیان، بڵاودەکەینەوە،

---

[1] تێزەکەی ئەحمەدی مەلا لە بارەی مەحوییەوەیە بڕوانە: د.ئەحمەدی مەلا، مەحوی لە نێوان زاهیرییەت و باتینییەت و سەرچاوەکانی عیشق و وێنەی مەعشووقدا، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١٣

نامەم بە فاکس ناردووە بۆ کوردستان، ئەم شاعیرانەی سەرەوە (کەژاڵ ئەحمەد، هەڵمەت، محەمەد عومەر عوسمان، قوبادی جەلیزادە) ش، شیعری خۆیانمان بۆ بنێرن بۆ وەرگێران، جا لە شیعری ئەو شاعیرانەی کە دەعوەت ناکرێن، تەنیا بۆ دۆسیەکە وەک محەمەد عومەر و قوبادی جەلیزادە، هێشتا من هچیم نەکردووە، بەکەسم نەگووتوە پرۆژەکە قبولکراوە، تەنها بە تۆ نەبێت. چاوەڕێ دەکەم هەندێ شیعرم بە فاکس پێبگات لە کوردستان، (......)[1] ئێوە لەلای خۆتان بۆ دۆسییەکە جارێ، شیعری خۆت و هەرکەسێکی لەوانەی ناویان هاتووەو لات دەست دەکەوێت، وەربگێڕە. بێگومان لەوانەی هەندێ شتیشت بۆ بنێرم. ماوەتەوە جارێکی دیکە لەگەڵ ماڵی شیعر قسەبکەمەوەو پرۆژەکەیان لەگەڵ ساغ بکەمەوە ڕۆژەکە دیاری بکەین وئێمەش هەندێ کار بکەین، ئینجا ئاگاداری کوردستان دەکەمەوە کە ئەو کەسانە دەعوەتکراون، و خۆیان ئامادە بکەن بێنە فەرەنسا. ئیتر هەوڵبدە وەلامم بدەوە.

برات موحسین

٩٩/٣/١

[1] ئەم دێرە دیارنیە و ناخوێنریتەوە.

**حەزم لە شیعرەکانتە.. لە جیهانتە.**

نامەی موحسین ئەحمەد بۆ فەرهاد پیربال

زۆر برای شیرینم.. فەرهاد گیان

هیوادارم هەمیشە سەرفراز و خۆش گوزەران بیت،

گزنگ (نەزەند بەگیخانی) زۆر سلاوت لێدەکات.

ماوەیەک بەر لە ئێستا نامەیەکم بۆ ڕەوانە کردی،

هیوادارم سەرم نەئێشاندبی، داوای لێبووردن

دەکەم.

برا گیان ئارام نامەی ناردووە، زۆر سەلامت

لێدەکات، مانگی شەشی ئەم ساڵیش دێتە

دانمارک، دەربارەی کێتبەکانیشت وابزانم بۆت

پۆست دەکات، وەختی خۆی بە نامە پیم

ووتبوو.

فەرهاد گیان ئەو نامەی بەردەست، کەلەبارەی

مۆسیقای کوردی یە، "مطالعات کردی"

ئەنستیتووت بڵاوبۆتەوە، وەرم گێراوەتە

سەر کوردی، بەومەبەستەی لە "پەیڤ" نەشری

بکەم. جالەبەر ئەوەی خۆم هیچ تعاروفێکم

لەگەڵ نووسەرانی پەیڤ و کەمال میراودەلی نی یە، حەزمکرد لە ڕێگای تۆوە بۆیان بنێرم.. جا واباشترە ئەگەر تۆش ماوەت هەیە، لەگەڵ دەقە فارسی یەکەی بەراوردی بکەیت، هەر هەڵەیەک هەیە ڕاسیتی بکەیتەوە. پەیڤ-یش ووتاری وەرگێڕراوی دەربارەی کلتووری کوردی و کورد بە گشتی بڵاودەکاتەوە. وام بە باش زانی بۆ ئەو گۆڤاری ڕەوانە بکەن. لە هەمان کات فەرهاد گیان.. گزنگ ماوەیەک بەر لە ئێستا قەسیدەیەکی بۆ پەیڤ نارد "جوولەی پێ یە سڕبووەکان" هەروەها لە هەمان نامەدا داوای کتێبێکی لە کەمال میراودەلی کردووە کە لەسەر ئیلیەتە، لێرەش دەست ناکەوێ، هەروەها گزنگ لە نامەکە بۆ کەمال میراودەلی باسی ئەوەی کردووە، کە وا کاک فەرهاد پیربال لە بارەی ئێمەوە نامەت بۆ ڕەوانە دەکات.

ئیتر فەرهاد گیان.. ئێمە و مەسەلەی زەمالەکەمان "ئێمە هەموو شتێکمان ئامادەیە، پاسپۆرت، شەهادە و .." هەیتم.

فەرهاد گیان زۆر غەریبیت دەکەین، بە تایبەتی من بە ڕادەیەک... زۆر حەزدەکەم بتبینم، لەگەڵت دانیشم، حەزدەکەم بێینە فەڕەنسا، لەگەڵ هەموو کەموکوڕی یەک، لەگەڵ هەوو ژیانێکی ناخۆشی و غەریبی. بەڕاستی لێرە هیچ کەسیک تێمان ناگات، ئێوە هەن، ئێوەش دوورن. من لەیەک کات غەریبی ئینسانی وەک تۆ و ماڵەوە دەکەم، بۆیە بینینی تۆ ئاسانترە وەک لە ماڵەوە، لە هەولێر، لە بینینی خانووە قوڕینەکان و ئەگەرچی بینینی ئەمانە بە خەونیش بێ هەر خۆشە.

ئەمڕۆ نامەیەکم لە عێراقەوە پێگەیشت، باسی ئەوە دەکات دلاوەر قەرەداغی گەڕاوەتەوە سلێمانی لەگەڵ عەفوەکە خۆی تەسلیم کردۆتەوە "شانۆگەری یەک لەلای تۆیە، من خۆم حەزدەکەم بڵاوبێتەوە".

حەزم لە شیعرەکانتە.. لە جیهانتە.

من شاعیر نیم و ناشمەوێ ببم بە شاعیر، بەڵام زۆر هەڵوەدای ئەوەم لەسەرە دەربارەی شیعر بنووسم، زۆر حەزیش بەم لایەنە دەکەم، تا ئێستا گەلیک

دراسەی باشم دەربارەی شیعر و فکری شیعر و فەلسەفەی شیعر و... خوێندۆتەوە، بە تایبەتی هی نووسەر و شاعیرە لوبنانی یەکان، لەگەڵ هەندێک لە ئێرانی یەکان وەک سوهراب و فروغ و اخوان ثالث و.. لەگەڵ ئەمەش من بیروبۆچوون ئەحساساتم بەلای ئەدەبی لامەعقول عبث و ئەدەبێکی پڕ دەڕوات. زیاتر حەزدەکەم لەم ڕوانگەیەوە خۆم دەربخەم، هەڵبەتە ئەویش بە ئەخلاقێکی فیکری هۆشیاری یەکی زیندووەوە دەکرێ، بۆیە زیاتر بەلای چیرۆکنووسین و ووتاری فەلسەفی دەشکێنمەوە.

بۆیە ناتوانم دەست بدەمە قەڵەم شیعر بنووسم، زۆر جار ویستوومە شیعر بنووسم، بەڵام بێزم لە خۆم کردۆتەوە، قەسیدەیەکم هەیە "هەروەها ڕەنگە لە ئایندە بۆتی ڕەوانە بکەم، قەسیدەیەکە هی ئێستا نی یە لە کۆن نووسیومە، ئەو کاتە هێشتا بێزم لە خۆم نەدەکردەوە".

فەرهاد گیان: سارتەر و سیمۆن و کامۆ و میرلۆبۆنتی و بەرجسۆن و شۆپنهاوەر و دیستۆفسکی ژیانی منیان گۆڕی، لە مرۆڤێکی ئاست نزم، منیان هێنایە ئاستی مرۆڤێکی دڵ و دەروون و بۆچوون تاریک. هەربۆیەشە حەزدەکەم و ئەدەبێکی تاریک بچنم. ئەمەش لەگەڵ تاریکییەکەی سەردەم دەگونجێ، هەروەکو سەروەر ووتی. من لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨-ەوە تا ڕۆژێک پێش دەرچوونم لە هەولێر. واتە تاکۆتایی ساڵی ١٩٨٧ هیچم نەدەکرد، لە ژوورەکەی خۆم دەرنەدەهاتم، هەموو ئەو نووسەرە گەورانەی دنیا بە تایبەتی ئەوانەی سەرەوە دووجار و سێ جارم خوێندەوە، هەربۆیەش دوای ئەوەی چەند کیلۆمەترێک لە هەولێر دوورکەوتمەوە، ئەو دوورکەوتنەوەیە بە جارێ لێم بوویە سەدمە. هەوڵم دەدا قەناعەت بە خۆم بێنم نەڕۆم. بەڵام هەمان کاتیش شتێک رایدەکێشام، ئێستاش کە گەیشتوومەتە ئێرە، تەئثیری ئەو سەردەمە هەر لەسەرم ماوە، بۆیە هەردەم لە ناو غەریبی یەکی پڕ دەژیم. لەگەڵ شیعرەکانی تۆش ئەوەندەی دیکە دەچمە خوارێ، قەسیدەکانت، باسی ئەو جیهانە سادەیەم بۆ دەکەن، باسی ئەو شتە بچکۆلانەم بۆ دەکەن، من پێ یان ئاشنام، بەڵام چاوم نەیانبینیوە، وەک ئەوە وایەتۆ یەکەم جارە پیشانم دەدەی و بەڵی تۆ باسی ئەو

شتانه دەكەی وەک ئەوەی یەكەم جارە دەیبینم و هەستی پێ دەكەم، ئیمڕۆ چەشنێكە لام و سبەینێش چەشنیكی دیكە. تۆ ووشەكان لە ناوەوە دەتەقێنیتەوە، سەریان دەخەی، دەیخەیتە گوێمان، ووشەكان، ووشەن، ووشەی پڕن، بە ناو فەلسەفەی غەریبی ڕۆدەچیت و مەنفا دەبێتە ئەو نیشتمانە كاتی یە پرە بە ئاوارە. ئەم ژیانە تاریكەش، لچكێكی زۆری تەفسیرێكی لامەعقول و جوان هەڵدەگری، بۆیە شیعرەكانتم خۆشدەوێ و حەزیان لێدەكەم. من حەز لە شیعریک دەكەم تەئسیسی فیكری و فەلسەفی تیابێت. بە زمانیكی سادە و تەشبیهاتی زیندوو بە ناو ئەو عالەمە تاریكە بچێتە خوارێ. تراژیدیەتی بوون، مەرگ، لە دایک بوون، پیشان بدات. شیعر بەلامەوە شتێكی زۆر ترسناكە، بەڵكو ئەدەب بە گشتی هەموی ترسناكەو بە تایبەتیش شیعر، بۆیە هەر دەم دەمەوێ شتێک بنووسم، لە سەدادسەد دەستم بەسەریا بشكێ.

ئەوەی تا ئێستاش كردوومە بریتیی یە لە چیرۆک و ووتاری فەلسەفی، لە ئایندە زۆر شتت بۆ دەنێر.

ئایە ئەبێ ڕۆژێک بێت بەیەكەوە دانیشین....؟!

كۆپنهاگن

١٩٨٩/٥/١٨

محسن احمد عمر

## زەنگی کاروانم بۆ ناردی...

نامەی میدحەت بێخەو

هەولێر ١٩٦٨/٩/١٤

ستوصف الصدريه

مدحت بێ خەو

مامۆستای بەرز و خۆشەویستم کاک عیزەدین مستەفا

هەموو کاتیکتان شاد

سڵاوێکی گەرم و گوڵاوی ناخی دل ..

بەرزی و سەرکەوتنتان ئاواتەخوازم، من باشم، باشتری بۆ ئێوەی خۆشەویست داواکارم.

مامۆستا دوای پشووی سەرە [سەری]ساڵی ڕابردوو، نامەیەک و چەند هەڵبەستێکم بۆ ناردی، ئەوە بوو ئێوە لەوێ نەبوون، بەلام هەڵگری نامە لای بەدالەکەتان نامەکەی جێ هێشتبوو، وە دوای ماوەێیک زانیم کە پێتان نەگەیشتووە دوای ئەوەی هەڵبەستی (ئەنجامی زۆرزانی) لە برایی بلاوکرایەوە.

ئەوە لەگەڵ کاک وریا چەند هەڵبەستێکم بۆ ناردی بۆ خۆت و بۆ بڵاوکردنەوەی لە (برایی) ئەگەر حەز ئەکەی..

مامۆستا کتێبەکەم ئامادەکردووە بۆ چاپکردن، وە بێگومان لەتۆش چاکتر نادۆزمەوە کە پێشەکییەکەی بنووسیت، چوونکە هەموو کەس ئەو توانایەی نییە، پێشکی هەڵبەستی خۆمانە بنووسێت، جار هەر کاتی کەمی باری ڕامیاری باشتر بوو، ئەوە دێم وە بە دیدەنیتان شاد ئەبم وە بە چاپی ئەگەیەنین، وە هەروەها لەگەڵ کاک وریا، (زەنگی کاروان)م بۆ ناردی، کەدانەی خۆیەتی و من لام نەمابوو، وە ناوەڕۆکی هەڵبەستی زەنگی کاروان نۆبەری هەڵبەستمە وە پێش دە

ساڵ بڵاوکراوەتەوە، وە رادەی گەلی جیاوازی هەیە، لەگەڵ بەرهەمی ئێستام، بێگومان ئەمە تێبینی ئەکەی وە ئەمەش ڕادەی توانا و پێشکەوتن پیشان ئەدا لە نێوان ١٠ ساڵ دا..

مامۆستا زۆر سوپاست دەکەم لە بابەت ئەوەی ناوی منت هینابوو بە باشی، بی گومان مایەی هاندان و پێشکەوتنی ئیمەی وە داوای بەرزی و سەرکەوتنت بۆ ئەکەین وە لە ئەنجاما دووبارە ڕیز و سلاوم پێشکەوشتانە. چاوەروانی وەلامین

برای دڵسۆزتان

مدحت بێخەو

تێبینی:

مامۆستا چاوەڕوانی نامەتم بۆ ئەوەی لەگەڵ برادەریک

کتێبەکە بۆت بنێرم تاکو بێ پەلە جاری پێشەیەکەی

بۆم بنووسی، تاکو خۆم بە دیدەنیتان ئەگەم.

**چیرۆکێکم بە بەریدی موسەجەلا ناردە...**

نامەی میرزا محەممەدئەمینی مەنگوڕی بۆ عیزەدین مستەفا

سلیمانی
٩٧٩/٨/٢٠

بو ماموستای بەریزم کاک دوکتور عزالدین
پێشکەشە

داوای بەرزیتان لە یەزدان ئەکەم هیوادارم هەروا پیشکەوتوو سەرکەوتوبن. کاکی خۆم بە بەرواری ژمارە ٢٨/٤/ ١٩٧٩ چیرۆکیکم بە بەریدی موسەجەلا ناردە خزمەت بە ناوی چیرۆکی (نەریمان بەختیاری) بەم هیوایەی کە بیخەنە موسابەقەی چیرۆک خوانیەوە.

وە ئەوەش لەسەر بانگەوازەکانی خوت بو. بەلام دوینی سەباح غالب ئەندامی لیژنەی یەکیتی نوسەرانی سلیمانی. ووتی تو ناوت لە قائیمەدا نیە و هیچ شتێک بە ناوی تووە تومار نەکراوە. جا کاکی خوم مادەم چیروکەکەی منان نەخستوتە بەر چاوی خویندنەوە و لی کولینەوە.

تکایە کتێبەکەم بۆ بگەرینەوە بۆ سلیمانی بە ناوی یەکیتی نوسەران سلیمانی. بەو مەرجەی پیم بگاتەوە چونکە زورم زەحمەت پیوە کیشاوە ئیتر خوشیتان کاکی خوم.

میرزا محمد امین مەنگوری
براتان

**... بەڵام درێژە بەهیچی نادات!**

نامەی نەزەند بەگیخانی بۆ فەرهاد پیربال

زۆر بەڕێز... برای خۆشەویست.. کاک فەرهاد پیربال...

سڵاوێکی گەرم... دەستەکانت دەگوشم.. هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم... هاوڕێ ڕێز و سڵاوی گەرمی هەیە بۆت...

دەستەکانت دەگوشێ..

کاکە فەرهاد گیان.. لەو نامەیەی دوایت داوات کردبوو

ڕا و بۆچوونەکانم لەسەر شانۆگەری یەکەت بنووسم..

لە ڕاستی دا من خۆم لەو بارەدا نابینم کە بتوانم

ڕا و بۆچوونەکانم بە شیوەیەکی هونەری وەکو پارچە

نووسینیک دەربڕم.. خۆشم هەوڵی ئەوە نادەم ئەو

شتە بکەم. هەر لەبەر ئەمەشە کە ناتوانم بیکەم..!!

هەر لە منالیمەوە جیهانی هونەر و ئەدەبم

خۆشویستووە، بەڵام وەکو پراکتیک تەنها لە مەیدانی

شعرنووسیندا کەمێ ڕۆیشتووم.. بەرنامەکانی

ژیانیشم وەکو هونەرمەندێ یان شاعیرێ

نابەم بەڕیوە... لەوانەیە دوای

خویندنەوەی شانۆگەرێ

یەکەت توانیبێتم چەند قسەیەک بکەم... یا کاتێ لەگەڵت دانیشم وەکو قسە دەتوانم چەند قسەیەک لەسەر شانۆگەری یەکەت بکەم... بەڵام وا هەست دەکەم ئەم چەند قسەیەم بۆ ناخرێتە ناو فۆرمێکی هونەری جوان.. وەکو رەخنەیەکی ئەدەبی نووسراو... لەبەر ئەوە داوای لێ بووردن دەکەم....!! زۆر بەرهەمی تۆم خویندۆتەوە... هەست بە جیهانێکی زۆر جوان دەکەم... زۆر بە پاکی و بە حەقیقی.. بەناسکی بەرەو ڕووی شتەکان دەبیەوە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەی..بەڵام خۆزگە ئەم هەموو توانا و بیر و هەستە جوانانەت بەسەر زۆر لایەن دابەش نەدەکرد... بەلای مرۆڤی رۆژهەلاتی بە تایبەتی کەسیکی کورد زۆر ئاسایی یە دەست لە زۆر شت بدات.. هەر ئەمەش لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی...

"ڕۆژێکیان لە ڕادیۆی دانمارک گفتوگۆیەک کرا لەگەڵ ئەو منالانەی تەمەنیان لە نێوان ٨ تا پانزە ساڵی بوو، دەربارەی حەز و ئارەزوو و هیوایەتیان لە ژیان و لە دوا ڕۆژ، یەک لە وانە کچیکی سیانزە ساڵ بوو ووتی من تەنها یەک ئارەزووم هەیە ئەویش ئەوەیە حەزدەکەم ببم بە مۆسیقالیدەریکی باش!! ووتیان ئەی باشە ئەگەر ئەمەت بۆ نەلوا... ووتی هەردەبێ ببم... هەموو هیز و توانام بۆ ئەمە تەرخان دەکەم... ئەگەر نا هیچ ئارەزوویەکی ترم نیە...!!"

تۆ سەیری ئەمە بکە و لەم تەمەنە بچووکەوە شتەکانی یەکلاکردۆتەوە لە ناوخۆی و حەز و ئارەزووی خۆی دیاری کردووە بە پێ ی توانا و بەهرەی خۆی.. هەر لەم تەمەنەشەوە قەناعەتی بەوە هەیە کە هەموو ژیانی تەرخان دەکات بۆ ئەوەی ببێ بە مۆسیقالیدەر و هیچی تر..

لە ڕاستی دا ژیان بەشی هەموو شتێک ناکات.. ئەگەر بتەوێ لە هەر هەموویان سەرکەوتووبی.. تۆ لەو باوەرەدانی ئەم منالە لە دوا ڕۆژ مۆسیقالێ دەریکی سەرکەوتووی لێ دەردەچێ..

ئێمەی ڕۆژهەلاتی بە حوکمی سەرکوت کردن و دامرکاندنەوەی حەز و ئارەزوو ناتەواوی پەروەردەکردن.. هتد.. نازانین دەمانەوێ ببین بەچی.. دەست لە هەموو شتێک دەدەین.. لەم دەست لێ دانەش، هەروەکو شاعیریکی ئینگلیزی کۆن دەڵێ:

Evory tging by starting

And mothing long….

واتە:

هەموو شتێک دەست پیدەکات... بەلام درێژە بەهیچی نادات

بۆچی هەوڵ نەدەین شتەکان یەکلابکەینەوە: "ت.. س.. ئیلەت" کە بۆ یەکەم جار دەستی کرد بە نووسینی دراما زۆر قۆناغی گەورەی لە مەیدانی شیعر و دراسات لە سەر دانتێ و شکسپیر بڕی بوو کەچی یەکەم دەستنووسی شانۆگەری یەکەمی دەدڕێنێ و دەڵێ جارێ زۆرم ماوە.. لە دوایدا دەڵێ شانۆگەری نووسین شتیکی ئاسان نییە.. شانۆگەری وەکو شیعر نیە.. دەبێ هەردەم بیر لەوە بکەیتەوە ووشەکان بەشیوەیەک دابڕژرێ کە بتوانرێ بووترین!! ئەمەش توانایەی زۆر دەوێ.. ئیتر وازدەهینێ تاماوەیەکی زۆر....!!

لەوانەیە لە مەبەستم بکەیت.. من کە شیعرەکانی فەرهاد پیربال دەخوینمەوە هەست بە هاوکیشەیەکی شیعری تەواو دەکەم لە نێوان خودو بابەت... کەلە بەرهەمەکانی تر.. دراما... وتاری ڕەخنەیی شانۆگەری پێش کەش کراو (کە ئەمەیان زۆر گرانترە لە هی نووسراو).. چیرۆک.. ووتاری سیاسی....!! من بم لە جیاتی تۆ ئەم هەموو توانایە تەنها لە یەک مەجال دەخەمەکار ئەوە رای منە.. لەوانەیە ڕای تۆ زۆر جیابێ.. بەلام با ڕای من و تۆ بخینە قالبی مەنتیقەوە کاک فەرهاد گیان..

ئەمەیان لەلایەک.. من شانۆگەری گێژەن و ووتارەکەی تۆم خوێندۆتەوە لە هەردووکیان هەست بە کەم و کوڕی دەکەم.. بە نیسبەت وتارەکەی تۆ.. ئایا تۆ کاتی خۆی پەلەت نەکردووە لە نووسینی ئەم ووتارە ئایا بەباشی بیرت لێ

کردوبۆووە.. نووسینی ووتاریکی رەخنەیی لەسەر شانۆگەری یەکی پێش کەش کراو کاریکی ئاسان نیە، لێرەدا دەگەڕیمەوە سەر خاڵی یەکەمی نامەکەم.. ئەویش یەکلانەکردنەوەی مەسەلەکانە.. لێرەدا هەست بە گرینگی و بایەخی ئەم لایەنە دەکرێت.. مەرج نیە مرۆڤ لە بارەی زۆر شتەوە بنووسێ.. مەرج ئەوەیە ئەو شتەیی تیای دەنووسی سەرکەوتنی تیا بە دەست بێنی..

"شعریکی نوێم داوەتە کاک هەڵکەوت بۆ ئەم ژمارەیەی یەککرتن.. لەوانەیە لەگەڵ بابەتەکانی تری پاشکۆی ئەدەب بۆتی بنێرێ.. حەز دەکەم ڕات بزانم لەسەری..."

گزنگ٧/٥/٩٨٩

**ئەبێ چی بکەین، چی بگۆڕین؟**

نامەی نەوشیروان مستەفا بۆ شێرکۆ بێکەس

بڕای بەڕێزم کاک شێرکۆ ٨٩/٥/٤ ڤییەنا

سڵاوێکی گەرم

هیوادارم هەمیشە لە شادیدا بی، بە پەرۆشەوە هەواڵت ئەپرسم، دەستی شەفیقە خان ماچ ئەکەم، سڵاو لە نەسرین خان دەکەم، ئومێدەوارم هەڵۆ و منداڵەکان تەندروست و سەرکەوتووبن..

ئەگەر پرسیاری هەواڵی ئێمە دەکەی ماوین و دەیگوزەرێنین، بەڵام بە داخەوە بە ئەنجامێکی ناخۆش گەشتین، گەلەکەمان بە هەلومەرجێکی سەخت و ناڵەباردا ئەژی، دیارە خۆت ئاگاداری کوێرەوەری خەڵکی پێویست ناکا لەسەری بڕۆم، هەمووشمان ئێستە لەبیرکردنەوەی ئەوەداین کە بۆ درێژەپێدانی خەبات، ئەبێ چی بکەین، چی بگۆڕین؟ شێوەکانی خەبات؟ ڕێگەکانی خەبات؟ یاخود (عەقڵییەت)ی جۆری خەبات و ئامانجەکانی؟ من خۆم هێشتا لەسەر شتێکی دیاریکراو ساغ نەبوومەتەوە. دیارە پەلەکردنیش باش نیە. بە هەرحاڵ بەهەر شێوەیەک مومکین بێ و بەهەر جۆرێکی لە تواناداا بێ درێژە بەکار ئەدەین و هەندێ ڕێگە و شوێنمان بۆ داناوە. تازە هەموو لایەنەکان پێ یان وایە کە ئەبێ هەوڵبدرێ بۆ چارەسەری سیاسی (شێخ ڕەزا گووتەنی: تازە ئەچێ بۆ بەصرە، بعد خراب البصره!) ئێستە تەرکیز لەسەر ئەوەیە لێ ی نائومید نیم و ئومێدی زۆریشم پێ ی نییە. بەکورتی ئەمە دیمەنی نوێ ی بۆچونەکانی ناوەوەیە..

با لەو باسە گەڕێین، بە هیوابوم یەکتری ببینین، بەلام ڕێ نەکەوت، ڕەنگە لەو ڕۆژانە سەفەرێکی شام بکەم، نازانم چەندە ئەمێنمەوە و دوای ئەوەئەگەڕێمەوە ئێران یاخود بۆ ئەم ناوە دێمەوە، چونکە چاوەڕوانی قسەی برادەرانم.

بە چاکم زانی پێشنیارێکت بو بکەم،کە لام وایە کارێکی گرنگ ئەبێ، خۆت ئەزانی شیعری سیاسی کوردی لە هەندێ قۆناغی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا

گرنگییەکی گەورەی هەبوە، چ لە دەربڕین و داڕشتنی هەندی لە ئاوات و ئارەزووەکانی گەلەکەمان و دیاریکردنی لایەنی فیکری، وە چ لە هاندانی خەلک بو خەبات، لام وایە ئەگەر بەشێکی کاتی خۆتی بۆ تەرخان بکەی تۆ رەنگە باشترین کەس بی کە لیکۆلینەوەی درێژ و زانستی لەو بارەیەوە ئامادە بکەی، بەتایبەتی لە باری ئیستای ژیانی ئێستادا و فرسەتیکی واهاتۆتە پێشەوە لەوانەیە پاش ماوەیەکی تر وا نەمێنێ.

پێشنیارەکەی من بە کورتی ئەمەیە:

<u>دەوری</u> شیعری سیاسی کوردی لە بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد دا

لەمەش دا ٤ قۆناغی مێژوویی بکریتە نمونە و لە فترەیەکی دیاری کراودا

ـ قۆناغی یەکەم ١٩١٨ – ١٩٢٥ سەردەمی شیخ مەحمود و دروستکردنی حکومەتی کوردستانی جنوبی و ئینجا تیکچوونی.

شاعیرەکانی ئەو سەردەمەش، بەرهەمەکانیان مەعلومە.

ـ قۆناغی دووەم جمهورییەتی مهاباد

شاعیرەکانی ئەو سەردەمەش مەعلومە، زۆربەی بەرهەمەکانیان لە رۆژنامەی کوردستان و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەدا هەیە، کاک مەحموود لایەتی ئەتوانی کەلکی لی وەربگری.

ـ قۆناغی سێیەم ١٩٥٨ ـ ١٩٦١ کوردستانی عێراق کە خۆت یەکێک لە شاعیرەکانی بوی.

ـ قۆناغی چوارەم ١٩٧٠_١٩٧٥

بیگریت ئەمە پێشنیارە، بەلام من خۆم بەلامەوە زور گرنگ و بەکەڵک ئەبێ کە بەرهەمیکی وا بنوسرێ و دلنیام فیکری کوردی زۆر دەولەمەن ئەکات. ئەهمییەتی شیعر لە مێژوویی نوێی گەلەکەماندا دەرئەخا.

بەنیسبەت خۆمەوە خەریکی نووسینی باسیکی دریژم لەسەر (مەسەلەی کورد لە کاروباری دەولەتان دا) هەندی بەشیم نوسیوە و خەرکی بەشەکانی تری ئەبم. هەرچەند فرسەتم هەبێ هەولئەدەم خەرکی بم، هەولئەدەم باسیکی سیاسی و فیکری وثائق بێ، وە دەری بخەم پیوەندی کورد و دەرەوە چۆن بوە، غەلەتی سیاسەتی خارجی و حرکەی کوردی، نوقتەی زەعیف و قووەتی چی بون و بۆچی ئەم عامیلە هەمیشە دژی مەسەلەی[1] کورد بوە، دەربخەم (بێ گومان بە پێ ی تەفسیری خۆم).

دوبارەی سلاوی بێ ئەندازم هەیە، بە ئومیدم لە هەلیکی نزیکا بە دیدارت شاد بیم، و هەمیشە لە خۆشیدا بی

[1] ئەم وشەیە دەشێت کەسی کوردی، یان مەسەلەی کوردیش بیت بەلام باش ناخوێنریتەوە.

ساخپیا وە دخازم.

نامەی نورەدین زازا بۆ عیزەدین مستەفا

مامۆستایێ دەلال

نۆزدە کتێب کو تە و ئەڤدیجەبار وە ژ من رە شاندینە، گیهان دەستێ من زور، زور، سپاس. د ناڤ واندا سێ کتێبێن تە هەنە کو ژ من رە دیاری کرینە، مالا تە ئاڤا، ئەز هیڤی دارم کو تو دوم ب خەباتا خوەیە ئەدەبی بکی و فۆلکلۆرا کوردی یا زەنگین و رەنگین ژ تاریێ دەرێخی و بێخی بەر چاڤان.

ئەگەر تو بکاری ب هن شعرێن (هەلبەست) گوران، هەژار و کامران ب عەرەبی یان ب ئینگلیزی پەیدا بکی و ژ من را بشینی ئەز پر مینەتبارێ تە ببم.

هەچی خەباتا من ل ڤیرمن نێزیکی دەهـ چیرۆک و دەستانێن کوردی وەرگێراندینە فرێنسیزی. چەندێک ژ وان د کوڤارێن سویسریێدە هاتن چاپ کرن.

ژ پیڤێ دو، بەندێن/(مەقالێ)من، یێک یانی یێک ژ ئەدەبی د نێزیک دە، د رۆژنامێییەکی سویسری دە وێ دەرکەڤن. من تێ دی بەحسا کتێبا تەیا ب عەرەبی ژی کریە. من ژی چەند هەڵبەست ژی ستاندین (باباروخ و باباتاهیر).

من د رادیۆ دا ژی بەحسا کوردان کر، (سەعاتەک و نیڤ). جارەک دن ئەزێ تێ بەحسا ئەدەبا کوردی بکم.

چەند هەڤالێن من ئێن عێراقی ل "لاوساننێ" دخوێندن، نها ل بەخدایێنە، گەلۆ تو وان ناس دکی؟ ئەگەر ئەز ێ ناڤێن وان بدمە تە، پر ئینسانێن پاکن.

ئیدی پرسا وە دیسان دکەم و ساخپیا وە دخازم.

**ڕەنگە ئێوە من نەناسن...**

نامەی هەڵکەوت حەکیم بۆ لەتیف هەڵمەت

برای بەڕێز کاک لەتیف هەڵمەت پاریس ١٩٨٩/١٠/١١

ئەم کاتە و هەمووکاتێکتان باش

ڕەنگە ئێوە من نەناسن، ئەوا من چەند ساڵێکە لە پاریس دەژیم، خەریکی دەرس وتنەوەی زمان و ئەدەبی کوردیم، لە زانستگای سۆربۆن. چەند وتاریکم لەبارەی ئەدەب و مێژووی کوردەوە بڵاوکردۆتەوە. هەفتەی ڕابردوو دە شیعری ئێوەم دا بە گۆڤاریکی فەڕەنسی، کە لەگەڵ هاوڕییەکی فەڕەنسی وەرگێرابوونە سەر ئەم زمانە، دووسێ هەفتەی تر بڵاودەکرینەوە، ئەو فەڕەنسییانەی شیعرەکانت دەخوێننەوە زۆریان بەدڵە.. ئەمە وای لێکردم بیر لە بڵاوکردنەوەی کۆمەلە شیعرێکتان بکەمەوە..

بەداخەوە لە پاریس تەنها دوو کتێبتان دەست دەکەون: (گەردەلولی سپی و وشەی جوان گوڵە گوڵ!)[1] ئایا بۆتان دەکرێت دیوانەکانی ترتان بنێرن؟ هەروا ئەگەرپێتان بکرێت بە دوورو درێژی سەرگوزەشتەی ژیانی خۆتان بنووسن، واتە چەند لاپەڕەیەک، دەتوانین سوودی لێ وەربگرین بۆ ئەو پێشەکییەی نیازی نووسینیم هەیە، ئەگەر بۆشتان بکرێ، نوسخەیەکی ئەو وتارانەی لەسەرتان نووسراون، بۆم بنێرن گەلێک سووپاستان دەکەم، ئەبینن داواکانم زۆرن!

هەر کە شیعرەکانتان بڵاوکرانەوە لەو گۆڤارە، یەکسەر بۆتانی دەنێرم، جا ئەگەر ئەدرەسی خۆتان بزانم ئەوە باشترە..

---

١ لەتیف هەڵمەت، گەردەلولی سپی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٨.
لەتیف هەڵمەت، وشەی جوان گوڵە گوڵ، بەغداد ١٩٧٨، چاپخانەی حوادث.

ئیتر ئاواتی سەرکەوتن و شادیتان بۆ دەخوازم

هەڵکەوت حەکیم

ئەمەش ئەدرەسی منە..

(....)

لەتیف هەڵمەت

**تا جاریکی تر، ئەو شەکرەی شام داکرمێنم!**

نامەی هیوا قادر بۆ ئەنوەری ڕەشی عەولا

سڵاو ئەنوەر گیان، ڕێکا گیان تۆش ساغبیت.

شیعرەکەتم بە وردی خوێندەوە پیرۆزبایت لێدەکەم، زۆر حاڵەتی ورد و جوانی تیایە، لێ ئەگەرچی من بۆ خۆم پێموایە دەکرێ کەمێ ئەو هەناسە خاوانەی کە لە ئیقاعەکاندا، هەن چڕتر و گورجتر بکرێنەوە، بەڵام بشزانە ئەوە منم کە وا دەڵێم نەک تۆ. ئەوەش دەقی تۆیە و خۆت سەرپشکی تیایدا. نامەوێ فلتەفلت زۆر بکەم، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەو شیعرە بۆ خۆی هەنگاونان و هاتنە دەرەوەیەکی وریایانەی تۆیە لە ناو ئەو وشکی و ڕۆتیناتەی ژیان و مەشغەڵەتی کارەی کە ماندووی کردوویت. ئەوجاش پیرۆبێت.

دەڵیم مەزاجی قسەکردنت نییە و بێدەنگ بە. وابێدەنگ بووم.

هیوادارم سەفەرەکەتان بە ئاسانی بێتە دەست و لەڕێ تووشی گرفت و کێشمەکێشمی حەسحەسە بەرتیلخۆرەکانی سوریا نەبن. منیش بۆ خۆم زۆر حەز بەسەفەری شام دەکەم، تا جاریکی تر ئەو شەکرەی شام داکرمێنم، بەڵام ئەمجارەیان با وابێ و ناچار بۆ خۆم سەفەرەکەم لە تورکیاوە بکەم. ڕەنگە لە کۆتایی مانگی شەش یان سەرەتای حەوت بگەمەوە شار، ئەگەر لە شانسی ئێمە ئەو سەگوگورگەی ئەوێ دووبارە تێهەڵنەچنەوە.

تۆ پێش وەخت سڵاوی من بگەیەنە بە شێراد حەسەن و باقی هاوڕییان کە تا بێت ئەوانیش بە داخەوە کەم دەبنەوە.

دەزانم تۆ ئێستا دنیایەک خەوی ڕەنگاوڕەنگ بەسەفەرەکەتەوە دەبینی، بەڵام چاکترە نەهێڵێ پەتی ئەو خەونانە زۆر درێژ ببنەوە. چونکە ئەو گۆمەڵگایە ئێستە وا شێواوە و گۆڕاوە کە هەرگیز زەینی ئێمە لە سەفەری مانگێکدا پەیی پێنابات. بە تایبەتی نەفسیەتی خەڵکانی ئەوێ، کەسە نزیکەکان، هاوڕێکانی جاران، تەنانەت دار و درەخت و تۆز و خۆڵی ئەوێ. بۆیە چاترە هەمیشە حەزەرێک لە

ناوەوەتدا هەبێت. تا دوای هەست بە برینداربوونێکی گەورە نەکەیت، هەڵبەت خۆت پێش من دەیبینیت و تێدەگەیت.

بە داخەوە گریانی ئێمە و خەونی ئێمە هەمیشە بەوێوەوەیە، کەچی ئەوێش وەک دێرە شیعرەکەی دیلان:

هەڵبڕە چاوی نومایشت و تێر سەرنجی ورد بدەوەک بەجێت هێشـــا وا نـەماوە شـارەکەی جارانەکەم

لە ڕاستی دا مەزاجی نامە نووسینم و نییە و ناشزانم چی بنووسم، نە من باشم و نە ئەوانیش باشترە بە بێ دەنگی پیاو بچێتەوە ناو خۆی. واپێم باشترە کەس ئاگاداری جیابوونەوەکەی من و نیاز نەبێت، ببورە وا دەڵێم دەزانم لێم تێدەگەیت، بۆیە وا بە کراوەیی قسە دەکەم، چونکە بە ڕاستی توانای وەڵامدانەوەی هیچ پرسیارێکم نییە بۆ ئەم مەسەلەیە. دەمەوێ سەفەرەکەم تۆزێ هەناسە هەڵکێشان و ماندوو دەرکردنی ڕۆحم بێت، ئەگەرچی دەشزانم ئەم مەسەلەیە بۆ من لەوێ سەریەشەی زۆرم بۆ درووست دەکات، بەڵام ئیتر بڵیم چی، کێ تەممەنای کۆتاییەکی وا دەکات؟!

وا ئەو نامەیەی شێرزادم بۆ ناردیت لەگەڵ کتێبەکەی خۆت دا، بەڵام ئەگەر بە قسەی من بکەیت، دیوانی یەکەمەت "کۆمۆنەی نان"! لەگەڵ بەرهەمەکەی ترتا چاپناکەیتەوە. ئەگەرچی تۆ تەنها مەبەستی پیشاندانی ئەو تەجروبەیەیە، بەڵام لە کۆتایی دا ئەو بەرهەمە زەرەر لە تەجروبە تازەکەی ترت ئەدا، وەکو تریش خۆت ئازادی.

ئاگات لە خۆت و ڕێکا بێت هیوادارم بە زووترین کات لە شار یەک ببینینەوە

خۆشمدەوێن

٢٥/ ٥/ ٩٩

هیوا قادر

**ئەو پیاوە چەندە عاشق و جوانە...**

نامەی هیوا قادر بۆ بەختیار عەلی

سڵاو کاک بەختیار عەلی

ڕۆمانەکەتم[1] خوێندەوە، زۆر سەرسام بووم پێی، سوپاس بۆ ئەو هەموو جوانیی و درەوشاندنەوانەی دەیبەخشی بە ئێمە.

لەم ڕۆمانەشدا هەوڵمدەدا بزانم تۆ چەندە توانیووتە بەو شێوازی ناولێنانە لە پاڵەوانەکانت کارئاسانی بۆ خۆت وەک نووسەر و بۆ خوێنەر دروستبکەیت، بەتایبەتیش لە هێنانەبەرچاوی دیمەنەکان و ناساندنی کەسایەتییەکاندا. ئەمە خاڵێکە من لە ڕۆمانی یەکەمتەوە پێی سەرسامم. من دەزانم ئەو ناونانانە بۆ تۆ وەک نووسەر یارییەکە زۆر سودت پێدەگەیەنێت لە دروستکردنی کەسایەتییەکاندا. لەگەڵ چاپکردنی ڕۆمانەکانی تۆدا، ناوی کوردیش لە ئەدەبی کوردیدا دەچێتە ناو قۆناغێکی تازەوە، کە من پێموایە بە قۆناغی ناوی ڕۆمانەکانی تۆ دەناسرێتەوە. تۆ ئەو ترادیشونە کۆنەت شکاند بۆ دروستکردنی وێنەی پاڵەوان لەگەڵ بیستنی ناودا، کۆمەڵێک ناوی ترت هێنا کە خاوەنی کۆمەڵێ دەموچاوی ترن، ئەو ناوانە تا ساڵانێکی دوورتر هەر نوێن و پێی دەچێت بەو زووانەش هەروا ئاسان کۆن نەبن. ئەم خۆ ونکردن و خۆ

---

[1] مەبەست لە غەزەلنووس و باغەکانی خەیاڵە:
بەختیار عەلی، غەزەلنوس و باغەکانی خەیال، چاپخانەی ڕەنج، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨

پیشاندانەوەیە بەم شێوەیە لە ڕێی ناوەکانەوە بۆ کەسایەتی ناو ڕۆمانەکەت یەکێکە لەهەرە سەرکەوتنەکانی تۆ.

ناوەکانی ئەم ڕۆمانە نوێیەت، بەتایبەتی لەناونانی بارۆنەکاندا، نیشانەی بەردەوامی ئەو یاریانەی تۆن لەگەڵ ناودا. هەندێک جار تا ڕادەی پێکەنین ناوەکان ختوکەهێنەرن، هەندێک جاریش وەک هەڕەشەیەک بەکاریان دەهێنیت لەئاست کەسایەتییە ڕاستەقینەکانی ناو دنیای کوردیدا، وەک بەوەی بڵێیت ئێمە هەمووتان دەبینین و دەتوانین ناوی ڕاستەقینەتان بڵێین، بۆیە ڕەنگە ئاسان ئەوانە خۆیانی تیادا بناسنەوە. ئیتر لەمەودووا بارۆنەکان لەم چەشنە ئەدەبە زیاتر دەترسن بەراورد بە ئەدەبێکی موباشیری تەمەن کورتی پڕ لە جنێوی ساکارو سادە. من پێموایە ڕۆمان لە مێژوو زیندووترە چونکە هەمیشە ئەگەری خوێندنەوەی ڕۆمانە زیندووەکان لە هەموو زەمانێکدا زیاترە لە خوێندنەوەی مێژوو. لە ئێستادا ئەوەندەی ئەم ڕۆمانە قورسایی و ترس دروستدەکات بەو ئاڕاستەی خوێندنەوەی کە تۆ پیشانت داوە لە گێڕانەوەی ئەو ساڵانەی ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕیندا، ڕەنگە چاوەکان هێندە بەو ئاراستەیەی تر نەگەڕێن بەدوای دۆزینەوەی جوانی و تەکنیک و ئەو پرسیارە وجودیانەی ناو ڕۆمانەکەدا. پێموانییە تۆش وەک نووسەری ڕۆمانەکە بتوانیت هیچ کام لەو دوو جۆری خوێندنەوەیە لە ئێستادا پاشوپێش بخەیت، کە ڕەنگە زۆریش گرنگ نەبێت، چونکە تۆ نووسەرێکی پەیام بەخش و مژدەهێنەرنیت.

یەکێک لە خاڵە سەرکەوتووەکانی تری ناو ڕۆمانەکەت، پیشاندانی ئەو مەحاڵەیە لە نێوان تێکەڵبوونی شاعیر و دەسەڵاتدا بەهۆی گێڕانەوەی خەونەوە. چونکە زۆر جار باسکردنی ئەم حاڵەتە هێندە ئاڵۆزکراوە تا لەساتی هەڵوێست فرۆشتن و شیعار هەراجکردندا لای زۆرینە تێگەیشتنی ئاسان نەبێت، من خۆم ئەو بەشانەی دوای ڕۆمانەکام زۆر پێجوانە کە زیاتر قسە لەسەر ئەم بابەتە دەکات، کە هەرگیز خەیاڵی شاعیر خەیاڵێک نییە دەسەڵاتداری سیاسی بتوانێت ببێتە خاوەنی، ئەم خاڵە پیشاندانی ئەو شکستەیە لەبەردەمی سیاسی کوردا کە پێی دەڵێیت: تۆ دەتوانیت زۆر شت بکڕیت تەنها خەونی شاعیرانە نەبێت. لەبری

ئەوەی کۆشکەکان دروستبکەیت، برۆ ڕوخاوی و برینداری ناو ڕۆحی ئینسانی کورد بنیاتبنێرەوە.

دوای ڕاپەڕین سیاسی کورد تەنها شەڕی بۆ بردنەوەی دەسەلات کرد، شەڕکردنیش تەنها لە پێناوی دەسەلاتدا دەتوانێت تەنها دەسەلات بباتەوە یان بدۆڕێت، نەک جوانی و خەیاڵ، ئەمە ئەو شکستە گەورەیەی کە وەهمی سیاسی کوردی و سیاسی هەموو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی تیادا ئەژی. هەر بۆیەشە شۆڕشەکان ناتوانن گەندەڵی لەناوبەرن، چونکە شۆڕشەکان تەنها بۆ بردنەوەی دەسەلاتن، هەربۆیە هەمیشەش ڕێژەی گەندەڵییەکان لە دوای شۆڕشەکان زیاترن وەک لە سەروەختی داگیرکردن و دیکتاتۆرەکان دا.

ئەم ڕۆمانە شاهیدی قۆناغێکی هەرە خەمباری کۆمەڵگەی ئێمەیە، ئەو کۆمەڵگە دڵڕەق و بێ حەوسەڵەیەی ئێمە، بەڕاستی ئێمە کۆمەڵگەیەکی دڵرەقمان هەیە، ڕەنگە هۆکارەکەشی بۆ نەبوونی یادەوەریی و ئەو مانایانەبێت کە وەک کوڵەکە دراونەتە ژێر چەتری ئەو ئاسمانەی کە کۆمەڵگەی کوردی لە ژێریدا باس لە جوانی و خەیاڵ و نیشتیمان و ئازادی و حورمەتی ئینسانی تیادا دەکات، کە هەموویان ماناگەلێکی زۆر بەربەری و ناشیرینن.

خەیاڵەکانتم پێ جوانن، سەرسامم بەو گرێدان و بەستنەوانەی، کە هەستدەکەم کەسایەتییەکان وەک کەروێشکی ماڵی لەژێر سیبەری دەستدا دێن و دەچن، تۆ گەورەترین زەینی ڕۆمانووسی ئێمەیت تا ئێستا، من خۆشحاڵم بەو زمانەی کە لەگەڵ شیردا خواردوومەتەوە ئێستا بە گەورەیی ڕۆمانێکی وا جوانی پێدەخوێنمەوە.

من چەند جارێکی تریش وتوومە، هەموو زمانێک هەڵگری جۆرێک لە تەکنیکی گێڕانەوەیە، زمانی گێڕانەوەی تۆ لە ڕۆماندا خۆی لەناو خۆیدا هەڵگری ئەم جۆرە تەکنیکەیە کە پێی دەنووسیت. ئەو زمانەی تۆ کە بەکاریدەهێنیت و پێی بیردەکەیتەوە خاوەنی ئەم تەکنیکەیە کە لە ڕۆمانەکانتا بەکاریان دەهێنیت.

کردنی خەیاڵ لە سەرەتاوە بەسەنتەری گێرانەوەکان لەم ڕۆمانەدا، هەرە خاڵی درەوشاوەی ناو ئەم ڕۆمانەیە. لە ڕاستیدا داخراوی کۆمەڵگەی ئێمە و دڵڕەقی خۆی بەرامبەر خۆی و دڵڕەقی و ناشیرینی دوژمنەکانیش بەرامبەری، ئینسانی کوردیان چەندان قۆناغ کرد بە کائینێک کە تەنها لەسەر خەیاڵ بژی، بەڵام خەیاڵێک کە تەنها لە سینە ٫و سەردا بمێنێتەوە و ڕێگای نەبێت بێتە دەرەوە و بتوانێت وەک خەونێک ئامادەیی هەبێت. ئێمە هەمووماان ئەو کچانەی کە بەخەیاڵ خۆشمانویستوون زۆر زیاترن لەو کچانەی کە لە واقیعدا توانیومانە خۆشمان بوێن، ئەو سەفەرانەی کە بەخەیاڵ کردوومانە زۆر زیاتربوون لەو شوێنانەی کە بەڕاستی توانیومانە بیان بینین. ئەم جۆرە خەونە زۆر جاوازترە لەو خەونانەی کە دواتر دەچنە خانەی تەمەنناوە، خەونیک گەر هێزی تەمەنای نەبێت دەبێت بە جۆرێک لە هەلوەسەو گرێی دەروونی، سودوەرگرتن لەم یادەوەریەی ئینسانی کورد و چوونەوە ناو خۆی، بۆتە هۆی ئەوەی کە تۆ بتوانیت باس لە عەشق و چیرۆکەکانی عەشق و خەیاڵ بکەیت. ئەو دیمەنانە ئەو ڕۆژە خۆڵەمێشی و پڕ ترسانەی ساڵانی هەشتا و نەوەدەکانم بیردەکەوتەوە کە تیایاندا ژیاین، ئێمە چەندە لەسەر ئەو ڕۆژانە بنووسین هێشتا کەمە، ئەوەی ئەو ڕۆژگارانە و سەردەمی ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین دەکات بە یادەوەرییەکی پڕ لە هۆشیاری تەنها نووسینە لەسەریان، چونکە ئەو ڕۆژگارانە لەناو هاژ و هوژ و دەنگە دەنگی سیاسەتی کوردی و هوتافە هەرزانەکانیدا ونبووە، ئەوەی کە ناهێڵێت ئەو یادەوەرییە خەمبارانە هەروا تێبپەڕن بەبێ هەڵوێستەکردن لەسەریان نوویسینەوە و جێکردنەوەیانە لەئەدەبی جدیدا. ئەوەندەی من شەڕی براکوژی لەناوەوە ڕایچڵەکاندووم هیچ شتێکی تر لە دنیادا نەیانتوانیوە هێندە ڕامبچڵەکێنێت و بەو بەردەوامییە لەلام بمێنێتەوە. بۆیە من بۆ خۆم هەمیشە ئارەزووی باسکردن و قسەکردنم هەیە لەسەر ئەم زەخمە.

کاتێک کە ژوورەکەی مەهنازم بینی، خێرا ژوورەکەی سیای "منداڵێک لەسەر مانگە"م بیرکەوتەوە، ڕێکەوتێکی چەندە سەیرە، بەبێ ئەوەی کەسمان ئاگامان لەیەکتری بێت ئەم دیمەنە لای هەردووکمان دووبارەبۆتەوە، کە خوێندمەوە زەردە گرتمی و بەخۆمم ووت شانسم هەبوو من پێش بەختیار عەلی

ڕۆمانەکەی خۆمم چاپکرد، دەنا کەس باوەڕی پێنەدەکردم و دەیانووت ئەها ئەوە هی بەختیار عەلییە، هههههه. بەڵام لەوەش بترسە "غ.س" دواتر شەڕت پێبفرۆشن و بڵێن بەختیار عەلی ئەو دیمەنەی لە هیوا قادر بردووە، هههههه. ئەگەر شتێکی وایان نووسی من بێدەنگ دەبم، هههههه.

زۆری پاڵەوانەکان و ناوەکانیان و هاتنیان بە هورووژم لە سەرەتاوە، جۆرێک تەرکیز لە خوێنەر داوادەکەن، بەتایبەتی دوای خوێندنەوەی یەکەم یاداشتەکانی بارونی خەیاڵ، کە ئەو یاداشتە تەرکیزی خوێنەر تیژدەکاتەوە و پێی دەڵێت ئاگاداربە تا بزانیت ئەو هەموو شتانە چین کە تۆزێکی تر بەڕێوەن ڕوودەدەن. تا سەد لاپەڕەی یەکەم کەسایەتییەکان سیمایان زۆر ڕوون نییە بەڵام دواتر وورده وورده سیمای پاڵەوانەکان پڕ دەبنەوە و خوێنەر ئاشنایان دەبێت. پێموایە هێنانی ئەو هەموو پاڵەوانە، یارییەکی تۆیە و تۆ خۆت پێتخۆشە وا بکەیت بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خەیاڵ و نووسینی خۆتمان پیشان بدەیت، دەبێت تۆ وەک نووسەر چەندە هەست بە سەرکەوتن و ئاسودەیی بکەیت لەو کاتانەدا!؟

من ئەو چوارینانەم زۆر پێ جوان بوون[1]، جگە لە دوو دانەیان نەبێت کەبەدوای یەکدا دێن و کەمێک سادەبوونەتەوە، دەنا ئەوانی تر پڕن لە ئیشراق و جوانی. ئۆی خوایە چەندە جوانە مەلای سوختە، گەر من سەد ساڵ لەوەوبەر بژیامایە حەتمەن دەبوومە مەلای سوختە، ئەو پیاوە چەندە عاشق و جوانە، من هەمیشە لە ڕۆحمدا حەنینێکی گەورەم بۆ ئەو جۆرە پیاوانە هەیە، دیارە ئەو حەنینەش لە ڕێگەی ئەدەبی کلاسیکییەوە لەلام دروستبووە سەرباری ئەو ژینگەیەش کە لە منداڵیمدا تیایدا ژیاوم. ئەگەر هەموومان سێبەری کەسایەتییەکی تر لەناوماندا بژی، وەک لە ڕۆمانەکەی تۆدا هاتووە، ئەوا من حەزدەکەم سێبەرەکەم مەلای

---

[1] دێت و دەڕۆیت و دەمریت، گەردەولوول و ڕەشەبایت
نەوجەوانێکی چینیت. غەزەلخوێنێکی تەنهایت
ئەستێرەت لێدەبارێ و کتێبێکی بێنەوایت
لە حەقیقەت دەچیت و سیحر و خەیاڵی ڕەهایت ل٤٠٩

سوخته یان هاجەر بێت نەک غەزەلنووس، ئەگەرچی ئێمە هەموومان غەزەلنووسێک لە ڕۆحماندا هەیە و جارجارە خۆیمان پیشان دەداتەوە.

دووبارە سوپاس، قسەم زۆرتر هەیە بیکەم، تەمەنا دەکەم دەرفەتم هەبێت و جارێکی تر ڕۆمانەکەت بیخوێنمەوە بۆ ئەوەی ووردتر بتوانم ئەم سەرنجانەم بنووسمەوە، چونکە هەمیشە سەرسامبوونی خوێندنەوەی یەکەم ناهێڵێت تەمی سەر ئەو پەنجەرانە بسڕیت و وردتر ببینیت تا بزانیت چی دەگوزەرێت لە ژوورەوە.

سوپاس کە ڕۆمانی "منداڵێک لەسەر مانگە"ی منت پێجوان بووە، دیارە زۆرتر پێمخۆشدەبوو سەرنجی وردتری خۆتم بۆ بنووسیت.

هەندێک هەڵەی چاپ لە ڕۆمانەکەتدا هەیە وا لە خوارەوە بۆتیان دەنووسم.

سڵاو و خۆشەویستیمان قبوڵبکەن

هیوا قادر

٢٠٠٧/١٠/٢٥

هیواقادر، جەمال غەمبار، شێرکۆبێکەس، دلاوەر قەرەداغی

پاڕانەوە لە ئاوم، زۆر پێ جوان بوو.

نامەی هیوا قادر بۆ جەمال غەمبار

هاوریم کاک جەمال غەمبار

سڵاو وخۆشەویستیمان بۆ خۆت و خاو خیزان هەیە

چاوەکەم، گەلێ سووپاس بۆ ناردنی شیعرەکانی (پاڕانەوە لە ئاو)[1]، زۆر لەزەتم لە خوێندنەوەیان بینی، ڕۆژیکیان بەتاییەتی بە پاسکیل نزیکەی سەعاتێک لە شار دوورکەوتمەوە، و لەگوێ دەریایەکدا بە تەنیا دانیشتم و شیعرەکانم خوێندەوە، هەندێ لەو شیعرانەم پێشتر بینیبوون. وە بەتایبەتیش شیعری (پارانەوە لە ئاو)م زۆر پێ جوان بوو. ئەو دوو قەسیدە جوانەی، تریشم لە پاشکۆی کوردستانی نوێ خوێندەوە.

چاوەکەم، هیوادارم چاوەڕوانکردنی سووریا مانووت نەکات، دەکریت هەوڵ بدەیت کەمیک خۆت لەگەڵ ژیانی شام دا بگونجێنیت، تا هێندە خەمزەدە نەبیت.

دەبیت ئێستا نامەی ڕەهەندت بەهۆی بەختیار عەلییەوە بە فاکس پێگەشتبێت، ئەگەریش ویستت بە نامەی ئاسایی بۆت بنێرین، ئاگادارمان بکەرەوە، ئەگەرچی بەختیار ئاگاداری کردمەوە، کە لەم ڕۆژانەدا خۆی پەیوەندیت پێوەدەکات. خۆشحال دەبم لە هەواڵت ئاگادار بم و ئەگەر پێم بکرێت لەگەڵ خەمتا بەشداربم.

ڕەنگە ئیمە سەفەری کوردستانمان لەسەرتای مانگی هەشتا بیتە ڕێ، خۆ ئەگەر وابوو، ئەوا بێگومان دیمە لات و یەک دەبینین، خۆ ئەگەریش نا، ئەوا ئێمە هەمیشە بەشیعر لە حزوری یەکتریدا بووین.

---

[1] جەمال غەمبار، پارانەوە لە ئاو، سالی ۲۰۰۱، لەلایەن بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژەوە بلاوکراوەتەوە.

نیاز سلاوی بۆ خۆت و پەیمان و منالەکان هەیە، ئاگاتان لە خۆتان بێت و خۆشمان دەوێن.

ئەگەر ویستت نامە بنێریت، ئەتوانی بە ئەدرەسی ڕەهەند دا بۆم بنێریت، ژمارە تەلەفۆن و فاکسەکەم:

13-6-2001

**هەموو شاعیرەکان، بەبرینداری ئەمرن.**

نامەی هیوا قادر بۆ کەژاڵ ئەحمەد

هاوڕێم، کەژاڵ ئەحمەد

ئایا شاعیرەکان چەند جار لە دایک دەبن؟

هاوڕێم تۆ قەت ئەم پرسیارەت لە خۆت کردووە؟ ژمارەیەک بڵێ.... سەد، هەزار، چەند جار!

من پێموایە شاعیری ڕاستەقینە دەبێت لەگەڵ هەموو شیعرێکدا لەدایکبێتەوە. لەگەڵ کۆتایی هەموو شیعرێکیشدا بمرێت. دواتر لەدایکبوونەوەکانی تر و مردنەکانی تر بێ ژمارە لای خوێنەرەکانمان درێژ دەبنەوە تا ئەو ڕۆژەی بە مەرگێک کۆتایمان پێدێت. ئاهـ کە مەرگی شاعیران ناخۆشە، مەرگ بۆ شاعیر هێندەی مەرگی سەرقەبرانێکی قەرەباڵغی شاری سلێمانی قورسە. چونکە هەموو شاعیرەکان بەبرینداری ئەمرن.

وەک دەڵێن، مرۆڤ لە ڕۆژی لەدایکبوونییەوە کرمەکانی جەستەی بەخێودەکات تا ئەو ڕۆژەی دەمرێت و دەیخۆن، ئاواش هەموو نووسینێک مەرگی خۆی لە پشتی دێڕەکانییەوە وەستاوە، کەچی ئێمە پێمانوایە کە دەنووسین بەشێک لە نەمریبوونی خۆمان دەنووسینەوە، بەڵام هەیهات وانییە.

شیعرە توڕەکەتم خوێندەوە، خۆزگە هەمیشە ئاوا توڕەدەبوویت، چونکە توورەبوونی شاعیر و جەلاد لەوەدا جیاوازیان هەیە، شاعیر بنیاتدەنێت و جەلاد دەکوژێت.

"من دەبێت خۆم بسمیل بکەم"،[1] کە خوێندمەوە ووتم خۆزگە زۆر، هەر زۆر زووتر ئەو بڕیارەت دەدا، بۆیە ئیتر کە من هاتمەوە بۆ نیشتیمان و ویستم سەردانت بکەم جارێکی تر نەیەمەوە ئەو شوێنە، ئەو شوێنەی کە لە داخا خەریکبوو خۆم ڕووتووقووت بکەمەوە، لەداخی سەرنووسەرەکەی و خۆم پیشانی پۆلیسەکانی بەردەرگای بدەم نەک ڕۆژنامەنووسە نائازاکانی. بەهەرحاڵ.. ئەمانەی کە ڕوودەدەن بەشێکن لە کوردبوون و موڕاڵی ئەو نیشتیمانە گەورەیەی کە من لە تاوا بچوکم کردۆتەوە و لەگەڵ خۆمدا هێناومەتەوە بۆ ماڵەوە، ئەو ماڵە کرێگرتەیەی کە لە گەڕەکێکی شاری ستۆکهۆڵمە و زۆرینەیان وەک من مەنفین و هەمووشمان بە پیاسە دە دەقەیەک دوورین لە دەریاوە، ئەو نیشتیمانەی کە ئێستا لای منە ئەگەرچی بچووکە، گەرچی جوانە و پڕە لە یادوەری ڕەنگاوڕەنگ، چیتر لەو نیشتیمانە ناچێت کە لە تەلەفزیۆنە درۆزنە کوردییەکاندا دەیبینم و زۆر گەورەیە، لەو نیشتیمانە کەڕولاڵ و بریندارەش ناچێت کەلەسەر لاپەڕە تورەکانی ڕۆژنامە ناحیزبییەکانە.

شیعرەکەتم چەند جارێک خوێندەوە، بەتایبەتی ئەم دێڕە زۆر زیندوو جوانە، "خۆزگە بتوانم بە قوڵفی گۆزەیەکدا تێبپەڕم/ بەڵکو پیسی ڕیاکاران لە پێستم داماڵرێت".

بەپێچەوانەشەوە دەبوو تۆ وەک شاعیرێک، نەهێڵیت مانا لۆکاڵییەکان داگیرتبکەن و بڵێی "وەک ئەوەی شوێنێکم/ بەر پشیلەیەکی تۆپیوو کەوتبێت". تکایە، پشیلەکانیش جوانن، تەنانەت ئەو کاتانەشی کە دەمرن.

---

[1] کەژاڵ ئەحمەد، من دەبیت خۆم بسمیل بکەم، پەڕەتەی تایبەتی کەژاڵ ئەحمەد، ماڵێک لە ئاسمان، ٢٠٠٧ شیعرەکە بەم پارچەیە دەست پێدەکات:

من دەبێتساڵێک ئاوی ڕوون
لەسەر قاچوقولم بڕوات
بۆ ئەوەی پاک ببێتەوە لە چڵپاوی
خاکێکی بێ مروەت.

ئاگات له خۆتبێت

لەبیرت نەچێت، هەمیشە ئەم پرسیارە لە خۆت بکە.

ئایا شاعیرەکان چەند جار لە دایک دەبن؟

هیوا قادر

٢٠٠٧/١٠/٦

ستۆکهۆڵم

ئێوارەیەکی پایزە، گوێ لە مۆسیقای فیلمی شین[١] ئەگرم، تەنها لە پەنجەرەوە سەیری ئەو باڵدارانە دەکەم کە لە من دەچن، منیش لەداخی ئەوەی کە وەک ئەوان باڵم نییە، ئەم نامەیەم بۆ تۆ نووسی.

---

[١] مەبەست لە یەکێک لە سینینەی ( شین، سپی، سوور) کریستۆف کیسلۆفسکی.

ئەحمەد رەزا، هیوا قادر، دلاوەرقەرەداغی، کەژاڵ ئەحمەد

**بە تووڕەبوونەوە، نیشتمانم بەجێهێشت!**

نامەی هیوا قادر بۆ یوسف عیزەدین

سڵاو هاوڕێی ئازیز کاک یوسف عیزەدین

ئێستا لە قاوەخانەیەک دانیشتووم، چایەک بەبێ جگەرە دەخۆمەوە، چونکە پێنج ساڵێک دەبێت جگەرەم تەرک کردووە. لەبەر ئەوەی هەستمکرد هەموو جگەرەکانی خۆمم لەژیاندا کێشاوە، بۆیە بڕیارمدا چیتر جگەرە نەکێشم. ئەم قاوەخانەی لێی دانیشتووم قاتی دووهەمی باڵەخانەیەکی شووشەبەندە و لەناوەڕاستی سەنتەری ستۆکهۆڵمدایە، کۆی باڵەخانەکە ناوی ماڵی کلتوورە.

ئەو کاتەی کە کوپێک چاو پەرداخێک ئاوم بەدەستەوە بوو چاوم دەگێڕا بۆ جێگەیەکی بەتاڵ، دوو کچی گەنجم بینی کە خەریکی لەبەرکردنەوەی قەمسەڵەکانیان بوون، یەکێکیان سەیریکردم و پێیووتم: دەتوانیت لەجێگەکەی ئێمەدا دابنیشت، منیش پێمووت: بەخۆشحاڵییەوە.

سەنتەری شار لەودیوو دیوارە شووشەبەندییە گەورەکەی قاوەخانەکەوە دیارە کە بەسەر گۆڕەپانە خانە شەترەنجیەکەیدا دەڕوانێت، هەمیشە جمەیدێت لەخەڵکی شپرزە و خێراڕەوت. ئەمدیو شوشەکەش کە ناو قاوەخانەکەیە دەنگی غەڵبەغەڵب و تێکدانی کوپی قاوە و چاکان و زرەی پەرداخەکان تێکەڵبوون. من دەمەوێت بەم نامەیە خۆم بگەیەنمەوە لای تۆ، کە نازانم ئێستا تۆ لەکوێیت، بەڵام تۆ نزیکتریت لە هەموو ئەو شوێنانەی کە مەزندە دەکەم لەئێستادا لێیانبیت. تۆ لەناو یادەوەریمدایت و لەگەڵ خۆمدایت. بەخێرایی چەندەها دیمەنی دڕاو و پارچە پارچە و تێکەڵ و پێکەڵ بەبیرمدا تێدەپەڕن، تۆ لەناو هەموو ئەو دیمەنانەدایت، ئێستا نامەوێت هیچ کام لەو دیمەنانە رابگرم و بۆ تۆیان بگێڕمەوە، وەک ئەوەی لەدواهەمین نامەدا بۆت گێڕابوومەوە پێش ڕۆیشتنم یەکەم دیوانی شیعری خۆمم پێشکەشکردبوویت، دیارە ئەو کاتەی تۆ باسیدەکەیت رەنگە کۆتاییەکانی ساڵی١٩٩١ بووبێت، یاخود پێش مانگی یەک و نیوەی مانگی دووی ١٩٩٢ بێت، دوای ئەوەی بە تووڕەبوونەوە نیشتمانم

بەجێهێشت؛ ئیتر یەکتریمان نەبینییەوە. ئای خوایە کات چەندە زوو تێپەڕدەبێت، کات وەک رەشەبا وایە و ئێمەش گەرد و خۆڵی ناو ئەو رەشەبا نەعلەتییەین کەناوی ژیانە، ئێمە هەموومان لەنیشتنەوەی ئەو رەشەبایە دەترسین، ئەو کاتەی لەسوچێکدا گرمۆڵەمان دەکات و بۆ ئەبەد دەم و چاومان پڕدەبێت لەخۆڵ، رەنگبێت پێش ئێمەش ئەو خۆڵە گەردی هەزارانی وەک ئێمە بووبێت، مەرگ... هەرگیز حەق نییە و ناشیرینترین ناحەقییە.

من تا لە وڵات بووم لەناو ئەو هەموو رۆژە ڕەش و ناشیرین و جەنگانەدا بەقەدەر ڕۆژەکانی ژیانم لەمەنفا لەمەرگ نەترساوم، هەستدەکەم ئەوسا رەنگە نزیکتربووبم لەژیان وەک ئێستا، یان رەنگە ئەم قسەیەشم تێنەگەیشتنێکی ترم بێت بەهۆی دووریمەوە لە نیشتیمان و ژیانم لە مەنفا. بەهەرحاڵ مەنفا بەردەوام ماندووم دەکات و دەمهاڕێت، تەنها هاوسەنگییەک کە لەژیانی مندا مابێتەوە رەنگە هەر نووسین بێت، چونکە هەستدەکەم جدیترین کاری من لەژیاندا ئێستا هەر ئەدەب و نووسین و بیرکردنەوەیە، تازە من هەموو خۆشییەکانی خۆم گۆڕییەوە بەخۆشی کاتی نووسین و فەنتازیاکردن بەژیانەوە.

ئێستاش خەریکی نووسینی رۆمانێکی نوێم بەناوی "منداڵانی گەڕەک"ەوە[1]، نزیکەی پەنجا لاپەڕەیەکم لێنووسیوەو هەفتەی دوو تا سێ رۆژ لەسەری دەنووسم و تاڕادەیەک دڵم پێی خۆشە، چونکە دەمەوێت لەڕێی ئەم رۆمانەوە هەرچی سێبەرێکی دڕندەبوون لەئینسانی ئێمەدا هەیە بیهێنمەوە دەرەوە و باسی بکەم، هەوڵ ئەدەدەم زۆرینەی گەنجە سەرکێش و دڕندە و خێر لەخۆنەدیوەکانی گەڕەکی چوارباخ زیندووبکەمەوە، ئەو گەڕەکەی زیاد لەسێ چوار وەچە لەگەنجەکانی لەناوچوون و کوژران. هەروەها دیوێکی نادیاری ئەورووپاش بەتایبەت ساتی بەیەکدادانی کلتوورەکان باسبکەم، بەهەرحاڵ بالێگەڕێین تا کاتی تەواو بوونی ڕۆمانەکە؛ نووسینی رۆمان بۆ من خۆشترین کاتی لەزەتبردنە لە نووسین لە دوای نووسینی شیعرەوە، چونکە من هەست

---

١ منالانی گەڕەک دوواتر بلاو دەبێتەوە: هیوا قادر، منداڵانی گەڕەک، ئەندێشە بۆ چاپ و بلاوکردنەوەی کتێب، چاپی یەکەم، ٢٠١٠

دەکەم پڕم لە گێڕانەوەکان و سێبەرەکان، بۆ ئەوەی هەمیشە بتوانم ببینم، حەزدەکەم هەمیشە بنووسم، لەڕاستیدا هەستناکەم هیچ چێژێک لەژیاندا هەبێت لەچێژی نووسینی ڕۆمان خۆشتتر و پڕ عەزابتر و ئارامبەخشتربێت، بەهەرحاڵ بۆ ئێستای من بەم چەشنەیە، هیوادارم هیچ چێژێکی تریش لەژیانمدا جێگەی ئەو چێژە نەگرێتەوە، بەڕاست ڕۆمانی "منداڵێک لەسەر مانگە"[1]ی منت خوێندەوە، پێتچۆن بوو؟ پێمخۆشە سەرنجت بزانم!

خۆشحاڵدەبم بەهەواڵ زانینت، تکایە بەوردی بۆم بنووسە تابزانم چۆنیت، من خۆم یەکێکم لەو نووسەرانەی هەمیشە دەمەوێت پێش باسکردنی دنیا لەژیانی خۆمەوە دەست بەگێڕانەوەکانم بکەم، بۆیە دەبینی زۆر جاران ژیانی خۆم بەشێکن لەبەرهەمەکانم.

زۆر خۆشحاڵدەبم چیرۆکەکان و گفتوگۆکانت دەخوێنمەوە، زۆرم پێخۆشە بەخەمەوە ئاوا باوەشت بەنووسیندا کردووە و دەتەوێت جوان بنووسیت، لەم ماوەیەدا چیرۆکێکی جوانتم خوێندەوە، وابزانم لەگۆڤاری "ئاینده"[2]دا بوو، ببوورە ناونیشانەیەکم باش لەبیر نییە، تێکەڵەیەک بوو لەو رستەیە "مەرگی سەگێک لەسێبەرەکەیدا"[3]، یاخود پاش و پێشی ئەو ناوە بوو، بەهەرحاڵ.. سەرەتای چیرۆکەکە زۆر جوان بوو، بۆیە بێ دوودڵی دوای کەوتم، وەک دواکەوتنی یەکەم کچ کە خۆشمدەویست!؟.

چەند ڕۆژێک بوو هەستم بەگوناه و کەمتەرخەمی دەکرد لە نەنووسینی وەڵامێک بۆ مەیلەکەت، دەمویست نامەیەکت بۆ بنێرم بەڵام کاتم هیچ نەبوو، بۆیە ئەمڕۆ دوای کار هاتم بۆ ئەم قاوەخانەیە و کۆمپیتەرەکەشم لەگەڵ خۆم هێنا تالێرە نامەکەت بۆ بنووسم، هەموو خەڵکانی ناو قاوەخانەکە بەکوڕ و کچ و

---

١ هیواقادر، منداڵێک لەسەر مانگە، سلێمانی ٢٠٠٧

٢ گۆڤاری ئاینده: گۆڤارێکی هاورچەرخە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکا.

٣ ئەم چیرۆکە لەم کتێبەدا چاپکرا:

یوسف عیزەدین، پێخەفێک لە خوێن، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٨

پیرەمێرد و پیرێژنەوە هەمووان پێکەوەن و تەنها من لەناویاندا تەنهام و لەبەردەم دیوارە شووشەییەکەدا دانیشتووم و دەنووسم، بەڵام پێشم وایە هەمووان تەنهان تەنها من نەبێت، چونکە دەنووسم. نووسین گەورەترین هێزی بەرگرییە لەبەردەم تەنهاییدا، بەتایبەت تەنهاییەکی رۆحی، ئەو تەنهاییانەی ئینسان لەکاتێکدا سەیری ئاسمان دەکات و دەمی پرە لەپرسیار و چاوی پرە لەفرمێسک بەبێ ئەوەی بتوانێت بەوشە دەریانبڕێت، هەربۆیەشە ئەدەب بۆتە جێگای بەشێکی زۆری ئەو پرسیارانەی ئینسان لەساتی شەیدایی و تەنهایی خۆیدا ئەیانکات.

من هەموو کوپە چاکەم خواردەوە و ئێستاش پەرداخە ئاوەکەم هەڵقوڕاند، نامەکەشم بۆ تۆ نووسی، ئاسمانی دەرەوەش لێڵ و ناشیرین بووە، من دەڕۆم سواری شەمەندەفەرێک دەبم تا بەکاتی بەیەکگەیشتنی دوو هاوڕێ بمبات بۆ شاری موحیبەت.

خۆشماندەوێن

هیوا قادر

قاوەخانەی"کلتور هوست"ماڵی کولتور، ستۆکهۆڵم.

٢٠٠٨/٢/١٨

**ئێواران کە دەگەڕێمەوە، کەس چاوەنوورم نییە !**

نامەی هێمن موکریانی بۆ شوکرییە ڕەسوڵ

شەکراوە شیرینەکەم

بە خوای چاکت کرد، شەکراو ناوێکی شیرین و خۆشە، بەڵام هێ هوو. شیرنیایەتی شەکراو لە کوێ و شیرنیایەتی کچێک. کچە کوردێکی جوان و دڵگر. کچە کوردێکی ڕەزا سوک و چەلەنگ لە کوێ؟ نا، نا، شەکراویش بۆ تۆ ناوێکی تەواو نیە بەلام لەوەی پێشوو باشترە. تەنیا منداڵێکی بچووکە کە شەکراو بە ماچیکی لێوی جوانان دەگۆڕێتەوە ئەویش باش ئەوەی پەڕەوازە بوو تێ دەگا چەند تێ شکاوە.

کچی خۆم، نازانم بۆ کەسێکم بۆنی ناهومێدی و بەزیوی لە نامەکەت کرد، تۆ لەتەمەنیکدای کە نابێ خەم بخۆی، وەرەز بی، هەست بە غەریبی و دوورە وڵاتی بکەی. ئەویش لە مۆسکۆ، لە مۆسکۆی جوان، ئەگەرلە باتی باوکی خۆت بای چت دەکرد؟ ئەوە پێنج ساڵی تەواوە پی ی ناوەتە شەش ساڵ دوور لە خۆشەویستان بە پیری و فەقیری و چارە ڕەشی ڕای دەبوێرم. شەوان وەک مانگی یەک شەوە باوەشم ئاوەڵایە بۆ خۆشەویستەکەم، بۆ ئەو خۆشەویستەی کە ساڵانی ساڵ لە باوەشم دا ئارامی دەگرت، بە ڕۆژ بۆ بەرێ چوون، بۆ ژیان کار دەکەم، ئەویش کاریک کە لەگەڵ زەوقی شاعیرانەم یەک ناگریتەوە، ئێواران کە دەگەڕێمەوە کەس چاوە نوورم نیە . بەڵام بەو حاڵەوە دەردی دل ناکەم و قسەکانم بۆنی ناهومێدی لێ نایە و تەنانەت پێم وانیە زیانم کردووە . چونکە دەزانم لەو حاڵە دا پتر دەتوانم خزمەتی نەتەوەکەم، نەتەوە بەش خوراوەکەم، نەتەوە لێ قەوماوەکەم بکەم.

کچەکەم. بۆ ئیمە هەموو کچ و کوڕ و ژن و پیاو و لاو پیرێکی کورد ناهومێدی یانی مردن، یانی بەزین، یانی سەنگەر بەردان، کە چاوەنۆر نیم کچێکی وەک تۆ تێگەیشتوو و پێگەیشتوو ناهومید بێ. هیوادارم گوڵی هیوات سیس نەبێ و بڵێسەی هومید لە دڵە ناسکەکەت دا نەمرکێ.

خۆشەویستەکەم. زۆر خەریکی خوێندن بە زانین بۆخۆی خۆشترین شتە لەم دنیایەدا، بەلام زانایەکی وشک و بەرزە دەماغ مەبە پاش گەڕانەوەش لە نەتەوەکەت جوێ مەبە و پیاو هەرچی زانا بێ لە ئاپۆرەی خەلک زانا تر نیە. دل نیا بە هەرچی پتر بزانی هێشتا موحتاجی ئەو ژنە قەرەجە دەبێ کە پار شتی لێ فێر ببوی . ئینسانێک ئەو دەمی چارە رەشە و دەبی بەزەییت پێ دا بێ و زگت پێی بسووتێ کە وەک هێندێک لە نەزانەکانی لای وابێ پڕ بووە و لە خەلک بێ نیازە.

شەکراو گیان سلاوی تۆم بە مامۆستا هەژار وکاکە حەمە راگەیاند ئەوانیش بە نۆرەی خۆیان سلاوت لێ دەکەن. کۆری زانیاری کارێکی باشی کرد هەژاری ناردە پاریس تا کورد و زمانی کوردی بە رۆژهەلاتناسەکان بناسێنێ. کاک دوکتۆر کەمال مەزهەر و دوکتۆرە نەسرین فەخریش چوون، سەرکەوتوو بن.

من بە تەنێ لە بەغدا ماومەوە و عارەق دەرێژم. بەراستی گەرماش بەلایەکی گەورەیە، رۆژی تا ئێوارە دەهاژم و بە لووزە و ئارەق دەڕێژم و ناتوانم بیر بکەمەوە تەنیا شەوانە بە تاقی تەنێ لەسەربانە بەرزەکەم رادەکێشم چاو لە مانگ و ئەستێران دەبڕم. ئەویش تەنیایی و بی جووتی رەنجم دەدا.

ئەو ماوە یەکە خەریکی هێندێک کاری زانستی و فەرهەنگیم و شیعری تازەم نیە. دیوانەکەم خراوەتە ژێر چاپ . بەلام کەی تەواو دەبی؟ نازانم لە عێراق کتێبی برێک گەورە چاپ کردنی گرانە. منیش لە کتێبی بچووک چاپکردن بێزارم و دەمەوێ هیچ نەبێ بەشکیی گەورەی دیوانەکەم چاپ بکەم. بەشەکەی تری با بمێنێتەوە بۆ پاش مردنم تا منیش وەک قانیع پاش مەرگم هەبێ خۆشەویستەکەم. هەتاو هەلات و ئارەقم بە ناوچاوان دا هاتە خوار و نووسین دژوار بوو. جارێ مال ئاوا..

باوکت هێمن

نامەم هەر بۆ بنووسە ٧٤/٩/٢٠

**من تا ئێستاش، جوانی پەرستم!**

نامەی هێمن موکریانی بۆ شوکرییە ڕەسول

کچی خۆم شوکرییە ی خۆشەویست

ئەوە یەمجارە ئەو عینوانە بۆ کچیک
دەنوسم، بۆ خۆم کچم نیە و هەرگیز
بە چاوی بابانەوەش تەماشای هیچ
کچێک ناکەم بەڵام لە درۆ بدا من تا ئێستاش
جوانی پەرستم هیچ جوانیکیشم پێ لە کچ
جوانتر نی یە. بەڵام لە تەواوی ژیانم
دا هەرگیز هیچ جوانێک
نەیتوانیوە زەوقی من رازی بکات و رەنگە
پیم وایە لەویش جوانتر هەیە
و جارێ تووشی نەهاتووم.
هەروەک هیچ شعرێکیش بە
تەواوی رازی[1] نەکردووم،
چونکە پیم وایە لەوە جوانتر
دەکرێ بخولقێ.
کچی خۆم بەڵام ئەوە ئەم
عینوانەم بۆ تۆ نووسی،

[1]ئەم وشەیە بە تەواوی دیار نەبوو.

چونکه هەست دەکەم تۆ وەک کچێک منت خۆشدەوێ منیش دەبێ وەک باوک تۆم خۆشبوێ، شوکری یە گیان بڕوابکە لە کانگای دلمەوە خۆشم دەوێی هیوام وایە نەک هەر کچیکی چاکی من بی، بەڵکو کچی چاکی کورد بی. کچی چاک بە بڕوای من ئەوە نیە، لە بن عابا و رووبەند دا بژی و نوێژو طاعەت بکا روو لە نامەحرەم بگرێ، من کچیکم پێ چاکە، بە چەکی زانینەوە خزمەت بە نیشتمان و نەتەوەکەی بکا. تیت ڕادەبینم تو یەکیک لەو کچانە بێ. هەر ئەوەی بە هەشتەوە (هەستەوە) یادی کەسیک دەکەیەوە کە ژیان بۆ ئەو وەک جەهننەم وایە بەسە بۆ ئەوەی تو بناسین و بزانین کچە کورێکی کە خزمەت کارانی کوردت خوش دەوی.

هەم بخوینە، هەم بژی، من قەت ئەوەندە وشک نیم پیم وابی خویندکاریک دەبی شەو رۆژ سەری لەسەر کتیب بی و تام لە ژیان نەکا. ئەوەندەش بی موبالات نیم حەق بدەم بە کەسیک هەلی وای بۆ هەلکەوی و کەلکی لی وەرنەگرێ. سەرکەوتنت بە ئاوات دەخوازم. سلاوی هەموو کچ و کوریکی باشی کورد لەوی دەگەیێنم.. لە باتی من تەماشای جوانەکان و ناسکەکانی وی بکە. هەرچەندە دەزانم خۆت زەوقی لی وەرناگرێ.

لە نوسین و خویندنەوەی کوردی غافل مەبە خەریک دیوانەکەم چاپ بکەم هەر چاپکرا، بۆت دەنیرم .

باوکت

باوکی دڵسۆزت هێمن

نەزەند بەگیخانی، ماری خسیوس، ئەحمەدی مەلا،
فەرهاد پیربالّ، موحسین ئەحمەد

ئەنوەری رەشی ئەولاّ، ئاکۆ کەریم، ئیسماعیل حەمەومین
رێبوار سیوەیلی

هەردی

میرزا محەمەد ئەمین ئەحمەد مەنگوڕی

مارف ئاغایی

ئەسترید لیندگرێن

ئازاد سوبحی

هێمن

برایم ئەحمەد

مارف عومەر گوڵ

ئەنوەر قادرمحەممە

**بیبلۆگرافیا:**

١. ئارام کاکەی فەلاح ساڵی (١٩٦٣) لە سلێمانی لە دایکبووە و لە سوید دەژی.
٢. ئازاد بەرزنجی نووسەر و وەرگێڕی کورد ناوی تەواوی ئازاد عەبدول محەمەد بەرزنجی لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٣) شاری سلێمانییە و ئێستا لە سلێمانی دەژی.
٣. ئازاد سوبحی نووسەری کورد، ساڵی ١٩٦٢ لە شاری کەرکود لە دایک بووە لە شاری سلیمانی دەژی.

٤. ئەحمەد خواجە، نووسەر و مێژووی نووسی کورد، کوڕی (عەزیز کوڕی عوسمان ئاغای ئەردەڵانە)، ڕۆژی ٦-٧-١٩٠٣ لەدایکبووە، ڕۆژی ١٩٩٧/٣/٤ لەشاری بەغدا کۆچی دوایی کردو لەشاری سلێمانیو لەگردی سەیوان بەخاک سپێردراوە.
٥. ئەحمەد شوکری (دکتۆر شۆ) نووسەر و شاعیری کورد، ناوی ئەحمەدی حاجی شێخ محمدی شێخ عبدالصمدم شوکری(ئەحمەد شوکری)، ساڵی ١٩١٠ لە هەڵەبجە لە دایک بووە، و ١٩٨٩ / ٥ /٢٤ کۆچی دوایی کردووە.
٦. ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل لە ساڵی ١٩٤٥ لە دووز لەدایک بووە، و ئێستا لە شاری هەولێر دەژی.

٧. ئەحمەد هەردی شاعیری کورد، ساڵی ١٩٢٢ لەسلێمانی لەدایک بوو، ڕۆژی ٢٠٠٦/١٠/٢٩ لەماڵەکەی خۆیدا لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە
٨. ئەحمەدی مەلا، شاعیر و وەرگێری کورد لە ساڵی ١٩٥٧ لە گوندی تۆماری ناوچەی شوان هاتوتە دونیاوە، ئێستا لە دەرەوە دەژی.
٩. ئەرخەوان ناوی خانم رەسول، خانمە شاعیری کورد، لە ساڵی(١٩٤٩) هاتۆتە دنیا و ئێستا لە سلێمانی دەژی.
١٠.ئەستريد ليندگرين خانمە نووسەری سوید، ١٤/ نۆڤەمبەری ١٩٠٧/ ٢٨/ جەنیۆەری ٢٠٠٢ . نووسەری کتێبی منداڵان و نەوجەوانان.
١١.ئەنوەر رەشی عەولا شاعیر و نووسەری کورد لە ساڵی ٦ / ٢ / ١٩٦٣ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە و ئێستا لە لەندەن دەژی.

١٢.ئەنوەر سوڵتانی نووسەر و لێکۆڵەری کورد، لە ساڵی ١٩٤٤ لە بۆکان لە دایک بووە و ئێستا لە هەندەران دەژی.

١٣.ئەنوەر قادر محەممەد شاعیر و وەرگێڕ و مامۆستای زانکۆ لە ساڵی(١٩٤٧) لە عەربەت لە دایک بووەو ، ئێستا لە سلیمانی دەژی.

١٤.ئەهبەلجەزائیری نووسەری عەرەب ( ؟ ).

١٥.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، نووسەر و زمانەوانی کورد، ساڵی( ? ) لە دایک بووە و ٢٠٠٧/٧/٨ بە روداوی ئوتومبیل کۆچی دوایی کردوو.

١٦.ئیحسان فوئاد نووسەر و مامۆستای زانکۆ، ساڵی ١٩٣٨ لە سلێمانی لە دایک بووە و ساڵی (٢٠٠٨)کۆچی دوایی کرد.

١٧.ئیسماعیل حەقی شاوەیس ( ئیسماعیل عەلی رەسول ئەحمەد ئاغا) ساڵی ١٨٩٤ لە موسڵ هاتۆتە دونیا لە ١٩٧٦/٥/١٢ کۆچی دوایی کرد.

١٨.ئیسماعیل حەمەئەمین نووسەر و رۆماننوسی کورد، ساڵی(٦٧) لە سلێمانی لە دایک بووە، ئێستا لە سلێمانی دەژی.

١٩.برایم ئەحمەد، نووسەر و سیاسەتمەدار کورد، لە ١٩١٤.٠٣.٠٦ لە بنەماڵەیەکی ناسراوی شاری سلێمانی لەدایکبووە، و ٢٠٠٠/٤/ ٨ لە شاری لەندەن کۆچی دواییکردووە.

٢٠.برایم چێوار هونەرمەندی شانۆکار برایم چێوار ساڵی ١٩٥٨ لە شاری سلێمانی لەدایک بووە . بەشی شانۆی لە ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی بەغدا تەواوکردوە. رۆژی ٢٥ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨ کۆچی دوایی کردوە.

٢١.بەختیار عەلی شاعیر و ڕۆماننووسی کورد لە ساڵی ١٩٦٠ لە سلێمانی لەدایکبووە، ئێستا لە ئەلمانیا دەژی.

٢٢.بەرزان هەستیار شاعیری کورد ساڵی(١٩٦٢) لە سلیمانی لە دایکبووە و ئێستا لە ئەڵمانیا دەژی.

٢٣.بەهرۆز حەسەن وەرگێڕی کوردی، ساڵی ١٩٦٥ سلێمانی لە دایک بووە و ئێستا لە دانیمارک دەژی.

٢٤.بەرۆژ ئاکرەیی شاعیر و چیرۆکنووس ساڵی ١٩٦٣ لە باشوری کوردستان لە دایک بووە، ئێستا لە شاری هەولێر دەژی.

٢٥.بورهان قانع نووسەر و وەرگێری کورد، ساڵێ ١٩٣٥ لە دێی نەوێ لە شارەزوور دایکبووە و ساڵی ١٩٨٥ کۆچی دوایی کردووە.

٢٦.بیمار ناوی تەواوی عەبدولرەزاق بیمار، نووسەری کورد، ساڵی ١٩٣٥ لە شاری کۆیە لە دایک بووە و ئێستا لە شاری هەولێر دەژی.

٢٧.تۆماس ترانستروێمەر نووسەر و شاعیر و وەرگێری سویدی، لە ساڵی ١٥ ئەپریلی ١٩٣١ لە دایک بووە، ئێستا لە سوێد دەژی.

٢٨.جەرجیس فەتحوڵلا، کەسایەتی دیاری کلدانی لە ساڵی ١٩٢٢ لە شاری موسڵ هاتۆتە دنیا، ١٣ تەمموزی ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردووە.

٢٩.جەلیل قەیسی نووسەر و چیرۆکنووسی عێراقی ساڵی ١٩٣٧ لە شاری کەرکووک لە دایک بووە، لە ساڵی ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردووە.

٣٠.جەمال غەمبار شاعیری کورد لە ساڵی ١٩٦٢ لە گەڕەکی مەلکەندی لە شاری سلێمانی لەدایک بووە و ئێستا لە شاری سلێمانی دەژی.

٣١.جۆیس بلاو نووسەری فەڕەنسی، ( ؟ ).

٣٢.حافظ مەلا محمدزادە نووسەری تورکمان، ( ؟ ).

٣٣.حسین عارف نووسەر و چیرۆکنووسی کورد، ساڵی ١٩٣٦ لە گەڕەکی چوارباخی شاری سلیمانی لە دایک بووە وئیستا لەوێ دەژی.

٣٤.حەسەن قازی نووسەری کورد، حەسەن قازی لە ( ١٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٦) لە شاری مەهاباد چاوی بە دنیا هەڵێناوە و ئێستا لە هەندەران دەژی.

٣٥.حەمە بۆر نووسەری کوردی ساڵی(١٩٢٧) لە سلیمانی لە دایکبووە و ئێستا لە سلێمانی دەژی.

٣٦.حەمەسەعید حەسەن شاعیر و ڕەخنەگری کورد، ساڵی (١٩٥١) لە دایک بووە و ئێستا لە هەولێر دەژی.

٣٧.خەسرەو خاڵ سەرکردە و شۆڕشگێری کورد، دکتۆر (خەسرەو مستەفا خاڵ) ناسراو بەدکتۆر خەسرەو خاڵ ساڵی (١٩٣٩). (١٩٨٨/١٢/٣١)لەیەکێک لەنەخۆشخانەکانی شاری دیمەشقی سوریا، بەنەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

٣٨.دلاوەر قەرەداغی ناوی دلاوەر شەریف کەریم شاعیر و وەرگێڕی کورد، ساڵی ١٩٦٣ لەدایک بووە و ئێستا لە شاری سلێمانی دەژی.

٣٩.دڵزار ناوی ئەحمەدی مستەفای حەوێزی یە، لەساڵی ١٩٢٠ لەشاری کۆیە لە دایک بووە و ئێستا لە هەولێر دەژی.

٤٠.دڵسۆز حەمە نوسەری کورد ساڵی ١٩٦٥ لە سلێمانی لە دایک بووە و لە دەرەوە دەژی.

٤١.رەحیمی قازی سیاسەتمەدار و نووسەری کورد، لە ساڵی ١٩٢٦ لە گوندێکی سەر چۆمی جەغەتوو بە ناوی" گوێگجەلی" لە دایک بووە. لە ٩/ ٥/ ١٩٩١ باکو کۆچی دوایی کردووە و لە گۆرستانێکی ئەو شارە بە ناوی "یاساماڵ" نێژراوە.

٤٢.رەفیق سابیر نووسەر شاعیری کورد، ساڵی ١٩٥٠ لە قەڵادزێ لە دایک بووە و ئێستا لە سوید دەژی.

٤٣.رەووف بیگەرد ساڵی ١٩٤٢ لە سلێمانی لە دایک بووە و ئێستا لە سلێمانی دەژی.

٤٤.رێبوار سەعید هونەرمەند و شیوەکاری کوردی، لە ٢٠ی دیسەمبەری ١٩٦٢ لە دایک بووە و ئێستا لە شاری سلێمانی دەژی.

٤٥.رێبوار سیوەیلی: ساڵی (١٩٦٩) لە بارێی بچووک لە شاربازێر لە دایکبووە و لە هەولێر دەژی.

٤٦.رێبین هەردی نووسەی کورد ١٩٦٨/٤/٢٨ لە سلێمانی لە دایک بووە و ئێستا لە سلێمانی دەژی.

٤٧.ساقی قەهرەمان، نووسە رو شاعیر و رۆژنامەوانی ئێرانی، ساڵی ١٩٥٦ لە مەشهەد لە دایک بووە و ئێستا لە کەنەدا دەژی.

٤٨.سدیق سەفی زادە(بۆرەکەیی) نووسەر و لێکۆڵەری کورد، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایک بووە و ئیستا لە دەرەوە دەژی.

٤٩.سەفوەت، شاعیرو نووسەری کورد، مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوڵی دێلێژە ناسراو بە (سەفوەت) ساڵی (؟) لە دایک بووە و ڕۆژی ٩-١٢-١٩٦٣کۆچی دوایی کردووە.

٥٠.سەباح ڕەنجدەر ناوی سەباح حەسەن، نووسەر و شاعیری کورد، ساڵی ١٩٦٥\١١\١٨ لە هەولێر لە دایک بووە و ئێستا لە هەولێر دەژی.
٥١.سەلاح شوان شاعیر و ڕۆژنامەوانی کورد، ساڵی ١٩٤٩ لە دێی مام ڕەش لە ناوچەی شوانی سەر بە کەرکوک لەدایک بووە، ئێستا لە هەندەران دەژی.
٥٢.سەید عەلی ساڵحی شاعری فارس، ساڵی(١٩٥٥) لە گوندی مورغابی ئوستانی خوزستان لە دایک بووەو
٥٣.سوزان سامانجی چیرۆکنووسی کورد، لە باکوری کوردستان ساڵی ١٩٦٢ لەپایتەختی کوردستان لەدایکبوە و ئێستاش لەوێ دەژیت.
٥٤.سیمین دانیشڤەر، ڕۆماننووسی ئێرانی، ساڵی ١٩٢١ لە شیراز لە دایک بووە و ٢٠١٢/٣/٨ کۆچی دوایی کردووە.
٥٥.شوکر مستەفا زمانەوان و وەرگێری کورد، شکوور مستەفا عەبدوڵلا ساڵی لە (١٩٢٦) لە دایک بووە و لە٢٠٠٣.٠٩.١٨دا هەر لەشاری هەولێر بەنەخۆشی دڵ کۆچی دوایی کرد و هەر شارەشدا نێژرا.
٥٦.شوکرییە ڕەسول لێکۆڵەر و نووسەر و مامۆستای زانکۆ، ساڵی ١٩٥١ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە لە هەولێر دەژی.
٥٧. شێرزاد حەسەن چیرۆکنووسی کورد لەگەڕەکی خانەقای شاری هەولێر لەدایکبووە ساڵی لەدایکبوون دەکرێت (١٩٥١ یان ١٩٥٢) بێت.
٥٨.شێرکۆ بێکەس شاعیری کورد، کوڕی شاعیری ناوداری کورد فایەق بێکەس و لە ساڵی ١٩٤٠ لە شاری سلێمانی لەدایکبووە و ئێستا لە سلێمانی دەژی
٥٩.عەبدولقادر دەباغی نووسەر و وەرگێری کورد ناسراو بە مامە قالە، ساڵی ١٩٢١ی زایینی، لە بانە لە دایک بووە، و ٢٠٠٩/٢/٦ لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە.
٦٠.عەبدوڵلا پەشێو شاعیر و وەرگێری کورد، ساڵی ١٩٤٦ لە گوندی بێرکۆت لە دەشتی هەولێر لەدایکبووە، ئێستا لە فینلاندە دەژی.
٦١.عەبدوڵلا سەراج نووسەر و ڕۆماننووسی کورد، ساڵی ١٩٣٧ لە شاری کەرکوک لە دایک بووە و ئێستا لە دەرەوەی وڵات دەژی.

٦٢.عەبدوڵلا مەردۆخی نووسەر و لێکۆڵەری کورد، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایک بووە، ئێستا لە هەندەران دەژی.

٦٣.عەبدوڵڵای حەسەن زادە نووسەر و وەرگێڕ و سیاسەتمەداری کورد، ١٩٣٨ لە سەردەشت لە دایک بووە و ئێستا لە باشوری کوردستان دەژی.

٦٤.عەبدوڵلا عەباس نووسەری کورد، ٤/٤/ ١٩٤٦ لە سلێمانی لە دایک بووە و ئێستا لە هەندەران دەژی.

٦٥.عەدنان سائغ شاعری عێراقی ساڵی ١٩٥٥ لە شاری کوفە هاتۆتە دنیاوە، ئێستا لە سوێد دەژی.

٦٦.عوسمان دانش نووسەر و کەسایەتی سیاسی کورد، ناوی عوسمان کوڕی "شەریف ئەفەندی"ە و ساڵی ١٩٢٠ لە دایک بووە. عوسمان دانش لە ساڵی ١٩٥٠ لە تەمەنی ٥٠ساڵیدا لە سلێمانی مالاوایی لە ژیان کردووە .

٦٧.عوسمان شەیدا شاعیری کورد، ساڵی ١٩٥٣ لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە،و ساڵی ٢٠٠٥ کۆچی دوایی کردووە.

٦٨.عیزەدین مستەفا ڕەسول نووسەر و وەرگێڕ و پرۆفیسۆری کورد، ساڵی ١٩٣٤لە سلێمانی لە دایک بووە و ئێستا لە سلیمانی دەژی.

٦٩.عەتا محەممەد ساڵی (١٩٧٠) لە سلێمانی لە دایکبووە و لە دەرەوەی وڵات دەژی.

٧٠.عەتا نەهایی ساڵی (١٩٦٠) لە شاری بانە لە دایکبووە و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەژی.

٧١.فەرهاد پیربال شاعیر و ڕۆماننووس و مامۆستای زانکۆ لە ساڵی ١٩٦١ لە هەولێر لە دایکبووە و ئێستا لەوێ دەژی.

٧٢.فەرهاد شاکەلی شاعیر نووسەر و مامۆستای زانکۆی، کوردە، ساڵی ١٩٥١ لەباشووری کوردستان، ناوچەی گەرمیان، لە دایک بووە، ئێستا لە سوێد دەژی.

٧٣.فەرید زامدار نووسەر و ڕۆژنامەنووسی کورد، ساڵی ١٩٥٢ لەشاری هەولێر لەدایکبووە،و ئێستا لە هەولێر دەژی..

٧٤.کاروان عومەر کاکە سور، ساڵی(١٩٦٤) لە هەولێر لە دایکبووە و ئێستا لە دەرەوەی وڵات دەژی.

٧٥.کاکەی فەلاح شاعیر و نووسەری کوردی ناوی حەمین کوڕی قادرە. لەساڵی ١٩٢٨دا لەچوارتا سەربە پارێزگای سلێمانی لە دایک بووە و کاکەی فەلاح لە ٩/١٠/١٩٩٠دا لە لەشاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

٧٦.کەریم حسامی نووسەر و وەرگێڕ و سیاسەتمەداری کورد، ساڵی ١٩٢٦ زایینی لە گوندی (بەیرەم) لە ناوچەیی مهاباد لە دایک بووە، لە ٢٠٠١/١٠/٦ کۆچی دوایی کردووە.

٧٧.کەژاڵ ئەحمەد شاعیری کورد، لەساڵی ١٩٦٧ لەگەرەکی تەپەی مەلا عەبدوڵڵای شاری کەرکوک لەدایک بووە و ئێستا لە (ئەردەن) دەژی.

٧٨.کەمال میراودەلی نووسەری کورد، ساڵی ١٩٥١ لە گوندی مەرگە لە دایک بووە و ئێستا لە بەریتانیا دەژی.

٧٩.لەتیف هەڵمەت شاعیری کورد ساڵی ١٩٤٧ لەشاری کەرکوک لەدایکبووە و ئێستا لە سلیمانی دەژی.

٨٠.لەمیا کەمال ئالوسی، خانمە چیرۆکنووسی عێراقی، ساڵی ١٩٥٤ لە شاری تکریت لە دایک بووە لە هەندەران دەژی.

٨١.لەمیاء نابلسی

٨٢. مارف ئاغایی شاعیری کورد ساڵی ١٩٦٦ دا لە گوندی 'وزنێ 'ی سە ر بە شاری نەغەدە لە دایک بووەو ساڵی١٩٩٨ بە هوی کارە ساتی ترومبیلەوە کۆچی دوایی دەکات.

٨٣.مارف خەزنەدار نووسەر و لێکۆڵەر و مامۆستای زانکۆ ناوی مارف عەبدولقادر مارف ئەحمەد ئاغا رەسوڵ ئاغای خەزنەدار–ە، لە ١٩٣٠لەشاری هەولێر لەدایکبووە لە ٢٥-١٠-٢٠١٠ لە هەولێر بە نەخۆشیی دل کۆچی دوایی کرد .

٨٤.مارف عومەر گوڵ شاعیر و مامۆستای زانکۆ، ساڵی ١٩٥٦ لە گوندی هەشەزینی باشور کوردستان لە دیاک بووە، ئێستا لە سلیمانی دەژی.

٨٥.محەممەد موکری رێکەوتی رۆماننووس و نووسەر و وەرگێڕی کورد، ساڵی (١٩٤٤) لە دایک بووە و لە ٥ی ئاپریلی ٢٠١٢لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

٨٦.محەممەد حەمە باقی نووسەر و لێکۆڵەری کورد، ساڵی ١٩٤٦ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە و ئێستا لە شاری هەولێر دەژی.

٨٧.محەممەد دلێر ئەمین میسری نووسەری کورد، ساڵی ١٩٥١ لە سلێمانی لە دایک بوە و ئێستا لەوێ دەژی.

٨٨.محەممەد مەلا کەریم نووسەر و لێکۆڵەری کورد، ساڵی ١٩٣١ لە بیارە لە دایک بووە و ئێستا لە شاری سلێمانی دەژی.

٨٩.محەممەد نوری تۆفیق چیرۆکنووس و وەرگێڕی کورد ساڵی ( ؟ ) لە دایکبووە و ساڵی (٨/٦/٢٠١١) کۆچی دوایی کردوە.

٩٠.حەمەنوری عومەر کاکی نووسەری کورد، ساڵی ١٩٥٥ لە هەڵەبجە لە دایک بووە و ئێستا لە سلێمانی دەژی.

٩١.مەدحەت بێخەو نووسەری کورد، ساڵی ١٨٣٤ لە مەخموور لە دایک بووە و ئێستا لە کەرکوک دەژی.

٩٢.مەحموود کزەڵ نووسەری کورد، ناوی مەحمود قادر ئەحمەد، ساڵی ١٩٢٧ لە هەلەبجە لە دایک بووە ئێستا لە گەرەکی بەختیاری سلێمانی دادەنیشێت.

٩٣.مەریوان وریا قانع، نووسەر و مامۆستای زانکۆی کورد، ساڵی ١٩٧٣ لە دایکبووە و ئێستا لە هەندەران دەژی.

٩٤.مەزهەری خالقی، هونەرمەند و موزیسیانی کورد، ساڵی ١٩٣٨ لە شاری سنە لەدایکبووەو ئێستا لە سلێمانی دەژی.

٩٥.مەلا عەبدولکەریمی مودەریس زانا و بیرمەند و لیکۆڵیاری کورد، ناوی عەبدولکەریم محەمەد فەتاح لە ساڵی ١٩٠١دا لە گوندی تەکیەی سەر بەشارۆچکەی خورماڵ لە دایک بووە و لە ٨/٣٠/ ٢٠٠٥ دا لە شاری بەغداد کۆچیی دوایی کردووە.

٩٦.مەلا مستەفای بارزانی سیاسەتمەداری کورد، ساڵی ١٩٠٤ لە گوندی بارزان لە دایک بووە و ساڵی ١٩٧٩ لە ئەمریکا کۆچی دوایی کردووە.

٩٧. مەنسور یاقوتی نووسەری کورد، لە سالی ١٩٤٨ لە گوندی کێوەنان نزیک کرماشان لە دایک بووە و ئێستا لەوێ دەژی.

٩٨.موحسین ئەحمەد نووسەر و مامۆستای زانکۆ، ساڵی ١٩٦٢ لە شاری هەولێر لە دایک بووە و ئێستا لەوێ دەژی.

٩٩.میرزا محەمەد ئەمین ئەحمەد مەنگوڕی شاعیر و مێژوونووسی کورد، لەساڵی ١٩١٠ لەقەڵادزێ لەدایکبووە و ساڵی (١٩٨٨/١/١٢) لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

١٠٠.میدیا بیگەرد شانۆکاری کورد ساڵی ١٩٦٦ لە سلێمانی لە دایک بووە و ئێستا لە دانیمارک دەژی.

١٠١. نەزەند بەگیخانی نووسەر و شاعیری کورد، ساڵی ١٩٦٣ لە کۆیە لە دایک بووە و ئێستا لە دەرەوە دەی.

١٠٢. نورەدین زازا نووسەری کورد، ساڵی ١٩١٩ لە مادەن دایکبووە و ساڵی ١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە.

١٠٣. نەوشیروان مستەفا نووسەر و سایەتمەداری کورد، ساڵی (١٩٤٤) لە سلێمانی لە دایکبووە و ئێستا لە سلیمانی دەژی.

١٠٤. هادی مەهدی نووسەر و شانۆکاری عەرەب، ساڵی ١٩٦٥ لە دیوانییە لە دایک بووە و ساڵی ٢٠١١ لە بەغدا کوژرا.

١٠٥. هەڵکەوت حەکیم، نووسەری کورد، ١٩٥٠/٦/٤ لە شاری خانەقین لە دایک بووە و ئێستا لە هەندەران دەژی.

١٠٦. هیوا قادر شاعیر و ڕۆماننوسی کورد، ساڵی (١٩٦٤) لە سلێانی لە دایکبووە، ئێستا لە سلێمانی دەژی.

١٠٧. هێمن ناوی محەمەد ئەمین شێخولئیسلامی موکری ناسراو بە هێمن شاعیر، نووسەر و وەرگێڕی گەورەی کورد بوو. هێمن بەهاری ١٩٢١ لە دایک بوو و ١٤ی ئەپریلی ١٩٨٦ لە ورمێ کۆچی دوایی کرد.

١٠٨. هەژار موکریانی نایو عەبدولرەحمان شەرەفکەندییە شاعی رو نووسەری کورد، ساڵی ١٩٢١ لە مەهاباد لە دایکبووە و ساڵی ١٩٩١ کۆچی دوایی کردووە.

١٠٩. یوسف عیزەدین ساڵی (١٩٦٧) لە سلێمانی لە دایکبووە و ئێستا لە سلێمانی دەژی.

پێرست:

بڕوا بکە دەیان جار نامەم بۆ نووسیویت،
بەڵام هەموو جارێ ڕووخسەتم لە هاورێیەتیمان وەرگرتووە
لەباتی تۆ هەرخۆم نامەکانم خوێندۆتەوە ! لە ڕۆژگاری ئێمەدا
زۆر جاران تەنەکەی زبڵ ،بەدەست پاکتر دەزانم لە سندووقی پۆستە
کیسەڵ بە خۆشبەخت تر لە پۆستەچی...!

لە نامەیەکی "عەبدوڵلا پەشێوە"وە